# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
ژمارە (7) شوباتی 2000 – ساڵی دووەم



ناونیشان:
سلێمانی – فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن : 29839 یان 4347
بۆ پەیوەندی کردن لە دەرەوەی وڵاتەوە
سەنتەری سەرچنار
Tel: 00873 761 477 268 – 00873 682 040 391
Fax: 00873 682 040 392 – 00873 761 477 269
بەرگ: ئۆفسێتی دلێر

# سەردەم

ژمارە (7) شوباتی 2000 ساڵی دووەم

■ فیکرو فەلسەفە 3

ئۆگست کۆنت (ب1) ✍: لویس ئەی کۆسەر و: لە ئیتاڵییەوە : د. ئەلبێرت عیسا 4

ئاڵتۆسێرو ڕاڤەکردنەوەی مارکسیزم ✍: عەبدولعەلیم محەمەد و: لە عەرەبییەوە: کامیل محەمەد قەرەداغی 27

ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی ✍: مۆریس گۆدۆلیە و: لە عەرەبییەوە: سەروەر عەبدولڕەحمان 37

ئەگەریەیەقین دەستپێبکەیت بەنایەقین ئەگەیت ✍: کریشنا مۆرتی و:لەفارسییەوە/ یاسین عومەر 57

■ ڕەخنەو تۆژینەوە 65

ڕەخنەی نوێ، فۆرمالیزمی ئاکاریو... ✍: ڕامان سیلدن، پیتەر ویدۆسۆن و: لە فارسییەوە: کۆزاد 66

تیۆری ئەدەب چییە ؟ ✍: ڕۆجەر وێبستەر و: لە ئینگلیزییەوە: پەیوەند فایەق 80

پێکهاتە شکانی دەق ✍: ڕۆجەر وێبستەر و: لە ئینگلیزییەوە: محەمەد غەفور 87

دەربارەی ئایتماتۆڤ ✍: ئەحمەد پوری و: لە فارسییەوە: فەرشید شەریفی 93

■ لەئەدەبی گەلانەوە 103

سێ شەممەی تەڕ (چیرۆک) ✍: بیژەنی ئەجدی و: لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد 104

پەیڤین لەگەڵ دیوارەکانی زیندانی ✍: کریستینا برۆکنەر و: لە ئەڵمانییەوە: د. هەژار مەعروف 110
شتامهایم (چیرۆک)

ویرانەخاک (شیعر) ✍: ت.س. ئیلیەت و: لە ئینگلیزییەوە: عەتا قە ڕەداخی 131

■ گفتوگۆ 143

گفتوگۆ لەگەڵ سۆلجنتسن ✍: دایڤید کویمان و: لەعەرەبییەوە: شوان ئەحمەد 144

■ فایلی ژمارە (کارل پۆپەرو کۆمەڵگای کراوە) 151

کارل پۆپەر ✍: د. حوسێن بەشیریە و: ئازاد بەرزنجی 152

لێبوردن و بەرپرسیارێتیی فیکری ✍: کارل پۆپەر و: ڕێبین هەردی 174

بیرۆکەیەک دەربارەی تیۆرو پراکتیکی ✍: کارل پۆپەر و: محەمەد کەریم 192
حکومەتی خەڵک (دیموکراسی)

هەڤپەیڤینێک لەگەڵ کارل پۆپەردا ✍: جیانکارلۆبۆزتی و: شۆرش جوانڕۆیی 208

مێزگردێک لەسەر کارل پۆپەر و:س. ع 212

■ ویستگەکانی سەردەم 225

مەرە ڕەشەکەی لاپلاند (226) *کۆچی دوایی ئەکیرۆ کوروساوا (232) * خۆزێ ساراماگۆ لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵدا (235)* هونەر لە سەردەمی ستالین دا(239) *تورکێک هەموو دنیا دێنێ (248)

# فیکرو فەلسەفە



- ئۆگست کۆنت

- ئالتۆسێرو راڤەکردنەوەی مارکسیزم

- ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتی



- کریشنا مۆرتی

# ئۆگست کۆنت

■ لویس ئەی کۆسەر

● و. لەئیتالیەوە: د. ئەلبێرت عیسا

– بەشی یەکەم –

1–ئیشەکەی:

ئامانجی کۆنت ئەوەبوو کە زانستێکی کۆمەڵ دابمەزرێنێتو ئەبوایە ئەم زانستە لەسەر مۆدێلی زانستە سروشتیەکان بناغەی داکوتایەو بیتوانیایە پێش بینی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بکاتو ئاییندەی ببینێت.

کۆنت ئەیویست جگە لەوەی زانستە تازەکەی بتوانێ شیتەڵی یاساکانی ئەو جولانەوە بکات، واتا بتوانێ راڤەی ئەو یاسایانە بکات کە جموجوڵ ئەخەنە کۆمەڵی ئادەمیزادەوە لە هەموو کاتێکدا، هەوڵی ئەوەشی ئەدا کە چوارچێوەی ئەو حاڵەتانە دەست نیشان بکات کە ئەتوانن رەچاوی سەقامگیربوونی کۆمەڵایەتی بکەن لەهەموو کاتەکانی مێژوییدا، خوێندنی دینامیکی کۆمەلایەتی (جولانەوەی کۆمەڵایەتی)و سەقامگیربوونی کۆمەڵایەتی واتا لێکۆڵینەوەی پێشکەوتنو پێڕەو، گۆڕانو نەگۆڕان کۆڵەکەی سیستمەکەی بوون.

لەروانگەی کۆنتەوە، کۆمەڵی ئادەمیزاد ئەبێ بەهەمان ئاستی زانستی جیهانی سروشتی بخوێنرێتەوە، هەرچەندە کۆمەڵی ئادەمیزاد زۆر لەوە ئاڵۆزترە، بەڵام وەك سەرجەمی کۆزم (جیهان) مل کەچە بۆ یاسا سەرەکیەکان.

کۆنت ئەیوت زانستی سروشتی توانیویەتی پەی بەرێكو پێکی دیاردە سروشتیەکان بەرێتو لەرێگای ئەوەی کە ئەم دیاردانە شێوە رێكو پێکیەکیان هەیە (هەر لەکەوتنی بەردەوە بۆ سەرزەوی تا ئەگاتە جولانەوەی گۆی زەوی) لەروانگەی بەدوایەکدا هاتنی قۆناغەکانی پێشکەوتن.لەجیهانی سروشتدا، زانست توانیویەتی وردە وردە، لایەنی کەمو کوورپیەکانی پێڕەو مەسەلەی رێکەوتو رووداوەکان کەم

بكاتەوەو ئێستا (لەروانگەی کۆنتەوە) کاتی ئەوە هاتووە کە هەوڵێکی واش بدرێت بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ.

زاناکانی سروشت، هەر لەکاتی نیوتنەوەو پێش ئەویش، هەندێ سکێمی (نەخشە) باسکەریان پێش خستبوو.؟ ئەم سکێمە باسکەرانە وازیان لە پشکینینی هۆی یەکەم هێنابوو، وە هەوڵیان ئەدا ئەو یاسایانە بخوێنن کە لەپەیوەندیە جێگیرەکانی بەدوایەکهاتنو لێکچوون بەدوای یەکترا ئەڕۆن(1).

زانستی نوێ، لەبری ئەوەی پشت بەدەسەلآتی نەریت ببەستێ، ئەبوایە لەسەر بناغەی تێبینیو عەقلآنیەت بوەستایە(2) تێبینیو عەقلآنیەت تەنها دوو رێگای ڕەوانن بۆ گەیشتنە زانینی تەواو. خۆ ئەگەر ئەوە راست بێت کە هەموو تیۆرێکی زانستی پێویستە لەسەر بناغەی تێبینی شت بوەستێتەوە، هەروەها ئەوەش راستە کە هەرچۆنێك بێت، تێبینی کردن پێویستی بە دۆزینەوەی تیۆریەوە هەیە(3).

ئەو زانستە تازە کۆمەلآیەتیەی کە کۆنت ئەیویست دایبمەزرێنێ پێی ئەوترا "فیزیای کۆمەلآیەتی". دوایی، پاش ئەوەی کۆنت زانی کە ئەم چەمکە "دزراوە" لەلایەن ئاماری کۆمەلآیەتی "ئەدۆلف کێتلێت"وە (Adolphe Quete let)، وشەی "سۆسیۆلۆژی" دروست کرد: ئەم چەمکە لێکدراوی دوو وشەیە: یەکەم لاتینی، دووەم یۆنانی. ئەم زانستە نوێیە ئەبوایە لاسایی مۆدێلێکی زانستی سروشتی بکردایەتەوە، نەك تەنها لەرووی میتۆدی ئەزمونگەریو پرینسیپەکانی ئەپستمۆلۆژیەوە پیشکەش بەمرۆڤایەتی بکات. بێگومان، زانستە کۆمەلآیەتیەکان، هەروەکو زانستە سروشتیەکان، تەنها مەیلێکی تیۆریانە نیە، بەڵکو بەروانگەی کۆنتەوە، ئەبێ کەڵکێکی پراکتیکیان بۆ ئادەمیزاد هەبێتو رۆڵێکی گرنگتر ببینن بۆ چاکردنی بارودۆخی ئادەمیزاد.

هەتا ئەو کاتەی کە ئادەمیزاد بتوانێ دەوروبەری "نائادەمیزادی" خۆی بگۆڕێ بۆ بەرژەوەندی خۆی، پێویستە لەسەری ئەو یاسایانە بزانێ کە حوکمی جیهانی سروشت ئەکەن؛ "هەموو کاتێك کە ئەتوانین ئیشێکی گەورە بکەین، ئەم ئیشە گەورەیە ئەکەین تەنها لەبەرئەوەی ناسینی یاسا سروشتیەکان رێگامان پێ ئەدات، کە هەندێ رەگەزی بگۆڕ لەهەندێ کاتدا، بتوانن ئامانجە پراکتیکەکانی کارەکانی دەرەوە بۆ بەرژەوەندی خۆ دابین بکەین.. لەزانستەوە پێش بینی دێتو لەپێش بینینەوە ئیش کردن دێت"(4). بەم شێوەیە، ئەگەر بتوانرێ یاساکانی جوولانەوەی پێشکەوتنی کۆمەڵی ئادەمیزاد دابنرێو بناغەی کۆمەلآیەتیو گونجانی مەدەنی دابین بکرێ، ئەوا دەتوانرێت ئیشێکی کۆمەلآیەتی بەکەڵك بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر بکرێت هەتا ئەو کاتەی بڕوای وا هەبێت کە ئاراستەی گشتی رووداوی کۆمەلآیەتی بەرگری ناکات لەپاڵەپەستۆی قووڵی دەستێوەردانی رووکەشی یاسادانەر (ئەمجا خوایی بێت یاخود ئادەمیزادی)، ناتوانرێ هیچ پێشبینیەکی ئەو رووداوە بکرێت؛ بێگومان مەبەستمان لە "پێشبینیەکی زانستیە"(5).

هەتا ئەو کاتەی بڕوای بەوە هەبێت کە هەڵسوکەوتە کۆمەلآیەتیەکان هیچ یاسایەکیان نیەو هەمووی ئیشی رێکەوتە (arbitrate)

ناتوانرێ هیچ دەست تێوەردانێکی ڕاستەوخۆ بکرێت بۆ چاك کردنی چارەنووسیان. لەم بارودۆخەدا خەڵکان یەك بەرامبەر یەك بەرەنگاری یەکتری ئەبنەوە بۆ جێبەجێ کردنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانو، وای لێدێت لەوە بکات کە تەنها مۆدیلی گونجاو و ڕێکو پێك مۆدێلێکی هۆبسی بێت (Hobbes) بۆ کۆمەڵ: لەناو کۆمەڵی هۆبسیدا تەنها دەسەڵاتو بەندکردنی دەسەڵاتەکە پێڕەو بەرقەرار ئەکات. بەڵام ئەگەر سۆسیۆلۆژی بتوانێ فێری یاسا نەگۆڕاوەکانی پێشکەوتنو پێشڕەو دەرهەق بە مەسەلە مرۆڤایەتیەکان بکات کە یارمەتیمان بدات بۆ کەڵك وەرگرتن لێیان بۆ ئامانجی "گشتی" ئەوا بارودۆخەکە جیاواز ئەبێت. "لەفەلسەفەی ڕامیاریدا، ئیمکانی پێڕەو پێکەوە گونجان نیە بەبێ مل کەچی کردنی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بۆ یاسا نەگۆڕەکانی سروشت؛ ئەمانە، هەموو گومانێك دیاری دەکەنو دەستنیشانی ئەو سنورە سەرەکیانە دەکەن کە کارەکتێری بنەیی هەڵسوکەوتی ڕامیارین"(6) کەشفکردنی یاسا سەرەکیەکانی کۆمەڵ سنوورێك بۆ خواستو ئارەزووەکانی خەڵکی دادەنێت لە هەموو کاتێکیمێژوویيدا، خەڵکی فێرئەبن کە سنورێك بۆ پێداویستیەکانی ئیش کردنی تایبەتی ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتیو هەڵسو کەوتیان دابنێن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا تێ ئەگەن کە ئەتوانن، تاڕادەیەك بەئاشکرا هەڵسوکەوت بکەن، ئەویش لەڕێگای گۆڕینی ڕەوتی یاسا کۆمەڵایەتیەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەنجامەکانیان. لەبواری کۆمەڵایەتیدا، وەکو لەهەموو بوارێکی تردا ئەوەی کە وترا پەیوەندی بە "ڕێکخستنی دیاردەکانەوە نیە، چونکە ئەوەی گرنگە گۆڕینی پێش کەوتنی سروشتی خۆیانە؛ بێگومان ئەمە پێش وەخت پێویستی بەتێگەیشتنی یاسایی ڕاستەقینەکانەوە هەیە"(7). ئەوەی کە هێشتا زۆر گرنگترە، ئەوەیە کە پاش ئەوەی سیستمێکی زانستی تازە دائەنرێ، خەڵکی بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام نابن لەبیرکردنەوە بەشێوەیەکی ڕەهاو بابەتە تایبەتیەکانی ناو کۆمەڵ بەشێوەیەکی ڕێژەیی تەماشا ئەکرێن. بۆ نموونە، شتێکی مەحاڵ ئەبێت کە خەڵکی ئامانجەکانی ڕامیاری ببینێ بەبێ ئەوەی حسابێك دابنێ بۆ حاڵەتە مێژوویی-کۆمەڵایەتیەکانی ئەو هەڵسوکەوتانەی کە پێیانەوە بەستراون. تەنها زانینی ئەوەی کە هەموو هلسوکەوتێکی کۆمەڵایەتی فەرزی هەڵسوکەوتێکی ڕامیاری ئەکات، خەڵکی بەرەو ئەو ڕێگایە ئەبات کە بتوانن پەیڕەوێك دابنێن بۆ کۆمەڵگەکەیان، بێگومان لەسنووری پێداویستیەکان کە پێوەی بەستراون.

زانستی تازەی پۆزەتیڤ (Positive) جێی باڵادەستی تەقلیدی سەد ساڵە ئەگرێتەوە. زیاتر لە چەند جارێك کۆنت جەخت دەکات کە هیچ شتێك نیە ڕەها بێت، هەموو شتێك ڕێژەییە، ڕەها بوونو ڕێژەیی ناوەڕۆکی باسەکەیەتی، لەبری ئەوەی ڕاستی تێیۆلۆژی پەسەند بکرێتو مەزەندە بکرێت کە هەمیشە بەکارە، کۆنت بەردەوامی پرۆسەی زانینی ئادەمیزاد شیتەڵ ئەکاتەوەو جەخت ئەکات لەسەر کارێکتەری خۆشالکەری چالاکی زانستی.

"هەموو لێکۆڵینەوەیەکی سروشتی ناوخۆی ئادەمیزاد هۆی یەکەمو کۆتاییان،... هتد ئەبێ هەمیشەو بەشێوەیەکی رووت ڕەها بێت، بەڵام

هـەموو لێكۆڵینەوەیـەكی یاسـای دیاردەكـان بەشـێوەیەكی رەهـا رێژەییـە، لەبـەر ئـەوەی پێشكەوتنێكی بەردەوام لە تێڕامانەوە پێویستە، ئەم تێڕامانە ئەبێ مل كەچ بێت بۆ باش كردنێكی لەسـەرخۆی تێبینـی، ئـەبێ بزانـرێ كـە واقـع لەهەموو بوارێكـدا رێژەیـی نیـە..؛ كـارێكتێری رێژەیـی زانینـی رێژەیـی بەشـێوەیەكی پێویسـت جیاناكرێتـەوە لـە واتـای راسـتەقینەی یاسـا سروشتیەكان"(8).

لەگـەڵ ئەوەشـدا كۆنـت هیـچ شـێوەیەكی دەسـەڵاتی رەتنەكردۆتـەوە: ئەگـەر هـاتوو دان بنرێت بەدەسەڵاتی بـاڵای زانسـت لـە رێبەرایـەتی كردنی كاروباری مرۆییدا خـەڵكی ئـەتوانن واز لـە لێكۆڵینەوەیەكی بێ كەڵك بێنن كـە فـەرزی مـافی رەهای لێكۆڵینەوەیەكی سەربەست بكات، یـاخود دۆگمـی سەربەسـتی بــێ سـنوری زانـین سـەربخات"(9) تەنها ئەوانەی كە بەرەزامەندی خۆیان مل كەچ ئـەبن بۆ پەیوەندیـەكانی توندی میتۆدۆلـۆژی زانسـتیو بـۆ یاسـاكانی پرۆڤـەی زانسـتی، تەنها ئەوانە ئـەتوانن شـتێك لـەبواری مرۆڤایەتیا بڵێن.

سەربەستی رای شەخسی هیـچ واتایـەكی نیـە لـەفیزیاو ئەسـترۆنۆمی (Astronomy)دا، وە لـە داهـاتوودا ئـەم سەربەسـتیە بـێ كـەڵك ئـەبێت لـەبواری زانستە كۆمەڵایەتیـەكاندا. كە خـەڵكی ئەیانـەوێ رای خۆیـان لەئیشـكالاتی زانسـتی بسەپێنن، بەراستی ئەمە شتێكە كە كەم پەسەند دەكرێ. رێك خستنەوەی فكـری كـە خەریكـە لـەدایك ئـەبێت لـەبواری زانسـتی كۆمەڵایـەتیدا، رێگـاخۆش دەكـات بـۆ "وازهێنـانێكی ناچـاری زۆربەی خەڵك بەرامبەر مافی رەهاو لێكۆڵینەوەی تایبـەتی، تەنانـەت بەرامبـەر هـەندێ بـاس كـە بـەرزترن لـەگرنگی راسـتەقینەی خۆیـان"(15) هـەروەكو زانسـتە سروشـتیەكان، لـەداهاتوودا، سۆسـیۆلۆژی هــەوڵ ئــەدات كــە "مــافی لێكۆڵینـەوەی [دیـاردە كۆمەڵایەتیـەكان] بـدات لەسـنوری نۆرمـاڵ (Normal)و بــەردەوامی خۆیاندا؛ ئەمانەش ئەو پەیوەندیە پێـك دێنـن كە رێگـا ئـەدات بـە پـەیڕەوی كردنـی یاسـا سەرەكیەكان بەشێوەیەكی گشتی"(11).

دەمەتەقێی زانستی، لەگەڵ هەموو خەسڵەتە بەسـتێنەرەكانی (كـە پیـاو ئەبەسـتێتەوە)، لەداهاتوودا سنووری تەواو دائەنێ بۆ تێڕامـانێكی بێ كەڵكو بۆ میولی یۆتۆپی بێ هاوتا.

## 1–1–میتۆدی لێكۆڵینەوە

كەواتـە ئـەو رێگایانـە چین كـە سۆسـیۆلۆژی پشتی پـێ ببەسـتێت لـەكاتێكدا كـە بویسـترێت شـیتەڵی یاسـاكانی پێشـكەوتنو سیسـتمی پەیڕەوی كۆمەڵایـەتی بكرێـت؟ هـەر ئەوانـەن كە بەســەركەوتووی لەزانســتە سروشــتیەكان بەكارهێنراون:

تێبینــی كــردن Obseruation، پرۆڤــەكردن Experinentation، بەراوردكردن Conparisow.

تێبینی كردن واتای لێكۆڵینەوەی هەرەمەكی نیە "بە بێ دەست نیشـانكردنێكی روونو بـۆ تیۆرەیەكی سەرەتایی"(12) تێبینیكـەر هـەرگیز ناتوانـێ كـام دیاردەیـە تێبینـی بكـات "هیـچ دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی واتای زانستی راستەقینە نابەخشـێ ئەگـەر بـەزوویی ئامـاژە نـەدات بەدیاردەیـەكی كۆمەڵایـەتی تـر"(13) لـەرێگای تیۆرەیەكی پێشووەوە، لەبەر ئەوە تێبینی كردن

تەنها لەکاتێکدا مەفعولی خۆی هەیە کە مل کەچ بکات بۆ یاسای ستاتیکو دینامیکی دیار.(14) ئەمە شتێکی پێویستە.

دووەم میتۆدی لێکۆڵینەوە، پرۆڤە کردنە، بەڵام ئەمە بەشێوەیەکی تەواو پراکتیزە ناکرێ بەسەر زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا. پرۆڤەی راستەوخۆ نیە لەجیهانی مرۆڤایەتیدا. بەڵام ئەتوانرێ باسی "تاقی کردنەوە بکرێت لەکاتێکدا کە ئەو دیاردەیە، بەشێوەیەك یان بەشێوەیەکی تر، چەند جارێك دووبارە بێتەوە.. حالەتی پاتۆلۆژی.. بەرامبەر زانستی راستەقینە تاقی کردنەوە پێك دێنن"(15). بێ رێکو پێکی بۆ ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتی وەکو "نەخۆشیە بۆ ئادەمیزاد"(16)؛ پاشان لێکۆڵینەوەی حالەتی پاتۆلۆژی ئەبێت بەچاکترین ئامراز بۆ تێگەیشتنی حالەتی ئاسایی.

بۆ کۆمەڵ ناسێك سەرەکیترین میتۆدی زانستی بۆ لێکۆڵینەوە بەراوردکردنە، لەبەر ئەوەی زۆر گونجاوە.. بۆ چاکتر لابردنی رۆحی رەها.

بەراورد کردن لەنێوان کۆمەڵی مرۆڤایەتیو ئاژەڵی، رێگامان پێ ئەدات تێ بگەین لە "یەکەم تۆوی پەیوەندی کۆمەڵایەتی"(17) و ئەو سنوورەی کە هەیە لەنێوان جیهانی مرۆڤایەتیو جیهانی ئاژەڵیدا. هەرچەندە بەراورد کردن لەنێوان جۆری مرۆڤایەتی گرنگترە بۆ سۆسیۆلۆژی.

لەم رووەوە، میتۆدی سەرەکی "پێك هاتووە لەبەراوردکردنێکی عەقلانی لەنێوان قۆناغی جیاوازی کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەسەر هەموو پارچەکانی سەرزەوی کە بەتەواوی سەربەخۆن لەیەکتری. ئەم رێگایە زۆر گونجاوە بۆ بەتەواوی کەشف کردنی قۆناغە سەرەکیەکانی پێشکەوتنی مرۆڤ"(18).

هەرچەندێك رەگەزی مرۆڤایەتی پێش کەوتبێ بەشێوەیەکی هاوتەریب "لەبەر هەندێ هۆی نادیار خەڵکی هێشتا نەگەیشتوونەتە پلەی یەکسان لەم پێش کەوتنەدا"(19). لەبەر ئەوە، هەندێ قۆناغی پێشکەوتن "کە مێژووی شارستانیەتیەکەمان هیچ شوێنەوارێکی وای لێ نەهێشتووەتەوە، ناتوانن بناسرێن ئەگەر لەرێگای لێکۆڵینەوەی بەراوردکردنەوە نەبێت کە زۆر پێویستە"(20). واتا لەرێگای میتۆدی بەراوردی کۆمەڵی بەراییەوە هەروەها، میتۆدی بەراوردی رەگەزێکی بنەڕەتیە لەشیتەڵ کردنەوەی تەوژمی رەگەزەوە یاخود هی ئاوو هەوا لەدیاردە مرۆڤایەتیەکان. بۆ نموونە ئەم میتۆدە پێویستە بۆ وەستانەوە دژی ئەو باوەڕە پووچانەی کە باسی "تەوژمی سیاسی ئاوو هەوا ئەکەن" وە کە باسی "کاری جیاوازی کۆمەڵایەتی ئەکەن بۆ سەر نایەکسانی پێشکەوتن"(21).

هەرچەندە ئەو میتۆدە تەقلیدیانەی زانست ئەبێ لەبواری سۆسیۆلۆژیدا بەکاربهێنرێن، بەڵام میتۆدێکی چوارەم هەیە کە سۆسیۆلۆژی پشتی پێ ببەسترێ ئەویش "میتۆدی مێژوویییە" بەراوردکردنی مێژوویی قۆناغەکانی مرۆڤایەتی تەنها ئامرازێکی سەرەکی زانستی نیە کە زانستی تازەی فەلسەفەی سیاسی پشتی پێ دەبەستێت.. بەڵکو ئەوە راستەوخۆ بناغەی زانستە[.....](22). بەراوردە مێژووییەکان کە ئاماژە بەو کاتانە ئەکەن کە مرۆڤایەتی بەسەریانا تێپەڕیوە؛ بناغەی لێکۆڵینەوەی سۆسیۆلۆژی

مەزەندە دەکرێن سۆسیۆلۆژی هیچ نرخێکی زانستی نیە ئەگەر ڕەچاوی زانینی پێش کەوتنی مێژوویی نەکات

## 1–2 یاسای پێشکەوتنی مرۆڤایەتی:

هەر ساڵی 1822، لەکاتێکدا یاریدەدەرو سکرتێری سان سیمون بوو، کۆنت پێشنیازی ئەو ئامانجەی کرد "تا ئەوە تێ بگات کە لەڕێی کام گۆڕانکاریەوە ڕەگەزی مرۆڤایەتی توانیویەتی بگاتە ئەو ئاستەی ئەمڕۆ کە ئەورووپای تێدایە، ئەو ئەورووپایەی کە لەقۆناغێکی نەختێك بەرزتر بووە لەکۆمەڵگای مەیمون"(23). بەپراکتیزەکردنی ئەوەی کە ڕەچاوی ئەکرد بە میتۆدێکی بەراوردی زانستی، کۆنت گەیشتە ئەوەی کە چوارچێوەی جیهان بینینی بنەڕەتی خۆی دابنێ؛ کە پێکهاتووە لە: یاسای پێش کەوتنی مرۆڤایەتی یاخود یاسای سێ قۆناغ. ڕۆحی کۆی خەڵکی بەشێوەیەکی تەریب لەگەڵ پیشکەوتنی ڕۆحی مرۆڤدا پێش ئەکەوێ ئەگەر بەتەنها وەرگیرێ. فیلۆجێنێز (Philogenesis) واتە پێشکەوتنی گروپە مرۆڤایەتیەکان یاخود پێشکەوتنی هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی لە ئۆنتۆجێنێز (Ontogenesis) [واتا پێشکەوتنی ئۆرگانیزمی مرۆڤ بەتەنها] خۆی ئەدۆزێتەوە هەروەکو چۆن هەریەکێك لەئێمە لەمناڵیدا مرۆڤێکی بەئیمانە، لەهەرزەکاریدا میتافیزیکیەکی ڕەخنەییەو لە پێگەیشتندا فەیلەسوفێکی سروشتیە، ئاوا ڕەگەزی مرۆڤایەتی، لەکاتێکدا کە تەشەنەی سەندووە ئەم سێ قۆناغە سەرەکیەی بڕیوە.

"لاسەرەکیەکانی تێگەیشتنمانو هەر کایەیەك لەکایەکانی زانینمان، بەسێ قۆناغی تیۆری جیاواز جیاوازدا دەڕۆن: قۆناغی تیۆلۆجی (theology) یاخود دروست کراو، قۆناغی میتافیزیکی یاخود ئەبستراکت، قۆناغی زانستی یاخود پۆزیتیف (Positive)... لە قۆناغی تیۆلۆجیدا، ڕۆحی مرۆڤ (لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی لێکۆڵینەوەی خۆی بەرەو سروشتی ناوخۆی مرۆڤ ئەباتو بەرەو هۆکانی یەکەم و دوایی [واتا بنەچەو ئامانجی بوون] هەموو ڕووداوێك ئەبات).. هەموو هەڵسوکەوتێکی ڕاستەوخۆو بەردەوام بەئیشی باوەڕمەندی سەرووسروشت (Supernaturalist) لەقەڵەم ئەدات.. لەقۆناغی میتافیزیکیدا.. [ئەم ڕۆحە] پێویستی بەهێزی ئەبستراکت، بەقەوارەی ڕاستەقینە بە تەجریدی بەرجەستەیی هەیە؛ لەم قۆناغەدا ئەمانە ئەتوانن هەموو دیاردەیەك بخەنە ڕوو.. لەقۆناغی (دوایی)، واتا قۆناغی پۆزیتیف، ئەم ڕۆحە واز لە لێکۆڵینەوەی بێ کەڵکی ڕاوبۆچوونی ڕەها دێنێو هەروەها واز لە بنەچەو چارەنووسی جیهان دێنێو لەهۆی ناوخۆ دیاردەکان بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی تەرخان بکات بۆ تاوتوێکردنی یاساکانیان، واتا بەو پەیوەندیە نەگۆڕاوانەی شوێنگرتن (تعاقب Succession) و لەیەك چوونەوە خەریك دەبێت"(24). لەڕوانگەی کۆنتەوە هەموو قۆناغێکی دوایی یاخود هەموو نیمچە قۆناغێکی پێشکەوتنی ڕۆحی مرۆڤ لەوەی پێشووی خۆیەوە پەیدا دەبێت. سیستمێکی تازە لەناوچوونی سیستمێکی پێشوو دێتەدی(25)و ئەم سیستمە تازەیەش دێتەدی پێش ئەوەی

هـەموو حـالّەتی رۆحـی ئـەوەی پێشـوو بەتـەواوی لەناو چووبێت.

پێویستە سیستمی کۆن برووخێنرێ لەکاتێکدا کـە نەفسـیاتی بـەرز بتوانـن لەخەسـڵەتو تایبەتمەندیـەکانی چـەرخی تـازە بـاش تـێ بگەن(26). جگە لەوەی کە کۆنت تەرکیزی کردە سـەر قۆناغـەکانی پێشـکەوتنو وردە وردە رزگـاربوونی رۆحـی مرۆڤایـەتی. هەولّیشـی ئـەدا لایەکی تر روون بکاتەوە: بەرامبەر هەریەکە لـەم قۆناغانـە، چـەند قۆنـاغێکی کـەش هـەن کـە بەشێوەیەکی تـەریب لەگـەڵ یـەکدا ئـەڕۆن، واتـا هـەموو قۆنـاغێك قۆنـاغێکی دیکـەی بەرامبـەرە لەپێشکەوتنی رێکخـراوی کۆمەڵایـەتیو جـۆری پـەیڕەوی کۆمەڵایـەتی، جـۆری گرووپـی کۆمەڵایەتیو هەلومـەرجی مـادی ژیـانی مـرۆڤ. لەروانگەی کۆنتـەوە ئـەم هـەموو رەگەزانـە لـە پێشـکەوتنیاندا بەهـەمان ئاراسـتەی گۆڕانـی تایبەتی ئەڕۆنو ئەو گۆڕانکاریانەش بەدی ئەهێنن لەبیردا.

کۆنت ئـەیوت: شتێکی هەڵەیـە چـاوەڕوانی پـەیڕەوێکی تـازەی کۆمەڵایـەتی بکـرێو ئـەم پـەیڕەوی کۆمەڵایەتیـە ئاکـامی پـەیڕەوە کۆمەڵایەتیەکەی پێشـوو بێـتو جیـاوازی نـەبێت لەگـەڵ سیستمی فکری تـازەدا: "پەڕینـەوە لـە سیستمێکی کۆمەڵایەتی بۆ سیستمێکی تر بـەهیچ شـێوەیەك راسـتەوخۆو بـەردەوام نیـە"(27). مێژووی مرۆڤایـەتی لەراستیدا پێکهاتووە لەیەك لەدوا یەك هاتنی چـەند چەرخێکی "ئۆرگانی" و چـەند چـەرخێکی "رەخنـەیی" لەچەرخـە ئۆرگانیەکاندا سـەقامگیر بوونێکی کۆمەڵایـەتیو هـارمۆنی (فکری) هەیەو بەشـەکانی جەسـتەی کۆمەڵایـەتی هاوسـەنگن. بـەڵام لەچەرخـە رەخنەیـەکاندا، بـیری کـۆن هەڵدەتـەکێو گلـۆر دەبێتەوە (بۆ خـوارەوە)و قـەوارەی کۆمەڵایـەتی لـەبارێکی ناسەقامگیری قووڵدایە. ئـەم چەرخـە رەخنەییانە (چەرخی کاتی کۆنـت) بـەقووڵی ئـەو خەڵکە بێزار ئەکەن کە تینـووی پـەیڕەون. بـەڵام هەرچۆنێك بێت ئەم چەرخانـە دەست پێشکەری پێویستن بۆ هاتنی قۆناغێکی ئۆرگانی، "بەلایەنی کەمـەوە بۆ چـەند نەوەیـەك، بوونێکی ئـەنارکی هەیە کە کـاراکتێرو هـاوەی لەسـەر چڕیو رادەی بڵاوبوونـەوەی تـازە بـوونو پێشـکەوتن ئەوەستنەوە"(28).

ناتوانرێ ئینکاری ئەوە بکرێت کە یاسای سێ قۆناغی کۆنت مەیلێکی زۆر رۆحی یـاخود میسـالی هەیە. بەڵام هەرچۆنێك بێت (وەکو لەپێشدا وترا) کۆنت پەیوەندیەك دروست ئەکات لەنێوان هـەموو کـاتێکی رۆحـی مرۆڤـو خەسڵەتە تایبەتیـەکانی رێکخـراوی کۆمەڵایـەتیو جـۆری خۆفـەرزکردنی سیاسـی(29). قۆنـاغی تیۆلـۆژی لەلایـەن قەشـەکانەوە دەستی بەسـەرا هێنراوەو لەلایـەن سـەربازەکانەوە حوکـم کـراوە (کۆنـت ئـەم قۆناغـەش دیسـانەوە دابـەش ئەکاتـەوە بـۆ چـەندەها قۆنـاغی بچوکـتر...). قۆنـاغی میتـافیزیکی (کە کـەم تـا زۆر بەرامبـەر چـەرخی ناوەڕاستو رێنیسـانس ئەوەستێتەوە) دەسـتی بەسـەرا هێنراوە لەلایـەن جـێرارکی کەنیسـەوە پیـاوی یاسا. قۆنـاغی پۆزیتیـف (لـەداهاتوودا) لەلایـەن پیـاوی پیشەسازیو ئـەو پیاوانـەی کـە دەسەڵاتی ئاکاری جیهانی زانستیان هەیـە حوکم

دەکرێ لەیەکەم قۆناغدا، خێزان تەنها یەکەیەکی کۆمەڵایەتیە، لەدووهەمدا دەوڵەت تایبەتی کۆمەڵایەتی خۆی ئەبێت وە لەسێهەمدا هەموو رەگەزی مرۆڤ ئەبێ بەیەکەیەکی کۆمەڵایەتی کارا.

گەلێك جار، کۆنت زۆر جەختی کردۆتە سەر ئەوەی کە "پێشکەوتنی فکری" "بناغەیەکی پێویستی باڵادەستە"(30) لەپێشکەوتنی مرۆڤ، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەو بوونی فاکتەری رێکەوت ئافەرۆز ناکات. بۆ نمونە زیادبوونی دیمۆگرافی وەکو فاکتەرێك پاڵ پێوەنەری گرنگ بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی سەیر دەکات.

"زۆربوونی (دیموگرافی) مرۆڤ... هاویەش ئەکات (بەتایبەتی لەسەرەتادا) لەدەست نیشانکردنی دابەش بوونێکی کار، ئەم دابەش بوونە زۆر ناگونجێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کەم لەخەڵك کە لەگەڵ یەکتردا هاوکاری ئەکەن. جگە لەوە.. ئەم دابەش بوونە، پاڵ بەخەڵکەوە ئەنێ کە هەولێکی تر بدەن، بەیارمەتی رێگای چاك چاك بۆ مسۆگەرکردنی ژیانیان.. بەدروست کردنی پێویستی تازەو زەحمەتی لەژیاندا، خەڵکی ئامرازی تازەی تر پێش ئەخەن؛ ئەم پێشخستنەش نەك تەنها بۆ ئەوەی پێشکەوون، بەڵکو بۆ ئەوەیش کە سیستمێك دروست بکەن بۆ خۆیان و نایەکسانی نێوان مرۆڤ کەم بکەنەوەو گرنگی زۆریش بدەن بەهێزی فیکری و ئەخلاقی..."(31)

کونت دابەش بوونی کار بەفاکتەرێکی پاڵ پێوەنەری کارا ئەبینێ لەگەشەو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا.

## 1-3 پەیژەی ژێرارکی لەنێوان زانستەکاندا:

دووەم تیۆری بەناوبانگی کۆنت پەیژەی ژێرارکیە لەنێوان زانستەکاندا ئەمە بەشێوەیەکی توند زۆر پەیوەندی بەیاسای سێ قۆناغەوە هەیە هەروەکو چۆن مرۆڤایەتی پێش ئەکەوێ و لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر هەنگاو ئەنێ و هەر قۆناغەی لەسەر قۆناغی پێشوو خۆی دروست ئەکات، ئاوا زانینی زانستی بەرێژەی جیاواز جیاواز پێش ئەکەوێ. "جیاوازی سروشتی دیاردەکانە... (کە دەست نیشان کراون لەلایەن خۆیانەوەو لەرێی پشت بەستنی دوو لایەنە لەنێوان یەکتریدا) کە پاڵ بەوەوە ئەنێن کایەکانی زانین لەپێشدا بگەنە قۆناغێکی پۆزیتیف (Positive). لەبەر ئەوە زانستی ئەستێرەکان (Astronont) کە زۆر گشتی و ئاسانترە لەزانستە سروشتیەکانی تر، لەپێش هەموودا ئەگاتە قۆناغی پۆزیتیف(32). پاش ئەو، فیزیا، کیمیا، بایۆلۆژی ئەمجا سۆسیۆلۆژی دێت. پێشکەوتن لەهەریەك لەم زانستانە ئەوەستێتە سەر پێشکەوتنی زانستەکانی تر؛ جێی گومانە، هەریەکە بەگوێرەی شوێنی خۆی لەناو زانستەکان و رادەی ئاڵۆزی و چوارچێوەی گشتی.

زانستە کۆمەڵایەتیەکان، کە ئاڵۆزترن و پشت بە زانستەکانی تر دەبەستن لە پێشکەوتنیاندا، "بەرزترن" لەروانگەی شوێنیان لەسەر پەیژەی ژێرارکی. "ئەشو نمای سەرەکی میتۆدی پۆزیتیف بەشێوەیەکی پێویست تەواو نیە چونکە بەشێوەیەکی پێویست تاوتوێی قۆناغی دوایی مرۆڤایەتی ناکات.. تەنها بەم شێوەیە کەواتای گشتی یاسا سروشتیەکان ئەتوانێ بەشێوەیەکی

چاك پێش بکەوێ"..(33) زانستی کۆمەڵایەتی، کە هەموو ئامرازی زانستەکانی تر کە لەپێشیەوەن بەکارئەهێنێ(34) بەلام زیاتر لەوەش، میتۆدی مێژوویی بەکار ئەهێنێ بۆ "لێکۆڵینەوەو ئەمەش نەك بۆ بەراوردێکی ساویلکە، بەڵکو بۆ ئەوەی وردە وردە ببێ بەلقێك لەوان"(35) "دیاردەی سەرەکی سۆسیۆلۆژی... واتا تەوژمی بەرە بەرەو بەردەوامی نەوەکانی مرۆڤایەتی لەسەر یەکتری، ناتوانرێ تێبگەیێنرێ یاخود واتاکەی شاراوەیە بەبێ شیتەڵکردنەوەی مێژوویی، ئەمەش زۆر پێویستەو خۆی دەسەپێنێت"(36). هەرچەند، سۆسیۆلۆژی خەسڵەتی میتۆدۆلۆژی تایبەتی خۆی هەبێت کە جیای بکاتەوە لەزانستەکانی تر کە لەسەر پەیژەی ژێرارکی پێش ئەون، سۆسیۆلۆژی پشت بەم زانستانە ئەبەستێت بەتایبەتی بایۆلۆژی، ئەم زانستە نزیکترە لەهەموو زانستە سروشتیەکانی تر. ئەوەی کە بایۆلۆژی جیائەکاتەوە لەزانستە سروشتیەکانی تر، کارێکتێری گشتیەتی (گشتیەتی واتای ئەوەیە کە هەموو زانستەکانی تر ئەخاتە ژێر باڵی خۆیەوە). بەجیاوازی لەگەڵ فیزیا و کیمیا (کە میتۆدی جیاکردنەوەی رەگەز بەکارئەهێنێ)، بایۆلۆژی لێکۆڵینەوە لەسەر کۆی ئۆرگانی ئەکات. لەم ئاستەدا، واتا لەئاستی لێکۆڵینەوەی مانای کۆی ئۆرگانی کە سۆسیۆلۆژی لەبایۆلۆژی ئەکات. "لێکۆڵینەوەی تەواو راستی نابێت لەرووی مەنتیقەوە بەهیچ شێوەیەك لەکۆ (هەموو) جیابکرێتەوە؛ ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە پێویستە.. هەمیشە ئیعتیبار بۆ هەموو لایەنە کۆمەڵایەتیەکان دابنرێ، جا ئەمە لەبواری ستاتیکی کۆمەڵایەتی بێت یاخود.. لەبواری دینامیکی کۆمەڵایەتی"(37). تەنها شێوە بۆ کارکردن لەبواری سۆسیۆلۆژیدا ئەوەیە کە ئیعتبار بۆ "لێکۆڵینەوەی رەگەز بکرێت وەك بەشێك لەسیستمێك.. [لەزانستە ئۆرگانیەکاندا] رەگەزەکان زیاتر ناسراون لەقەوارە گشتیەکە.. ئەوەی پێویستە بکرێ ئەوەیە کە لە ئاسانترەوە بەرەو ئاڵۆزتر برۆین. بەلام.. رێگاکەی تر [واتە پێچەوانەی ئەم رێگایە] زۆر جار ئەبێ بەرێگایەکی عەقڵانی تر [لە لێکۆڵینەوەی مرۆڤو کۆمەڵ] چونکە [مرۆڤو کۆمەڵ] وەکو کۆیەك، بەدڵنیایی، زیاتر ناسراونو بەشەکانی کە لەگەڵ یەکتریدا جیائەکرێتەوە، کەمتر ئاڵۆزن"(38)

### 1-4 ستاتیكو دینامیکی کۆمەڵایەتی (وەستانو جولانەوەی کۆمەڵایەتی):

هەروەکو لەبایۆلۆژیدا شتێکی بەکەڵکە ئەناتۆمی جیابکرێتەوە لە سۆسیۆلۆژی، بەهەمان شێوە شتێکی باشە کە لە سۆسیۆلۆژیدا حاڵەتی وەستاو لەحاڵەتی جولانەوە جیابکرێتەوە. ئەم جیاکردنەوەیە لەنێوان دوو شت نیە، بەڵکو لەنێوان دوو لایەنی یەك تیۆریدایە. ئەم جیاکردنەوەیە، "بەرامبەر... چەمکی پەیرەو پێشکەوتن ئەوەستێتەوە.. بێگومان، دیاردەکە.. پەیرەو.. لەبنەرەتدا واتای هارمۆنیەکی راست لەنێوان دوو حالاتی وجودی کۆمەڵی مرۆڤایەتیو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی... ئەبێ، بەشێوەیەکی سروشتی، چەمکی سادەی پێشکەوتنی بنەرەتی بگرێتەوە"(39). پەیرەوی پێشکەوتن، وەستانو جوولانەوە هەمیشە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیەو هەمیش یەکتری ئەگرنەوە.

بۆ ئەوەی راستیەك بۆ تیۆری سێ قۆناغەکە بسەلمێنێت، کۆنت لێکۆڵینەوەی خۆی بەردەوام پێدا لەبواری سەقامگیرکردنی کۆمەڵایەتیدا. "سۆسیۆلۆژی ستاتیك (وەستاو) ئەبێ بابەتی لێکۆڵینەوەکەی تاوتوێی پۆزیتیڤی (ئەمبرقیو عەقلانی) کارو پەرچەکرداری بەرامبەر بێت، هەموو شتەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی کار لەیەکتری دەکەن"...(40).

سۆسیۆلۆژی لێکۆڵینەوەی هاوکێشەی پەیوەندیەکان ئەکات کە لەنێوان رەگەزەکانی کۆیەکی کۆمەڵایەتی هەیە. "دەبێت هەمیشە هارمۆنیەکی ئیرتیجالی.. لەنێوان کۆو هەموو بەشەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی هەبێت"(41). ئەگەر ئەم هارمۆنیە نەبێت خۆمان بەرامبەری حاڵەتێکی پاتۆلۆژی ئەبینینەوە.

کۆنت لەکاتێکدا کە لێکۆڵینەوەی لەسەر بەشەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی ئەکات بەشێوەیەکی سەرلەبەر ئافەرۆزی ئەوە ئەکات کە ئادەمیزاد (تاك) بێت بەشە سەرەتاییەکان "رۆحی زانستی رێگا نادات کە راستەوخۆ کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەچەند تاکێك پێك هاتبێت. بەڵکو یەکێتی راستەقینەی کۆمەڵایەتی پێك هاتوە لەخێزان، بەلایەنی کەمەوە لە پەیوەندی دووییدا (ژن و مێرد) کە بناغەی سەرەکی کۆمەڵ پێك دێنێت.. زۆر خێزان ئەبن بەخێڵو ئەمانەش بەمیللەت"(42).

زانستێکی کۆمەڵایەتی کە لەدەست پێکردنیەوە پێویستیو مەیلی تاکەکەس لێك ئەداتەوە بەرەو توانەوە ئەچێت. بەتایبەتی شتێکی هەڵەیە مەبەستی قازانج وەرگرتن لەو مەیلە کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤەوە هەڵێنجێنین کە وەکو دەرمان خست سەر بەسروشتی خۆین(43).

لەقۆناغی سەرەتایی مرۆڤدا کەڵکەکانی بەکۆمەڵایەتی کردن (Association) زۆر روون نەبوون "ئیتر، ئەوە زۆر روونە کە حاڵەتی کۆمەڵایەتی نەئەهاتە کایەوە، ئەگەر بەکۆمەڵایەتی کردن کەڵکی خۆی نەبوایە"(44).

لەراستیدا، لەناو خێزاندا کە مەیلی خۆپەرستی سەرەتایی دەرئەکەون و بەکارئەهێنرێن بۆ ئامانجی کۆمەڵایەتی" لەراستیدا مرۆڤ تەنها [لەرێگای خێزانەوە] دەست ئەکات بەدەرچوون لەخۆیو پێش هەموو شتێك فێر ئەبێت کە لەنێوان خەڵکیدا بژیو مل کەچ ئەبێت بۆ حەزو ئارەزووە بەهێزەکانی خۆی"(45). خێزان یەکەیەکی کۆمەڵایەتی سەرەتاییەو نموونەی هەموو کۆمەڵایەتی کردنی مرۆڤە؛ لەخێزانەوەو لەگرووپی خوێنی پێشکەوتنی بنەڕەتی بەدی ئەکرێ "ئەندامی کۆیی [واتا کۆمەڵ]، لەبنەڕەتدا، پێك هاتووە لەخێزان: خێزان رەگەزە راستەقینەکانی کۆمەڵ پێك دەهێنێت کە پێك هاتووە لەچین و کاستەکان (Cast) (کە دادەنرێن بە پێکهێنەری راستەقینەی شارو شارۆچکە کە ئەندامی راستەقینەی کۆمەڵن"(46).

لەکاتێکدا، کۆمەڵێ لەرێگای هەمان پەیوەندیەوە لەگەڵ ئەندامی بایۆلۆژی ئیعتبار ئەکرد، کۆنت ئاگای لەو کۆسپە هەبوو کە ئەم شێوە رێبازە بۆی دروست ئەکرد ئەندامێکی بایۆلۆژی، بۆ نمونە، سنوری مادی خۆی هەیە. ئەندامێکی کۆمەڵایەتی، بەپێچەوانەوە، لەرێگای مەتریالیەوە دیاری ناکرێ؛ لەرێگای رۆحیەوە

دیاری ئەکرێ. لەبەر ئەوە، کۆنت بایەخێکی زۆری‌دا بەئامرازی پەیوەندیو بەتایبەتی بەئاین.

ئامرازی پەیوەندی (زمان) کەناڵێکە کە بەهۆیەوە بیری نەوەی پێشوو و کولتووری باوو باپیرانمان پارێزراوە. لەکاتێکدا کە هەموومان هەمان زمان بەکار ئەهێنین، ئەڵێین کە ئێمە کۆمەڵێکی زمانین، ئامرازی پەیوەندی ئێمە لەگەڵ برایانمان کۆئەکاتەوەو لەهەمان کاتدا ئەمان بەستێتەوە بەو زنجیرە درێژەی کە کۆمەڵێ زیندوو بەباو باپیرەوە ئەبەستێتەوە. کۆمەڵی مرۆڤایەتی زیاتر پێك هاتووە لەوانەی کە ئەژین وەك لەوانەی کە مردوون. بەبێ ئامرازێکی پەیوەندی گشتی، مرۆڤ هەرگیز نەی ئەتوانی سۆلیداریەتی (Solidarity) بەتێکڕای (Conseusur) بگەیەنێ؛ بەبێ ئەم ئامرازە گشتیە هیچ سیستمێکی کۆمەڵایەتی بەدی نایەت.

بەڵام، ئەگەر یەك ئامرازی کۆمەڵایەتی پێویست بێت بۆ هەموو کۆمەڵی مرۆڤایەتی، ئەمە تەنها ئامرازێکەو دەلیلێك نیە بۆ هەڵسوکەوت. ئەبێ بەتەنیشت ئەوەشەوە بڕوایەکی ئاینی هەبێت چونکە ئاین بناغەی یەکیەتیو زەمینەیەکی گشتیە کە بەبێ ئەو جیاوازی نێوان خەڵك و کۆمەڵ بەرەو لەت و پەت بوون ئەچێت. ئاین رێ دەدات خەڵکی مەیلی خۆپەرستی بەلاوە بنێن و تەجاوزی خۆین بکەن لەخۆشەویستی براکانیاندا؛ ئاین بناغەیەکی بەهێزە بۆ هێشتنەوەی یەکیەتی کۆمەڵ: کۆمەڵێك ئەمێنێتەوە لە رێگای باوەڕو سیستمی گشتی باوەڕ، ئاین بناغەی پێڕەوی کۆمەڵایەتیەو زۆر پێویستە بۆ بەشەرعی کردنی فەرمانەکانی دەسەلات هیچ دەسەلاتێکی نادینی ناتوانێ خۆی بگرێ بەبێ پشتگیری دەسەلاتێکی رۆحی "هەموو حکومەتێك پێویستی بەئاینێك هەیە بۆ ئەوەی حوکم کردنو گوێڕایەڵی پێکەوە رێك بخات"(47) جگە لەزمانو ئاین، فاکتەرێکی تر رۆڵی خۆی ئەبینێ لەیەکگرتنی خەڵکی: دابەش بوونی کار. خەڵکی بەیەکەوەن هەروەها لەڕێی دابەش بوونی کار:

"ئیتر، دابەش بوونی کارەکە ئەبێ بەهۆیەکی سەرەتایی بڵاوبوونەوەو ئاڵۆزی زیاتری ئەندامی کۆمەڵایەتی.. رێکخراوی کۆمەڵایەتی هەمیشە لەسەر بناغەی جیاوازی تاك دەوەستێت، هەریەکە نیشی خۆی ئەکات بۆ گەیشتن بەئامانجی خۆیو لەڕێگای سروشتی خۆیو پەروەردە بوونی ئەو پۆستەی کە داگیری کردووە، واتا بەگوێرەی خەسڵەتە سەرەکیەکانی خۆی. بەم شێوەیە، هەموو رێکخستنە کۆمەڵایەتیەکان بەکارهێنراون بۆ چاکەی گشتی بەبێ ئەوەی هێڵ بهێنرێ بەژێر ئەوانەی تەواو کامڵ نەبوون"(48)

کۆنت بیری وابوو کە دابەش بوونی کار سۆلیدارێتی (Soliderity) و هاوکاری مرۆڤ بەهێز ئەکات چونکە بەپێش خستنی توانای تاکەکەس لەناو هەموو مرۆڤدا هۆشیاری ئەوە دروست ئەکات کە هەموو کەسێك پشت بەیەکتری دەبەستێت. بەڵام، لەهەمان کاتدا شێوەی بینینی هەندێکی پەسەند ئەکرد کە ئیعتیباری هەندێ لایەنی نێگەتیڤیان ئەکرد سەبارەت بەلایەنەکانی دابەش بوونی پیشەسازی تازەی کار. "لەراستیدا، ئەگەر جیابوونەوەی کارە کۆمەڵایەتیەکان رێگە بدات کە پێشکەوتنێکی بەختیار بێتە کایەوە.. لەلایەکی ترەوە ئەمە

ئەبێتە هۆی (بەشێوەیەکی راستەوخۆ) خنکاندنی رۆحی گشتی، یاخود بەلایەنی کەمەوە ئەبێتە هۆی رێ لێگرتن بەشێوەیەکی قووڵ. بەهەمان شێوە لەروانگەی ئەخلاقیەوە لەکاتێکدا کە هەموو کەسێك پشت بەوی تر دەبەستێت، بەشێوەیەکی سروشتی لەپێشکەوتنی سروشتی چالاکی خۆی لائەدات؛ ئەمە، بەشێوەیەکی بەردەوام ئەیبەستێتەوە بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیو ئیتر زۆر بەشێوەیەکی ئاڵۆز پەیوەندیەکە نابینێ لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی. بەتایبەتی کردنی لاکانی بنەڕەتی نابەرامبەر گەشە پێ ئەدات بەقەدەر لایەنە چاکەکانی"(49).

کۆنت زۆر هیوایەکی گەورەی هەبوو کە لەداهاتوودا دەسەڵاتی کاتیو (TEMPORAL POWER) دەسەڵاتی رۆحی (SPIRITUAL POWER) بتوانن یەکتر بگرن" بۆ ئەوەی پێکەوە، بەبێ وچاندان بیری گشتیو هەستی سۆلیدارێتی گشتی بپارێزن"(50).

کۆنت تەماشای دەزگای کۆمەڵایەتی-ئامرازی پەیوەندی، ئاین یاخود دابەش بوونی کار-، ئەکرد نەوەك وەکو شتێك خۆیان لەخۆیاندا، بەڵکو وەکو ئاماژەکردن بۆ هاوبەشیان لە پێڕەوی کۆمەڵایەتی. لەم لایەنەوە، کۆنت بەیەکێك لەرابەرەکانی وەزعیەکان (Functionalist) ئەژمێررێ، چونکە نەوەك هەر دراسەی تەوژمی دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی بۆ سەر سیستمی کۆمەڵایەتی کرد، بەڵکو لەهەمان کاتدا، پەیوەندیو بەستنی (ربط) لەنێوان دیاردەکاندا روون کردەوە.

"دەبێت هەمیشە هارمۆنیەکی "ئیرتیجالی لەنێوان کۆو (ALL) بەشەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی‌دا هەبێت.. لە راستیدا شتێکی روونە کە نەك تەنها دەزگای رامیاریو نەرێتی کۆمەڵایەتی لەلایەکەوەو نەرێتو بیر لەلایەکی ترەوە ئەبێ بەشێوەیەکی بەرامبەر پشتگیری یەکتر بن؛ زیاتر لەوەش ئەبێ ئەم کۆیە (ALL) بەسترابێتەوە بەخۆیەوە لەو قۆناغەی بەرانبەر بەپێشکەوتنی تەواوی مرۆڤایەتی"(51).

لەروانگەی کۆنتەوە، لێکۆڵینەوە لە وەستانێکی کۆمەڵایەتی، واتا شیتەڵ کردنەوەی حاڵاتو پێش حاڵاتی (Precondition) پێڕەوی کۆمەڵایەتی بەستراوەتەوە بەتاوتوێکردنی جوڵانەوەی کۆمەڵایەتی کە بۆ ئەو، هاوتای پێشکەوتنو ئەشونمای مرۆڤایەتی ئەوەستێتەوە.

هەرچەندە ئەم پەیوەندیەی بەشێوەیەکی تایبەتی ئاماژەی پێ نەداوەو ئیش کردنی پراکتیکی دەرنەخستووە، بەڵام زۆر جار ئەم تێزەی بەشێوەیەکی بەردەوام دووبارە کردۆتەوە.

هەروەها بۆ هۆی میتۆدۆلۆژیو لێکۆڵینەوە پێویستە لێکۆڵینەوەی ستاتیك (وەستاو) جیابکرێتەوە لەجوڵاو، بەڵام لەواقعی ئەبستراکدا بەیەکەوە بەستراونەتەوە. شیتەڵ کردنەوەی وەزیفی (Functional Analysis)و گەشەپێدان دژ بەیەکتر نین، بەڵکو، لەراستیدا تەواوکەری یەکترین.

**5-1 باوەڕگەری،نۆرمەتیڤ** (NORMATNE DOCTRINE):

جگە لەنووسینە زانستیەکانی پێشووی کۆنت، پێویستە ئاماژە بۆ تیۆری پیڤانتس بکرێت. ئەم تیۆرەیە یەکێکە لەهەوڵێن ئیشی کە دوایی

لەنووسینی کۆرسێك لە فەلسەفەی پۆزیتیڤو ئیشەکانی تری روون کراوەتەوە. لەپلانە ئالۆزەکەی کۆنت سەبارەت بەپێڕەوی پۆزیتیڤ وەکو کۆمەڵی داهاتوو، ئەرکی رابەرایەتی دراوە بە دەسەڵاتی رۆحی قەشەکانی ئاینی تازەی پۆزیتیڤو سەرۆکەکانی جیهانی دارایيو پیشەسازی. ئەمانە پێك هاتوون لەزانایان، کۆمەڵ ناسەکانو قەشەکان کە (لەکاتێکدا دەسەڵاتی زانستی بەرز بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی خەڵکی بەرەو بەدی هێنانی ئەرکەکانیان ببەن) وەکو کاتۆلیکەکانی چەرخی تیولۆژی پێشوو، و ئەرکی سەرکردایەتی ئاکاریو دەسەڵاتی کۆمەڵو بەرپرسراوی پەروەردەو حاکمیەتی بەرزی تواناکانی لە ئەندامانی کۆمەڵ جێبەجێ دەکەنو حوکمی پۆزەتیفی داهاتووی کۆمەڵ ناسان (Positvesociocrscy) قەشەکانی داهاتووی ئاینی مرۆڤایەتی، لەبەر ئەوەی ناسینی پۆزیتیڤان لە باشو خراپی پەیدا کردووە، توانای ئەوەی هەبێ کە خەڵکی هان بدەن بۆ بەستنەوەیان بە بەدیهێنانی ئەرکی گشتیو یارمەتیان بدەن کە هەموو بیرێکی رووخێنەر لابەرن کە لەسەر بناغەی مافی سروشتی راوەستاوە، سان سیمۆن بیری لەوە کردبووەوە کە لەداهاتوودا دەسەڵاتی مرۆڤ بۆ سەر مرۆڤ لەسەر بناغەی ئیدارەی شت وەستاوەتەوە.

کۆنت دەڵێت لەئێستادا ئیدارەی "شت" جێگای ئیدارەی مرۆڤ ئەگرێتەوە.. هەروەکو پاپا ئیلدێبراندۆ، لەسەدەی پانزەیەمدا، حوکمی رۆحی خۆی گەورە کردبووەوە تا حوکمی کاتیشی ئەگرتەوە (بۆ ماوەیەکی کەم)، ئاوا قەشەی بەرزی مرۆڤایەتی (لەبەر ئەوەی ئاستێکی زانستی گەورەتری هەیە بە بەراوردی کردنی لەگەڵ پاپا) ئەتوانێ حوکمێك دابمەزرێنێ کە نموونەی هارمۆنیو عەدالەتو راست گۆییو یەکسانی بێت. هەر بۆ ئەوەی ئەو دەربڕینە بخەینەوە پێش چاو کە کۆنت حەزی لێ ئەکات، پێڕەوی پۆزتیڤی تازە ئەبێ خۆشەویستی هەبێت وەکو پرانسیبو پێڕەو وەکو بناغەو پێشکەوتن وەکو ئامانج. مەیلی خۆپەرستی مرۆڤ کەتا ئێستا مێژووی رابووردوو پێیەوە تلاوەتەوە نامێنێو ئەوی دی خوازی (ALTRVISM)و فەرمانی بژی بۆ ئەوانی تر جێی ئەگرێتەوە. خەڵکی خەڵکیان خۆش ئەوێتو رێزی ئەو پۆزیتیڤستانە ئەگرن کە خۆیان تەرخان ئەکەن بۆ چارەسەری رۆح. ئەم پۆزیتیڤستانە، لەحیکمەتی خۆیاندا تەمسیلی ناسینی زانستی رابردوو و ئێستای مرۆڤ ئەکەنو رەوتی مرۆڤایەتی ئەگۆڕن لەداهاتوویەکدا کە پێش ئەکەوت بەتایبەتی لەنووسینەکانی دوایدا کۆنت تەنها ئیمپراتۆری شارەکەی نەك بەزانایەکی کۆمەڵایەتی دائەنا، بەڵکو (بەتایبەتی بەپێغەمبەرێكو داهێنەری ئاینێکی تازە کە ئەتوانێ مرۆڤ لەهەموو ناخۆشی دنیا رزگار بکات) ئەم لاپیڤانیانەی (NORNATIVE) بیری کۆنت تەنها گرنگیەکی لابەلایان هەیە، هەرچەندە بۆ خۆشیان، گرنگن لەروانگەی مێژووی بیر بەتایبەتی لەم لێکۆڵینەوەیەدا کە پەیوەندی سەرەکی بە سۆسیۆلۆژیەوە هەیە وەکو بینایەکی زانستی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم لایەنەی ئیشەکەی کۆنت ئەبێ بە پەیوەندی لەگەڵ ژیانیو دەقی کۆمەڵایەتیو بیری (فکری) ئەو چەرخەی تیا ژیاوە رەچاوبکرێت.

## 2-ژیانی کۆنت:

ئۆگست کۆنت(52) لەمۆنپلیێ 19 ژەنایەری ساڵی 1798 لەدایك بووە کە شارێکی خوارووی فەرەنسایە. باوکی لەکاتۆلیکێکی زۆر پەرۆشو ریالیستێکی بەئاگابوو فەرماندەیەکی سادەبوو؛ بەجۆشو خرۆشو رێکوپێکیەوە خۆی تەرخان کردبوو بۆ ئیشەکەی، و خۆیو ئاینو خێزان؛ کاتی دەستبەتاڵیەکەی تەرخان کردبوو بۆ باخچەکەیماڵیان. باوکی زۆر حەزی لەشۆڕش نەئەکردو تاوانباری شاڵاوکردنەسەر ئەو هێرشەی ئەکرد کە دەیانکردە سەر کاتۆلیکەکان. بەڵام لەهیچ کاتێکدا لەبیری خۆی نەئەبردەوە کە ئەبێ لەخزمەتی دەوڵەتدا بێت، هەرچۆنێك بێت لەوکاتانەدا پێکهاتەو فۆرمی دەوڵەت زوو زوو ئەگۆڕا. پێش هەموو شتێك پیاوێك بوو کە زۆر بەستراب‌وەوە بەژیانی پیرەوەوە، کۆنت لەگەڵیدا بچوکو ناسکو زۆر جار نەخۆش ئەکەوت. لەگەڵ ئەوەشدا (لەنۆ ساڵیدا) خوێندکارێکی زۆر وریا بوو لەکۆلیژی ئیمپراتۆری شارەکەیدا.

زۆر بەئاسانی خوێندنی خۆی ئەبردەسەر، بەڵام لەهەمان کاتدا حەزی لەرێکو پێکی ئەکرد. هەر لەساڵانی یەکەمی ژیانی خوێندکاری، وازی لەئاینی باوکو دایکی خۆی هێناو خۆی بەپەرۆشەوە تەرخان کرد بۆ بڕواکردن بە سەربەستی کۆماری. رقی لەئیمپراتۆریەت بوو و خەوی ئەبینی کە رۆژێك کاتە مەزنەکانی شۆڕش بگەڕێنەوە.

تەنها یەك مامۆستا ئاگاداری تایبەتی کۆنتی راکێشا، ئەویش مامۆستای ماتماتیکی پرۆتستانت بوو بەناوی Daniele Encontre. ئەم مامۆستایە خاوەن کلتوورێکی گەورەو باوەڕی کاتۆلیکی هەبوو و کاریگەری لەسەر کۆنت زۆر بوو بۆ ئەوەی حەز لەماتماتیك بکاتو لەهەمان کاتدا کۆنت بە مامۆستای خۆی دائەنا بەمۆدیلێکی فکری کە زانینەکەی چوارچێوەیەکی ئێنسیکۆپیدی هەبوو.

لەمانگی ئۆگۆستی 1814دا کۆنت لەخوێندنگای پۆلیتێکنیك Elole polytechnigue لەمانگی ئۆکتۆبەرا دەستی کرد بە دەوام کردن لەم خوێندنگایە لەپاریس، ئەو پاریسەی بەشێوەیەکی هەمیشەیی تیایدا ژیاو بەجێی نەهێشت تەنیا لەماوەی زۆر کورتا نەبێت. ئەم خوێندنگایە کە لەلایەن شۆڕشەوە چوارچێوەیەکی زانستی هەبوو، ئیمپراتۆر بەهیچ شێوەیەك شەعبی نەبوو. ئیمپراتۆر ئەم خوێندنگایەی دیسانەوە لەسەر بناغەی مۆدیلێکی سەربازی رێك خستبووەوەو خستبوویە ژێر چاودێری پارێزەرێکی سەربازیو یارمەتی دەرەکانی. هەرچەندە دروست کرابوو بۆ ئەوەی خەڵکی تەکنیکی ئامادە بکات بۆ کارگوزاری گشتی، ئەم خوێندنگایە ئەبوایە، لەروانگەی ناپلیۆنەوە، بەشێوەیەکی سەرەکی ئەفسەری ئامادە بکردایە. خوێندکارەکان کە هێشتا ناوەرۆکی زانستی ئەم خوێندنگایەیان لەبیر نەچووبووەوە، خۆیان بەزانا دائەناو هەستیان بە بەجێهێنانی ئەو ئامانجە نەئەکرد کە ناپلیۆن ئەیویست بیگاتێ.

لەسەرەتاکانی 1814، لەکاتێکدا کە هێرش برایە سەر پراگ، گەنجەکانی پۆلیتێکنیك لەکوچەو شەقامەکاندا شەڕیان دژی دوژمن ئەکرد، بەڵام لەتۆقەمبەردا خوێندنگاکە چالاکی

ئاسـایی خـۆی دەسـت پـێکردەوەو کۆنـت بەنەختێك پەشیمان بوونەوەوە، دەرفەتی ئەوەی بۆ هەڵکەوت کە زۆر زانـای بـەناوبانگی فەرەنسـی وانەی پێ بڵێتەوە.

زوو هەستی بەوە کرد کە ئەم خوێندنگایە هی خۆیـەتیو نـەك تەنها ئەیـەوێ تیـایدا بخوێنـێ، بەڵکو ڕۆژێك وانەی تێدا بڵێتەوە.

کۆنتـی گـەنج کـە لەلایـەن هەڤاڵەکانیـەوە بەمامۆستا دائەنرا، بەردەوام بوو لەسـەر نـەزۆکی هەڵسـوکەوتی بزۆکـی کاتـەکانی خوێندکـاری لـەئامادەی مۆنتپیلێر (Montpellier). ئەگـەرچی لـەکاتی خۆیـدا دوژمنـی ستەمی نـاپلیۆنی بـوو، بەلام هاتنەوەی بۆربۆنەکانیشی بەچاك نەئەزانی. لەگـەڵ زۆربـەی هـەڤالانی بـاوەڕی کۆمـاری، ئیمپراتۆریـەتی نـاپلیۆنی بەبـەراوردکردنی لەگـەڵ پادشـایەتیو فـەرماندە نزمـەکانی بەشـتێکی زۆر باش دائەنا.

کـاتێك کـە نـاپلیۆن گەڕایـەوە، هـەموو خوێندنگاکە بە پەرۆشـەوە خۆیـان خستە پـاڵیو کۆنـت بـوو بەیـەکێك لەسـەرۆکی خوێندکـارە شۆڕشـگێڕەکان. بـەلام "سـەد ڕۆژەکـە" زوو تـێ پـەڕین. پـاش واترلـۆو مـل کـەچ بوونـی پـاریس، پـێڕەو گەڕایـەوە خوێندنگاکـەو چالاکی ئاسـایی خـۆی دەسـت پێکـردەوە "کۆنـت"یـش (کـە بەرهەڵسـتی زۆری دەسـەلاتی خوێندنگاکـەی ئەکرد) گەڕایەوە خوێنـدنـی خۆیو هەڵسوکەوتی ئاسایی وەرگرتەوە.

لە ئەپریلی 1816دا، شەش خوێندکار بێزاری خۆیان دەربڕی دژی ئیدارە، لەبـەر بەسـەرچوونی ئـەو شـێوەیەی کـە خوێندکـاری پـێ تـاقی ئەکرایەوە. لەکاتێکدا کـە خوێندنگاکـە ئەیویست سـزای ئـەو خوێندکارانـە بـدات، هـەموو خوێندکارەکـان پشـتگیریان لیٚ کـردن. ئیـدارەی خوێندنگاکـە راوێـژی بـە وەزارەت کـرد. ڕاگرەکـە ئاماژەی بەمە کرد کـە خوێندنگاکـە ئـەبێ پێـش هەموو شتێك دابخرێو پاش ئەوەی پرۆڤەی ئەوە هـەبێت کـە بەباشـی هەڵسـوکەوت ئەکـەن، خوێندکارەکـان پێویسـتە داوای وەرگرتنـەوە بکەنـەوە. لـەڕقا کۆنـت گەڕایـەوە ماڵـەوە؛ بـەلام لەماڵـەوە (لـەمونتپیلێر Monpellier) زۆر نەمایەوەو گەڕایەوە پـاریس لـەکاتی گەڕانـەوەیدا بـۆ پـاریس لـەمانگی تـەموزدا، کۆنـت هیـوای بەکەوتنی زۆرداره بۆربۆنەکان بوو.

خۆی بەوانەوتنەوە ئەژیانو لەوێ ژەنەرالێکی ناسی کە پەیوەندی بەئەمریکاوە هـەبوو، بـەڵێنی پێدابوو کە شوێنێکی لەخوێندنگایـەکی ئـەمریکی بۆ بدۆزێتەوە؛ ئەم خوێندنگایە وەکو پۆلۆتیکێکی فەرەنسی بوو کە خەریك بوو ئەکرایەوە. کۆنـت، پڕ لە جۆشێکی کۆماری، خـەوی بـەوەوە ئـەبینی کـەکۆچ بکـات بـۆ وڵاتـی سەربەسـتی، بـەلام پرۆژەکەی سەری نەگرت. کۆنگرە، ڕاستە بڕیاری بۆ دروست کردنی پۆلۆتیکێکی ئـەمریکی دابوو، بەلام کردنەوەکە خرابووە کاتێکی نادیار. ناچار کۆنت بەردەوام بوو بەوتنەوەی وانەی ماتماتیكو هاوکـاری کـردن لـە وەرگـێڕانی پـەرتوکێکی ئەندزیاری لـەزمانی ئینگلیزیـەوە بـۆ فەرەنسـی، بـەلام داهـاتووی زۆر روون نـەبوو هیچ هـەوڵێکی کەشی نەدا بۆ ئەوەی لـەخوێندنگای پۆلیتێکنێك وەرگیرێتەوە کە خەریك بوو ئەکرایەوە. بەلام ئەو شتە ڕوویدا کە هەموو ژیانی گۆڕی.

**2-1 هاوكاری كردن لەگەڵ (سان سیمۆن)دا:**

لەهاوینی ساڵی 1817دا كۆنت هێنری سان سیمۆنی ناسی؛ ئەوسا سان سیمۆن بەڕێوەبەری گۆڤاری "پیشەسازی" بوو. پیاوێكی نارێك و پێك و پڕ لەڕاڕایی.. بەڵام خاوەنی بیری بەپیتو تازە، سان سیمۆن تەوژمێكی گەورەو بەردەوامی دایە ژیانو ئیشەكانی كۆنت. لەوكاتەدا كە تەمەنی نزیكەی شەست ساڵ بوو، سان سیمۆن هەستی بەزرنگی ئەم گەنجە ئەكردو لەبەر ئەوەی ئەیزانی كە توانایەكی میتۆدیو وریایی هەیە لەئیشدا (خۆی لەرووكەشدا وەكو مامۆستایەك وانەبوو) كردی بەسكرتێرو یاریدەدەری نزیكی خۆی.؟

بۆ ماوەیەكی كەم لێك گەیشتنێكی قووڵ لەنێوانیاندا بەدی ئەكرا. لەسەرەتادا كۆنت مانگانە 300 فرانكی وەرئەگرت، بەڵام لەكاتێكدا كە سان سیمۆن لەتەنگانەیەكی داراییدا بوو، كۆنت بەردەوام بوو لەهاوكاری كردن بەبێ ئەوەی مانگانەی خۆی وەربگرێ، ئەمەش نەك تەنها بۆ هۆی فكری، بەڵكو لەبەر ئەوەی كە هیوای هەبوو كە رۆژێك مافی خۆی بدرێتەوە.

زۆر لە لێكۆڵەرەوان پرسیار لەخۆیان ئەكەن، ئایا كۆنت یاخود سان سیمۆن زیاتر كەڵكی لەم هاوكاریە وەرگرتووە. لەبەر ئەوەی ئەمە باسێكی ئەوەندە بەكەڵك نیە، لەو باوەڕەداین كە پێویست ناكات درێژەی پێ بدەین. ئەوە بەسە كە بڵێین كۆنت بەدڵنیاییەوە تەوژمی پارێزەری خۆی زۆر بوو بەسەریەوە، هەرچەندە پەیوەندیە تەسكەكە بە سان سیمۆنەوە توانی ئەو بیرانەی كە لەپێشدا هەی بوو پێیان بگەیەنێ. ئەوە راستە كە بەهەرچ شێوەیەك بێت، كۆنت گەنجی كۆماریو بەرگریكەر یەكسانی، بوو بەكابرایەك كە روانگەی ئیلیتیسی (Elitist) پەسەند كردو پارێزگاری لێ كردوە؛ یەكێك لە وتارە هەرە باشەكانی كۆنت؛ كە لەمانگی حەوتی 1819دا نووسراوە، ئەوە دەرئەخات.

ئەو خاڵو وتارانەی كە كۆنت دای رشتبوو لەساڵانی هاوكاری نزیك لەگەڵ سان سیمۆندا، بەتایبەتی لەنێوان 1819و 1824دا پێزی (سەرەتای) هەموو بیرەكانی دوایی تێدایە، واتا نەك تەنها ئەو بیرانەی كە گەشەیان پێ دراوە لە كۆرسی فەلسەفەی پۆزیتیف، بەڵكو سەرەتای ئەو روانگانەش كە دوایی گەشەی پێئەداتو پێویستی پێڕەوێكی گشتی یەكگر كە بناغەی دەسەڵاتێكی رۆحی تازەبێت رەچاو ئەكات.

لەساڵی 1824دا كۆنت بەشێوەیەكی كۆتایی پەیوەندی لەگەڵ مامۆستاكەی خۆی دابڕی هۆی ئەم تێك شكاندنە دەرئەنجامی مشتومڕێكی ئاڵۆزو بێ واتا بوو. پەیوەندی بەشێوەی بڵاوكردنەوەی یەكێك لە وتارەكانی كۆنتەوە هەبوو. ئەبوایە وەكو جاران، وتارەكە بڵاوكرایەتەوە بەناوی سان سیمۆن یان بەناوی ئۆگست كۆنتو ناونیشانی سیستەمی رامیاری پۆزیتیف (systeme de politique positive) بەرگی یەكەم، بەشی یەكەم؟

سەد دانە لەئیشەكەی خۆی درا بە كۆنت بەناوی خۆیەوە؛ لەهەمان كاتدا سان سیمۆن سەد دانەی لەنووسراوەكە دەركرد بەناوی رێنمایی ئاینی پیشەسازەكان؛ لەناو بەشی سێیەمی، سەرەتایەكی ئیمزانەكراوی سان سیمۆن نووسرابوو (جگە لەنووسراوەكی كۆنت)

که خۆی دووره پەرێز راگرت لەخوێندکارەکەی خۆی. بەمە کۆنت قێزی لە مامۆستاکەی کردەوەو بۆ هەموو ژیانی نەفرەتی لەناوی سان سیمۆن کرد.

لەراستیدا چەند هۆیەکی فیکریو مەتێریالی (مادی) هەبوو بۆ ئەم چەندوچوونە. کۆنت لەناو جیهانی رۆژنامە نووسی لیبرالو هەڵبژاردەیەکی پیاوانی زانستا ناسرابوو. بەهانەی لێکۆڵەرەوە پیرەکە (سان سیمۆن) بەرامبەر بەکۆنت بەردەوام لەمامەڵەی (کۆنت)ی خوێندکارێکی بچوك دەکرد (وەکو جاران) نەك وەکو پەیوەندیەك لەنێوان دوو کەسی یەکساندا، ئەمەش "کۆنت"ی بێزار کردبوو.

جگە لەوەش، لەنێوان ئەو دوو نووسەرە کە بۆماوەیەکی زۆر هاوکاریان لەگەڵ یەکتری کردبوو، هۆی ئەو ناکۆکیەی کە لەنێوانیاندا هەبوو ئەگەرایەوە بۆ هەڵبژاردنی ستراتیجێك کە رەزامەندیو فشاری خەڵکی بەهێند وەربگیرێ.

سان سیمۆن کە پارتیزانی هەڵسوکەوتی توندو پاڵپشتی ریفۆرمێکی زوو بەزوویی بوو ئامانجی سەرەکی ئەوە بوو، کەپیشەسازە لیبرالیەکانو خاوەن بانکەکانو لایەنگرەکانیان بکات بەخەڵکێك کە هەمیشە زیاتر خەریکی رێکخستنەوەی کۆمەڵی فەرەنسی بن. کۆنت، بەپێچەوانەوە، ئاماژەی بەوە ئەدا کە چالاکی تیۆری ئەبێ پێش هەموو چالاکیەکی چاکسازی بێتو گرنگتر ئەوەیە کە بناغەی بیروڕای تیۆری زانستی دابنرێ، چونکە ئەم بناغەیە پێویستە بۆ چوارچێوەی هەموو پێڕەوێکی پراکتیك. زیاتر لەوە، کۆنت، کە دوایی ئەبێت بە قەشە ورەکەی مرۆڤایەتی، نکوڵی لەو ئاراستە ئاینیەی دەکات کە سان سیمۆن ئەیویست بیدات بەبیروراکەی: ئەمانە دژایەتیەکانی Contradietion ناکۆکیەکانی مێژووی بین.

ئاوا، هەرچەندە زۆر بەخۆشیەوە نامەی سەرسام بوونو هاندانی زانا بەناوبانگەکانی پێ ئەگەیشت، وەکو C.Cuvier و Humboldt، جگە لەنامەی نوێنەرانی میللەتو رۆژنامەنووسە لیبرالیەکان، کۆنت دیسانەوە بەتەنیا بوو لەرووی فیکریەوە لە پۆستێکی نزمو پەیوەندیەکانی لاواز بوون لەگەڵ خەڵکی ئەدەبو زانست لەپاریسدا، راستە ئیتر سیستمێکی کۆنتی هەبوو، بەڵام داهێنەرەکەی هیچ پلەو پایەیەکی نەبوو نە مامۆستا بوو، نەمووچەی وەرئەگرت.

لەم بارودۆخەدا، کۆنت بیری کردەوە کە بەلایەنی کەمەوە بۆ ژیانی تایبەتی خۆی ئارامیەك مسۆگەر بکات؛ لەفێبرایەری 1825دا ژنێکی گەنجی هانی بەناوی Caroline Massin کە چەند ساڵێك بوو وەك سۆزانیەك ئەیناسی کە لەپێشدا لەکۆشکی حقیقی ئیشی ئەکردو دوایی بوو بوو بە خاوەنی دوکانێکی فرۆشتنی پەرتوکی کۆن. ژن هێنانەکەی زۆر بەتەنگ و چەڵەمە بوو: زیاتر لەچەند جارێك لەگەڵی جیابووەوەو لەدواییدا بەهەمیشەیی وازی لێهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ ماوەیەك کۆنت کە لەحاڵەتێکی زۆر ناخۆشا ئەژیاو لەجیهانی کۆمەلایەتیو ئیشەوە دوور بوو، وای ئەزانی کە بەلایەنی کەمەوە توانیویەتی بەهێمنی خێزانێك پێك بهێنێت. کۆنت کاری ئەندازیاری کیمیاوی رەت کردەوە، زیاتر حەزی لەوە بوو کە وانەی تایبەت بڵێتەوە بۆ ئەوەی بژی، هەرچەندە پارەکەی کەم بوو، چونکە مامۆستایەتی بواری ئەدایێ کە خۆی

تەرخان بکات بۆ هەندێ کێشەی تیۆری زیاتر لە کێشەی پەیوەندی باش ببەستێ لەگەڵ کەسو کارە کولتووریەکانی خوێندکاراندا بۆماوەیەکیش بەهۆی نووسینەوە توانی پارەی تر پەیدا بکات، بەتایبەتی هاوکاری لەگەڵ رۆژنامەیەکدا کرد بەناوی "بەرهەم هێنەر" (منتج) کە لەلایەن هەندێ لەخوێندکارانی سان سیمۆن دامەزرابوو پاش مردنی مامۆستاکەیان.

لەم ساڵانەدا زۆربەی کاتی بەئامادەکردنی فەلسەفەی پۆزیتیڤ ئەبردە سەرو زۆربەی چالاکیەکانی بۆ تەرخان کردبوو. لەکاتێکدا کەزانی نووسراوەکەی تاڕادەیەکی باش پێشکەوتووە بۆ ئەوەی شایستەی ئەوە بێ کە پێشکەشی جەماوەرێکی زۆر بکرێ، کۆنت، هەر لەبەر ئەوەش کە مامۆستای زانکۆ نەبوو بۆ ئەوەی تیۆرەکانی بخاتە پێش چاو، بڕیاریدا کە کۆرسێکی ئەهلی بکاتەوە؛ بۆ ئەم کۆرسە ئەبوایە خەڵکی پێش ماوەیەک خۆی تۆمار بکردایەو ئەویش بەرزترین بیری لەبواری زانینی پۆزیتیڤ پێشکەش بکردایە. کۆرسەکە لە ئەپریلی 1826دا دەستی پێ کرد هەندێ پیاوی بەناوبانگ گوێ گرەکەی بوون:

Vonhumboldt AAlexander و زۆر لە ئەندامانی ئەکادیمی زانستەکانو ئێتیکۆ نومیست Dunoyer Charles و دۆق Napoleon Montebello و Caruot Hippolite و کوڕی رێکخەرەکەی لەشکرە شۆڕشگێڕەکانو برای زانای گەورە Sadi caruot و زۆر لەخوێندکارە کۆنەکانی خوێندنگای پۆلیتێکنیك.

کۆنت تەنها فریای سێ کۆرس کەوتو لەچوارەمدا تووشی نەخۆشیەکی گەورەی عەسەبی بوو. بۆ ماوەیەک بەشێت لەقەڵەم ئەدراو لەنەخۆشخانەکەی دکتۆر Esquirol کەوت؛ ئەم دکتۆرە کە دانەری نووسراوێك بوو بەناوی سەرنجێك سەبارەت شێتی، هەوڵیدا چاکی بکاتەوە بەمیتۆدی ئاوی سارد.. لەکاتێکدا کە ژنەکەی ویستی بیهێنێتەوە ماڵەوە، Esquirol رازی نەبوو و لەپەرتوکی تۆماری نەخۆشخانەکەی نووسی کە کۆنت چاك نەبۆتەوە (Nou N.G" gue'ri).

پاش ئەوەی گەڕایەوە ماڵەوە، کۆنت تووشی خەمۆکیەکی گەورە بوو: تەنانەت هەوڵیشیدا کە خۆی فڕێ بداتە ناو رووباری سێن بۆ ئەوەی خۆی بکوژێ. لەساڵی 1827دا، پاش پشوویەکی زۆر لەشاری لەدایك بوونی (Montpellier)، وردە وردە هاتەوە سەر خۆیو لە 1828 بەتەواوی چاك بووەوەو سەرکەوتنی بەسەر نەخۆشیەکەیدا لەناو پەرتووکێك بەناوی "وروژانو شێتی" بەخەڵك ناسێنرا.

کۆنت لەساڵی 1829دا دەستی کردەوە بەکۆرسەکەی خۆش حاڵ بوو بەبینینی ناوی پیاوانی گەورەی زانست لەنێوان گوێ گرەکانیدا. لێرەشدا ئەم ئیعتیبارە زۆر کاتێکی کورتی خایاند چونکە لەگەڵ رۆیشتنی کاتدا، هەرچەندە هەندێ پیاوی بەناوبانگ نزیکی بوون، کۆنت گاڵتەی پێ ئەکرا لەنێوان خەڵکی کۆمەڵی زانستی. ئاواتەکەی کە بریتی بوو لەنووسینی ئیشێکی گەورەی ئێنسیکلۆپیدی سەبارەت بەهەموو زانستەکان لەلایەن هەموو نوێنەرانی جیهانی زانینەوە بەفیڕۆبرا.

کۆنت کە لەیاد کراو گۆشەگیر کرا ژیانێکی نابەختەوەری بردەسەر؛ بەهەژاری بەردەوام بوو

لەژیانێکی ناخۆشو داگیرکردنی نزمترین پلەی جیهانی ئەکادیمیو تەنانەت لەو ساڵانەی نێوان 1830 و 1842 کە ئیشە گەورەکەی کۆرسێك سەبارەت بە فەلسەفەی پۆزیتیف نووسیبوو. ئەو هەموو هەوڵانەی کە لەپێشدا دابووی بۆ ئەوەی ببێ بە مامۆستا لەخوێندنگای پۆلتینکیك یاخود لەئاکادیمی زانست یان لەکۆلیژی فەرەنسا سەریان نەگرت.

لەساڵی 1832 توانی تەنها پۆستێك بدۆزێتەوە لە پۆلتینکیك وەکو "یاریدەدەری مامۆستا بۆ دووبارە کردنەوەی کۆرسی شیتەڵ کردنەوەو میکانیك"؛ پێنج ساڵ دوای ئەوە، توانی پۆستی تاقیکەری دەرەکی بۆ خۆی دابین بکات. ئەگەر لەئیشەکەی یەکەمیدا دوو هەزار فرانکی بێ نرخی دەست ئەکەوت، لەئیشەکەی دووەمیدا نەختێ زیاتر بوو. هەروەها کۆنت وانەی ماتماتیکیشی وتەوەو لەخوێندنگایەکی ناحوکومیدا. لەگەڵ ئەوەشدا، بەهەرسێ موچەکەی پلەی ژیانی نەختێك بەرزتر بوو لەهەژاری.

دژایەتی جیهانی ئەکادیمیو کێشەی دارایی‌و باری سەختی ژیانی لەخێزاندا کە تا ئەهات ناخۆشتر ئەبوو، سەریان لەکۆنت شێواندبوو لەو ساڵانەی کەکۆرسەکەی ئەنووسیەوەو ئەو ساڵانەش زۆر خۆ تەرخان کردنیان ئەویست. وردە وردە کۆنت خۆی دائەخست لەوکاتەی کە سیستەمەکە سەرنەکەوتو بڵاونەبووەوە. بۆ هەندێ هۆی "تەندروستی عەقڵی" ئاگای لەو نووسراوانە نەبووە کە لەجیهانە جیاوازەکانی زانست بڵاونەکرایەوە:

لەراستیدا لەساڵی 1838دا بریاری‌دا کە ئیتر هیچ لە ئیشە زانستیەکان نەخوێنێتەوەو تەنها ڕۆمان‌و شیعر بخوێنێتەوە، تەنها پەرتووك کە لەو ساڵانەی دواییدا زۆر جار خوێندبێتیەوە پەرتووکی "لاسایی کردنەوەی عیسا" بوو.

لەگەڵ ئەمەشدا، کۆنت توانی کە هەرچۆنێك بێت خوێندکار بۆ خۆی پەیدا بکات. لەوانەیە، تەنها سەرچاوەی خۆشی ئەوەبوو کە هەندێ لەخوێندکارە گرنگەکانی فەرەنسی دوای کەوتن بۆ نموونە وەك لێکۆڵەرەوەی گەورەی فەرەنسی Emilelittre و بیروڕا پۆزتیڤەکەی بڵاوبووەوە تا گەیشتە ئینگلتراو لەوێ سەرنجی خەڵکیان راکێشا. فیزیاوی بەناوبانگ David Brewster بیروڕای بەشێوەیەکی پۆزتیف وەرگرتو لەناو گۆڤاری Edinburgh Rereiw بڵاوی کردەوەو زۆر گرنگتر لەوەش ئەوە بوو کە John Stuart Mill بوو بەسەرسامێکی تەواوی کۆنتو بەرگری لێ ئەکردو داینا بەیەکێك "لە پێشڕەوترین بیرمەندی ئەورووپی" لەنووسینەکەی بەناوی سیستمی لۆژیکی عەقڵانی ئیستنتاجی کە لە ساڵی 1843 بڵاوکراوەتەوە. کۆنتو Mill بەنامە پەیوەندیەکی بەردەوامیان پێکەوە هەبوو: کۆنت برادەرە بەریتانیەکەی ئاگادار ئەکردەوە بۆ هەموو ئیشە زانستیەکانی‌و ئەو کۆسپانەی کە تووشی ئەبوو لەژیانی خێزانی‌و ئابووری‌دا. میل (Mill) توانی تەنانەت کار بکاتە سەر ئەو بەریتانیانەی سەرسام بوون بەکۆنت بۆ ئەوەی پارەی چاکی بۆ بنێرن بۆ ئەوەی لەتەنگو چەڵەمە داراییەکانی رزگار بێت.

لەساڵی 1844، ئەو ساڵەی کە لەبەر چاوی خەڵکی نزم کرایەوەو لە پۆلتێکنیك وەرنەگیرایەوە، دەرکەوت کە ساڵی بەختەوەری گەورە بێت بۆی: حەزی لەبێوەژنێکی سی ساڵو

دەوڵەمەند کرد بەناوی Clotilde de vaux.. کۆنت ئەم ئافرەتەی لەماڵی خوێندکارێکی گەنجی خۆی ناسیو وەکو سەرخۆشێك حەزی لێ کرد. لەپڕ، ئەو سەرپۆشە ساردو میتۆدیەی کە کۆنت پیشانی دابوو بە خەڵکی لابرا. خۆشەویستی کۆنتی گۆڕیبوو. هەموو حەزە سروشتیەکانی کە لەپێشدا کپ کرابوون هاتنەوە سەرڕوو، ناسینەکەی Clotilde هەرچەندە زۆر کەم بوو، بۆ کۆنتی پێگەیشتوو بەقەدەر کۆنتی گەنج (کەسان سیمۆنی ناسیبوو) گرنگ بوو، حەزە گەورەکەی کۆنت نەبوو بەپەیوەندیەکی لەش بە لەش لەگەڵ کلۆتیلد؛ ئەم بەرگری لەداواکاریەکانی کۆنت کردوو پەیوەندی لەگەڵیا لەسەر پلەیەکی بەرزی پلاتۆنیو رۆمانتیکی هێشتەوە. پاش چەند نامەی خۆشەویستی لەنێوانیاندا، کلۆتیلد نەخۆش کەوت. پاش کەمتر لەساڵێك لەو پەیوەندیەی لەنێوانیاندا، کلۆتیلد تووشی نەخۆشی مانتیکیت بوو و مرد: ئەو نەخۆشیەش سیل بوو. بەم شێوەیە کۆنت سوێندی خوارد کە باقی ژیانی تەرخان بکات بەیادکردنەوەی "فریشتەکەی".

نووسراوی سیستمی رامیاری پۆزتیڤی کە لە سەرەتای ساڵی 1844 دەستی پێ کردبوو بوو بەئیشێکی گەورە کە پێشکەشی کرد بە خۆشەویستەکەی. لەم ئیشەدا، کۆنت ئیتر ئەرکە سۆزدارەکانی گرنگتر دائەنا وەك لەئەرکی فیکری، هەست گرنگتر بوو لەعەقڵ (بیرکردنەوە)و ئەیوت کە دەسەڵاتی تەندروستی گەرمی ژنایەتی بۆ ماوەیەکی زۆر لەمێژووی مرۆڤایەتیدا لەلایەن بیری کزی پیاوەوە پێشێل کراوە.

لەکاتێکدا کە لەنێوان 1851 و 1854 سیستمەکەی دەرکەوت، کۆنت زۆر یاخود زوربەی موعجیبە عەقڵانیەکانی لەکیس چوو؛ ئەو موعجیبانەی کە لەو پانزە ساڵانەی دواییدا توانی پەیدایان بکات Emlie Littre, John Stuart Mill نەیان ئەتوانی لەگەڵ ئەو بیرەی کۆنتا بن کە ئەیوت: خۆشەویستی گەردوونی (گشتی Universal) ئەتوانێ چارێك بۆ تەنگو چەڵەمەی ژیان بدۆزێتەوەو قبوڵی ئاینی مرۆڤایەتیان نەئەکرد کە کۆنت بۆ ئەوەی خۆی کردبوو بەقەشەی گەورە.. پێغەمبەری قۆناغی پۆزتیڤ لەوەی ئەکرد بکەوێتە ناو تاریکایی قۆناغی تیولۆژی. هەر لە نووسینە پێشووەکانیدا شوێنەواری ئەمانە دیار بوو، بەڵام سەرنجی ئەوانی رانەکێشابوو. لەکیس چوونی خوێندکار، کۆنتی بەهێمنیو ئارامی نەهێشتەوە: بابڕۆن، ئەی چی ئەکات؛ خەڵکی کە دێنە کڵێسا تازە! خۆی قەراری دابوو کە لەداهاتوودا هەموو نامەکانی ئیمزا ئەکردو لەسەری ئەنووسی: "داهێنەری ئاینی مرۆڤایەتی، گەورە قەشەی مرۆڤایەتی" لەسەر کورسی پاپایەتی تازە، نامەی بۆ پیاوە بەدەسەڵات دارەکان ئەنارد بۆ ئەوەی هەڵیانگێڕێتە سەر ئاینیو پێڕەوی تازە: زار نیکۆلاو وەزیری گەورەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو سەرۆکی ژێرویتەکان لەهەمان کاتدا لەماڵەوە وانەی بەخەڵکی هەمەچەشنە ئەوتەوە، بەتایبەتی رووی ئەکردە کرێکارەکان بۆ ئەوەی بیان هێنێتە سەر رێگای ئاینی تازە. نامەی بۆ کارەکەرەکان ئەنارد بەناونیشانی کاتێشیزمی پۆزیتیڤست Catechisme Postiviste، بانگەواز

بۆ كۆنە پەرستەكانو بۆ هەموو كەسێك كە گوێیان لێ ئەگرت.

لەساڵی 1848دا، چەند رۆژێك پاش شۆڕشی فەبرایەر كۆنت "كۆمەڵەی پۆزتیڤستی" دامەزراند لەپانزە ساڵی سەرەتادا بوو بە مەبەستی سەرەكی بیروڕای. ئەوانەی كە هاتو چۆیان ئەكرد، جگە لەوەی كە مانگانە ئابوونەی خۆیان ئەدا بۆ پشتگیری كردن لەپێویستیە مادیەكانی مامۆستاكەیان، وەعدیان ئەدا كە پەیامەكەی بڵاوبكەنەوە لە ئیسپانیاو ئینگلتراو ئەمریكاو هۆڵەندا، بیروراكان هەموو هەفتەیەك بڵاوئەكرانەوەو كۆنتیش نووسینەكانی خۆی ئەنارد (كە بەراورد ئەكران بەنامەكانی قدیس پۆلس) بۆ ئەو خوێندكارانەی خۆی كە لە هەرێمەكانی دەرەوە نیشتەجێ بوون. هەموو ئێوارەیەك لەكات ژمێری حەوتەوە تا نۆ (جگە لەپێنج شەممە كۆبوونەوەی دووروو درێژی لەپۆزیتیڤست ئەكرد) كۆنت، خوێندكارە پاریسیەكانی لەماڵەوە كۆئەكردەوە: خوێندكارە كۆنەكانی پۆلیتێكنیكو پیاوە سیاسیەكانی داهاتوو و بیرمەندەكانو كارەكەرەكانو هەموو ئەوانەی كە خۆشەویستیەكی گەورەیان هەبوو بۆ مامۆستاكەیان پاش ئەو هەموو ماوەیەی كە پشت گوێ خرابوو، كۆنت بەخۆشیەوە هوشیاری بۆ دروست بوو كە ئیتر لەمەودوا لەباتی برادەرە رووگەشەكانی رابردووی خوێندكارەكان دەورەیان ئەداو ئەتوانێ لەگەڵیان كۆبێتەوەو ئەمەش نەك تەنها بۆ ئەوەی ئیعجابی خۆیان دەربڕن بۆ بیرەكەی، بەڵكو هەروەها بۆ ئەوەش كە خۆشەویستی بۆ یەكتری دەربڕن.

كۆنت، خوێندكاری یاخی شاری Monpellie، دوور لەپەرۆشی كۆماریو هەڵسوكەوتی بەرهەڵای گەنجیەتی، وتاری چاكی مل كەچ كردنو پێویستی پێڕەوی ئەدا. دوو دروشمەكەی كەنیسەی پۆزیتڤیست هەر پێڕەو پێشكەوتن بوون، بەڵام لەو ساڵانەی دواییدا پێویستی پەیرەو گرنگیەكی زیاتری هەبوو بۆ دامەزرێنەر. نارەزاییەكەی بۆ رووداوە خوێناویەكانی مانگی شەشی 1848 نزیكی كردەوە لەناپلیۆن بەڵام تەوسی بۆ پێڕەو بەو رێگایانەی برد كە زارو وەزیری گەورەو تەنانەت سەرۆكی ژێرویتەكانیشی بەبرا دابنێت.

لە 17ی فبرایەری 1857 نیشانەكانی سەرەتایی نەخۆشی شێرپەنجە ناچاریان كرد كە لەماڵەوە بمێنێتەوەو بۆ یەكەم جار لەپانزە ساڵدا نەیتوانی سەربدا لەگۆڕەكەی كلۆتیلد كە لەگۆڕستانی Pairs Lachaise نێژرابوو. نەخۆشیەكەی زۆر خێرا گەشەی كردو بەشێوەیەكی خێراو لەپێنجی ئەیلول گیانی سپارد.

سێ شەممەی پاش مردنی، گروپێكی بچووكی خوێندكارو برادەرو دراوسێ دوای تابووتەكەی كەوتنو كەوتنەڕێ بۆ گۆڕستانی Pairs Lachaise گۆڕەكەی بوو بە سەنتەرێكی بچووكی گۆڕستانی پۆزیتیڤیست، بەوەفاترین خوێندكارەكانی ئەم مامۆستایە لەم گۆڕستانە نێژراون.

1- Auguste conte, cours dephilosophie positive, 6 roll. Paris A. costes, 1934, vol, I, P.3

2- I bid., p.3

3- I bid., P.3
4- I bid.,P.35
5- I bid, P.212-213
6- I bid,P.211
7- I bid.,P. 263
8- I bid., P 204-205
9- I bid., P.68
10-I bid.,P.73
11-I bid., P. 70-71
12-I bid., P. 269
13-I bid., P. 272
14-I bid.
15-I bid., P. 274-275
16-I bid., P. 275
17-I bid., P. 279-280
18-I bid., P. 281
19-I bid., P. 281-282
20-I bid., P. 282
21-I bid., P. 282
22-I bid., P. 286
23-A. Conte systeme de politique positve, 4 roll., Paris cres, 1912, vol. IV Appendice Parte IV. Consideration Philosophiques sur les Sciences et les savauts (novembtre 1925) P. 150.
24-A. conte, cows, cit, vol. I. 2-3
25-I bid. P 62-63
26-I bid. P. 63
27-I bid. P. 62
28-I bid.
29-I bid. P. 47
30-I bid. P. 392
31-I bid. P. 389-390
32-I bid. P. 40
33-I bid. P. Vol II. P668-669
34-I bid. P. 669
35-I bid
36-I bid. Vol. I.P. 304
37-I bid. P. 233
38-I bid. P. 235-236
39-I bid. P. 216
40-I bid. P. 218
41-I bid. P. 224
42-I bid. P. 345
43-I bid. P. 334
44-I bid. P.335
45-I bid. P. 346
46- A. conte, systeme de politique positive, cit, vol II. P. 293
47-I bid. P. 194
48-I bid. P. 366-367
49-I bid. P.P 368-369
50-I bid. P. 370
51-I bid. P. 224

- بۆ ئەم بەشە سەرچاوە سەرەکیەکان ئیشە گەورەکەی گوهیێیە

H. Gouhier, La jeunesse d Augaste conte,

3 Vol., paris, vrin, 1933-1941

H. Gouhier. La Vie d Auguste conte, paris, Gallimard, 1931

وە هەروەها:

F.E. Monuel, the New World of Henry saint- simon, comberidge (Hass), Harvard univerity. Press, 1962, Emile Litter. Auguste conte et la philosophe positive, paris, 1877

سەرچاوە: مامۆستایانی بیری سۆسیۆلۆژی

Lewis A. Coser



# ئاڵتۆسێرو راڤەکردنەوەی مارکسیزم

■ ئا: د.عەبدولعەلیم محەمەد

● و: کامیل محەمەد قەرەداغی

**ئاڵتۆسێر** بەخەسڵەتێکی وەك ئوستادی فەلسەفەو، خەسڵەتێکی دیکەی وەك ئەندامێکی حزبی شیوعی فەرەنسی، ئەرکێکی گرتۆتە ئەستۆی خۆی، زۆر قەبە دێتە پێشچاو، ئەو ئەرکەش هەوڵی دۆزینەوەی (بیرکردنەوە رەسەنەکەی مارکسە) لەپشتی ئەو شێواندنانەوە کە مارکسیزم لەناو کۆمەڵگەی بۆرژوازی و تەنانەت لەناو خودی حزبەکەی ئاڵتۆسێریشدا، واتە حزبی شیوعی فەرەنسی بەدەستیانەوە ناڵاندوویەتی.

ئاڵتۆسێر ئەم ئەرکە گەورەیەی لەساڵی 1960ەوە دەست پێکردووە، دەست پێکردنەکەی بەبڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەی بووە کەناوی (لەپێناوی مارکسدا)یەو کۆمەڵە وتارێکە کەپێشتر لەماوەی نێوان 1960و 1965دا بڵاوکراونەتەوە.

لەناو ئەم وتارانەدا ئاڵتۆسێر خۆی وەك پشتیوانیکەرێك لەمارکس‌و بیرکردنەوە رەسەنەکەی پیشان دەدات، نەك تەنها بەرامبەر بەوانەی کەلەرووی پرەنسیپەوە بەمارکسیزم نەیارن، بەڵکو بەرامبەر بەو مارکسیستانەش کەهەلی لە(مارکسیزم تێگەییشتنیان) بۆنەرەخساوە.

دیارە ئاڵتۆسێر سەرباری ئەندامەتیی خۆی لەحزبی فەرەنسیدا، قسەو باسەکانی- ئەگەر بەرواڵەتیش بێ- پەیوەست نیە بەهیچ کام لەرەوتەکانی ناویزوتنەوەی کرێکارییەوە، بەڵکو هەوڵی دۆزینەوەی هزرە رەسەنەکەی کارڵ مارکس بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەسەر خوێندنەوەی (سەرمایە) بنیات دەنێ.

فۆجێر ولاسیش بەچاوپێداگێڕانێکی خێرای بارودۆخی بزووتنەوەی کرێکاریی جیهانی‌و پەرەسەندن‌و گەڵاڵە بوونی مارکسیزم لەچێوەی ئەم پرۆسە مێژووییەدا دەست پێدەکات‌و، جەخت لەسەر کۆمەڵەو تەزایەك دەکات


مارکس

کەبێگومان ئالتۆسێر لێیان بێئاگا نیە، بەڵام لەشوێنەکەی خۆیەوە لەناو حزبە فەرەنسیەکەدا ناتوانێ بەدروستی بیان بینێت.

دەرکەوتنی مارکسیزمو دۆزینەوەی مەتریالیزمی مێژوویش بەنوێ دادەنرێنو لەساڵی 1845وە دەستیان پێکردووە. وروژاننامەکانی تایبەت بەتیۆری ململانەی چینایەتیو چەمکی زانستیانەی سۆشیالیزمو ستراتیژیەتی شۆڕشی پرۆلیتاریش بۆساڵی 1848 دەگەڕێنەوە.

ئەم دۆزینەوانەش هاوکات بوون لەگەڵ دەرکەوتنی چینی کرێکاری ئەورووپاو گەڵاڵەبوونی وەك چینێکی شۆڕشگێڕو لەگەڵ هەڵکشانی بۆرژوازیەتو پێکهاتنی ڕێکخراوە خەباتگێڕیەکانی پرۆلیتاریای وەك کۆمەڵەی شیوعیەکان کەمارکسو ئەنگلز ڕۆڵی گرنگیان تێدا گێڕا.

لەو بەروارەشەوە شیکردنەوەی زانستیانەی مارکس بۆشێوازی بەرهەم هێنانی سەرمایەدرای بەپەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ پەیوەستبووە بەدامەزراندنی ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی کرێکارانەوە لە1864 هەروەها مارکس لەساڵی 1867دا بەشداریی لەدامەزراندنی نێونەتەوەیی یەکەمیشدا کردووە، ئەوەبوو یەکەم کتێبی (سەرمایە)ی بڵاوکردەوە.

لەمەوە نووسەر ئەوە هەڵدەهێنجێ کەپەرەسەندنی مارکسیزمو مەتریالیزمی مێژوویی لەپەرەسەندنی بزووتنەوەی کرێکاری جیا نەبۆتەوەو هەریەکە لەوروژاننامەکانی مارکسیزمو مەتریالیزمی مێژوویی لەچێوەی مومارەسەی خەباتگێڕانەی کرێکاریدا گەڵاڵە کراون، وروژاننامەکانی هەریەکە لەمارکسو ئەنگلزو، ئەوانەی کاوتسکی لەڕووبەڕووبوونەوەی برنشتاینو ئەوانەی لینین لەڕووبەڕووبوونەوەی سۆشیال دیموکراتو، ترۆتسکی لەڕووبەڕووبوونەوەی ستالیندا، ئەوانیش هەریەکەمان شێوەن.

لێرەوەیە کەفۆجێر وڵاس جەخت لەسەر ئەوەدەکات کەگەڵاڵەبوونی مارکسیزمو ئەو پەرەسەندنانەی کەلەسەر دەستی لینینوترۆتسکیو خەڵکی دیکەوە بەدوایدا هاتن تەنها ڕاڤەکردنو ئیجتیهادی ئاوەزیانەی کارەکانی مارکسو ئەنگلز نەبوون، لەچێوەیەکی ئەکادیمیانەدا رووبدەن، بەڵکو لەبنەڕەتدا چەند گوزارە لێکردنێکی هەستەوەرانی ئەو پەرەسەندنە بوون کەبزووتنەوەی کرێکاریی شۆڕشگێڕ لەخەباتیدا دژبە کۆمەڵگەی بۆرژوازی بەخۆیەوەی دەبینێ.

وروژننامەکانی کاوتسکی لەدژی برنشتاینو ماریکاریی نێوان چینەکانیش بەم شێوەیەبوو، ئەگەرچی ئەمە ئەو ڕێگەیەی لەبرنشتاین نەگرت کە پاشتر بکەوێتە داوی سۆشیال دیموکراتەوە. وروژاننامەکانی لینین لەڕووبەڕووبوونەوەی ئەم رەوتەی دواین لەناوبزووتنەوەی کرێکاریو، وروژاننامەکانی ترۆتسکی لەدژی ستالینیزمیش

بەم شێوەیە بوون، لێرەوە نووسەر لایەنە تیۆریەکانی پەرەسەندنی مارکسیزمو واقعی پراکتیکیانەو مومارەسەی خەباتگێڕانە بەیەکەوە گرێدەدات.

لێرەوە دەگات بەرەخنەگرتن لەو هەوڵەی ئالتۆسێر کەلەبارێکی (ئەکادیمیانە)ی (کەلتوریانە)وە بەراڤەکردنەوەی مارکسیزم هەڵدەستێو بەدوور لەچێوە مێژووییەکەی بزووتنەوەی کرێکاری جیهانی، بەدوای مارکسە ونبوەکەی ناو واقعی کۆمەڵگاکانی ئێستادا دەگەڕێ. بەتایبەتیش لەوەدا (واتە رەخنەکە لەوە دەگرێ) کەهەوڵەکە واپێشکەش دەکرێ کە گوایە ئەمە تەنها (خوێندنەوە)یەکە، ئەگەر خوێندنەوەیەکی نەخۆشانەیش نەبێ.

## گەڕان بەدوای خاڵی دەست پێکردندا

کۆنگرەی بیستەمی حزبی شیوعی سۆڤیەتی فەبرایەری 1956 خاڵی دەستپێکی هەوڵی ئالتۆسێر بوو بۆ راڤەکردنەوەی مارکسیزم. لەمەدا ئەویش وەك رۆشنبیرە ستالینیەکانی دیکە وایە. پێشتریش ئالتۆسێر نوقڵانەی ئەوەی لێدابوو کەسەردەمێکی نوێ بۆحزبە مارکسیستەکانو بەتایبەتیش بۆرۆشنبیرەکانیان لەدەست پێکردندایە. ئەو سەردەمە نوێیە راستیەك دەبێ، پەتی ئەو بێدەنگیە دەپسێنێ کەسالآنێکە باڵی بەسەر حزبەکەیدا داداوە.

ئالتۆسێرلەسەرەتاوە سەرکێشی بەوەوە نەکردووە کەرەخنە لەسەرراپای ستالینیزم بگرێ بەڵکو بەرەخنە لێگرتنی رەوشێکی وازی هێناوە– کەرەنگە ئەوەیان خەتەرترینیان بێ– ئەویش دۆگمابیە، بەتایبەتیش سەبارەت بەرۆشنبیران.

بۆدژایەتیکردنی دۆگمایی، ئالتۆسێر (گەڕانەوە بۆ دەقە رەسەنەکان)ی هەڵبژاردووە، یان ئەگەر بڵێین گەڕاوەتەوە بۆ رەسەنترینی دەقەکان کە ئەویش (سەرمایە)ی مارکسە. لێرەدا ئەوە بەسەر فۆجێر ولآسدا تێپەڕ نابێ کەئاگایی لەوەبدات بانگەشەکردن بۆ (حەجکردنو گەڕانەوە بۆدەقە رەسەنەکان) بانگەشەیەکە بۆگومانکردنو زۆربەی جاریش بەدوورکەوتنەوە لەرەسەنەکان، یان دابڕان لەگەڵیان کۆتایی دێ. پێویست نیە شارەزاییەکەی لای (لاکان)و گەڕانەوەکەی ئەو بۆ(فرۆید)مان لەیاد بچێت کەتائێستا گەڕانەوەیەکی زیندووە.

بانگەشەکەی خرۆشۆف بۆرەخنەگرتن لە(کەسێتی پەرستن)و ستالینو گردبوونەوە لەدەوری پرەنسیپی سەرکردایەتی بەکۆمەڵی، کلیلێك بوو کەوتە دەستی ئالتۆسێرو لەوێوە هەستا بەبلآوکردنەوەی (لەپێناوی مارکسدا)و (سەرمایە بخوێنەرەوە)و رایگەیاند کە ئەمانە بەرهەمی گەڕانەوەن بۆسەر (رەسەنەکان) ئەوکاتەش پسپۆرانی بواری کاری ئایدۆلۆژی واتێگەیشتن کە کارەکانی ئالتۆسێر شتە بنەرەتیو جەوهەریو ئەوشتانە دەپارێزێ کەپێویستە پارێزگارییان لێبکرێ، ئەمەش لەبەرئەوەی کە لەرووی سیاسیەوە ستالینیزمی نەخستۆتە پای تۆمەت پێکردنەوە. هەروەها خۆیشی لەشێوە کرێکاریو دەستەلآتە بیرۆکراتیەکانی دەوڵەت نەداوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەو ئاگایی رۆشنبیرە بەرهەڵستکارەکان بەرەو گێژاوێکی تیۆری دەشێوێنێ کەبابەتەکەی مارکسیزمە.

## کۆتایی فەلسەفە

گــە ئاڵتۆســێر لەخوێندنــەوەی مــارکس‌و بەتایبەتیش فەلســەفەکەی لـە(سـەرمایە)دا بۆوە گەیشــت بــەوەی کــە بــە فەلســەفەیەکی نــوێ گەیشــتووە هێشــتا دەرکــی پێنــەکراوە، یــان بەتەواوی هەستی پێنەکراوە. فۆجێر ولاس ئەم وتەزایە دەخاتـە پـای تۆمەتپێکردنەوە: چونکـە چۆن دەکرێ مارکسیستێك کەدەڵێ مارکسیزمی خوێندۆتــەوەو بەباشــی تێیگەیشــتووە، لــەو خوێندنەوەیـەوە فەلسەفەیەکی نوێ دەربێنــێ؟ چونکــە فەلســـەفە لـــەتێڕوانینی مارکســـدا لەئایدۆلۆژیایەك بەولاوە شــتێکی دی نیـە، یـان - لەباشــترین بــاریدا- شــێوازێکی نموونەییــە لـەئایدۆلۆژیا، هـەردەبێ وابێ، بـەکۆتایی هــاتنی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی فەلسەفەش کۆتایی هاتووە. لێرەدا نووســەر رایـەکی مـارکس دێنێتـە گـۆڕێ، لەئەترووحـەی (ئایدۆلۆژیـای ئــەڵمانی)ی وەرگرتــووە، دەربڕێنێکــی دیـاری نـا ئەتروحــەی یانزەی سەر فیورباخە، دەڵێ (فەیلەسووفەکان لە راڤەکردنی جیهان پتریان نەکردووە، بــەلام کـاری سەرەکیی گرنگ گۆڕینی جیهانە).

فەلسەفە لەتێڕوانینی بزووتنـەوەی کرێکـاریی شۆڕشگێڕییەوە پەیوەندیی بە ڕابوردووەوە هەیـە. میراتێکە لەسـەدەی شەشــەم‌و ســێیەمی پێــش زایندا لەئەسینا ڕۆڵی هەبووە، لەسەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەشدا لەئەڵمانیا دەربڕینی ئایدۆلۆژیانەی چین‌و توێژە کۆمەڵایەتەکان بـووەو ناکرێ بە تێڕامانی ئایدۆلۆژیانە، یان فەلسـەفیانە بەسەر ئەم کەلەپوورەدا هەنگاو بنێین.

فۆجــێر ولاس دەگاتــە ئــەو دەرەنجامــەی کەبیرۆکــەی حەشــاردراوی پشــت ئاراســتە فەلسەفیەکەی ئاڵتۆسێر، نائامـادەیی ئاڵتۆسـێرە




بۆئـەوەی مارکسیزم وەك دەربڕینێکـی زانسـتی‌و تیۆریی بزووتنەوەی کرێکاریی شۆڕشگێڕو کۆتایی فەلسـەفە ببینێت. بـەڵکو دەگـات بـەوەی بڵێــت پەیوەندییــەك لــەنێوان کتێبــی (مــەتریالیزمی دیالـەکتیك‌و مـەتریالیزمی مێژوویــی)ی ســتالین‌و نووسینەکانی ئاڵتۆسێردا هەیـە. رەنگـە بـەڕای ئــەو، نادۆگماییــەك لـــەڕووی ڕواڵەتـــەوە لەنووســینەکانی ئاڵتۆســێردا هــەبێ، بــەلام لــەناوەڕۆکیداو بەئاراســتەی گەلاڵــە کردنــی فەلسـەفەیەکدا کەبـەخۆی دەڵــێ مارکسیســتە، بــەلام لەڕاســتیدا بەمارکسیســتی ناکۆکــە لەیـەکچوونێکی لەگـەڵ ئـەو رەخنـە رادیکاڵیانـەدا هەیە، کەنەك لەلایەن مارکس‌و ئــەنگلزەوە بـەڵکو لەلایــەن لینــین‌و ترۆتسکیشــەوە لەفەلســەفە دەگیرێ.

ئاڵتۆسێر چۆن دەتوانـێ ئـەوە نـەبینێ، یان خۆی نایەوێ ئەوە ببینــێ کـەخۆی لەژێرپـەردەی ئـەم ڕواڵەتـە تەلەفزیـە مارکسـیانەوە بەشـداری لەپتـەو کردنـی دەمـاری ئایدۆلۆژیـای بـیرۆکراتیی ستالینیدا دەکات؟

ئالتۆسێر وا باس لەکارەکانی مارکس دەکات کەئەوانە کاتی لاویی مارکس، واتەپێش ساڵی 1845 کاری (بڕین) بوویێتن‌و لەسەرەتای 1845 وە بووبن بەدابڕان واتە Coupure ولەپێش نوسینی سەرمایەشەوە (1845– 1847) بووبن بەکاری رەسیو (ناضج) وکارە ڕەسیوەکانیش لە 1857 بەدواوە دابڕانی ئەبستمۆلۆژیانە Coupure Epistemologique یان دروست کردبێ. مەبەستی ئالتۆسێر لەمانە ئەوەیە کە پێویستە لەئایدۆلۆژیای ئەڵمانیدا واتە مەتریالیزمی مێژوویی تێبگەین کەهێڵێکی جیاکەرەوە بێ لەنێوان شێوازی بیرکردنەوەی پێش زانستی (Pre- Scietifique)و شێوازی بیرکردنەوەی زانستیدا.

لێرەدا دەبێ ئیشارەتێك بەوەش بدەین کەئالتۆسێر زاراوەی دابڕانی ئەبستمۆلۆژیانەی لەگاستۆن باشلار خواستوە، مەبەستی باشلاریش لەم زاراوەیە پرۆسەیەکی دیالەکتیکیانە بووە کەلەچێوەی‌بیرکردنەوەداو تەنها لەڕێگەی بیرکردنەوە رووبدات، کەوابێ زاراوەیەکی خۆبەخۆیەو لەبۆچوونێکی ئایدیاڵیانەی باڵابون‌و گەلالە بوونی زانست‌و مەعریفە Avenementبەو لاوە چیدیکە نیە، و لەبیرکردنەوەی مارکس‌و ئەنگلزیشدا شتێکی وانیە کەلەگەڵ ئەوشتەدا یەك بێتەوە کەهەریەکە لە ئالتۆسێرو باشلار بۆی چوون، چونکە بیرکردنەوەی هەریەکە لەمارکس‌و ئەنگلز لەسەر چەمکی پەیوەندی نێوان بیرکردنەوەو کار، یان تیۆرو پراکتیك دامەزراوەو تەواو پێچەوانەی بۆچوونە باوەکانی پێش خۆیان بووە.

لەو رەخنە لەخۆگرتنەدا کەئالتۆسێر لەساڵی 1974دا پێی هەستاوە، خۆی دانی بەوەدا ناوە کەتووشی ئینحرافی تیۆری هاتووە، لەهەمان کاتدا وازی لەچەمکی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی نەهێناوە، بەڵکو لەدواشیکاریدا هەوڵی داوە وەك چەمکێکی سیاسیش بەکاری بهێنێ، نەك ئەبستمۆلۆژی. بەڵام نە لە ئەمیانداو نە لە ئەمیشیاندا ئەوەمان پێناڵێ کەئەو ئینحرافەی لەکوێوە هاتووەو رەگەکانی چین‌و ئەوەشمان پێناڵێ کەمانای دابەزاندنی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی بۆ دابڕانێکی سیاسی مانای چی؟

سەرباری ئەوەش ئەم رەخنە لەخۆگرتنە ئەوە لەئالتۆسێر نابورێ کەبیەوێت‌و نەیەوێ، بەشێوەیەك چەمکی دابڕانی ئەبستمۆلۆژیانەی بەکارهێناوە کە نیازی بەشاردنەوەی مۆرکی شۆڕشگێڕانەی مارکسیزم هەیە، ئەو مۆرکەی کەمارکسیزم گوزارەکردنێکە لەململانەی چینەکان‌و ئامرازێکە بۆڕێکخستنی چینی کرێکار لەبەرامبەر پاوانکارانی. لەسەرووی ئەمەشەوە بەکارهێنانی ئەم چەمکە باشلاری‌و ئایدیالیانە دەربارەی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی لەلایەن ئەوەوە وای کردووە کەمەتریالیزمی مێژوویی وەك تەنها نوێکردنەوەیەکی ئاوەزیانە پێشکەش بکرێ‌و گەیشتن بەو (واتە بەمەتریالیزمی مێژوویی) لەڕێگەی وردبینییەوە سازاو بێ.

ئەم هەوڵەی ئالتۆسێر کەدەیەوێ دەقەکانی مارکسی لاو لەمارکسی پاش 1845 جیا بکاتەوە، بەرسەنگی ئەو حەقیقەتە دەکەوێ کەناکرێ تێزەکانی مارکسیزم لەیەکتر جیابکرێتەوە لەبەر ئەوەی ئەو تێزانە یەکگرتوو بەیەکەوە گرێدراون‌و پەیوەستن بەو مەرجە مێژووییانەوە کەلەچێوەیاندا خەمڵیون.

ئالتۆسێر لەڕەخنە لەخۆگرتنەکەیدا کەئەنجامی داوە دانی بەوەدا ناوە کەبە ئیحایەکی سپینۆزیزم لەگوتاری (فەلسەفەی مارکسی) سپینۆزادا کەوتۆتە هەڵەوە، بەڵام

فۆجیرۆ ولاس لەو بڕوایەدایە کە ئالتۆسێر کەوتبێتە سەر ڕەوتی کانتیزمی نوێ، ئەو کانتیزمەی کەسەر چاوەی سەرەکی وزەپێدانی (ئەبستمۆلۆژیا)ی فەرەنسی‌یەو برۆشڤیچ Brushchvicgوە باشلار نوێنەرایەتی دەکەن.

## مەتریالیزمی مێژوویی‌و پێداچوونەوەی ئالتۆسێریانە

فۆجێر ولاس دێ بەراوردێك لەنێوان داڕشتنەکەی مارکس‌و ئەنگلزی مەتریالیزمی مێژوویی‌و ئەو وێنە بونیاد گەرییە شێوێنراوەیدا دەکات کەئالتۆسێر داڕشتووە، مەبەستی لەمە ڕوونکردنەوەی ئەو جیاوازییە گەورەیەیە کە لەیەکیان جیادەکاتەوە، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەو ئەنجامانی کەهەوڵەکانی ئالتۆسێر بۆ (گەڕانەوە بۆ دەقەرەسەنەکان)پێیگەشتووە. ڕاڤەکردنی ئالتۆسێریانەی مەتریالیزمی مێژوویی پشت بەو وتەیە دەبەستێت کەگوایە مارکس‌و ئەنگلز لەناو کۆگیریی کۆمەڵایەتیدا هەڵاواردنیان لەنێوان سێ بونیادی (بونیادی ئابووری، بونیادی یاسایی سیاسی، و بونیادی ئایدۆلۆژی)دا کردووە. ئەمجا ئالتۆسێر دێت گرفتی پێکەوە گرێدانی نێوانی ئەم بونیادانە، یان بەهەند وەرگرتنی یەکیان لەبەرامبەر ئەوی تریاندا دەوروژێنێ، ئەم هەوڵەش بەشێوەیەکی چار هەڵنەگر دەکات بەکێشەیەکی ئەکادیمی وا کەبەتەواوی لەپراکتیك دابڕاوە. نەك هەر ئەمە، بەڵکو ئالتۆسێر هاتووە چەمکی (چرکە سات- اللحظة- Instant) ی لەدەروون شیکاری خوازراوی لە دەست نیشانکردنی چەمکی (منو بەرزەمنو پشتەمن- Moi, surmoi, ca) وەك ئاستەکانی کەسێتی بەکار هێناوە، کەئەم چەمکە خۆی، لەپاش دۆزینەوەی ئەرجسیەتەوە، یارمەتی پێشکەش بە دامەزراندنو پەرەپێدانی فرۆیدیزم کردووە. خوازە کردنی چەمکی (چرکەسات)و ئامبازکردنی بەمارکسیزم لەلایەن ئالتۆسێرەوە، ڕێگایەکی بونیاد گەریی نموونەیی لێ بەرپا بوو لەبری ئەو مۆرکی دیالەکتیکیەتەی کەلەمەتریالیزمی مێژووییدا هەبوو، بەڵام ئەوڕێگایە بەمەتریالیزمی مێژوویی نەیارو ناکۆك بوو.

ئەم ڕاڤە کردنە بەتەواوی لەگەڵ ئەوشێوازە ڕەسەنەی مەتریالیزمی مێژووییدا ناکۆکە کە مارکس‌و ئەنگلز تەرحیان کردووە، بەتایبەتیش لەو ڕووەی مەتریالیزمدا کەڕێبازێکی مەعریفەی زانستیی کۆمەڵگەیەو لەڕووی ئەو ئەنجامەشەوە کە لە ئەنجامی پێکەوە گرێدانی نێوانی پەرەسەندنی بزووتنەوەی کرێکاریی شۆڕشگێڕیو پەرەسەندنی تیۆری، مەتریالیزمی مێژوویی بەرپای کرد.

لەناواخنی ئەم ڕێگایەشدا ئەو بیرۆکە سەرەکیە حەشاردراوە کەدەڵێ مرۆڤ بەبەرهەمهێنانی پێویستیە مادیەکانی خۆیو ئامرازەکانی بەرهەمهێنان خۆشی وەك بوونەرێکی کۆمەڵایەتی بەرهەم دەهێنێو لەچێوەی کۆمەڵە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا بەشێوەیەکی مێژوویی باری خۆی دەست نیشان دەکات.

لەڕاستیدا مەتریالیزمی مێژوویی وەك ڕێبازێکی ئەبستمۆلۆژیی زانستی، بەدیسپلینە ئەبستمۆلۆژییە زانکۆییەکانی وەك ئابووری سیاسیو کۆمەڵایەتیو زانستی سیاسەتو مێژوو ناکۆکەو هیچیان لەوی دییان جیاناکاتەوە، هەروەها ڕەوشە ئابوورییەکان لەڕەوشە کۆمەڵایەتیو مێژووییو سیاسیەکان جیاناکاتەوە. لەمەوە، کە دێت کۆمەڵگەو مرۆڤ دەخاتە بەر تاوتوێ کردن لەمیانەی هەموو ئەو پرۆسانەوە سەیریان دەکات کە چالاکیەکانی کۆمەڵگە، یان مرۆڤ چێوەبەند دەکەن، دیارە ئەو پرۆسانەش

وەك ئەوەی کەکۆمەڵایەتیو ئابوورین، سیاسیو مێژوویيشن.

لەوێدا کەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیو بەرهەمهێنیەکان ئەو بنەما ماددیەی کۆمەڵگەن کەبونیادی ئایدۆلۆژیی دامەزراوەیی کەلتوورییان لەسەر ڕادەوەستێ، وەك ئەوەی نووسەر (مەبەست لە فۆجێر ولاسە) دەڵێ دەکرێ هەڵاواردن لەنێوان دووشێوەی دیالەکتیکدا بکەین: (هێزە بەرهەمهێنەکان، کرێکارانو ئامرازەکانی کارکردن، لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەمدا لە بەیەکدا چوونێکی بەردەوامدان)(ئەو چرکە ساتەش کەزێدە ئابووری (الفائض الاقتصادي)ی تێدا دەر دەکەوێ، هەرهەمان ئەو چرکە ساتەیە کەچینە بەیەکدا هەڵپژاوەکانی تێدا دەردەکەوێ).

لەلایەکی دییەوە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ دامەزراوە ئایدۆلۆژیەکانی هاوکۆك لەگەڵ ئەو پەیوەندییانەدا لەپەیوەندیەکی بەیەکدا چوونی بەردەوامدان.

لەنێوان ئەم دوو دیالەکتیکەدا شێوازێکی بەرهەمهێنانو تێکەڵکێشبونێکی نێوانی بنەمای مادیی کۆمەڵگەو ئەو دامەزراوە ئایدۆلۆژیانە هەیە کەململانەی چینەکانیان لێدێتە بەرهەم. ئەمەش ئەو پرۆسە بنەڕەتیەیە کەسەیرورەی کۆمەڵایەتی مێژوویی بڕیار لێدەدات.

لێرەدا ناکۆکیی نێوان بۆچوونەکانی ئاڵتۆسێر لەراڤەکردنی مەتریالیزمی مێژووییدا نمایشکردنی هەمان ئەو سەرچاوەیە بەپێیڕانانی نووسەر دەردەکەوێ، ئەوەتا دیارە کەئاڵتۆسێر نیازی بەپووچکردنەوەی ناوەڕۆکی مەتریالیزمی مێژوویی هەبووە.

لەسەر ئاستێکی تر- وەك ئەوەی فۆجێر ولاس وادەڵێ- لەوەدەچێ کە لەیەك جیاکردنەوەی نێوان بونیادی یاسایی سیاسیو بونیادی ئایدۆلۆژی دوژمنایەتیەکی ناڕەوای


لینین

ئاڵتۆسێر بێ بۆ سەر (تیۆری سەرخانی) مارکسیزم. چونکە ئەو دامەزراوانەی کەلەسەرخاندا هەن لەو ئایدۆلۆژیایانە دابڕاو نین کەپەیوەستن بەسەرخان (البناء الفوقی)یەوە، ئەمە جگە لەوەی کەئەم سەرخانە دامەزراوەییو ئایدۆلۆژییەش ئەگەر سەر بە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی بەرهەم نەبێ، ئەوا پەیوەستە پێیانەوە.

هەروەها ئاڵتۆسێر بەخواستی چەمکی (چرکەسات) وازی نەهێناوە، بەڵکو چەمکی (بڕیاری فرەفاکتەر Surdetemination)یش خواستوە. لەوێدا کە ئەو راڤەکردنێکی ئەبستمۆلۆژیانەی ئاوەزیانە بۆمارکسیزم دەکات، چ شەرمێکی تێدانیە ئەم چەمکەش بخوازێ.

## ئاڵتۆسێرو گرفتەکانی سەرخان

تێڕوانینی ئاڵتۆسێر بۆگرفتەکانی سەرخان پشتی بەجیاکردنەوەی رواڵەتیانەی نێوان ئایدۆلۆژیاو دامەزراوەکان بەستووەو هەردووکیانی

کردووە بەدوو بونیادی جیاکراوە. ئەمە ئەو جیاوازیکردنەیە کە ئالتۆسێری خستۆتە هەڵوێستی پێداچوونەوە بەمارکسیزمدا.

ئالتۆسێر لەمروەوەو لەرێگەی ئەوەوە کەخۆی ناوی ناوە تیۆری کاریگەریی بنەڕەتیی سەرخان La theorie del,efficace des Supersructures) هەوڵیداوە کەسەبارەت بەئایدۆلۆژیا گومان لەتیۆری مارکسیزم بکات، وەك ئەوەی کەئەم تیۆرە بۆ تاوتویێ کردنی گرفتەکانی سەرخانی ئایدیۆلۆژی بەس نەبێ و ئەو لە رێگەی تێکردنی چەند وشەیەکی وەك: کاریگەر efficaceو کرۆك essenceو ئۆتۆنۆمی autonomie وە ئەم کەموکورتییە چارەسەر بکات.

ئەوەتا ئەو جیاکردنەوەی کە ئالتۆسێر لە نێوان لایەنی یاسایی سیاسیو لایەنی ئایدۆلۆژیدا کردوویەتی هەر ئەوەی کردەوە کەئەوەی جاران لەبیرکردنەوەی مارکسدا روون بوو، ئەم لێڵو تەمومژاویی کردۆتەوە. چونکە مارکس دەزگا دامەزراوەییەکانی کۆمەڵگایەكو شێوازی هۆشیاریە کۆمەڵایەتیە بەرقەرارەکانی ناو ئەو کۆمەڵگایە لەیەك جیا ناکاتەوەو یاساش لەکۆمەڵگادا بەشێکی دانەبڕاوە لەچێوەی دامەزراوەییو ئایدۆلۆژی.

راڤەکردنی تەنزە ئایدۆلۆژییەکان لەوەوە دەبێ کە لەگەڵ ئەو دامەزراوانەدا بەهاوکوفی سەیریان بکرێ کە تەنزەکانیان لەسەر رادەوەستێ. کەوابێ تاوتوێکردنی فەلسەفەو شێوە هونەریو سیاسەکانیش پەیوەستە بەتاوتوێکردنی دامەزراوەکانو ناوەرۆکە کۆمەڵایەتیەکەیانەوە.

ئایدیۆلۆژیاش بەدەر لەو دامەزراوانەی کەگوزارەی لێدەکەنو چالاکی دەکەن، بوونینیە، سەرخانی دامەزراوەییو ئایدیۆلۆژیش بەدەر لەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەی بەرهەم کە ململانەی کۆمەڵایەتی بە رەهەندەکانیەوە دەجوڵێنێو وزەی پێدەدات، بوونی نیە. ئەمجا لە نێوان بنچینەی مادیی کۆمەڵگەو بونیادی دامەزراویی ئایدیۆلۆژیدا جۆرە پەیوەندیەکی وەك پەیوەندیە هیگڵیەکان (کرۆکی رواڵەتەکان)و پەیوەندیە ئالتۆسێریەکانی(لە بونیادەوە بۆ بونیاد) نین. بەڵکو کۆمەڵە پەیوەندیەکی دیالەکتیکی لە نێوان هێز و گرووپە مرۆییەکاندا هەیە.

ئالتۆسێر هەوڵیداوە بەدوای سەربەخۆ بوونێکی(ونی) سەرخانی دامەزراویی و ئایدۆلۆژی لە بەرامبەر بنچینەی مادیی کۆمەڵگەدا بگەڕێ، بەڵام ئەم گەڕانە بەرەو چەند پایگەیەکی ناکۆك بەمارکسیزم و بگرە ناکۆك بە رێبازی زانستیشی بردوە، ئەگەرچی نیازی ئەو سەربەخۆ بوونە( سەربەخۆبونێکی رێژەیی)ش بووبێ، چونکە لەنێوان دامەزراوە ئایدۆلۆژیەکان و کەلتووریەکان و بنەمای مادیی کۆمەڵایەتیدا چەند پەیوەندیەکی دیالەکتیکی گرێچن هەن و ئەم پەیوەندیانەش دەچنە بەرباری تاوتویێ کردنی زانستیی مێژوییەوە، نەك ئەو تێرامانە فەلسەفیە ئەبستراکتەی کە دەگات بەجیاکردنەوەی ئەو شتانەی کەلەرووی بابەتیەوە بەیەکەوە بەستراون.

نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەو لێك جیاکردنەوەیەی کە ئالتۆسێر لە نێوان لایەنی یاسایی سیاسیو لایەنی ئایدۆلۆژیدا کردوویەتی، گەیاندویەتی بەوەی کەچەمکێکی تر بەکار بهێنێ کەهێندەی چەمکەکانی تری تەمومژاوی و شێوێنراوە ئەویش (دەزگا ئایدۆلۆژیەکانی دەوڵەت) (Appareil ideologique de, Etat) (د. ئا. د)ە، ئەم چەمکەشی بەرەو ئەوەی بردووە کەوەك ئەوەی لینین (لەکتێبی دەوڵەتو شۆڕش) دا باسی کردووە بچێتە سەرنەو بروایەی کەچەمکی مارکسیزم بۆدەوڵەت بەس نیە، لینین لەتێروانینی خۆیەوە تەنها لایەنە

سەرکوتکارەکەی دەوڵەتی بینیوەو لایەنە قایلکاریەکەی (واتە ئایدیۆلۆژیەکەی) فەرامۆش کردووە.

چەمکەکانی ئالتۆسێر سەبارەت دەزگا ئایدۆلۆژیەکانی دەوڵەت (د. ئا. د)و دەزگا سکولاریستیەکان و خێزان وسیاسییەکان و سیاسەت و سەندیکایی و زانیاریی و کەلتووریەکانیش هەر لەم پێگەیەوە دەردەچن.

هەر ئالتۆسێر رۆڵی دژایەتی کردنی توندوتیژیی و سەرکوت بەدەزگا سەرکوتکارەکانی دەوڵەت دەسپێرێت و رۆڵی قایلکارانەو ئایدیۆلۆژیانەش بەدەزگا ئایدیۆلۆژیەکانی دەبەخشێ. لێرەدا وادیارە زاڵبوونی چینی باو بەسەر هەموو چینەکانی تردا توندوتیژیەکی کەمتری هەبێ لەرێورەسمە حکومەتیەکان و رێکخستنی ئیدارەو کاری سوپاو پۆلیس و دادگاکان.

تێڕامانێکی ئالتۆسێر سەبارەت بە(د. ئا. د) نیازی بەئەنجامدانی دوو ئەرك هەبووە، یەکەمیان لۆژیکی و ئەویتریان سیاسی. نیازی یەکەمیان گەلاڵە کردنی چەمکێکی کۆگیرانە بووە کە بڵێ ئەمە مارکسیانەیەو ئەو لەیەك جیاکردنەوەیەی پێبکات کەخۆی بۆ نێوانی بونیادی یاسایی سیاسی و بونیادی ئایدۆلۆژی پێشنیار کردووە. بەڵام وەزیفە سیاسیەکەش ویستوویەتی گرنگیەکی تایبەت بدات بەئایدۆلۆژیاو سەربەخۆی بکات و لەبەرامبەر بونیادی کۆمەڵایەتیدا سەربەخۆییەکی زاتیی پێببەخشێت.

فۆجێر ولاس لەکۆتاییدا دەگات بەوەی کەئالتۆسێر لەهەوڵو کارەکانی خۆیدا نە دابڕانێکی معریفی و نە دابڕانێکی سیاسی لەگەڵ ستالینیزمدا (ستالینیزم وەك ئەودامەزراو و ئایدۆلۆجیایەی کەگوزارەی لێ دەکات) بەرپا نەکردووە، نەشیتوانیوە ئەو مەرزە سیاسی و تیۆری و فکریانە تێبپەرێنێت کەدەوریان

لەهەوڵەکانی راڤەکردنەوەی مارکسیزم و دۆزینەوەی ئەو رەسەنایەتیە ونە داوە کە لە سەرەتای شەستەکانەوە ئالای بانگێشەکردنی بەرزکردۆتەوە. ئەم نە لەمیان و نە لەویان نەیتوانیوە رەخنەیەکی رەگاژۆی سەراپاگیر بۆ ستالینیزم و دامەزراوە حیزبی و ئایدۆلۆژییەکانی دروست بکات بۆیە هەوڵەکەی ئەو لەرواڵەتدا (رەسەنکردنەوەی مارکسیزم و پاراستنی بوو لەو شێواندنەی کە پێوەیی لکێندرابوو لەگەڵ رەخنەگرتن لە ستالینیزم بەڵام ناوەرۆکی هەوڵەکەی نوێکردنەوەی ستالینیزم و درێژکردنەوەی ماوەی مانەوەکەی بوو، ئەمەش وای لێکرد کەلەناوبازنەی ستالینیزمدا رابوەستێت و نەتوانێت تێیبپەرێنێ.

ئێمە نازانین کەخوێنەر تاچەند لەگەڵ ئەو قەواڵەدایە کەلەمیانەی رانانی ئەم بیرانەو ئەم رەخنانەوە هاتنە زەینمانەوە کە فۆجێر ولاس لە لیڤی شتراوس و لاکان و ئالتۆسێری گرتووە*. ئەوسیانە هەرسێکیان و هەریەکەیان بەشێوازی خۆی ئالای گەران بەدوای دەقە رەسەنەکانیان بەرزکردۆتەوە، کەچی سەرباری ئەوەی کەهەوڵەکانیان کاریگەریان لەسەر چەند ناوەندێکی زانستی و ئەکادیمی و رۆشنبیران داناوە ئەو هەوڵانە بەرەنجام لەدەقەرەسەنەکان دوور کەوتوونەتەوە. لێڤی شتراوس بە شێوازەکەی خۆی لەمرۆڤایەتیی بەراییداو بە دوور لەگرێچنییەکانی کۆمەڵگای نوێ بەدوای رەسەنایەتی دەقدا بگەرێ، وەولی لێبڕاوانەی بۆدۆزینەوەی یاسا نەستی و کاریگەرەکانی سەر رەوانی مرۆڤایەتی خستۆتەگەڕ: (وەك سیستەمی خزمایەتی و بیرکردنەوەی بەرایی و ئەفسانە) جاك لاکانیش بەهەمان شێوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی پەرپوت بوونی فرۆیدیزم لەسەردەستی دەروونناسە ئەمریکیەکان ئالای گەرانەوە بۆسەر فرۆیدیزمی رەسەن و فرۆیدی وەك دامەزرێنەری

تـــاكرەوی قوتابخانـــەی دەرونشـــیكاریی بەرزكردەوەو كاری ئەمیش گەشت بەشێواندنی ئـــەو چەمكـــە ســـەرەكیانەی كەدامەزرێنـــەری قوتابخانەكـــە بـــە گرنـــگ وەریگرتبـــوون‌و بەكاریـــهێنابوون. ئـــەو ناوەڕۆكـــە زانســـتیەی لێتەكاندنـــەوە كـــەكاتی خـــۆی دۆزینەوەیـــەكی گـــەورەی نـــاو مێـــژووی پێكـــهاتنی كەســـێتی مرۆڤایەتی بوو لەسەر ئاستی دەروونی بایۆلۆجی‌و كۆمەلایەتی.

ئالتۆسێریش ئەركی دۆزینەوەی بیركردنەوەی رەســەنی ماركســی گرتــە ئەســتۆی خــۆی. ئــەمجا هەوڵـە ناودارەكـەی بـۆ دۆزینـــەوەی بیركردنـــەوە (رەســـەن)ەكـــەی مـــاركس‌و بەتایبـــەتیش (ســەرمایە)كـەی خســـتەگەڕ بۆئــەوەی ناسـنامە رەسەنایەتیەكەیان بەرجەستە بكات.

پـــاش ئـــەوەش كـــە دامەزرێنەرەكـــەی مـــەتریالیزمی مێژوویـــی خوێنـــدەوە كۆمـــەڵێك چـــەمكی تەبـــەنی كـــرد كەناوەڕۆكـــە زانســـتی‌و سیاسیەكەیان لەگەڵ چەمكەكانی ماركسدا ناكۆك بوو.

باشە بڵێی ئـەو گومانـەی كـە فۆجـێر ولاس بەرامبەر بەوەی كەناوی گەڕانـەوە بۆئەسڵەكانەو ولاس خـۆی پێیدەڵـێ(حـەج) كردویـەتی بـۆ بانگەشە ئسوڵیەكانی كۆمەڵگا نائەورووپیەكانیش دەشێ؟

یان ئایا دەتوانین بـەرەنجامێكی گشتیی وای لێهەڵهێنجین كەهەموو بانگەشەیەكی گەڕانەوە بـۆ ئسوڵ بەدووركەوتنەوە لەئەسڵەكان كۆتـایی دێ؟ باشە ئەگەر ئەمە وابـوو ئایـا ئـەو هۆكارانـە چـین كەئـــەم دووركەوتنەوەیـــە دەنوێنـــن؟ ئایـــا لەپێداچوونەوەی یاسا كاریگـەرەكانی جاراندان؟ یان لەسروشتی رەوتە كۆمەلایەتی، ئابووریەكـەدا حەشاردراون بەوپێكهاتە بنەڕەتیانەیانەوە كـەكار بۆلادانـــی ئـــەم هەولانـــە لەســـەر ئامانجـــە رەسـەنەكەیان دەكـەن؟ یان ئەوەیـە كـەبۆ راژە گـەیاندن بـە بـەرژەوەندیی هـێز وگرووپـــە بالادەستەكان دەخرێنە گەڕ؟ یان بـەحوكمی ئـەو لۆژیكـەی كەبەشـێوەیەكی ئـەندامی پێوەیـان لكاوە؟

پرسـیارەكان لـێرەدا بێشـومارن‌و دیـارە وەلامەكانیشـیان زۆر ئـاڵۆزن‌و ئێمـەش لـێرەدا لەهـەوڵی وەلام پێدانـەوەیاندا نـین، هێندەمـان دەوێ كەخوێنەریش لەگەڵ ئێمەدا بەوردی دیقەت لەو قەواڵەیە بدات كەلەمیانەی رانـانی هـزری ئـەم رەوت‌و كەسێتیانەوە گەڵاڵە بوون.

**پەراوێز:**

- ئـەم بابەتـە لەڕاستیدا درێـژەی بابـەتێكی رەخنەیی بیریـاری مۆدێرنـە (پیـێر فۆجـێر ولاسـە كە لـە هـزری هەریەكـە لـە شـتراوس‌و لاكـان‌و ئالتۆسێر دەدوێ. وتارەكە لەلایەن (د. عبدالعلیـم محمـد)ەوە ئامادەكراوە‌و لـەگۆڤاری (المنـار)دا بلاوكراوەتـەوە، وتـارێكی درێـژە، لەبەر درێژیەكـەی بـەپێی نووسـەرە رەخنـە لێگیراوەكـان كردم بە سێبەشەوە كەئەم دەقە دوایین بەشیەتی‌و بەشی یەكـەم‌و دووەمیشـی لەپێشـترەوە بلاوكراونەتـەوە، بـەم شێوەیە:

  - بەشـی یەكـەم- پیـێر فۆجـێر ولاس‌و تاریكخوازیی هاوچەرخ- گۆڤاری سەردەم- ژمارە چوار- ئابی 1999 لاپەڕە (59-75) -كامیل محەمەد قەرەداخی.
  - بەشـی دووەم - جاك لاكـان‌و راڤەكردنـەوەی فرۆیدیزم- گۆڤاری گەلاوێژی نوێ- ژمارە شانزە- 1999 لاپەڕە (53-57)- كامیل قەرەداخی.

**سەرچاوە:** گۆڤاری (المنـار) ژمارە (34) سـاڵی 1989 لاپەڕە (136-143).



# ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی

## ئێستاش ئەوە دەهێنێت ساتێك خۆی پێوە خەریك بكرێت؟

## وەڵامی چەند دەنگێكە لە ئەمریكاوە

■ مۆریس گۆدۆلیێ

● و. سەروەر عەبدولڕەحمان

**مۆریس گۆدۆلیێ Mourice Godelier:**

م. گۆدۆلیێ لە 1934/2/28، لەشاری كامبرای لە باكووری فەڕەنسادا، هاتووەتە ژیانەوە لە شارەكانی كامبرای ولیل و پاریسدا خوێندوویەتی، قوتابی یانەی مامۆستایان بووە. پاشان بڕوانامەیەكی پرۆفیسۆری فەلسەفەی وەرگرتووە. دواتر لە دەروونناسیولە زانستە مرۆڤایەتیە نوێیەكاندا پلەی بەدەست هێناوە. دواتریش بڕوانامەیەكی دوكتۆرای لە زانكۆی لۆڤان لە بەلژیكا دراوەتێ. لەنێوان سالانی 1982–1986دا پۆستی بەڕێوەبەرێتی زانستی مەڵبەندی نەتەوەیی لێكۆڵینەوە زانستیەكانی وەرگرتووەو، مامۆستای بەشی ئەنترۆپۆلۆژیا بووە. لە نێوان ساڵی 1967 و 1969 و پاشانیش هەتا ساڵی 1988 هەستاوە بەكۆمەڵێك لێكۆڵینەوەی مەیدانی لە گینیای نوێو، ئەمەش ئەنترۆپۆلۆژیەكی هەڵكەوتووی لێ دروست كردووە. بە سەردان لە زانكۆكانی یاڵ و هارفاردو نیویۆرك و لاڤاڵ و ئان ئاربۆرو لۆڤانی نوێدا مامۆستا بووە.

ئێستاش: بەڕێوەبەری لێكۆڵینەوەكانی قوتابخانەی خوێندنی باڵایە لە زانستە كۆمەڵایەتیەكاندا لە پاریس. بەڕێوەبەری مەڵبەندی توێژینەوەكان و ڕێكخستنە دەربارەی

*ئۆقیانووسیا لە مارسیلیا. بەڕێوەبەری پرۆژەی توێژینەوەو فێرکاریە لە مۆزەخانەی هونەرو ژیارەکان.*

*گرنگترینی دانراوەکانی:*

*1- عەقڵانیەت و ناعەقڵانیەت لە ئابووریدا (1966).*

*2- هزریو ماددی (1984).*

*3- چەند ئاسۆو ڕێرەوێکی مارکسی لە ئەنترۆپۆلۆژیادا (1972).*

*4- دەربارەی کۆمەڵگە پێش- سەرمایەداریەکان (1970).*

*5- مەتەڵی بەخشش (1996).*

*هەروەها زیاتر لە (200) باس و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارە جۆربەجۆرەکاندا بڵاوکردووەتەوە(1).*

*ئەم بەرهەمەی بەردەستی خوێنەری بەڕێزیش، ئەنجامی ئەزموونێکی قووڵ و بەنرخی م. گۆدۆلییە، شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتیو کارو بەرهەمی ئەنترۆپۆلۆژیاییەکانە، هەروەکو گێڕانەوەی ئەزموونێکی خۆیی نووسەریشە وەکو ئەنترۆپۆلۆژیایەکی ئەم سەدەیە. م. گۆدۆلییێ قوتابخانە ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان هەڵ دەسەنگێنێت و، هۆکارو ریشەکانی سەرهەڵدانی ئەنترۆپۆلۆژیا لێك دەداتەوەو، پەنجە دەخاتە سەر نەخۆشیە پەنامەکیەکانی ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی، بەمانەش هەوڵ دەدات بگاتە وەڵامی پرسیارەکەی.*

---

**ئایا** ئێستاش ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی(2) ئەوە دەهێنێت ساتێك خۆی پێوە خەریك بکرێت؟ ئەگەر چەند دەنگێك کە لە ئەمریکاوە هاتوون و پشت بە میشێل فۆکۆ M. Faucault و جاك دێریدا J. Derida و جان فرانسوا لیۆتار J. F. Lyotard و چەند نووسەرێکی فەڕەنسایی دیکە دەبەستن و، پێشبینی دەرچوونی ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی دەکەن لە بازنەی هزری نوێ، بەجێی باوەڕ دابنێین؛ ئەوا نەخێر، رەنگە ئەوە نەهێنێت! قەیدی چیە؟ بەڵام من - وەکو ئەنترۆپۆلۆژیەك- ویستم پێش ئەوەی ناچاری ئەم سەرەنجامە شوومەی ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی ببم یاخود پشتگیری لێ بکەم، هەڵوێستەیەك بکەم بە مەبەستی بیرکردنەوە لەو پەیوەندیانەی کە لە شەستەکانەوە لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکاییدا،، لەو ماوەیەدا کە بواری ئەنترۆپۆلۆژیام هەڵبژاردبوو، بەستبووم.

یەکەم پەیوەندیم لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکاییدا هیچ پەیوەندیەکی بە گینیای نوێ(3) وە نەبوو.. ئەوەبوو لە ساڵی 1964دا بواری ئابووریو فەلسەفەم بەرەو ئەنترۆپۆلۆژیا بەجێ هێشتبوو، لەسەر ئاستی تیۆریش، لەو ماوەیەدا خەریك بووم بە شیکردنەوەی شوێنەوارو گرنگی ئەو چالاکیو پەیوەندیانەی بە چالاکی و پەیوەندی ئابووری ناوزەد دەکرێن، لە پرۆسێسی پێکهاتنی کۆمەڵگەکان و داڕشتنەوەی بەرهەمهێنانیدا، لەو کاتانەشدا لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا جەنگێکی بە تاووتین لە گۆڕێدا بوو لە نێوان لایەنگران و دژانی تەرزە بۆچوونێك کە پێی دەوترێت فۆرمالیزم "الشکلانیە" کە سکۆت کۆك S.Cock و سیریل بیلشۆ C.Bilsho و

.... هتد نوێنەری بوون و، تەرزە بۆچوونێکی تر کە پێی دەوترێت سەبستانتیالیزم "الجوهرانیە" سەبارەت بە رووداوە ئابوورییەکان. بەرجەستەبوونی ئەمەیان لە کارڵ پۆلانی K. Polany دا بوو، مارشاڵ سالینز M.Sahlins یش یەکێك بوو لە قوتابییەکانی، هەروەها جۆرج دالتۆن G. Dalton یش کە چووم بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ چاوپێکەوتنی و سازدانی مشتومڕ لەگەڵیدا.

هەستم دەکرد کە زیاتر لە فۆرمالیستەکانەوە نزیکترم تاکو سەبستانتیالیستەکان، بەلام باوەڕیشم وابوو کە ئەم دوو تەرزە بۆچوونە هەر بە خودی دژیەکیەکەیان، بە شێوەیەکی قووڵ، دیدو نیگایەکی نامۆیان دەگەیاند، کە دەگونجێت سەبارەت بە چالاکی بەرهەمهێنانەکی هۆکارەکانی ژیان یاخود سامانی مادی کۆمەڵگەکانیش، بێت. ئینجا بابەتی رەخنەیەکی ریشەیی چەمکە رۆشنبیریە پێشینەکانمان، پێشتر و لەهەمان گۆڕەپاندا، خرابووە ئاراوەو، لەو کاتەشدا لە بنچینەی ئەم رەخنەیە دەگەڕام بە باری مارکسیزمێکی رەخنەگرانەو نوێکراوەدا. لە هەمان ئەو ماوەیەدا ببوومە یارمەتیدەری کلۆد لیڤی-شتراوس C.Levi- Strauss، لەبەر ئەوەش پەیوەندیەکی بەردەوامم لەگەڵ گەشەی ئەو بەرهەمانەدا هەبوو کە زادەو دەرهاویشتەی بونیادگەرایی(4) بوون.

لەسەر ئاستەکەی تریش، ئاستی مەیدان(5)، کارتێکەری هاوەڵە ئەمریکاییەکان هەر زوو لێرەشدا زۆر بەهێز بوو. ئەوە بوو ساڵی 1966 کاتێك فەرەنسام بەرەو گینیای نوێ بەجێهێشت، هیچ پەیوەندیەکمان بە ئەوەی کەسانی وەکو مارگرێت مێد M.Mead و گریگۆری باتێسۆن G.Bateson وە نەما، بەڵکو بەئەوەی میرفەت


میشیل فوکو

میگێت M.Migeth رۆی راباپۆرت R.Rababort و پێتەرفایدا P.Fida وە. بە کورتیش بە بەشەکانی ئەنترۆپۆلۆژیاوە لە زانکۆکانی کۆلۆمبیا ئان ئارپۆرو شیکاگۆ.

پلە پلەو بەکاری توێژینەوەکانیان، ئیتر کۆمەڵگەو رووداوە سەرنجدراوەکانی گینیای نوێ ئەوەیان لێ نەدەخوێنرایەوە کە دەتوانن بە ئاسانی لە تیۆریەکانی خزمایەتیو سیاسەتدا پەرەپێدانی مایێرفۆرتێس M.Fortes و ئیدوارد ئێڤانز- پریچارد E.Evans- Pritchard و کەسانێکی تر بوون، جێیان بێتەوە.

ئەوەتا جۆن بارنێز J.Barnes بونیادە کۆمەڵایەتیەکانی گینیای نوێ -کاتێك لەگەڵ کۆمەڵگەکانی ئەفریقاو رژێمەکانی خزمایەتی دوو رەگەزی(6) تیایدا بەرامبەر بکرێتەوە، وا رادەنوێنێت کە "بەرفراوان" و ئاڵۆزو تێکەڵ و، شلۆق و، نەگیرساون و، زۆرێك لە ئێتنۆلۆژیایی (رەگەزناس) ە کانیش دەستیان کرد بە تۆخکردنەوەی ئەم چەمکی "بەرفراوانی" ە.

بەلام رەنگە روونکردنەوەی دەستڕۆیشتوویی ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی لە فەرەنسادا

ناچارمان بکات دوو وتە سەبارەت بە گەشەی ئەنترۆپۆلۆژیا لەم وڵاتەدا بڵێین. دەبینین ئەو گەشەیە لەسەر دوو بنەما بووە: پێکهاتن و فراوانبوونی ئیمپراتۆریەتێکی ئیمپێریالیزمی(7)ی فەڕەنسایی لە هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدەیەمداو، ناچاربوونی دەوڵەتی پاشایەتیو، پاشانیش کۆماری، لەسەر دروستکردنی تەواوترین رێبەر کە لە توانادا بێت بۆ ئەو دابونەریتە ناوخۆییانەی پەیوەستن بە بوونی چەند کۆمەڵەیەکی ڕەگەزی جۆراو جۆر "باسکیەکان و پرۆتۆنیەکان.. هتد" لە وڵاتەکەداو، هەروەها بە بەردەوامبوونی چەند شێوازێکی کۆمەڵی رێکخستنی جوتیاریو خاوەنێتی زەویو زار لە هەندێك ناوچەدا. دەوڵەتیش بڕیاری دروستکردنی ئەم ڕێبەرەی دابوو، چونکە ئەم شێوازانەی ژیان و خاوەنێتی ببوونە رێگرێك لەبەردەم فراوانبوونی خاوەنێتی تایبەتی زەویو زارو سەرمایەو، گەشەی بازاڕێکی ناوخۆییو، ئینجا شتێکی پێویست بوو کە بەم ئاراستەدا گەشەیان پێ بدرێت، بەڵکو هەر لابرێن، وەکو ئەوەی دوای دەرچوونی کۆمەڵە یاساکەی ناپلیۆن روویدا، لەسەر ئاستی تیۆریش، ئەو دراو و زانیاریانەی کە لەو رێبەرانەی دابونەریتە ناوخۆییەکانی گەلانی ئەوروپادا کەڵەکە بوو بوون، دواتر لە مشتومڕەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا لەسەر ریشەو گەشەی ژیار(8)ە هیندۆ- ئەوروپیەکان، بەکارهێنران.

**تا گەیشتە ئەوەی ئەم دابونەریتانە بە چەند شێوەیەك دابنرێت کە خاوەنێتیو پرینسیپەکانی رێکخستنی کۆمەڵگەیان تێدا دەهاتە جێو، بەرامبەری چەند قۆناغێکی کەم تا زۆر دێرینی رێگەی گەشەکردنی کەلەپوورێکی هاوبەشی زۆر دێرین، دەبنەوە.** ئەو ماددانەش کە لەگەڵ فراوانبوونی ئیمپراتۆریەتی ئیمپێریالیزمی فەڕەنسایی لە ئەفریقا یاخود ئاسیاو ئەمریکادا کەڵەکە ببوون، هەندێك نموونەیان دەهێنایە پێش چاو کە زۆر سەیرتر بوون و، زۆر زیاتر لە دابونەریت و رژێمە کۆمەڵایەتیەکان جیاوازیان تێدا بوو، واتە، بەکورتی، ئەو ماددانە ماددەی زۆر جۆراوجۆری وا بوون کە بواریان دەڕەخساند بۆ بەرەو پێشچوونی ئێتنۆلۆژیا(9)یەکی کۆمپارتیڤ "مقارن" و تێپەڕاندنی ئاستەکەی جاران کە لە پێڕستسازی فۆلکلۆرە ئەوروپاییەکاندا خۆی دەبینیەوە. هەمان بزاوت لە ئینگڵتراش هاتەدی، هەر لەسەر بنەمای ئیمپراتۆریەتێکی ئیمپێریالیزمی -بەڵام- فراوانتر. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمیشدا هەردوو وڵات ئیشیان کردووە لەسەر پێگەیاندنی کادری کارگێڕی ئیمپێریالیزمی شارەزا لە ئێتنۆلۆژیا، یاخود بەکارهێنانی پسپۆڕی ئیتنۆلۆژیا لە کارگێڕی کۆلۆنیا "المستعمره" کانیاندا. ئەمەش سەبارەت بە هەردوو: "قوتابخانەی فەڕەنسای ئەودیو دەریاکان" لە پاریس و، "نووسینگەی ئیمپێریالیزمی" لە لەندەن.

بەڵام شەقاوە گەورەکەی ئەنترۆپۆلۆژیا لە فەڕەنسادا -کە بەراستی دەکرێت بەڕووداوێکی کتوپڕ دابنرێت- لە ساڵی 1960وە دەست پێ دەکات، ئەویش هاوکات لەگەڵ رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئیمپێریالیزمی فەڕەنسایی لە هەردوو جەنگەکەی ڤێتنام و جەزائیردا، کە ئەو کاتە فەڕەنسا ناچارکرا دان بنێت بە **پرینسیپی سەربەخۆیی ئەو وڵاتانەو ئەو کۆمەڵگە خێڵەکی یاخود ناخێڵەکیانەی داگیری کردبوون. هەندێکیش لە ئێمە، کە لەو کاتەدا ببووینە** ئەنترۆپۆلۆژیایی، پێشتر پابەندی سیاسی(10) بووین دژی ئەو دوو جەنگەو، لە پێناوی



شتراوس

سەربەخۆ بوونی کۆلۆنیا فەرەنساییەکان دەجەنگاین. بەلام، ئەم گەشە دواخراوەی ئەنترۆپۆلۆژیا چی بوو و بۆچی هاتە گۆڕێ؟ وەلامەکە -بە بڕوای من- ئەوەیە کە ئێمە لە هەمان ئەو کاتانەدا لە نێوەندی گەشەی خێرای زانستە کۆمەلایەتیەکاندا دەژیاین و، دەمانبینی کە ئێتنۆلۆژیا، بەلای کەمەوە لە فەرەنسادا، وردە وردە جێگەیەکی بنەڕەتی دەگرت لەناو ئەم زانستانەدا.

ئەوەش هەر لەو کاتەوە کە فۆکۆ رایگەیاند کە ئەنترۆپۆلۆژیاو شیکردنەوەی دەروونی ئەو دوو لقەن کە لەگەڵ بواری تەواو و پڕاوپڕی زانستە کۆمەلایەتیەکان یەکتر دەبڕن، لەکاتێکدا کە ئەو دوو لقە لاکانی ئەو بوارە دەگرن. بەلگەش لەسەر ئەم گۆڕانکاریە لەدیاریکردنی شوێنی ئەو دوو لقەدا ئەوەیە کە وەلانانی زاراوەی ئیتنۆلۆژیا تایبێت زیاتر دەبێت و زاراوەی (ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتی) جێی دەگرێتەوە، کە ئەمەیان لیڤی شتراوس و کەسانێکی تر، بە ئاشکرا، لە ئەنترۆپۆلۆژیای بریتانیەوە وەریان گرتووە، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی لقەکەی ئێمە (ئەنترۆپۆلۆژیا) لە بازنەی لێکۆڵینەوەی تایبەتیو تەسکی کۆمەڵە رەگەزیەکان تێپەڕێنن و، وەکو زانستێکی کۆمەلایەتی کە جیهانی بێت لە ئامانج و رۆڵیدا بیهێننە پێش چاو، واتە ببێتە لقێك کە میتۆدو گریمانەکانی بگونجێت لە لێکۆڵینەوەی هەموو کۆمەلگە مرۆییەکاندا پراکتیز بکرێن، نەك تەنها کۆمەلگە (بەراییەکان) یاخود (کشتیاریەکان).

لەوەش زیاتر، کە ئەمەیان تایبەتە بە فەرەنساوە، دەبینین کە (ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتی)ی نوێ هەروەها کاریگەری لە چەند لقێکی تری روو لە زیادی زانستە کۆمەلایەتیەکان دەست داوەتێ، وەکو مێژوو، کە هەندێك پسپۆڕی وەکو جاك لۆگۆف J.Legoff و ئیمانوێل لۆروا- لادووری E.Lorwa-Ladury ئەوکاتە قسەیان لە پێکهێنانی (ئەنترۆپۆلۆژیایەکی مێژوویی) دەکرد. ئەوەی گرنگە لەسەری بڕۆین ئەوەیە کە ئەو کاریگەریەی لەو دەمەدا لەمەڕ ئیتنۆلۆژیاییە فەرەنساییەکان گەورەترین قورسایی هەبوو، لە ئەمریکاوە نەهاتبوو، بەلکو لە بریتانیاوە هاتبوو. لەبەر ئەوە با هەلوێستەیەك لەسەر ئەم خاڵە گرنگە بکەین:

لەوکاتەدا ئەنترۆپۆلۆژیای بریتانی شوێنێکی زاڵی گرتبوو، ئەمەش بەهۆی بەشداریە تایبەتیو ناوازەکانی لە دوو گۆرەپاندا: /شیکردنەوەی رژێمە سیاسیەکان و/ شیکردنەوەی خزمایەتی ئەوە بوو ئێمە ئەو سالانەی دوای بلاوکردنەوەی (رژێمە سیاسیەکانی ئەفریقا)کەی ئیڤانز - پریچارد (1940)و، (رژێمە سیاسیەکانی بورمای

سەروو)ەكەی سیر ئێدمۆند رۆلاند لێچ S.E.R.Leach، پەراوەكەی رۆلان بارت R.Barth دەربارەی (ئەلسوات باتان)ەكەی ماكس گلووكمان M.Gluchman... هتد، لەگۆڕەپانی خزمایەتیشدا پەراوەكانی ئەلفرێد ڕێگینالد رادكلیف- براون A.R.Radcliffe. bROWN و داریل فۆرد d.fORDE و ڕەیمۆند فیرت R.Firth، هەروەها ئێڤانز- پریچاردو مایێرفۆرتێس، دەرچوو بوون، ئەمانەی دواییان نێوانی خزمایەتیو سیاسەتیان پێكەوە دەبەستەوە، بەو پێیە كە ئەمان ڕۆڵی بنچینەیی رووە سیاسی- یاساییەكەی پێكهێنانی بونیادەكانی خزمایەتی، هۆزەكان، ڕەگەزەكان(11)..هتدیان روون دەكردەوە، هەر ئەو كاتانەش لە وڵاتە یەكگرتووەكانەوەو كاریگەریەكانی مۆردۆگ Mordog و گودنێڤ Godnev و لاونسپۆری Lawnspory گەشتە لامان كە پێچەوانە بوون لە ئاراستەدا. بەڵام بریتانیا هەروا ڕۆڵێكی تری گرنگی بینی لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی چەند لێكۆڵینەوەیەكی تاك جەمسەری چڕوپڕو بەرزەوە لە چۆنایەتیو ئاستدا، كە هەریەكەیان كۆمەڵگەیەكی بەدرێژە پێدانەوە شی دەكردەوە بە پێی شێوازی (چەند سەرنج و پشكنینێك)، واتە بە دابەشكردنی كۆمەڵگە، هەموو جارێك، بەپێی دابەشبوونی ئابووریو خزمایەتیو ئاین.. هتد. بەڵام گرنگ ئەوە بوو كە ئەم لێكۆڵینەوە تاك جەمسەرانە ئەو ددانەیان كردبووە پاڵپشت كە لە ماوەیەكی زۆردا كۆكرابوونەوە، كە لە فەرەنسا هەمیشە بەو شێوەیە نەدەبوو. ئەوەندەش بەسە كە چەند مانگە مەیدانییە كەمەكەی لێڤی شتراوس لەناو نامبیكۆرا (12)دا بهێنینەوە یادی خۆمان. بەڵام هەموو ئەنترۆپۆلۆژیایەكانی نەوەكەی من و هەموو شوێنكەوتوانمان، لە شەستەكانەوە، چەند ساڵێكیان لەسەر خۆیان دانابوو كە لە مەیداندا ئیش بكەن.

دوای ئەوە ئەم كاریگەریانەی لە بریتانیاو وڵاتە یەكگرتووەكانەوە هاتبوون گرنگیان بەو شێوەیە نەما، ئەویش هاوكێش لەگەڵ گەشەی دوو تەوژمی زۆر دینامی لە فەرەنسادا، ئەوانیش بونیادگەراییەكەی لێڤیشتراوس و، چەند شێوگ(13)ێكی هەمەجۆرو جیاوازی ماركسیزم، كە هەندێكیان زۆر رەخنە گرانە لە ئاست هەموو بانگهێشتێكی (ماتێریالیزمێكی) ئاسایی(14) هەڵس و كەوتیان دەكرد. بەڵام پێویستە پێش و دوای ڕووداوەكانی مایسی 1968 لە فەرەنسا لە بیرنەكەین كە گرنگیان بەخشی بە سەرلەنوێ خوێندنەوەی ماركس لەلایەن لویس ئاڵتوسێر L.Altusser ەوە، ژمارەیەكیش لە ئەنترۆپۆلۆژیاییەكانی نزیك بە ئەو دەستیان دایە ماتێریالیزمێكی كورتكردنەوەیی(15) كە لە هەوڵدا بوو بۆ دەرهێنانی پەیوەندیەكانی خزمایەتی یاخود چەمكە ئاینیەكانی ژیارێك لەسەر بنەمای ئەو شێوازەی یاخود ئەو شێوازانەی بەرهەمهێنان كە ئاكاری تایبەتی ئەو كۆمەڵگەیەن. ئەم توێژینەوەیەش كە "لەكۆتاییدا" لەدووی تەنها هۆكارێكی دیاریكراوە، دوای ئەوە لە بەردەم لێشاوی رەخنەدا خۆی نەگرت. زیاد لەوەش، رەخنەیەكی ئاواش لە لویس دوومۆن L.Dumont گیرا.

نوسراوەكەی لویس دوومۆن دەربارەی هیندستان جێیەكی رەسەنی لە دیمەنە فەرەنساییەكەدا گرتبوو لەو ماوەیەدا. چونكە ماوەیەكی زۆر بەشێوەیەكی مەیدانی ئیشی كردبوو و، ئینجا زمانی سەنسكریتی دەزانی و، دەیتوانی لە دابونەریتە نوسراوەكانی هیندستان

بکات، بەڵام هەوڵی دابوو کە –بەتایبەتی– دەرکی لۆژیکی سەرلەبەری رژێمی تیرەکان "نظام الطوائف" بکات لە ریزەبەستی مرۆڤایەتیدا. چەمکە گشتیەکەشی لەگەڵ فرمانگەرایی(16)ی بریتانیایدا دژایەتیان هەبوو. ئینجا لەبەر ئەوەش زۆر گرنگی بەریزەبەستی ئەو بەهاو بۆچوونانە دەدا کە لە کۆمەڵگەیەکدا دەبینرێنەوەو کارو فرمانی تێدا رێك دەخەن؛ لە روویەکەوە لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیای ژیاری(17) ە ئەمریکاییدا یەکیان دەگرتەوە. جگە لەمانەش لەکاتێکدا کە لە مارکسیزمدا ئابووری خاڵی سەرەتایە، لویس دوومۆن بەهانەی کۆتایی خۆی لە ئایندا دەبینیەوە.

دوای ئەم پوختە پانۆرامایە زۆر کورتەی ئەنترۆپۆلۆژیای فەرەنسایی لە شەستەکاندا، کاتی ئەوە هاتووە بگەرێینەوە سەر ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی،و ئەو تایبەتمەندیەی بخەینەوە یاد کە تا ئێستاش کار لە ئەنترۆپۆلۆژیایە ئەوروپاییەکان دەکات و، کەمەندکێشیان دەکات، کە –زۆر بەسادەیی– بریتیە لە توانای بەردەوامی لەنوێکردنەوەو هەمەجۆرکردنا، کردنەوەی یەك لەدوای یەك یاخود هاوکاتی وەرشەی نوێدا (ئەنترۆپۆلۆژیای شارەکان، ئیکۆلۆژیا(18) مێژووی رەگەزەکان، رەگەز–زمانێتی(19)، ئەنترۆپۆلۆژیای مەعریفە(20) ئەنترۆپۆلۆژیای پەروەردە.. هتد). بەڵام –پێدەچێت– دیارترین رووداو لەم بیست ساڵەی دواییدا گەشەپێدانی ئەنترۆپۆلۆژیای "دوو رەگەزەکە" بێت، واتە شیکردنەوەی ئەنترۆپۆلۆژیاییانەی پەیوەندیەکانی نێوان پیاو و ئافرەت و، شوێن پێی هەریەکەیان بەو پێیە کە "دوو جۆر"ن، بەشێوازێکی نوێ کە دیدو بۆچوونانی سەبارەت بە لەش و خزمایەتی‌و دەسەڵات.. هتد نوێ کردۆتەوە.

ئینجا لەبەر ئەوەش کە ئەم هەمەجۆریە لەمەیدانەکانداو لە تیمەکانیاندا زۆر جار دامەزراندنی چەند گۆڤارێکی نوێی (وەکو گۆڤاری "ئێتنۆلۆژیایی ئەمریکایی" یاخود نوێکردنەوەی گۆڤارە کۆنەکانی لەگەڵدایە؛ لەئاکامدا ئەم بڵاوکراوانە بوونەتە ئامرازێکی بنەرەتی کە بالادەستییان بۆ ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی بەسەر ئەنترۆپۆلۆژیای فەرەنساییدا دەستەبەر کردووە. کۆمەڵێك هۆکاری تریش هەن کە لە براوتێکی بە رواڵەت پێچەوانەوە سەرچاوە دەگرن کە ئەمیش هەر کاریگەری ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی لێك دەداتەوە. کە بریتیە لەوەی ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی هەرچەند فرانس بواس F,Boas ی بینیبوو رەخنەی لەمۆرگان(21) دەگرت و، هەموو تەرزە بۆچوونێکی سەر بە گەشەسەندنی رەت دەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری ئەو پەیوەندیە دێرینانەی کردبوو کە لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا بەسترابوون لەنێوان ئێتنۆلۆژیاو ئارکیۆلۆژیا(22) و پێش مێژووناسی(23) و بەرایناسی(24)دان ئیتر خوێنەرانی گۆڤارە ئەمریکاییەکان هەردەم دەگەڕان شوێن زانیاری مشتومڕ لەسەر نوێترین ئەو دۆزراوانەی پەیوەندیان بە گەشەسەندنی پێشینەکانی مرۆڤی ژیر(25) و، تیۆریەکانی بنچینەی زمان و، ئارکیۆلۆجیای کردارە هێماییەکان.. هتدەوە هەبوو.

بەڵام لەبەرامبەرەوە لە فەرەنسادا، پەیوەندیەکانی نێوان ئێتنۆلۆژیاو ئەو لقانەی تر دوای ئێمیل دورکایم E.Durkheim پچڕابوون و، ئیتر جارێکی تر نەبەسترابوونەوە، لەبەر ئەمە گۆڤارێکی وەکو "ئەنترۆپۆلۆژیای بازرگانی"

جیهانیدا کۆکراونەتەوە (داگیرکاری خۆرئاوا پرۆسێسێکی ئەوروپایی کۆلۆنیالیزم بوو لەناو ئەمریکاوە دژ بە بەرژەوەندی ئەو نەتەوە هیندیانەی نیشتەجێی دێرینی خاکەکەن(27)، دەی خۆ ئەمڕۆ لەسەر مۆدێلێکی تری ئیمپراتۆریەت وەستاوە، لەسەر باڵکێشانی جیهانی ڕژێمێکی ئابووریو کۆمەڵایەتی کە زادەو دەرهاویشتەی خۆرئاوایە، واتە سەرمایەداری، لەسەر باڵکێشانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەسەر گشت جیهانی ناو زەد بە "لیبراڵ" لەدوێنێداو، بەسەر گشت هەسارەکەدا دوای ڕووخانی ڕژێمەکانی بلۆکی کۆمۆنیزم لەمڕۆدا. هەرچەند ئەم سەرداریو سالاریەش سنووری هەیە، چونکە نە خۆرئاوا و نە وڵاتە یەکگرتووەکان دەسەڵاتی تەواویان بەسەر چین و بەسەر هەندێك لە وڵاتانیئیسلامیشدا، نیە، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەموو جیهان دەزانێت کە ئەمڕۆ چەندین ئەنترۆپۆلۆژیایی ئەمریکایی هەن، لە هەموو شوێنێك، لە چینەوە تا تاجیکستان، لە هیندستانەوە تا بولگاریا.

بەڵام ئەوەی زیاتر مایەی سەرسوڕمانە، ئەوەیە لەکاتێکدا کە وڵاتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەك کە نکوولی لیّ نەکرێت، بووەتە هێزی زاڵ لەناو ئەو ڕژێمە کۆمەڵایەتی-ئابووریە تاقانەیەی کەوا دیارە زاڵ بێت بەسەر جیهاندا، لەکاتێکدا کە وڵاتە یەکگرتووەکان، لەگەڵ ئەوەشدا بۆتە "برای گەورە" و "کۆچانی گەورە" بەسەر هەموو گەلانەوە، گەواهی ئەمەش ئەو ڕۆڵەیە کە وڵاتە یەکگرتووەکان لەجەنگی کەنداودا دەیبینی، ئا لەم کاتەدا ژمارەیەك لە ڕۆشنبیرو ئەنترۆپۆلۆژیاییە ئەمریکاییەکان پەرەیان بە ڕەخنەیەك داوە کە هەتا بنچینەکانی کارو تیۆری ئەنترۆپۆلۆژیایی دەداتە بەرپرسیارو،


پۆل ریکور

گرنگیەکی زۆر پەیدا دەکات بۆ پیشەکە، چونکە وەکو دوانگەیەکی بەردەوام وایە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەنجامی دۆزینەوەکانی بواری ئیتنۆلۆژیاو پالیۆنتۆلۆژیا(26).. هتد و سازدانی مشتومڕ لەسەریان. بەڵام ئەو گۆڤارە لە ڕوویەکی تریشەوە هەر گرنگە، ئەویش بەو پێیە کە تاکە گۆڤارێکە لە پیشەکەی ئێمەی ئەنترۆپۆلۆژیاییدا کە لەجیهانی خۆرئاوادا ناسرابێت و، بەدرێژایی بلۆکی کۆمۆنیزم پەیوەندیو گفتوگۆی نێوان ئیتنۆلۆژیاییەکان و شوێنەوارناسەکان لە وڵاتانی خۆرئاواو ئەوروپای خۆرهەڵات و هەتا چینیشدا، نەپچڕاندبێت.

بەڵام ئەم هەڵسەنگاندنە پۆزەتیڤانەیەی ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی نابێت چەند ڕوویەکی تری تابلۆکەمان لەیاد بباتەوە. چونکە ئەگەر ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمێرکایی لەسەر بنچینەی ئەو دراو و زانیاریانە دامەزرێنرابێت کە لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتێکی کۆلۆنیالیزمی

وەكو ئەنجامی پرۆسێسی لێككردنـەوە "تفكیك" ێكی قورسی بونیادێك و تێڕامـانێكی رەخنەگرانە دەردەكەوێت. زیاد لـەوەش، پرۆسێسێكی لـەم جۆرە، ئێستا زیـاتر لـە هـەموو كـاتێكی تـر، لەبـەردەم رژێمـی نوێـی جیـهانیدا خـۆی دەسەپێنێت.

بەلام ئێمە لە ئاست هەندێك شێوەی ئـەم گەشە نوێیەی ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریكاییدا هەست بە خۆشنوودی تواو ناكەین، چونكە بـە زۆری لای ئێمە ئـەوە دەفامرێتـەوە كـە ئـەم هەوڵـە بـۆ لێككردنەوەی بونیاد دەبێتە هەڵوەشاندنەوەیەكی لقەكەی ئێمە (ئـەنترۆپۆلۆژیا)، كـە ئەمەشـیان پرۆسێسێكە، بە شێوەی ریزپەڕی(28)ەك، لەمەڕ پاڵەوانانی، رێگـە بـۆ گەیشـتنیان بـە شـوێنی دەسـەلات (ی ئاكادیمیـایی)ی ئـەم لقـە (ئەنترۆپۆلۆژیا) ئاسان دەكات. ئەگەر هـاتوو ئـم بزووتنەوەیە هـەموو لایەكیشـی گرتـەوە، ئـەوا سەردەكێشێت بۆ ئاوابوونی ئەنترۆپۆلۆژیاكـەمان، كە وردە وردە و لەداهاتوویەكداو لە تـەوژمی ئـەو سێلاوەی پێی دەوترێت "لێكۆڵینەوە ژیاریەكان" -كـە بنكـەی جـەماوەری فراوانـی لـە ولاتـە یـەكگرتووەكان بـۆ دروسـت بـوو- لێـك هەڵدەوەشێت.

ئەم ئەنجامەش لە داهاتوودا رەخنەیەكی -لە ڕواڵـەتدا- ریشـەیی ژیـاری خۆرئـاوا دەهێنێتـە گۆڕێ، كە بریتیە لە رەخنـە لەسـەر پێشكەوتنی ئـەو ئەنترۆپۆلۆژیایـەی كـە بابەتـەكانی و بـەڵكو چەمكەكانیشـی كۆمپـارتیف كـراون. هـەندێك جـاریش ئـەوەی خۆ لە تەنگەی پیـاو دەدات و سەرسامی دەكات ئەوەیە كە ئـەم پرۆسێسـی لێككردنەوەی بونیاد -هەڵوەشـاندنەوەیە پشتی بەستووە بە شوێن و پلـەی كۆمـەڵێك نووسـەرو، كۆمـەڵێك نووسراو كـە زۆربـەیان لـە فەرەنسـا دەرچـوون و كـاتێكیش ئەتڵەسـی دەبـڕن پێشـنیارەكانیان تێكـەڵ بـەجۆرێك تێكچوونـی تیۆری دەبـن كـە نـاوێكی زلی لیٚ دەنرێت ئـەویش "پۆسـت-مۆدێرنیتـی"(29)ە، كـە فۆرمەلەیەكـە یەكەمجار ئەندازیارێكی تەلارسازی بەكاری هێنـا، پاشان لیۆتـار لـەوی وەرگـرت و كردیە دیدێكـی تیۆری گشتی لـە فەلسـەفەدا. ئەگـەریش كەسێك پۆست- مۆدێرنیست بێـت، لەبـەر دڵـی لیۆتـاردا، دەبێت "گوتـارە تێپەڕێنـەرەكان زۆر بـە راسـت نەزانێت". ئەمەش پێناسەیەكی كورتە لـە "مـەرج لەدوای قسە" (1979)ەكەیدا دەبینرێتەوە.

ئەنتیكەیـە ئـەوەش بڵێـین كـە ئـەم كتێبـە لـە راسـتیدا راپۆرتێكـە كۆنگـرەی زانكۆكـانی حكومەتی هەرێمی كوێبێك Quebec لـە كەنـەدا لەدانەری داوا كردووە، سەبارەت بـە "سروشـتی مەعریفە لە كۆمەڵگە زێدە گەشە سەندووەكاندا".

گوتاری تێپەڕێنەر(30) چیە؟ مۆدێلێكە لە گوتار، كە تیۆریەك پێشانی دەدات كەوا لە قەڵەم دەدات ئەگەر كاتی پێویستی بدرێتێ توانای لێكدانەوەی هەمەلایەنـەی مـەیدانێكی هەیـە كـە خـەریكیـەتی، بەشێوەیەك وا پێشان دەدات دەركی هـەموو ئـەو پرنسـیپ و میكانیزمانـە دەكـات كـە هـەموو رەگـەزەكان دەهێننـە گـۆڕێ. ئەگـەر لـە چـەند هەڵوێستێكی وەكـو هەڵوێستەكەی لیۆتاریشـەوە دەست پێ بكەین، دەگونجا كە ئـەوە لـە بیریـارە "پۆسـت-مۆدێرنیست"ەكان چاوەڕوان بكەین كـە خۆیان سەرقاڵی تیۆریە "زێدە مەزنەكان" بكەن، ئـەو تیۆریانـەی كـە پێشـتر لـە بـواری زانسـتە كۆمەڵایەتیەكاندا پێشنیار كرابوون بۆ لێكدانەوەی یەكبوویی و هەمـەجۆری كۆمەڵگـەو ژیارەكـان و یـەكبوویی و هەمـەجۆری سـەرەنجامەكانیان (پـەیدابوون- گـۆڕان- لـەناوچوون-). بەڵگـە نەویسـتیش بـوو كـە لـە ریزەكـانی پێشـەوەی

مەبەستەکاندا لێڤی- شتراوس و بونیادگەرایی‌و مارکس و مارکسیزم و، لەسەر سنوورەکانی زانستە کۆمەلایەتیەکان، سۆسیۆ-بایۆلۆژیادا، دەریکەون- ئەگەر چەند نموونەیەکی کەممان بەس بێت. بەلام بە گەرانەوە بۆ لای لیۆتار ئەوەش روون دەبێتەوە کە بابەتی رەوایی گوتارە تێپەرینەرەکان، سیاسی بن یاخود زانستی یاخود ئیستاتیکایی.. هتد، لە فەرەنساش لە کۆتایی حەفتاکاندا بەرووني پێشنیار کرابوون، زۆر پێش ئەوەی لە ولاتە یەککرتووەکان و بریتانیا پێشنیار بکرێن.

بۆ ئەوەش سەرسامی خۆمان لە ئاستی ئەم تێکەلە هەلبژێراوانەدا روون بکەینەوە، لەسەر بارودۆخی پەیوەندیەکانی نێوان فۆکۆو دێریدا دەدوێم، ئەم دوو نووسەرە لە فەرەنسادا بەردەوام رووبەرووی یەك بوونەتەوە. فۆکۆ لە دیدێکی -بابلێین- مێژوویییەوە بۆ رووداوە کۆمەلایەتیەکان دەچوو، هەولی دەدا بزانێت دەسەلاتی بۆرژوازی فەرەنسایی چۆن دامەزراوەکانی بەندکردنی شێت و نەخۆش و تاوانبار.. هتدی داهێنابوو و، کاتی خۆی لە ئەرشیفی ئەم دامەزراوانەدا بەسەر دەبرد. لەسەر ئاستێکی تیۆریش بە ئاسانی ئەوەی سەلماندو دووپات کردەوە کە پەیوەندیەکانی دەسەلات بوارە سیاسیەکەو پەیوەندیە چینایەتیەکان تێدەپەرێنن، هەروەها هەریەکەش لە پزیشك و سستەرو مامۆستاو پیاوی ئاینی.. هتد دەسەلاتێکیان هەیەو پیادەشی دەکەن.

فۆکۆ لە ژیانیدا نەشی دەویست دیدێکی میتافیزیاییانە لەم رووداوانە پێك بهێنێت و ئەوە بکات بە رەخنە لەسەر دێریدا. ئەم رەخنانە هەرچۆنێکیش بن، هیچ کەس نیە لە فەرەنسادا نکوولی لەوە بکات کە دێریدا خاوەنی بەرهەم و نووسراوی گرنگە، بەلام من، وەکو ئەنترۆپۆلۆژیاییەك، نامەوێت لەگەلیدا بم لە پرۆسێسی لێککردنەوەی بونیادی چەمکی بەخشش و بەخششی پێچەوانە(31)و، هەروەها لێککردنەوەی بونیادی نوسراوەکەی مارسێل مۆس M.Mauss یش، کەوای لیٚ کردووە بنووسێت کە "دەتوانین تا ئەو رادەیە بروێین بلێین کە پەراوێك لە گرنگی "توێژینەوە لە بەخشش"(32)ەکەی مارسێل مۆسدا لەهەموو شتێك دەدوێت، بەخششی نەبێت"(لا39)، هەروەها بلێت کە دەگەرێتەوە بۆ سەر ئەو پرسیارە کە مۆس، بە سەرجەمی، لە دواییدا، لەچی دەدوا؟ (لە: ج. دێریدا: "کات پێدان"دا).

ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان لە فەرەنسادا بە گشتی دەزانن جیاوازی لەنێوان دێریداو جاك لاکان J.Lacan و پۆل ریکۆر P.Ricoeur و هایدگەر Heidegger دا بکەن و، کاتێکیش ئەمانە بۆ مەبەستی خۆیان هەول بدەن فۆکۆ یاخود دێریداو پێیار بۆردیوو P.Bourdieu و لیۆتار بەکاردەهێنن. با لێرەداو بە سەرپێیەکیشەوە بلێین کە بۆردیوو لە فەرەنسادا وەکو دوا مارکسیەکی فەرەنسایی بۆی ناروانریٚ، وەکو لە دەرەوەی فەرەنساو، بەتایبەتیش لە ئەلمانیا، وایە. گەرانەوەش بۆ لای هەموو ئەو نووسەرانە هیچ پلەو پایەیەکی تایبەتی نادات (یاخود ئیتر لەمەودوا نادات) بە خێراکردنی رەورەوەی بەرەو پێشچوونی ئەکادیمیایی لەمرۆی فەرەنسادا. هەلوێستی ئەنترۆپۆلۆژیاییە فەرەنساییەکانیش، بە گشتی، هەلوێستی پراگماتیزمێکی ژیرانەو رەخنەگرانەیە کە نابێت بەهەلبژێری(33) دابنرێت.

پێویستە ئەوەش لە پراگماتیزمی ژیرانەوە، رەخنەگرانە تێبگەین کە هەریەکە لە کاری خۆیدا

ئەوە بەکاردەهێنێت کە ئەوە بەڕێوە دەبات لە هەمەجۆر بۆچوونی تیۆریدا لەبەر رەخنەدا خۆی دەگرێت و، لێهاتوویی خۆی لە شیکردنەوەدا دەسەلمێنێت.

بابەتی هەموو هەوڵدان یاخود هەڵنانێك بۆ پێشنیارکردن و بنیاتنانی چەند لێکدانەوەیەکی گشتی بۆ هەمەجۆریو بۆ مێژووی کۆمەڵگەکان و، روونکردنەوەی مۆرکی کەم تا زۆر خەیاڵی ئەو لێکدانەوە گشتیانەی کە پێشتر پێشنیار کراون، لە رواڵەتدا خاڵە بەهێزەکەی پێشنیارە پۆست-مۆدێرنیزمیەکان پێك دەهێنێت. بەڵام ئەم خاڵە نوێ نیە.

ئەمە هەر شێوەیەکی تری هێنانەوە ئارای بابەتێکە کە ناکرێت دوورەپەرێزی لێ بکرێت، لە بارودۆخێکی نێودەوڵەتی نوێدا، واتە بابەتی گرنگیو پێویستی پیشاندانی بەڵگە لەسەر رەوایی هەموو گوتارێکی، زانستی- بێ گومان و، هەروەها سیاسییو رەوشتیو ئیستاتیکایی.. هتد کە خۆرئاواییەکان رووبەرووی خەڵك و هەروەها خۆشیانی دەکەنەوە. زیاد لەوەش، بابەتەکە بۆ هەموو ژیارەکان: ژیاری چینی، رووسیایی، ژاپۆنی.. هتد پێشنیار دەکرێت، نەك هەر تەنها ژیاری خۆرئاوایی.

بەم شێوەیەش تێدەگەین بۆچی پێویست بوو کە پێشنیارە پۆست-مۆدێرنیزمیەکان دەنگدانەوەی خێرایان لەمەڕ ئەنترۆپۆلۆژیاییە ئەمریکاییەکان ببێت و، سەبارەت بە رەوایی تیۆریو رۆمانە ئێتنۆلۆژیاییەکان بکەونە تێڕامانەوە، هەندێکیشیان: جۆرج مارکۆس G.Marcos و مایکڵ فیشەر M.Fisher و جێمس کلیفۆرد J.Clifford و پۆڵ رابیناو P.Rabinow- ئەگەر ئەم ژمارەیەمان بەس بێت، هەستاون بە لێککردنەوەیەکی رێك و پێکی بونیادی چەند نووسینێکی تیۆریو رۆمانێك کە پێشتر چەند کەسێکی بەناوبانگ، یاخود هەر خۆیان، دایاننناون بۆ باسکردن و شیکردنەوەی ئاکارە ڕەسەنەکانی چەند ژیارێکی هەمەجۆرو چەند میکانیزمێکی کار لە هەمەجۆر کۆمەڵگەدا کە -بەگشتی- خۆرئاوایی نین. ئێتنۆلۆژیاییەکانیش، وەکوو ئەریتی خۆیان، توانا دەخەنە کار بۆ تێگەیشتنی ئەو میکانیزمانە لەسەر بنچینەیەکی دوو لایەنەی کۆمەڵێك دراو و زانیاری کە خۆیان لە ماوەی چەند نیشتەجێ بوونێکی کەم تا زۆر خایەن لە مەیدانەکەدا کۆیان کردووەتەوەو، ئەو لێکدانەوانەی کە لەسەریان بنیاتیان دەنێن. بەیارمەتی سیستەمێك لە گوتە شیکارییەکان(34)و ئەو گریمانانەی کە لەلایەن چەند نووسەرێکەوە کە قوتابخانەیەکیان پێك دەهێناو سەر بە خۆرئاوا بوون، پێگەیەنراون.

کەواتە هەریەکەیان بە گەرمی خەریکی سەرلەنوێ خوێندنەوەی تێکستەکانی خۆی یاخود تێکستی هاوڕێکانی بووە، بە مەبەستی روونکردنەوەی ئەو بنەمایانەی کە لە بنیاتنانیاندا بەکارهێنراون و، دۆزینەوەی ئەو پێشینە چەمکە تایبەتیانەی تێیاندا حەشار دراون، بێ ئەوەی لە لایەن نووسەرەکانیشیانەوە سەرنج درابێت و، کاریگەریان لە هەڵبژاردن و لێکدانەوەو نووسینی رووداوەکاندا هەبووە. تەنها نووسراویش نیە کە لە بێژنگ درابێت، بەڵکو جۆرەکانی بێدەنگ بوون و لە یادچوونیش. بۆ نموونەش لەسەر ئەمە، کاتێك جێمس کلیفۆرد دەستی دایە سەرلەنوێ خوێندنەوەی یەکێك لە دانراوە ئێتنۆگرافی(35)ە هەرە دەوڵەمەندەکان لە رووی سەرنجی رووداو و، لەڕووی هەڵسەنگاندنەوە "خوایەتیو ئەزموون: ئاینی دینکا"ی گۆدفری لینارد G.Lynard (1961)؛ بە ئاسانیو بە ماوەیەکی کەم ئەوەی

دەرك كرد كە لینارد كە لە كۆمەڵگەو كرداروو رەفتاری دینكا(36) دەدوێت، تەنها گوێی بۆ پیاوانی دینكا گرتبوو، یەك ئاماژە نەبێت سەبارەت بە شێوەی پەیوەندیەكانی نێوان پیاوان و مەڕو ماڵات لە دیدگای ئافرەتەوە. بە كورتیش هاووێنەی ئەم پرۆسێسانەی لێككردنەوەی بونیاد ئەنجامێكی پۆزەتیڤی هەیە كە بریتیە لە دەرخستنی خێرای مۆركی هەندەكیو تەسكی زۆرێك لە "راستی"ە ئێتنۆلۆژیەكان، كە شتێكی نوێیە.

كەواتە لێككردنەوەی بونیاد -لێرەدا- كارێكی سروشتیە، چونكە دۆزینەوەی تەسككردنەوە جۆراو جۆرەكان لە شیكردنەوەداو لە بێدەنگبوون لە هەڵسەنگاندنێكداو لە یادچوون لەسەرنجدانێكدا، ساتێكی پێویست و بنچینەیی پێك دەهێنێت لە هەموو چالاكیەكی مەعریفەبیدا، ساتی رەخنە لەخۆگرتن لە هەنگاو و لەئەنجامی هەنگاو نەرانیشدا. دەشتوانین بڵێین ئەوە هەموو كاتێك وا بووە، بەڵام زیاد لەوە لە هەموو ساتێكیشدا دابڕینێكی سۆسیۆلۆژیایی‌و مێژوویی هەبووە ئایا كارڵ ماركس K.Marx كە تاقانەش نیە لەمەدا- رەخنە ناگرێت لە مێژوونووسانی كاتی خۆی لەسەر كورتكردنەوەی مێژووی كۆمەڵگەكان لە مێژووی مرۆڤە مەزنەكان یاخود لە باسكردنی رووداوە سیاسیەكان یاخود سەربازیە هەرە مەزنەكاندا، یاخود لەسەر دوورخستنەوەی ئامادەیی‌و دەنگی ملیۆنان بكەری بێئاگاكراو لە شانۆی واقیع، لەبەر ئەم هۆیە، كە دەكرێنە "جەماوەرێكی چەوساوە"ی نەبینرو یاخود كەم تا زۆر بێدەنگ؟ هەروەها رەخنەی ئەوەشی لێ دەگرتن كە لە یادیان دەچووەوە تا رادەیەك لە نزیكەوە مەرجەكانی ژیانی ئەو بكەرە بێئاگاكراوانە شی‌بكەنەوە كە كارو هەوڵیان بنچینەی سامان و هێزی ئەوانەی پێك دەهێنا كە پێشەكی شانۆو ناونیشانی پەڕاوەكانیان بۆ خۆیان قۆرخ دەكرد. رەخنەكەشی بۆ ئێستاش لەجێی خۆیدایە. چونكە ئێمە، زیاد لەوە، لەنیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا، بینیمان كە بەشێك لەم جەماوەرە بێئاگاكراوە، كە ئافرەتانن، چۆن دەنگو رەنگی خۆیان لە باس و خواس و شیكردنەوەی ئەنترۆپۆلۆژیاییان و مێژوونووساندا گەڕاندەوە، ئەویش بەزۆر پاڵەپەستۆ و زۆرانی لایەنگرانی ئافرەت.

كەواتە ئەو پرسیارەی پێویستە لە خۆمانی بكەین رۆشنەو، دوو لانەشە. ئایا، لەگەڵ ئەو دوورخەریانەی كە ئێتنۆلۆژیایی، بەئاگایی‌و بێ ئاگایی، بەرامبەر ئەو رووداو و كەسانەی كە توانیویەتی سەرنجیان بداتێ، كردوونی، هەروەها لەگەڵ ئەو شێواندنانەی كە بەهۆی چەمكە پێشینە تایبەتیەكانیەوە، لە گوتارو بونیادەكانیدا، ناچاریان بووە، ئایا، لەگەڵ ئەمانەدا، دەشێت كارەكەی چەند رەگەزێكی نائایدیۆلۆژیایی‌و چەند چەمكێكی مەعریفەیی "بابەتیانە" ی هێنابێتە گۆڕێ كە بۆمان هەبێت بڵێین ئەمانە كارێكی "زانستی"ن، نەوەك گوتارێكی ئاینی یاخود سیاسین، یاخود -زۆر بەسادەیی- بەسەرهاتی گەشتێكن، چەشنێكی "ئەدەبی"ن كە هیچ خولیایەكی زانستی نەبێت؟ ئایا ناشێت، هەروەها هەرگیز ناشكرێت بەها تایبەتیەكانی خۆی، هەرەمەیی، بەسەر خەڵكدا ساخ كاتەوە، ئایا ناشێت، لەكۆتاییدا، جیاوازیەكی بنەڕەتی نەبێت لەنێوان ئەو گوتارەی ئەو و هەموو گوتارەكانی تردا، گوتاری سیاسی، ئاینی.. هتد كە بەرامبەری هەمان ئەو رووداوانە دەبنەوە؟ ئایا هەموو چیرۆك و گێڕانەوەكان

بەپێوانەی پێوەری راستی رەها یەکسان دەبن؟ لەباری یەکەمدا، مافی ئەوەمان هەیە بەهیوا بین کارێکی ئێتنۆلۆژیایی بەئاگایانەتر، کە ملکەچی رەخنەیەکی خۆیەکی بێت کە هەوڵبدات هەر رەگەزێك بزانێت لەو کارە دوور خراوەتەوە بیگرێتەوە بۆ بواری شیکردنەوەکەی، بە هیوابین ئەو کارە بەو شێوەیە کەمتر ئایدیۆلۆژیاییو خۆیەکیو، زیاتر بابەتیو، کەمێکیش زانستی، بێت.

لەباری دووەمیشدا، بە ناچاری، ئەنترۆپۆلۆژیا دەبێتە رەخنەیەکی ریشەیی لەهەموو مەعریفەیەکی "زانستی" ی کەسانی ترو لە شێوازی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیان، هەروەها ئەوەش دەردەخات کە ئەگەر بکرایە وردە- وردە تێگەشتن و دەرکی دیاردە سروشتیەکان رێك و پێك بکرایە، ئەو ساتە ژیار لەلایەن ئەوەوە ژێرباری ئەوە دەخرێت کە وەکو دۆخ و بارێك بمێنێتەوە کە مەتەڵ و نهێنیەکانی، لە ریشەوە، لێککردنەوە هەڵنەگرن. ئەوەش کە لە داهاتوودا ئەنترۆپۆلۆژیا، بە شێوەیەکی گەش و کراوە، دەیسەلمێنێت، تەنها جیاوازی ریشەیی نێوان ژیارەکانی مرۆڤ نابێت، بەڵکو خۆیەتی ریشەیش(38) دەبێت بۆ هەموو ئەو لێکدانەوانەی کە دەکرێت بکرێت بۆ ئەو ژیارانە. لەناو ئەم دۆخە گەشەکردووەدا، پرۆسێسی لێککردنەوەی بونیادی رشتە بەندکراوی کارو بەرهەمی ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان، بێ هیچ گومانێك، سەردەکێشێت بۆ شیبوونەوەی ئەنترۆپۆلۆژیا. لە باشترین بارو دۆخیشدا، لە داهاتوودا ئەنترۆپۆلۆژیا دەچێتە ژێر باری ئەنجامێك، کە ئەویش توانەوەیەتی لە تەوژمی سێلاوی "لێکۆڵینەوە ژیاریەکان" لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا کە لەوێ بنکەیەکی جەماوەری فراوانی پەیدا کردووە، یاخود ئەوەیە ببێتە چەشنێکی ئەدەبی بچکۆلە لەجۆری بەسەرهاتی گەشت و گەران.

بەلام دەبێت هەرگیز ئەوەمان لەیاد نەچێت کە زۆر تەوژم لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی پۆست- مۆدێرنیزمیدا پێکەوە دەژین. دوانیشیان من وا ئەبینم، لە روویەکی ترەوە، بێدەنگیو پێکەوە گونجانیان لەنێواندا نەبێت یەکەمیشیان بەناوی جۆرج مارکۆسەوە پەیوەست دەبێت، دووەمیشیان بەناوی کلیفۆرە گیرتز C.Geertz وە. بەلام وا دیارە رای گشتی لەلای خۆیەوە ئەو چەمکە گشتیەی لەم مشتومرانە گەلاڵە کردووە کە ناگونجێت "زانست"ێك بێت سەبارەت بە مرۆڤ- واتە کۆمەڵێك تێبینی کە بەشێوەیەکی میتۆدی بەرێوە بچن و، کۆمەڵێك شیکارو ئەنجام کە بەئاسایی ملکەچی پابەندبوون بە پرینسیپی هەوڵدان بۆ یەکتربرینی نێوان رووداوەکان و هەروەها بە تاقیکردنەوەی گریمانەکانەوە بن. هەڵوێستەکەی ئێمەش پێچەوانەی ئەوەیە چونکە ئێمە ئەم دووپاتکردنەوەیەی نەتوانایی زانستە کۆمەلایەتیەکان لە بواری تێگەیشتنی کاری واقیعی کۆمەڵگاکاندا، ئەم دووپاتکردنەوەیەی کە بە زۆری بە شێوازی لە خۆدان (الجلد الذاتي) خۆی دەنوێنێت، ئێمە وانابینین بنچینەیەکی هەبێت.

لە واقیعی فەرەنساشدا، شیکردنەوەی بونیادگەرانە بۆ ئەفسانەکان و زاراوەکانی خزمایەتی بەبێ هیچ شەرمێك و بێ ئەوەی ئەو کەسە بونیادگەرا بێت، بەردەوامە. زیاد لەوە هەموو کەسێکیش دەزانێت کە پەیوەندیە خزمایەتیەکان کورت ناکرێنەوە لە کۆمەڵێك زاراوەی شێوەکیو رێسای رووتەوە، بەڵکو وەکو هەموو پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان، لە لەشدا، هەن، ئەو توانایەش کە ئەمرۆ بەخت دەکرێت،

بەپێوانەی پێوەری راستی رەها یەکسان دەبن؟ لەباری یەکەمدا، مافی ئەوەمان هەیە بەهیوا بین کارێکی ئێتنۆلۆژیایی بەئاگایانەتر، کە ملکەچی رەخنەیەکی خۆیەکی بێت کە هەولبدات هەر رەگەزێك بزانێت لەو کارە دوور خراوەتەوە بیگرێتەوە بۆ بواری شیکردنەوەکەی، بە هیوابین ئەو کارە بەو شێوەیە کەمتر ئایدیۆلۆژیایی و خۆیەکی و، زیاتر بابەتی و، کەمێکیش زانستی، بێت.

لەباری دووەمیشدا، بە ناچاری، ئەنترۆپۆلۆژیا دەبێتە رەخنەیەکی ریشەیی لەهەموو مەعریفەیەکی "زانستی" ی کەسانی ترو لە شێوازی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیان، هەروەها ئەوەش دەردەخات کە ئەگەر بکرایە وردە- وردە تێگەشتن و دەرکی دیاردە سروشتیەکان رێك و پێك بکرایە، ئەو ساتە ژیار لەلایەن ئەوەوە ژێرباری ئەوە دەخرێت کە وەکو دۆخ و بارێك بمێنێتەوە کە مەتەڵ و نهێنیەکانی، لە ریشەوە، لێککردنەوە هەڵنەگرن. ئەوەش کە لە داهاتوودا ئەنترۆپۆلۆژیا، بە شێوەیەکی گەش و کراوە، دەیسەلمێنێت، تەنها جیاوازی ریشەیی نێوان ژیارەکانی مرۆڤ نابێت، بەڵکو خۆیەتی ریشەیش(38) دەبێت بۆ هەموو ئەو لێکدانەوانەی کە دەکرێت بکرێت بۆ ئەو ژیارانە. لەناو ئەم دۆخە گەشەکردووەدا، پرۆسێسی لێککردنەوەی بونیادی رشتە بەندکراوی کارو بەرهەمی ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان، بێ هیچ گومانێك، سەردەکێشێت بۆ شیبوونەوەی ئەنترۆپۆلۆژیا. لە باشترین بارو دۆخیشدا، لە داهاتوودا ئەنترۆپۆلۆژیا دەچێتە ژێر باری ئەنجامێك، کە ئەویش توانەوەیەتی لە تەوژمی سێلاوی "لێکۆڵینەوە ژیاریەکان" لە ولاتە یەکگرتووەکاندا کە لەوێ بنکەیەکی جەماوەری فراوانی پەیدا کردووە، یاخود ئەوەیە ببێتە چەشنێکی ئەدەبی بچکۆلە لەجۆری بەسەرهاتی گەشت و گەران.

بەلام دەبێت هەرگیز ئەوەمان لەیاد نەچێت کە زۆر تەوژم لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی پۆست- مۆدێرنیزمیدا پێکەوە دەژین. دوانیشیان من وا ئەبینم، لە روویەکی ترەوە، بێدەنگی و پێکەوە گونجانیان لەنێواندا نەبێت یەکەمیشیان بەناوی جۆرج مارکۆسەوە پەیوەست دەبێت، دووەمیشیان بەناوی کلیفۆرە گیرتز C.Geertz وە. بەلام وا دیارە رای گشتی لەلای خۆیەوە ئەو چەمکە گشتیەی لەم مشتومرانە گەلاڵە کردووە کە ناگونجێت "زانست"ێك بێت سەبارەت بە مرۆڤ- واتە کۆمەڵێك تێبینی کە بەشێوەیەکی میتۆدی بەرێوە بچن و، کۆمەڵێك شیکارو ئەنجام کە بەئاسایی ملکەچی پابەندبوون بە پرینسیپی هەوڵدان بۆ یەکتربرینی نێوان رووداوەکان و هەروەها بە تاقیکردنەوەی گریمانەکانەوە بن. هەڵوێستەکەی ئێمەش پێچەوانەی ئەوەیە چونکە ئێمە ئەم دووپاتکردنەوەیەی نەتوانایی زانستە کۆمەلایەتیەکان لە بواری تێگەیشتنی کاری واقیعی کۆمەڵگاکاندا، ئەم دووپاتکردنەوەیەی کە بە زۆری بە شێوازی لە خۆدان (الجلد الذاتي) خۆی دەنوێنێت، ئێمە وانابینین بنچینەیەکی هەبێت.

لە واقیعی فەرەنساشدا، شیکردنەوەی بونیادگەرانە بۆ ئەفسانەکان و زاراوەکانی خزمایەتی بەبێ هیچ شەرمێك و بێ ئەوەی ئەو کەسە بونیادگەرا بێت، بەردەوامە. زیاد لەوە هەموو کەسێکیش دەزانێت کە پەیوەندیە خزمایەتیەکان کورت ناکرێنەوە لە کۆمەڵێك زاراوەی شێوەکی و رێسای رووتەوە، بەڵکو وەکو هەموو پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان، لە لەشدا، هەن، ئەو توانایەش کە ئەمرۆ بەخت دەکرێت،

پەیوەندیە نایەکسانیانە لە شێوەدا نەگۆڕن و نەیاندەنە پاڵ سەرچاوەی بەدەر لە مرۆڤ، خواوەندەکان، یاسای سروشت.. هتد؟

—ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت ئەم جۆرە نایەکسانیانە لە ڕووی بەدەستەوەبوونی هەلومەرجی خەیاڵییەوە بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگەو جیهان، پێ دەچێت، پێش پەیدابوونی شێوە نایەکسانەکانی خاوەنێتی هەلومەرجی ماددی ژین کەوتبێت، واتە زەوی‌و زار، هێزی کاری تاکەکان، بەرهەمی کاریان... هتد.

—ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت چالاکیە مرۆییەکان و هەموو ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانەی ئەو چالاکیانە دەکەنە کاڵاو ناوەڕۆکی خۆیان خودی ئەو کێشەیان نیە لە بەرێچوونی بەرهەمهێنانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و سەرلەنوێ دارشتنەوەی بەرهەمهێنانی شێوەیەك لە شێوەکانی کۆمەڵگە.

—ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت ڕژێمە کۆمەڵایەتیەکان ماوەیەکی سنوورداریان لە ژیان هەیەو، گواستنەوەش لە ڕژێمێکەوە بۆ ڕژێمێکی تر تەنها پشت بە مەبەست و نیازی تاك و کۆمەڵەکان و، پەیوەندیە هێزەکیەکانی نێوان دژانی‌و لایەنگرانی، نابەستێت.

—لە دواییشدا، ئەو بۆچوونە مەزنەی کە لە مارکسەوەو هەر لە نووسینە سەرەتاییەکانیەوە هاتووەو، دەڵێت مرۆڤ تەنها ئەوەندە نیە وەکو گیاندارە کۆمەڵایەتیەکان، بژی لە کۆمەڵگایەکدا، بەڵکو کۆمەڵگەیەك بەرهەم دەهێنێت بۆ ئەوەی تێیدا بژی. کە ئەمەش دیدێکە کە مرۆڤی، بە شێوەیەکی بنەڕەتی، بە بەرهەمهێنی ژیارێك دادەنا، جگە لەوەش لەسەر ئەوە سوور بوو کە مرۆڤ ئەگەر بەرهەمهێنی ژیارێك بێت، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤ توانای بەرپاکردنی گۆڕانکاری هەیە لەو سروشتەی دەوروبەریدا کە هەلومەرجی ژیانی خۆی لێ گەڵاڵە دەکات و، هەروەها لە سروشتی تایبەتی خۆشیدا بە خستنەگەڕی ئەو تواناییانەی کە لەسەرەتاوە بە شاراوەیی هەن و، ئەو تواناییانەش کە دەیخاتە سەر خاڵی سەرەتای بونیادێکی تەواویان لێ پێك دەهێنێت.

بەڵام هیچ یەکێك لەم بیروبۆچوونانە ڕێگە بەوە نادات کە نکوولی لەوە بکرێت کە مارکسیزم، وەکوتیۆریەکی تێپەڕێنەر، هەرەسی هێناوەو شانۆکەی پێ بەجێهێڵراوە، بەڵگەنەویستیشە کە چەمکی جیاکاری لە نێوان بونیادی سەرینەو بونیادی ژێرینە(39) سەرکەوتوو نەبوو، هەر پێش ئەوەی زۆر بمێنێتەوە ناڕەحەتی زۆری دروست کرد. چونکە لە کۆمەڵگەدا سەرو ژێر نیە. بێهودەییشە وابزانیت کە ڕژێمێکی خزمایەتی بونیادێکی سەرینە پێك دەهێنێت لەسەر بنکەی شێوازێکی بەرهەمهێنان بوەستێت و بەرامبەری ببێتەوە. ئەمڕۆ بەڵگەنەویستیشە، هەرچەند پێشتر هەوڵی هەندێك لە ئەنترۆپۆلۆژیاییە مارکسیەکان لەئارادا بوو، کە ناکرێت لە شێوازێکی بەرهەمهێنان ئەو ڕژێمەی خزمایەتی دەربهێنرێت کە لەهەمان کۆمەڵگەدا لەگەڵیدا هەڵ دەکات.

ئەشزانین کە ڕژێمێکی ئاینی، لە ئاسمانی بیروبۆچوونەکاندا، گوێزەرەوەی ڕاستەوخۆی ڕووداوی هێزە ئابووریەکان بە بەهێزترین سەرچاوەی سەرهەڵدان یاخود نەمانی کۆمەڵگەکان، بەلای کەمەوەو ئەگەر نەکرێتە تاکە سەرچاوە، دابنرێت. هەرەسهێنانی هاوکاتی ئابووری سەنتەری‌و ڕژێمی سیاسی وڵاتانی ناوزەد بە "سۆسیالیست" یش گەواهیەکی بەرچاوە لەسەر ئەم گریمانە تیۆریەی کە گریمانەکەی مارکس فراوان دەکات و گۆڕانکاری تێدا دەکات.


هایدیگەر

زیاد لەمەش، لە مارکسیزمی دوێنێدا جێگەی بیرکردنەوە نەدەبووەوە لە شێوەی تری سەرکوتکردن و باڵادەستی جگە لە سەرکوتکاری چینایەتی‌و تیرەگەری، بەتایبەتی نێوان دوو رەگەزەکە. ئەم کەلەبەرە بوو کە ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمریکایی لێوە هاتە ناوەوە لەو کاتەدا کە داواکاری ئافرەتان و پێشنیارو بانگەشەکانیان لەوڵاتە یەکگرتووەکان و پاشانیش کۆمەڵگای ئەورووپاییدا، لە فراون بووندا بوو. دەبێت بزانین کە ئەمریکا لەم خاڵەدا لە پێش ئەورووپاوە بوو و، کارگەریشی نەبڕاوە(40).

بەش بەحاڵی بونیادگەراییش، سنوورەکانی بەخێراییەکی باش لە فەرەنسا دەرکەوتن. ئەوە بوو لێڤی-شتراوس هیچ ئاوڕێکی لەو مێژووە نەبوو کە لەمەیدانی ڕێکەوت و رووداودا کورت کرابووەوە، هەروەها تاک و کۆمەڵەکانی، وەکو چەند خودێکی کاراو بەتوانا، لە رۆڵبینینی سەرەنجامی خۆیان بێبەش دەکرد. ئەمە هەمووی رەخنە ئاوێزانەکانی بونیادگەرایی بەهێز دەکرد، لوتکەی ئەم نەمان و ئاوابوونەی خود لەم نموونە بەناوبانگەدا لە "کاڵ و کوڵاو" (1964)(41)ەکەیدا دەبینینەوە، کە دەڵێت:

"ئێمە ناڵێین چۆنیەتی بیرکردنەوەی مرۆڤ لە ئەفسانەکان روون دەکەینەوە، بەڵکو چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەفسانەکان لەخۆیان و، لە مرۆڤەکانیش، بەنهێنی‌و بە بێ ئاگاداری ئەمان، رەنگە گونجاو بێت، بەچاوپۆشین لە هەموو خودێك، لەوەش زیاتر بڕۆین و، بەهەر شێوەیەك بێت، وا دابنێین ئەفسانەکان لەناو خۆیاندا بیر دەکەنەوە، (ل20).

ئێمە ئێستە لە کوێین؟ هەموو ئەنترۆپۆلۆژیاییەك، بێگومان، هەمیشە، خۆی رووبەڕووی هەردوو لای کارەکەی دەبینێتەوە، /لەلایەکیەوە، رووبەڕووی سەرنجدانی کارو کرداری تاك و کۆمەڵەو کرێکاری دامەزراوەکان و، گوێگرتن لە گوتاری ئەوانەی ژیان و کاری هاوبەشی لەگەڵیاندا هەڵبژاردووە، واتە، بەکورتی، کەڵەکە کردنی ئەو زانیاری‌و دراوانەی لە بەرامبەریەوە دەردەچن./ لەلاکەی تریشیەوە، لە هەوڵی لێکدانەوەی ئەو زانیاری‌و دراوانەدا کە زیاد لەم هەوڵەی ئەنترۆپۆلۆژیاییەکە، دەبڕێنەوە سەر ئەو لێکدانەوانەی کە لەمەڕ بکەرەکان خۆیان بۆیان دەکرا. ئەمەش لایەنی بوون و رۆڵی ئەنترۆپۆلۆژیاییە.

بەڵام شتەکان بەم شێوەیە ساکارنین. چونکە هەموو یەکێك دەزانێت کە ئەم "دراو" انە شوێنەوارو ئەنجامی پرۆسێسێکی بنچینەیی لەخۆ دەگرن لە پێکهێنانی کۆمەڵگەکان و داڕشتنەوەی بەرهەمهێنانیاندا، پرۆسێسی چەندین سەرکوتکردن و بێدەنگکردن و گواستنەوەو چاوبەستی بەسەر شێوەکانی کردارو رەفتاری

کۆمەڵایەتیدا کە ئەو دراوانەی کۆدەکرێنەوە فرە واتا دەکات، واتای -بەڕواڵەت- ڕۆشن لەمەڕ ئەو بکەرانە خۆیان کە دەتوانن کردارەکانیان بۆ خەڵك لێك بدەنەوە، واتای -تارادەیەك- شاراوەش کە ناتوانن لێکیان بدەنەوە، یاخود لێککردنەوەی مەتەڵ و نهێنیەکانیان، بەڵکو داننان بەبوونیشیاندا، قورس و گرانە. جا بۆ ئەوەی بە نموونەیەك مەبەستەکە روون بکەینەوە، دەبینین سێکس بوارێکی ژیانی تاکە کەسیو کۆمەڵایەتی پێك دەهێنێت کە ناتوانێت، لەهەموو روویەکەوە، لەگەڵ هەستی تاکەکەسی یاخود کۆمەڵیدا هەڵ بکات. بەڵام وەکو س. فرۆید S.Freud روونی کردەوە، ئەوەی سەرکوتکراو و بەژێرەوە کراوە هەرگیز لەناو ناچێت، بەڵکو بوون و کاریگەری خۆی درێژە پێدەدات و بە چەندین شێوەی دەمامکدار خۆی دەنوێنێت.

ئەمە سەبارەت بە رەگەزەکانی بالکێشان و سەرکوتکاری لەناواخنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیشدا هەر وایە. پێویستیش ناکات بچین بۆ گینیای نوێ بۆ بینینی نەریتی رەچەڵەکدانان(42). بۆ منداڵان و، چۆن پیاوان، لەرێی رێو رەسم و ئەفسانەکانەوە، نکوولی دەکەن لە مافی ئافرەتان لە خاوەنێتی زەویو زارو چەك و توندوتیژی و شتە پیرۆزەکانداو، لە دواییشدا لە سەرپەرشتیاریو دەستگرتندا بەسەر سەرەنجامی منداڵەکانیاندا، بۆ ئەوەی دەرکی ئەوە بکەین کە خودی ئەم پرۆسێسانەی شاردنەوەو نامۆکردن لە پەیوەندیە نایەکسانەکاندا، لەم کۆمەڵگە "نامۆ"یانەداو لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکانیشدا هەیە.

حەزیش دەکەم لە کۆتاییدا، سەرنجی زیاتر بۆ ئەوە راکێشم کە ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان لە زۆربەی وڵاتانی خۆرئاوادا زانیاریان دەربارەی خۆرئاوا کەمترە لە زانیاریو ئاگاداریان لەو کۆمەڵگەیانەی لەژێر دەستی خۆرئاواداندا و زۆربەی ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان بۆ کارەکەی خۆیان، بەشێوەیەکی سەرەکی، بۆیان چوون.

کۆمپانیا پیشەسازیەکان، سیندیکاکان، کەنیسەکان، پارتە سیاسیەکان، دەوڵەت، هیچ یەکێك لەمانە، رەنگە ئەنترۆپۆلۆژیایەکی بۆ نەهاتبێتە گۆڕێ. ئەمەش لەوەوە سەری هەڵداوە کە ئەنترۆپۆلۆژیاییەکان ئەوەندەی گرنگی بەژیاری خەڵك دەدەن ئەوەندە گرنگی بەژیاری خۆیان نادەن، کە ئەم بارودۆخەش ئەمڕۆ پلە پلە لە سووکبووندایە. چونکە لەگەڵ نەمانی کۆلۆنیاکاندا زیاتر روون بوەتەوە کە ئەنترۆپۆلۆژیا بە شێوەیەکی پتەو پەیوەست نیە بە خۆرئاواوە کە زێدو خاڵی سەرهەڵدانی بووو، -بەپێچەوانەی بیروباوەڕی هەندێکەوە- لە بارودۆخی قەیرانێکی گشتیدا دەژی، کە نیشانەیەکی پێشوەختی ئاوابوونی نزیك و یەکجاریەتی.

## پەراوێزی وەرگێڕ:

1-بۆ ئەم کورتەیە لەژیانی گۆدۆلیێ سوودم بینیوە لە گۆڤاری: النهج، ژمارە (16)، پایزی 1998.

2-(مرۆڤناسی کۆمەڵایەتی) "الانسانیات الاجتماعیة" Sosial Antheropology لقێکە لە ئەنترۆپۆلۆژیا، بریتیە لە لێکۆڵینەوەی ژیانی گەل و خێڵ و کۆمەڵە بەراییەکان لە روانگەی کارلێك و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیانەوە، هەروەها لێکۆڵینەوەی سیستەم و بونیادو رژێمە کۆمەڵایەتیەکانێن بروانە: قاموس الانثروبولوجیا، د.ش.م.سلیم،893، جامعة الکویت، الطبعة الاولى،1981.

3-گینیای نوێ "غينيا الجديدة" Neo- Guinea: دورگەیەکی گەورەیە لە زەریای هێمندا دەکەوێتە باکووری ئوسترالیاوە، لەبەر ئەوەی خێڵ و کۆمەڵەکانی بەراین، ئینجا لەلایەن ئیمپێریالیزمەوە دەستیشی بەسەردا گیرا؛ شوێنێکی گونجاوە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژیایی.

5-مەیدان "الميدان" Field لە ئەنترۆپۆلۆژیادا: ئەو کۆمەڵگەیەیە کە پسپۆڕی ئەنترۆپۆلۆیایی تێیدا دەمێنێتەوە بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوەو کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی، بەگوێرەی رشتەیەك رێسای تایبەتی. ؟ ئینجا لێکۆڵینەوەی مەیدانی "الدراسة الميدانية" Fieldwork ئەو لێکۆڵینەوەیەیە کە پسپۆڕی ئەنترۆپۆلۆژیایی لە گەلێك یاخود خێڵێکدا لەناویاندا ئەنجامی دەدات، فێری زمانەکەیان دەبێت و هەرچی دەربارەیان نوسرابێت دەخوێنێتەوەو، خۆی بەشداری دابو نەریت و رێو رەسمیان دەکات. بروانە قاموس الانثروبولوجيا، 343.

6-خزمایەتی دوو رەگەزی "القرابة الهجينية" Cross- Kinship: ئەو پەیوەندیە کۆمەلایەتیەیە کە لە ئەنجامی دروستبوونی نەوەیەك لە دوو رەگەز یاخود دوو جۆر پەیدا دەبێت. هەروەها بروانە: قاموس الانثروبولوجيا، 220،469. وەرگێڕی عەرەبی لێرەدا "القرابة المقطعية"ی داناوە، چونکە ماددەی (cross) واتای (دوورەگەزی) و (یەکتربڕین)یشی تێدایە کە لەیەکەوە نزیکن.

9-(رەگەزناسی) "السلاليات" Ethnology: لقێکە لە ئەنترۆپۆلۆژیا، بریتیە لە لێکۆڵینەوەی خاڵەکانی جیاوازیو هاوشێوەیی نێوان ژیار "حضارة" Culture ەکان، بە مەبەستی دۆزینەوەی ریشەو رەگەزەکانیان و کاروانی گەشەسەندن و فراوانبوون و دابەش بوونیان. جیاوازیەکەی لەگەڵ ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتیدا ئەوەیە کە ئەمەی دووەمیان زیاتر گرنگی بە شیکردنەوەی پێکهاتەو بونیادی ژیاری کۆمەڵگەکە دەدات. بروانە: قاموس الانثروبولوجيا، 314،315.

7- ئیمپێریالیزم "الاستعمار التوسعي" Imperialism شێوازێکی نوێی داگیرکاری خۆرئاوایە لەم سەدانەی دواییدا. بەڵام کۆڵۆنیالیزم "الاستعمار الاستيطاني" Colonialism شێوازی دەورویەری سەدەی شازدەهەم بوو بۆ مەبەستی نیشتەجێ بوون لە وشکانیە نوێیەکاندا (ئەمریکاو ئوستورالیا..).

هەروەها بروانە: موسوعة السياسة، د. عبد الوهاب الكيالي، 172/1،200، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الاولى،1979.

10- پابەندی سیاسی "الالتزام السياسي" Political Enagagement: بریتیە لە پابەندبوون بە هەڵوێستێکی سیاسی دیاریکراو و رۆشن و بەردەوامەوە، لە شێوەی بەشداریکردنی بەردەوامی کارو چالاکی لە بەرژەوەندی ئەو هەڵوێستەدا. بروانە: موسوعة السياسة،259.

8-ژیار لەسەرتاسەری ئەم باسەدا بەرامبەری "الحضارة" Culture ە، کە کولتووریش لەخۆ دەگرێت.

4بونیادگەرایی "البنيوية" Structuralism: تیۆریەکە بنچینەی ئەنترۆپۆلۆژیای بونیادگەرایی پێك دەهێنێت. بنەماکەی بریتیە لە شیکردنەوەی دیاردە کۆمەلایەتیەکان لەو روانگەیەوە کە نیشانەو بەڵگەی ئەو دیاردەو بنەما کۆمەلایەتیە گشتیانەیە کە بە پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانەوە پەیوەستن و، بەرەنجام و رەنگدانەوەی پێکهاتەو بونیاد "البنية" Stuctur ە کۆمەلایەتیەکەن. لیڤی شتراوس دیارترین سەردەستەیەتی.

بروانە: قاموس الانثروبولوجيا،928.

11-هۆز "العشيرة" Clan، رەگەز "السلالة" Race، هەروەها خێڵ "القبيلة" Trip.

12-نامبیکۆرا Nambicuara: خێڵێکە لە هیندیە ئەمریکاییەکان، لە ناوەراستی بەرازیلدا دەژی. قاموس الانثروبولوجيا،663.

13-شێوگ "الصيغة" Formalu.

14-"مادية عامية" Common Materialism.

15-کورت کردنەوە "الاختزال" Shorening.

16-فرمانگەرایی "الوظيفية" Functionalism: قوتابخانەیەکە لە ئەنترۆپۆلۆژیادا، بنەماکەی بریتیە لە گرنگیدان بەو رۆڵەی کە هەر بەشێك لە بەشەکانی

ژیار له پێکهاته گشتیەکەیدا دەبینێت، له (3) خاڵی سەرەکیدا:

أ/هەموو ئاکارێك لەژیاردا بەپێی سیستەمێکی لەو گەورەتر لێك دەدرێتەوە.

ب/هەر بەشێك له ژیار بە شێوەیەکی فرمانەکی "وظیفي"Functional بە بەشەکانی ترەوە بەسراوەتەوە.

ج/کۆمەڵگا بونیادو، فرمان "الوظیفة" Function ی هەیە، رژێمە کۆمەڵایەتیەکانیش لەچوارچێوەی بونیادە کۆمەڵایەتیەکەدا فرمانەکانیان بەجێ دەهێنن، واتە ئامرازی فرمانەکانی بونیادی کۆمەڵایەتی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەیە کەبونیادەکەی دروست کردووە.

دوورکایم دامەزرێنەریەتی برۆنیسلۆف، سپێر مالینۆفسکی B.K.Malinovski و، رادکلیف-براون و، ئێڤانز پریچاردو، فیرت، دیارترین سەردەستەن. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا،376،377.

17-(مرۆڤناسی ژیاری) "الانسانیات الحضاریة" Cultural Anthropplpgy: بریتیه له لێکۆڵینەوەی ژیار (بەرهەمی ماددیو هزری)ی گەلانی بەرایی، واتە ئامرازو چەك و خانوو و پۆشاك و خشڵ و، هونەرو ئەدەب و چیرۆك و ئەفسانەکانیان. هەروەها لێکۆڵینەوەی گەشەسەندنی ژیاریو گۆرانی کۆمەڵایەتی ئەو گەلانەو، بنچینەو ریشەکانی ژیارو جۆرو بونیادەکانی. لەمەڕ ئەنترۆپۆلۆژیاییە بریتانیاییەکان لقێکە له ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی بەلام ئەنترۆپۆلۆژیاییە ئەمریکاییەکان دەیهێننە بەرامبەری ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتیو، دەیکەنە لقێکی ئیتنۆلۆژیا. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا، 224،314،893.

18-(ژینگەناسی) "علم البیئة، التبیؤ" Ecology له ئەنترۆپۆلۆژیادا: لێکۆڵینەوەی پەیوەندی کۆمەڵگە مرۆییەکان بە ژینگە -بەتایبەتی- سروشتیەکانیانەوەو، چۆنیەتی گونجانی ژیار لەگەڵ ژینگەی ژیۆگرافیاییدا. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا،290.

19-"التأریخ الاثني" Ethnohistory: رەگەز-زمانێتی "الاثنیة- اللغویة": لێکۆڵینەوەی رەگەزو زمان لەرووی پەیوەندی ئۆرگانیانەوە.

20-(مرۆڤناسی مەعریفە) "الانسانیات المعرفیة" Cognative Anthropology: لقێکە له ئەنترۆپۆلۆژیا، بریتیه له لێکۆڵینەوەی ژیار بەو پێیە کە ئەو کۆمەڵە زانیاریەیە کە لەمەڕ تاك هەیەو، ئەو رێسایانەیە کە بەهۆیانەوە تاك بە ڕەزامەندی کۆمەڵگە هەڵسوکەوت دەکات، واتە لێکۆڵینەوەی رێساکانی هەڵسوکەوتی تاك بەو پێیە کە ئەندامێکی ژیارەکەیە. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا،187.

21-لویس هێنری مۆرگان L.H.Morgan (1818-1881): ئەنترۆپۆلۆژیاییەکی ئەمریکاییە، یەکێکە لە بانگخوازانی بیرۆکەی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی له پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و سەرجەم مێژووی مرۆڤایەتیدا. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا: 646.

22-شوێنەوارناسی "علم الآثار" Archaeology.

23-"علم ماقبل التأریخ" Prehistory: لێکۆڵینەوەی ئەو کۆمەڵگە مرۆییانەی پێش پەیدابوونی نووسین و مێژوو کەوتوون. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا، 768.

24-"علم البدائیة" The Science of the Primitiveness.

25-"الانسان العاقل" Homo Sapiens: ئەم مرۆڤە نوێیەیە کە (45-50) هەزار ساڵە پەیدا بووە.

26-(دێرینەناسی) "علم المستحاثات" Palentology: لقێکە لە ژیۆلۆژیا، لە زیندنەوەرە بەبەردبووەکانی چاخە دێرینەکان دەکۆڵێتەوە. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا، 713.

27-ئێسکیمۆ Eskimoو هیندیە ئەمریکاییەکان American Indians، کە سەر بەرەگەزی مەغۆلین، (15-20) هەزار ساڵێك لەمەوبەر لە رێی گەرووی (بێرنگ)ەوە له ئاسیاوە پەڕیونەتەوە بۆ ئەمریکا. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا، 45،46،310،311.

28-ریزپەری "المفارقة" Incongruity: پێچەوانەیی لەگەڵ باری سروشتیدا.

29-(پاش-نوێیەتی) "مابعد الحداثة" Post-modernity. (پاش- نوێگەرایی) "مابعد الحداثیة" Post-modernism.

30-تێپەڕێنەر "التجاوزي" Transgressive.

31-بەخشش "الهبة" Don: دیاردەیەکە- بەتایبەتی- لەگەڵی بەراییدا دەردەکەوێت، وەکو ئەو ئاهەنگە ئاینیەی لە هیندیە ئەمریکاییەکاندا بە ناوی پۆتلاچ Potlach ەوە (وشەکە واتای بەخشش دەگەیەنێت)، لەو ئاهەنگەدا بەشێوەی کێبەرکێ بەخشش دەگۆڕنەوە، واتە هەریەکە بەرامبەرکێی بەرامبەرەکەی دەکات بەگێڕانەوەی بەخششەکە، واتە بەخششی پێچەوانە. بۆ ئاگاداری تەواو، بڕوانە: لغز الهبة، م. غودولییە، ترجمة: ح. ظاظا، دار المدى،1998.

32-"البحث عن الهبة" Essiaia sur le Don.

33-هەڵبژێری "الانتقائیة" Eclectism: تەرزە بۆچوونێکە هەوڵ دەدات کۆمەڵێك بیرۆکەو دید پێکەوە گرێ بدات گە لە کرۆکدا پێکەوە پەیوەست نەبن و، بەشێوەیەکی رووکەش پێکهاتەیەکیان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی لێ پێك بهێنێت، کە - بەزۆری- سەردەکێشێت بۆ بیرۆکەی ناراست و پێچەوانە. بڕوانە: موسوعة السیاسة،347.

34-"المقولات التحلیلیة" Analytic Categories: کۆمەڵێك چەمکن بۆ دەرککردنی واقیع بنیات دەنرێن.

35-ئیتنۆگرافیا "علم وصف المجتمعات البشریة" Ethnography: بریتیە لە لێکۆڵینەوەی ژیاری گەلێکی تایبەتی، بەکێشانی وێنەیەکی ورد بۆ شێوەی ژیان و رژێم و پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانیان. لەمەڕ بریتانیاییەکان لقێکە لە ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتی، بەلام ئەمریکاییەکان بە لقێکی ئەنترۆپۆلۆژیای ژیاری ناوی دەبەن. بڕوانە: قاموس الانثروبولوجیا،314.

36-دینکا Dinka: خێڵێکی زینجیە لە باشووری سودان لەسەر سنوورەکانی سودان -ئەنگۆلیا دەژی. قاموس الانثروبولوجیا،262.

37-بنەماکان "الاولیات" Axioms: بەهاو پێوانە گشتیەکان لە کۆمەڵگەدا.

38-"الذاتیة الجذریة" Radical Personality.

39-بونیادی سەرینە "البنیة الفوقیة" Superstructure: رەهەندو پەیوەندیەکانی ئاستی فیکریو کۆمەلایەتیو سیاسی لەکۆمەڵگەدا، بونیادی ژێرینە "البنیة التحتیة" Infrastructure: رەهەندو پەیوەندیەکانی ئاستی ئابوری، بەتایبەتی لە نێوان بەرهەمهێن و، رەگەزەکانی بەرهەمهێنان و، دابەشکردندا، بونیادی بناغەیی. موسوعة السیاسة،576.

40-النيء والمطهي" The Raw and the Cooked.

41-بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە: اعادة قراءة اعمال مارکس علی اعتاب القرن الحادي والعشرین، م. غودولییە، مابعد المارکسیة، فالح عبدالجبار، دار المدی، 1998.

42-رەچەڵەکدانان " التنسیب" Attribution.

تێبینی:

تەرزە بۆچوون "المقاربة" Approach - طریقة، اقتراب. پرۆسێس -العلمیة، السیرورة- Process. رووداو -الوقیعة، المعطی- Data.

# ئەگەر بەیەقین دەست پێ بکەیت
# ئەوا بە نایەقین دەگەیت

**- دەمەتەقێ لەگەڵ بودابیەکان دا -**

■ کریشنا مۆرتی

● و. یاسین عومەر



کریشنا مۆرتی

**یەکەمین** بەشداربوو(1): تا ئەو جێگەیەی کە من تێیگەیشتووم، ئێوە دەڵێن کە ژیان هیچ مەبەست یان ئامانجێکی نییە لەبەر ئەوە رێگەیەکیش بۆ هەنگاوهەڵهێنانەوەی تیانییە، بەناچار هەر تاکێ خۆی لەگەڵ هەر لەحزەیەکدا رووبەڕووە. ئەگەر بڕیارە چرکەسات بەدەست بێت ئەوا ئەو چرکەساتە هەر هەمان چرکەساتی کار، چرکەساتی زانستو ئارەزووە. ئایا ئەم لێهەڵهێنجانە تەواوە؟

کریشنا مۆرتی: ئەگەر رێگەم بدەن دەبێت ئاماژە بەوە بدەم کە ئێمە لەبارەی ئەوەوە نادوێین چی تەواو راستو دروستەو چی ناتەواو و نادروستە. ئەم بابەتە پێویستی بەتوێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زۆر هەیە.

یەکەمین بەشداربوو: ئێوە بەو قسەیەتان کە دروست یان نادروست بوونی نییە، لەراستیدا بۆ ئەو مرۆڤانەی کە حەزیان بەتێگەیشتنو پەی پێ بردن هەیە گیروگرفت ئەخوڵقێنن.

کریشنا مۆرتی: نەء، بەپێچەوانەوە، من دەڵێم کە ئێوەو ئێمەش هەمووماں وە منیش خۆم وەکو یەکێکیان، حەزمان لەلێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوەیە. من ناڵێم "ئەمە دروستە، ئەمە هەڵەیە" بەڵکو ئێمە سوورین لەسەر ئەوەی کە لەگەڵ یەکتریدا بەقوڵایی ئەم مەسەلەیەدا رۆبچینە خوارێ.

یەکەمین بەشداربوو: چۆن دەشێت بوونەوەرێکی مرۆیی هەبێتو نەتوانێ بڕیار بدات لەمەڕ ئەوەوەی کە چ شتێ دروستە یان دروست نییە، چی چاکەو چی چاک نییە؟

کریشنا مۆرتی: ئێمە دوایی دەچینە سەر ئەو مەسەلەیەش. من ناڵێم چاکە بوونی نییە. چاکە دەشێت بەتەواوی لەگەڵ چاکی ئێوەو چاکی منا جیاواز بێت، لەبەر ئەوە رێگە بدەن بزانین کامیان بەڕاستی چاکەیە، نەك ئەوەی ئێوە یان ئەوەی من بەڵکو ئەو شتەی کە بەڕاستی چاکە، بەدەستی بهێنین.

دووەمین بەشداربوو: .. (چاکە) لەناوخۆیدا

کریشنا مۆرتی: بەڵێ.

یەکەمین بەشداربوو: راستیەکەی ئێوە خەریکن "نەبوونی یەقین" لەشێوەی روانینی تاك بۆ شتەکانو یان لەروانگەی فەلسەفی ئەوەوە دەناسێنن.

کریشنا مۆرتی: بەڵێ، ئەگەر بە "یەقین" دەست پێ بکەیت، ئەوا لە کۆتاییدا بە "نەبوونی یەقین" دەگەیت.

یەکەمین بەشداربوو: ئەم رستەیەش "ئەگەر بە یەقین دەست پێ بکەیت ئەوا لەکۆتاییدا بە نەبوونی یەقین دەگەیت" خۆی زۆر ناکۆك دێتە بەرچاو.

کریشنا مۆرتی: هەڵبەتە ژیانی رۆژانە ئاواییە.

چونکە ئێوە پرسیارێکتان خستەڕوو کە دەلالەت لە "کات"، "فکر"و "کار" دەکات، لەبەر ئەوە دەتوانین لێرەوە دەست پێ بکەین کە "کات" چییە؟. کات نەك بەپێی تیۆرەکەی بودا یان هەندێ لەکتێبە پیرۆزەکان، بەڵکو تەنیا ئەوەندە بزانین کات چییە؟ هەر کەسەی بە جۆرێ کات راڤە دەکات، زانایان دەڵێن کە کات زنجیرەیەك کارو بیرۆکەی بچوکە، یان رەنگە ئێوە بڵێن کە کات مردنە، کات ژیانە یان کات فکرە. بەم پێیە، ئایا ئێمە لەحاڵی حازردا دەتوانین ئەو قسانەی کە ئەوانی تر گوتوویانە لەوانەش قسەکانی بوداو تەنانەت ئەوەی کە من گوتوومە یان نەمگوتووە بخەینە لاوە واتە هەمووی لە مێشکماندا پاك بکەینەوەو بڵێین. "ئێستا، کات چییە؟" ئایا کات تەنیا گیروگرفتێکە کە ئێمە لەژیاندا هەمانە؟. کات. نەك تەنیا وەك کۆمەڵە رووداوێك، بەڵکو لەدایك بوون، پێگەیشتن، مردن، کات وەکو رابردوو، ئایندەو ئێستا؟ ئێمە لەکاتدا دەژین، ئەو ساتەی کە ئومێدمان هەیە بەواتەی ئەوەی کاتمان هەیە. من ئومێدەوارم "بوویم"، ئومێدەوارم "ببم"و ئومێدەوارم بگەمە ئیشراق. هەموو ئەم رستانە دەلالەت لەکات دەکەن. بەدەست هێنانی زانست، پێویستی بە کاتەو تەواوی ژیان هەر لەسەرەتایەوە تا مردن جگە لەمەسەلەی کات شتێکی تر نییە. ئایا وانییە؟ ئایا دەتوانم مەبەستەکەم روونتر بکەمەوە؟ ئابەم پێیە بێ، ئەوەی کە ئێمە بەکات ناوی دەبەین چییە؟

یەکەمین بەشداربوو: ئێوە لەم بارەیەوە، چەندان جار قسەتان کردووە بەڵام دەمەوێت بڵێم کە سات کە هەمان زانستو کارو هەروەها ئارەزووە، ساتێکە کە کات تیایدا بوونی نییە.

کریشنا مۆرتی: سەبرکە، سەبرکە، ئایا ئێوە دەتوانن ئەم ساتو ئەو ساتە لەهەموو ساتەکان جیابکەنەوە؟

یەکەمین بەشداربوو: لەساتی (سەرنجدان) یان (بینین)دا کات بوونی نییە.

کریشنا مۆرتی: مەبەستتان لەبینین و سەرنجدان چی‌یە؟ داوای لێبوردن دەکەم لەوەی کە ئەوەندە وردو شیکاریانە مامەڵە دەکەم. بەڵام ئەگەر بڕیارە کە ئێمە لێکتری تێبگەین، دەبێت مێشکمان مەعنای روونی لەبارەی ئەم دوو دەستەواژەیەوە (بینین و سەرنجدان) لابێت. کاتێ بە کردەوە نەك بەتیۆری سەیر دەکەن، چی روو دەدات؟ کاتێ ئەو درەختو، ئەو باڵندەو، ئەو ژنەو، ئەو پیاوە دەبینن، چی روودەدات؟

دووەمین بەشداربوو: لەوساتی بینینەدا، هەڵبەتە ئەگەر بینینێکی راستەقینە بێت..

کریشنا مۆرتی: ئایا هەیە یان نەء؟ من هەر خەریکم پرسیار دەکەم. ئایا کاتێ ئێوە دەستەواژەی "بینین" بەکاردەبەن، چ واتایەکتان لەمێشکی خۆتاندا بۆی هەیە؟ دەشێت من واتایەکم بۆی هەبێت، دەشێت ئەویش واتایەکی بۆی هەبێتو یەکێکی تریش تێگەیشتنێکی تری هەبێت.

دووەمین بەشداربوو: بەڵام ئێوە لە Pamditji دەپرسن کە "ئەو" مەبەستی لە "بینین" چییە.

کریشنا مۆرتی: هەروەها مەبەستی لە دەستەواژەی "سەرنج" چییە. روخسەت دەدەن پرسیارێ بکەم؟ ئایا دەتوانین قسەوباس و گفتوگۆیەکمان هەبێت واتە منازەرەیەکمان لەسەر دەستەواژەیەك هەبێ کە تێڕامانێکی زۆر باشیشە، ئایا واتای دەستەواژەی "تێ ڕامان" دەزانن؟ ئەم دەستەواژەیە لە "لیبرا" وە دێت کە بەزمانی یۆنانی بەواتای هاوسەنگی -کێش دێت. هەمان مەسەلە لە بورجی فەلەکی لیبراشدا بوونی هەیەو لەلیبرادا دەستەواژەی lilrate بەواتای ئازادکردن دێتو هەروەها لەدەستەواژەی deliberare کە بە ئیتالی بەواتای دانیشتن، خستنەژێر باس و دانوستانی سەرلەنوێوەو راوێژو ئاخاوتن لەگەڵ یەکو، لەگەڵ یەکدا بەراوردکردن، دێت.

مەسەلەکە ئەمە نییە کە ئێوە بڕوایەك بخەنەڕوو و منیش بڕوایەك بخەمەڕوو، بەڵکو مەسەلەکە ئەمەیە کە ئێمە هەردووکمان پێکەوە راوێژبکەین و مەسەلەکان هەڵسەنگێنین، چونکە دەمانەوێت هەقیقەت بدۆزینەوە نەك ئەوەی کە من پێشتر دۆزیبێتمەوەو پاشان بەئێوەی بڵێم، شتێکی ئاوا لە دەستەواژەی (delilerate) شاراوە نیە. کاتێ کا پاپا لەڕۆما لە سیستین چاپل لەڤاتیکان هەڵدەبژێررێت. ئەوان لەگەڵ یەك ئەکەونە راوێژو راگۆڕی و هەڵسەنگاندن- دەرگاکان داخراون و هیچ کەسێ ناتوانێت بچێتە دەرەوە. ئەوان بۆچوونە سەر ئاوو چوون بۆ چێشتخانەو نان خواردن شوێنی تایبەتیان هەیەو هەموو شتێ بۆ دوو هەفتە یان چەند رۆژێ رێکخراوە ئەوانە بەدرێژایی رۆژانی دانیشتن، مەحکوومن بەجێگربوون و دانیشتن وە ئەمە ناودەبرێ بە "تێڕامان"(2).

بەم پێیە ئایا دەتوانین لەجێگەیەکەوە دەست پێبکەین کە هیچ شتێ نەزانین؟

سێهەمین بەشداربوو: ئەم کارە بۆ panditji گرانە.

کریشنا مۆرتی: گران نی‌یە، من هیچ شتێ نازانم، زانینی ئێمە تەنها یادەوەریە. ئێستا لەم رستەیەدا چ گرفتێك هەیە؟ من دەڵێم دەشێت زانست گەورەترین مەترسی بێت لەجیهاندا، زانست دەشێت گەورەترین رێگربێت، ئێمە بۆ زیادکردن و تەنینەوەی زانست بەردەوام چاکەی خۆمان فراوانتر دەکەین، زانایانیش بەردەوام پێی زیاد دەکەن و ئەوەی زیادیش دەکرێت بەردەوام سنووردارە.

دووەمین بەشداربوو: هەڵبەتە. بەڵام ئەگەر کامڵ و تەواو بێت، ناتوانیت هیچی بۆ زیادبکەیت.

کریشنا مۆرتی: بەڵێ. بەم پێیە زانیاریتان بەردەوام سنووردارە، خۆگەر لەو سنوورداریەوە دەست بە لێکۆڵینەوە بکەیت ئەوا هەر بە سنوورداریش کۆتایی دێن.

دووەمین بەشداربوو. وە ئەوە بە ئیصطلاح دیاریکردنی هەمان سنورداریە.

کریشنا مۆرتی: بەڵێ سنورداری.

یەکەمین بەشداربوو: ئێمە زۆر گوێبیستی قسەکانی ئێوە بووینو شتگەلێکی تایبەت تێگەیشتووین بەڵام ئەگەر بڕیارە تێگەیشتن لەئاستێکی قووڵتردا شکڵ بگرێت، ئەوا لەو کاتەدا کەسێکی وەکو ئێوە، لەم بارەیەوە بەرپرسە، چونکە. ئێمە لەئاستی جیاجیادابن.

کریشنا مۆرتی: زۆر باشە، زۆر باشە، بەڵام هەمان مرۆڤ واتە کریشنا مۆرتی دەڵێت کە زەویو لەنگەرگاکانتان جێ بێڵنو بێنو پێکەوە سەرنابوبکەوین.

یەکەمین بەشداربوو: چۆن چۆنی ئێمە دەتوانین بەیەکەوە سەرنابوبکەوین لە حاڵێکدا لەدوو ئاستی جیاوازدابن؟

من ئەمەم قبووڵ نییە. من قبووڵم نییە کە لەدوو ئاستی جیاوازدابن.

یەکەمین بەشداربوو: ئێمە گلەییەکمان لەئێوە هەیە کە ئەویش ئەوەیە کە.

کریشنا مۆرتی: ئەویش ئەوەیە کە من جەراحێکی هەژارم!

یەکەمین بەشداربوو:.. بەڵێ پزیشکێك، لەبەر ئەوەی کە هەموو کێشەو دژایەتیەکان، کە دەرەکیو زۆرن، تەنها ئەو مرۆڤانەی وەکو منن کە ئیمتیازی ئامادەبیان لەخەڵوەتی ئێوەدا هەیە، ئەو (بینین بەچاوی دڵ بصیرە) بە دەست دێنن بەڵام پزیشك ناتوانێت پێت بڵێت کە چۆن چۆنی زاڵ بیت بەسەر دیاردە دەرەکیو زۆرو زەوەندەکانداو چۆنی گرفتەکان چارەسەر بکەیت.

کریشنا مۆرتی: بەم پێیە ئێوە دەتانەوێت سەرەتا کێشە دەرەکیە زۆرەکان چارەسەر بکەنو پاشان لە گرفتەکانی دەروونتان نزیکتر ببنەوە. ئایا مەبەستتان ئەمەیە؟

یەکەمین بەشداربوو: نەء، من دەمەوێت هەردووکیان بەیەکەوە چارەسەر بکەم.

کریشنا مۆرتی: من پۆلێنکاریم پێ قبوڵ نییە.

یەکەمین بەشداربوو: بەڵێ من ئەمەم قبوڵە.

کریشنا مۆرتی: جیهان، منم، من جیهانم. ئێستا لەدوای تێگەیشتنی ئەم خاڵە چۆن دەمانەوێت کێشەکە چارەسەر بکەین؟

یەکەمین بەشداربوو: وەرن بڵێین کە من رازی نیم بەهیچ جیاوازیەك لە نێوان شتە دەرەکیو ناوەکیەکاندا.

کریشنا مۆرتی: سەرەتا دەبێت بەنیسبەت ئەم مەسەلەیەوە دڵنیابن. ئایا بەڕاستی هەقیقەتی ئەم کارە تێدەگەن یان ئەوەی کە ئەم کارە بەتەواوی تیۆریە.

یەکەمین بەشداربوو: بە رای من ئەم مەسەلەیە تیۆریە.

کریشنا مۆرتی: بەڕێز، پێش هەموو شتێك تیۆری لای من هیچ نرخێکی نیە. هەڵبەتە بمبەخشن کە بێ راشکاوی قسە دەکەم. من شایەتم کە چ شتێك خەریکە روودەدات، واتە جەنگ، نەتەوە گەراکان، کوشتارو هەموو شتە ترسناکەکان کەوەختە روویدەن، مەبەستم ئەمەیە کە بەکردەوە خەریکن روودەدەن، من لەم روەوە دووچاری خۆشخەیاڵی نیم بەڵکو هەموو ئەمانە بە بەرچاوانەوە خەریکن روودەدەن، وەلحال ئێستا کێ ئەمانەی خوڵقاندووە؟

یەکەمین بەشداربوو: بوونەوەرە مرۆییەکان.

کریشنا مۆرتی:ئایا قبووڵتە بڵێین کە ئێمە هەموومان ئەوەمان خوڵقاندوە؟

دووەمین بەشداربوو، بەڵێ، هەڵبەتە.

کریشنا مۆرتی: زۆر باشە، بەم پێیە ئەگەر ئێمە هەموومان ئەوەمان خوڵقاندبێت کەواتە دەشتوانین بیگۆڕین.

من دوێنێ لەنیویۆرك چاوم بە زانایەك کەوت، پزیشکێك کە بۆتە فەیلەسوف. ئەو گوتی کە هەموو ئەمانە هەر تەنیا قسەنو ئێستا پرسیاری واقعی ئەمەیە کە: ئایا شانەکانی مێشك دەتوانن گۆڕانکاری لەخۆیاندا دروست بکەن. ئەویش نەك لەڕێی مادە سڕکەرەکانەوە، یا لەڕێگەی پرۆسە جۆراوجۆرەکانی جیناتەوە بەڵکو ئایا خودی شانەکانی مێشك، دەتوانن بڵێن ئێمە هەڵەیە،

کەواتە بگۆڕێ ئاگاتان لێیە؟ ئایا خودی شانەکانی مێشک دەتوانن بەبێ جڵەوگرتنو بەکارهێنانی مەوادی سڕکەر ببینن کە چیان خەڵق کردوەو بڵێن: ئەمە هەڵەیە، بگۆڕێو ئاوەژوو بەرەوە!

یەکەمین بەشداربوو: بەڵام ئێوە رازین بەبوونی جیاوازی لەنێوان مێشکو هزردا.

کریشنا مۆرتی: بەڵێ، رەنگە بێ ئەقڵانە بێتە بەرچاو، بەڵام لام وایە جیاوازین چونکە مێشک مەڵبەندی سەرجەمی هەستەکانی ئێمەیە.

چوارەمین بەشداربوو: کاکە ئەمە هەر ئەو پرسیارە بوو کە دوێنێ من لێم کردن، ئەمەی کە ئایا ئێمە دەبێت چاوەڕوانی ئەو ئاڵوگۆڕە بین؟

کریشنا مۆرتی: ناتوانن. چونکە درێژە بەڕێگەی خۆی دەدات.

چوارەمین بەشداربوو: ئایا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دێت؟

کریشنا مۆرتی: نەء

چوارەمین بەشداربوو: کەواتە ئێمە دەبێ بۆ گەیشتن بەوە هەوڵو کۆشش بکەین.

کریشنا مۆرتی: ئێوە دەزانن کە گۆڕان زەرورییە. ئێستا چی دەکەن؟

چوارەمین بەشداربوو: بەڵێ هەموو لەسەر ئەم هەقیقەتە کۆکین.

کریشنا مۆرتی: ئێستا چ شتێك ئەوە دەگۆڕێت؟ مەبەستم گۆڕانە لەشانەکان، نەك لەئایدیاکاندا. شانەکانی مێشك هەموو یادەوەریەکانی رابردووی تیادایە. ئایا ئەو شانانە بەبێ پاڵەپەستۆ و بەبێ کەوتنە ژێر کاریگەریو بەبێ بەکارهێنانی مەوادی کیمیایی دەڵێن "ئەمە دوا رێگەیە. من دەگۆڕێم"؟

دووەمین بەشداربوو: نەء. ئەگەر نفوزو پاڵەپەستۆیەك نەبێت واتە ئەمەی کە ئەم کارە لەخۆیەوە ئەنجام نادرێت.

کریشنا مۆرتی: نەء، گوێ بگرن. شانەکانی مێشك تەواوی یادەوەریو پاڵەپەستۆو فێرکردنو پەروەردە، ئەزموونەکانو هەموو شتێکی لەبەرەوەدایە. مێشك، مەڵبەندی زانستە.

دووەمین بەشداربوو: بەڵێ پڕە لەزانست.

کریشنا مۆرتی: بەڵی بەزانستی (2) یان (نیو) ملیۆن ساڵێ پڕە، ئێمە هەموو شتێکمان تاقی کردۆتەوە، مەوادی کیمیایی، خەڵوەتکێشان، رەنجو هەر شێوەیەك لەئەزموونمان بۆ بەدیهێنانی گۆڕانێك لە لەناوەوەی کە لەسەردا ئەنجام داوە. بەڵام سەرکەوتوو نەبووین. ئەندازەی جیناتو هەر شێوەیەك لەتاقیکردنەوە بۆ گۆڕینی ئەوەی کە لە سەردا دەگوزەرێ دیسان ئەنجام دراون بەڵام هیچ کامێکیان سەرکەوتوو نەبوون هەڵبەتە تا ئێستا سەرکەوتوو نەبوون، دەشێت هەزار ساڵی تر سەرکەوتوو بن. بەم پێیە بۆچی مێشك پشتی بەم شتانە بەستووە؟ واتە بەمەوادی کیمیاییو بزوێنەرەکانو بە چێژەوە پێیانەوە وابەستەیە؟ ئایا مێشك چاوەڕێیە ئازادبێت؟ "نەء بەداخەوە، ئەمیش هەر خۆدزینەوەیە".

دووەمین بەشداربوو: واتە لەچاوەڕوانی کەسێکی ترا بوون.

کریشنا مۆرتی: بەڵێ. کەواتە ئایا شانەکانی مێشکیش ئێستا دەتوانن کۆتایی بەسەرجەمی یادەوەرییەکانی رابردوو بهێنن؟ پرسیارەکەی من ئەمەیە کە ئێستا ئێوە چی دەڵێن؟

یەکەمین بەشداربوو: من پرسیارێکی ترم هەیە، من دەبێت وانە بە قوتابیەکانم بڵێمەوە وە من ئەم کارە لەڕێگەی پرۆسەیەکی لۆژیکیەوە ئەنجام دەدەم، لەڕوی لۆژیکیشەوە زۆر شت روون دەبێتەوە. بەڵام لەهەمان کاتدا سنووردارێ ئەویش دەناسمەوە بەتایبەتی لەوکاتەی کە لەگەڵ ئێوەدا لەپەیوەندیدا بووم. و تێگەیشتم کە هەموو ئەمانە دەستکرد و تیۆریو سنوردارن. بەم پێیە کاتێ ئێمە دێینە لای ئێوە شتگەلێکمان گوێ لێ دەبێت کە باشنو لەیەك خاڵی بەرزدا بەرەو خاڵێکی تر دەڕۆین بەڵام لەکۆتاییدا تێدەگەین کە هێشتا لەشوێنێکدا نین

لەهەقیقەتەوە نزیك بێت. لەبەر ئەوە لەجیاتی ئەوەی کە بەدەوری بازنەی لۆژیکدا خول بخۆین، لەنێو بازنەی ئەم قسانەدا خول دەخۆین بەڵام جیاوازییەکیان نییە.

کریشنا مۆرتی: بەڵێ کاکە. ئەمانە هەمووی سەرتاپایان روون کردنەوەنو ئێمە لەو لۆژیکەوە بۆ ئەم لۆژیکە دەجولێین. بەم پێیە ئایا ئاگادارین کە لۆژیك سنورداره؟ ئێستا ئایا دەتوانم ئەو لۆژیکە بەبێ رۆیشتن بەرەو لۆژیکێکی تر واز لێ بێنم، لەبەر ئەوەی لەسەرەتادا پەیم بەوە برد کە لۆژیك سنووردارە. جا چ ئەو لۆژیکە باڵا بێ یا لۆژیکی باوبێ.

یەکەمین بەشداربوو: نەء، ئەم دوو لۆژیکە ناتوانن بەراورد بکرێن. چونکە یەکێکیان لۆژیکە، بەتەواوی لۆژیکیەو هەر ئەوەیە کە تێگەیشتووین سنووردارە لەحاڵێکدا کە لێرە ئەم قسانە هەرهەموویان لۆژیکی نین. ئەویش کاتێك کە رۆشن بینیو روناکیی بەدەست دەهێنین. سەرئەنجام بەردەوام هەر بەدەوری ئەم شتە بچوکانەدا سوڕ دەخۆینو تێگەیشتنێکیش شکڵ ناگرێت.

کریشنا مۆرتی: زۆر باشە، ئەگەر وایە کە من گومانم هەبێ، ئایا مەسەلەکە ئەوەیە کە ئێوە داوای بەسیرەتێکی تەواو دەکەن. پرسیارەکەی ئێوە دەلالەت لە خواستێك وا دەکات.

یەکەمین بەشداربوو: ئێمە دەبێت لەو شتەی کە وەریدەگرین رازی بین، لەحاڵێکدا کە موحتاجی ئەو شادمانیەین کە شکڵ بەفکر دەدات. ئێمە بەسیرەتە کەمو کورتەکانمان چنگ دەکەوێت نەك بەسیرەتە کامڵەکان.

کریشنا مۆرتی: من سەبارەت بەشادمانی قسە ناکەم. من سەبارەت بە (بینین بەچاوی دڵ قسە دەکەم. من پێشنیاری تەواویو کەماڵ بۆ ئێوە دەکەم. من مەنتیقانە تەواویو کەماڵ پیشانی ئێوە دەدەم. بەڵام ئایا گوێتان لێ دەبێت بەبێ ئەوەی کە بڵێیت بەڵێ، ئەمە دروستە یان ئەمە هەڵەیە؟ هەموو نووسەرو نیگارکێشێ، زانا، شاعیرو مامۆستایەکی رۆحانی، بەکردەوە خاوەنی بەسیرەتێکی سنووردارن. منو تۆ بەیەك دەگەینو دەڵێین "سەیرکە، ئەمە سنووردارەو من بەسیرەتی واقعی، کامڵو پڕم دەوێت نەك بەسیرەتی رێژەییو جوزئی".

یەکەمین بەشداربوو: ئێمە پێویستمان بەوەیە کە لەم مەسەلەیە تێبگەین، ئایا بەسیرەتی کامڵ چی‌یە؟ ئایا ئەزمونێکە؟

کریشنا مۆرتی: نەء، گومان دەکەم ئەزمونێ بێت. نەء ئەزمونێك نی‌یە.

دووەمین بەشداربوو: کەواتە دەبێت لەناوەوە جۆش بخوا.

کریشنا مۆرتی: نەء، دەزانی مەسەلەکە ئەوەیە خەریکە پەلە لەشتێك دەکەن بەر لەوەی رووبدات.

دووەمین بەشداربوو: کەواتە ناتوانرێت پێشبینی بکرێت.

کریشنا مۆرتی: ئێوە ناتوانن لەو بارەیەوە یاسا دابرێژن. ناتوانی بڵێیت کە ئەمە ئەزمونێکە چونکە نییە.

دووەمین بەشداربوو: بڕیار بوو ئێوە بەئێمە بڵێن کە چۆن چۆنی هەموو ئەم شتانە دەبنە یەك هەمەکی (کل)

کریشنا مۆرتی: نە ئەم شتانە بەشەکانی هەمەکی دروست ناکەن، منیش بە ئەندازەی ئێوە هەمووتان "مەعلونانە" مەنتقیم. تەنیا دەڵێم بەجۆرێکی خراپ لەگەڵ ئەودا مامەڵە دەکەن. مەسەلەی من ئەمەیە. نەڵێن کە ئەمە ئەزموونێکە یان لەسەر بنچینەی زانستە. ئەوەی لەسەر بنچینەی زانستە دۆزینەوەیەتی نەك خوڵقاندنی.

شەشەمین بەشداربوو: بەرێز ئەو ناڵێت کە ئەمە ئەزمونێکە لەسەر بنچینەی زانست بەڵکو دەبێت ئەو شتە واقعی بێتو قابیلی سەلماندنی بێت.

کریشنا مۆرتی: مەسەلەکە ئاوایی نیە کە من شتێك تاقی بکەمەوە. ئەمە واقعیەتێکە من لەبنەڕەتدا لەگرفتەکەی ئێوە تێ ناگەم. کەسێك

دێتو چیرۆکێکم بۆ دەگێڕێتەوە. من بەتاسەوە گوێی بۆ رادەدێرم. لەبەر ئەوەی چیرۆکێك جوانەو زمانێکو شێوەیەکی دڵنشینو خۆشی هەیە. بەبیستنی ئەو چیرۆکە دووچاری جەزبەو خۆ لەبیرکردن دەبم. گوێ لەچیرۆکەکە دەگرمو چیرۆکەکە رۆژ لەدوای رۆژ درێژ دەبێتەوەو من بەهۆی ئەم چیرۆکەوە کەم دەکەمو دەتوێمەوە. بەم پێیە چیرۆکەکە بەوتنی "لێرەدا چیرۆکەکە رادەوەستێ" کۆتایی دێت

پێنجەمین بەشداربوو: چیرۆکەکە بۆ ئێمە کۆتایی نایەتو لێرەوە گرفتەکە بەردەوامی دەبێت.

کریشنا مۆرتی: بەرێز ئێوە دۆستی منـو من دەمەوێت پێتان بڵێم کە مرۆڤەکان بەسیرەتێکی سنووردارییان هەیەو ئەمەش شتێکی ئاشکرایە. لێرەدا دۆستەکەی ئێوە دەڵێت کە من بەئێوە دەڵێم بە چ رێگەیەك دەتوانن بەسیرەتی تەواوتان هەبێت. ئایا گوێی لێدەگرن؟ باسو وتووێژ مەکەن بەڵکو تەنها گوێ بگرن. ئێوە برنج دەدەنە سوالکەرێك لەکاتێکدا ئەو چاوەڕوانی هیچ شتێ لەئێوە نەبووە بەڵام ئێوە برنجی دەدەنێو بەهەمان شێوەش ئەو دیارییەك دەداتە منو دەڵێت "بیگرەو مەڵێ بۆچی دراوە بە تۆو کێ داویەتی، بەڵکو تەنها وەریبگرە" بەم پێیە من خەریکم دەڵێم بەسیرەت وابەستە نیە بەئەقڵەوە، بەسیرەت پشتی نەبەستووە بە زانستەوە. بەسیرەت پشت بەستوو بە هیچ جۆرە یادەوەریەکەوە نیە. ئیشراق پشتی نەبەستووە بەکاتەوە.

کات، یادەوەری، بەبیرهێنانەوە، هیچ کامێکیان بوونیان نیە کەواتە ئێوە بەسیرەتان هەیە، بەسیرەتی کامل. وەکو دووکەشتی کە لەشەودا بەتەنیشتی یەکتردا رەت دەبن یەکێکیان بەوی تریان دەڵێت "ئاواییە"و تێدەپەڕێت. ئێوە چی دەکەن؟

چوارەمین بەشداربوو: بەرێز ئایا بەسیرەت لەرێگەی راهێنانی پلە بە پلەوە بەدەست دێت یان کارێکی هەنووکەییو دەست بەجێیە؟

کریشنا مۆرتی: راهێنان واتە لەبەرکردن واتە کات.

چوارەمین بەشداربوو: بەم پێیە بێت بەتەواوی دەتوانێت هەنووکەییو دەست بەجێ روویدات.

کریشنا مۆرتی: ئۆ! نەنە، بەرێز بەس گوێ بگرە ئەو شتێ بەمن دەڵێو دیارنامێنێت، ئەو منی بەتەنها لەلای زێڕو زیوێکی سەرسوڕهێن جێ هێشتووەو من سەرقاڵی تەماشاکردنی جوانی ئەوم. من ناڵێم ئەو بۆچی ئەوەی دا بە منو، ئەوە کێیەو.. هتد. ئەو ئەو زێڕانەی دا بەمنو گوتی بیگرە هاوڕێم، بەوە بژی خۆ گەر ناتەوێت توڕی هەڵدە" و من هەرگیز جارێکی تر ئەو نابینمەوە. مەفتونی ئەو زێڕانە بوومو ئەو زێڕانە دەست دەکەن بە ئاشکراکردنی شتگەلێك کە هەرگیز نەمبینیونو ئەو زێڕە دەڵێت لەنزیکترەوە هەڵمبگرە، تا زیاتر ببینی". بەڵام من دەڵێم. "من ژنم هەیە، منداڵم هەیە، چەندان دۆستو هاوڕێم هەیە، دەچمە زانکۆو ئیشو کارم هەیە، من ناتوانم ئەم کارە بکەم" لەبەر ئەوە ئێوە ئەو شتە دەخەمەوە سەر مێزەکەو خۆرنشین دەگەڕێمەوەو تەماشای دەکەم بەڵام زێڕەکان بێشەوق بوونو رەنگیان دۆڕاندوە. لەبەر ئەوە دەڵێن کە هەڵیبگرە یان رێزی لێبگرە، خۆشت بوێت، سەیری بکەو چاودێری بکە.

من هەوڵ نادەم کەسێك لەبارەی شتێکەوە قەناعەت پێ بکەم، من دەبینم کە زانست زۆر سنووردارەو دەشێت زۆر ترسناکو ژەهراویش بێت.

بەرێز من رۆژێك پێش ئێستا رێك پێش ئەوەی بێم بۆ هند، چاوم کەوت بەسێ پسپۆڕی بواری کۆمپیوتەر، پسپۆڕترینیان بوون، ئەوان بەشێوەیەکی قوڵ بەرەو ئەقڵو هۆشی دەستکرد هەنگاو دەنێنو هۆشی دەستکرد دەتوانێت زۆربەی ئەو شتانەی کە بوونەوەرە مرۆییەکان ئەنجامی دەدەن، ئەنجام بدات واتە شەڕ بکاتو زانستێکی سەرسوڕهێنو لەوەی ئێمە زیاتری هەبێت. کە زانستی ئینگلیزو ئەورووپاو فەرەنساو روسیاو هەمو ئاپانیشادهاو هەموو گیتاکانو

ئینجیلەکانو قورئانەکان هەموو شتەکانو... هتد لەخۆبگرێتو بەکردەوەش بیانکاتو پێتان دەڵێت کەچی بخۆنو چی نەخۆن، کەی بە مەبەستی پاراستنی سەلامەتیتان بۆ جێگەی خەوتن بڕۆنو کەی ناتوانن پەیوەندی سێکسی بکەن. ئەم کێشەیە بەشێوەیەکی جدی دەستی پێکردوە لەبەر ئەوە ئەگەر ئەو ئامێرە بتوانێت هەر ئەوەی کە من ناتوانم ئەنجامی بدەم، ئەنجام بدات، جگە لە بەستنی پەیوەندی سێکسی یان سەیرکردنی ئەستێرەکان ئەوکات چ کارەساتێك بەسەر مێشکی مرۆڤدا دەقەومێ؟ ئەی کەواتە نەفسی بوونی مرۆڤێك چییە؟ هەموو سەرگەرمی‌یەکانی تەکنەلۆژیای ئەمڕۆ، تۆپی پێ، تێنسو هتد بەداخەوە زۆر بەهێزن. لەبەر ئەوە ئەگەر مرۆڤ لەهەموو سەرگەرمیەکانا، کەسەرگەرمیە ئاینیەکانیش دەگرێتەوە. دیل بووبێت، جێگەو شوێنەکەی لەکوێیە؟ بەڕێز ئەم پرسیارە زۆر جدیە، نەك قسەیەکی ئاسایی.

دووەمین بەشداربوو: ئەم پرسیارە لەوکاتەدا کە گۆڕانو ئاڵوگۆڕی بەسەر مێشکدا دێت، گۆڕانێك کە زۆر پێشتر لەمێشکدا ئامادەیە ئیتر مەترەح نابێت چونکە مێشکی ئێستا، لەبەرکەرە و ئامێر، توانای لەبەرکردنێکی زۆر باشتری هەیە.

کریشنا مۆرتی: یەك توێژاڵو یەك پارچەی ناسك لەم مێشکە ئەلکترۆنیە شەش سەد ملیۆن وشە لەخۆیدا دەپارێزێت.

دووەمین بەشداربوو: هەموو کتێبخانەکانی جیهان دەچنە ئامێرەوە.

کریشنا مۆرتی: هەر ئێستاش ئاواییە. وانییە؟ وابێت دەبێت بۆچی من بچم بۆ کتێبخانە، بۆچی دەبێت گوێ بۆ ئەم هەموو هەڵەتو پەڵەتیە بگرم. کەواتە سەرگەرمی تاقی دەکەمەوە.

دووەمین بەشداربوو: یان گۆڕان.

کریشنا مۆرتی: کتو مت خۆیەتی. ئەمە هەمان ئەو پرسیارەیە کە لەسەرەتادا خستمانەڕوو.

دووەمین بەشداربوو: لەبەر ئەوە دووبارە گەڕاینەوە بۆ ئەم پرسیارە.

یەکەمین بەشداربوو: ئایا چاودێری کردن لەم وتەزایانەدا شوێنێکی هەیە؟

کریشنا مۆرتی: بەڵێ. بەڵام ئایا چاودێرییەك هەیە کە بەرنامەو پلانی نەبێتو پێی نەوترێت کە ڕاهێنان بکە، ڕاهێنان بکە، ئایا چاودێرییەك هەیە کە هیچ پەیوەندیەکی بەهیچ یەکێ لەوانەوە نەبووبێت؟ لەبەر ئەوە هەر ئەوەندەی من تەمرین دەکەم تا کەسێکی دەوڵەمەندم لێ دەربچێت ئامانجێکی عەمدیم هەیە.

لەبەر ئەوە ئەوەی ئێمە لەحاڵی حازردا ئەنجامی دەدەین ناتوانێت چاودێری بێت. لەبەر ئەوە ڕەنگە چاودێرییەك هەبێت کە هیچ پەیوەندیەکی بەم شتانەوە نەبێتو من دەڵێم چاودێرییەك هەیە کە بەم شێوەیە نییە.

دووەمین بەشداربوو: ئایا دەتوانین ئالێرەدا قسەو باسەکە ڕابگرین.

کریشنامۆرتی: بەڵێ هەر ئالێرەدا دەتوانین قسەو باسەکە ڕابگرین وەکو چیرۆکەکە.

## پەراوێزەکان:

1–بەشداری سەرەکی لەم منازەرەیەی کە لەگەڵ بودابیەکاندا سازکراوە "پاندیت جاگانات ئاپادهیایا" یە (Pandit Jagannath upadhaya)

2–deliberation.

تێبینی:

1–ئەم دەمەتەقێیە بەشی یەکەمی کتێبێکە بەناوی "ئابندە ئێستایە"

کە لەنووسینی "کریشنامۆرتی"یەو، "مرسدەلسانی" وەریگێڕاوە بۆ فارسیو دەزگای "انتشارات بهنام" ساڵی (1997)ی زاینی بۆی چاپو بڵاوکردۆتەوە. عنوانەکەش لەدانانی وەرگێڕی کوردیە.

2–وشەی ئیشراق– حاڵەتێکی ڕۆحیو فەلسەفیە

3–بەسیرەت، زۆر دووبارە بۆتەوە، بەواتای بینین بەچاوی دڵ، چاوڕوونی، بەرجەستەبوونی نادیارەکان لەبەرچاوی خاوەن بەسیرەتە تەواوەکان کە خەڵکی ئاسایی ناتوانن بیانبینن.



# رەخنەو تۆژینەوە

- رەخنەی نوێ، فۆرمالیزمی ئاکاری و...
- تیۆری ئەدەب چی یە؟



- پێکهاتە شکانی دەق



- دەربارەی ئایتماتۆف

# رەخنەی نوێ[7]،

# فۆرمالیزمی ئاکاریی‌و ف. ر. لیویس

■ رامان سێلدن، پیتەرویدۆسۆن

● و: کۆزاد

## شوێنەزاکان: ئیلیۆت و ریچاردز و ئێمپسۆن

شوێنزاکانی نەریتی زاڵی رەخنەی ئینگلیزی-ئەمریکایی لەسالآنی ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا (لەسالآنی 1920 وە تا 1970) وەکو هەڵوێستو کارکردە تیۆریو رەخنەییەکانیان ئاڵۆزو زۆربەی جاریش دژاو دژن. بەڵام بەکورتی ئەکرێ بڵێین کە کارتێکەریی ماتیو ئارنۆڵد، شاعیرو رەخنەگری ئەدەبیو فەرهەنگی سەدەی نۆزدەهەمی بەریتانیایی بەگشتی پێوە دیارە- بەتایبەت ئەو ئارنۆڵدەی پێشبینی کردبوو کە لەکۆمەڵی نوێدا دینو فەلسەفە جێگەی خۆیان بەشیعر ئەسپێرن، هەروەها رایگەیاند، کە فەرهەنگ وەك "باشترین شتێ ناسراوە کە بیری لێکراوەتەوە لە جیهاندا" ئەتوانێ لەبەرامبەر "پشێوی" کاولکەردا بەرگرییەکی مرۆڤ خوازانە بکات؛ ئەو پشێویەی کە دواتر ف. ر. لویس ناوی لێنا ژیاری "تەکنۆلۆژیکی بنتامی" کۆمەڵی شارستانی بەپیشەسازی کراو. لەسەدەی بیستەمدا، ئەو کەسەی کە بەشێوەیەکی سەرەکی بیری ئارنۆڵدی بەرەو بزاڤە رەخنەییە نوێکان راگوێزا، کاریگەرترین سیمای ئەم بزاڤانە چ لەبەریتانیاو چ لەئەمریکادا -شاعیرو شانۆ- نامەنووسو رەخنەگری ئەمریکایی (ودواتر دانیشتووی ئینگلیز) تی، ئێس، ئیلیۆت بوو.

بە ئاسانی ئەکرێ بڵێین کە بنچینەی تەوەرەیی دەورە جۆراوجۆرەکانی بیری نەریتی ئینگلیزی -ئەمریکایی کە لە سەرچاوەکانی

سەرەوە هەڵئەقوڵێن- ڕێزێکی زۆری تێکەڵ بە پیرۆزایەتیە بۆ خودی بەرهەمە ئەدەبیەکان، خاڵی بەرچاوی ئەم ڕوانگەیە سەرنجی گوماناوییە سەبارەت بە "خودی دەق" یاخود "وشەکانی سەر لاپەڕەی کاغەز"، ئەوەك شتێکی کەمتر یان پتر لەمە. بەرهەمە ئەدەبیەکان ڕواڵەتگەلێکن لەبابەت بایەخە مرۆییەکان کە دژی بەربەریەتی فەرهەنگی سەدەی بیستەم بەکاردێن. یاخود بەواتەی ئارنۆڵد، ڕەخنەی "بەرچاو" و "زانستی" و "بێلایەن" لەدەق -بەڵام گەوهەری ئەم ڕوانگەیە پیشاندەری تێگەیشتنێکی ئامانج خوازانەیە لەلایەنەکانی جوانیی ناسیی- مرۆڤ خوازانەی بەرهەمە ئەدەبیەکان. وشەی "ئەدەب" ئەخەینە ناو دوو کەوانە، چونکە یەکێ لەکاریگەرترین ئاکامەکانی ئەم نەریتە ڕەخنەییە -کە دواتر بەشێوەیەکی جیددی بونیادشکێنی کرا- سەرخستنی هەندێ بەرهەمی ئەدەبی بوو بەسەر بەرهەمەکانی تردا لەڕێگەی توێژینەوەی دەقەوە بەشێوەیەکی "بێ لایەن" و "ورد" (ئەو "وردبینی(1)" یەی ئەبێتە هۆی "پەی بردن(2)" کە هەردووکیان زاراوەی کلیلن لای لویس) بەواتایەکی دیکە، تەنیا شتێك لەبەرهەمە ئەدەبیەکان بە "ئەدەب" دائەنران (باشترین ئەو بەرهەمانەی بیریان لێ کرابووەوەو نوسرابوون)و ئەیانتوانی ببێتە بەشێك لە "نەریت" یاخود لەگەڵ زاراوەگەلی ئەمڕۆدا بچنە ریزی "بەرهەمی ڕەسەن"(3)ەوە. ("نەریت یەکێکە لەزاراوە کلیلەکانی ئیلیۆتو لویس و کتێبێکی بەناوی نەریتی مەزن نووسیوە). بەرهەمە ڕەسەنەکان بەپێی سروشتی خۆیان تایبەتیو خاوەن پلەی زنجیرەیین، خۆ ئەگەر ئەو مەیلە باوە بۆ جێکردنەوەی خۆیان وەك دیاردەیەکی ڕێوڕاست سروشتی نەبوایە، وا دیاری ئەدا کە بەشێوەیەکی دەستکردو بەهۆی هەڵبژاردنی عامیلی مرۆییەوە، واتە ڕەخنەگران"، بەرهەم هاتوون، مەبەست لە "سروشتی"، بێ چەندو چوونو پێویست کراو و ئاشکراو مەوجودە، نەك شتێ کە لە ئاکامی "پەی پێ بردنی" ڕەخنەیی، چەشنایی، باڵادەستیو ڕوانینی یەك لایەنەوە پێکهاتبێ.

بارودۆخی وەها زۆر جێگەی ترسەو بەشێکی بەرینی بەرهەمە ئەدەبیەکان لەبایەخ ئەخاتو بۆ توێژینەوەی جدی بەباشیان نازانێ. بەم هۆیەیە کە شۆڕشی ڕەخنەیی پاش 1960 ئەبێ لەرەمز دایماڵێو هەڵیوەشێنێتەوە بەچەشنێ کە بتوانین گشت بەرهەمە "دەستکورتەکان لەمەیانی ڕەخنەدا" - بۆنموونە، چیرۆکەکانی "گۆوتیك" و "جەماوەریی"، بەرهەمەکانی چینی کرێکارو ژنان- بۆ جارێکی تر لەفەزایەکی تاڕادەیەك ئازاد لەکۆتو پێوەندی هەڵسەنگاندنی ڕێ لێگر لەبەرنامەی کاردا دابنێین.

لەزۆربەی ئەو ڕوانگانەی تا ئێرە پیشانمان دان، تی. ئێس. ئیلیۆت دەوری تەوەرەیی هەبوو، هەروەها یەکێ لە یەکەمین گوتارەکانی بەناوی "نەریتو زەوقی تاکەکەس"(4) (1919) ڕەنگە بەتەنیا کاریگەرترین نووسراوە بووبێ لەڕەخنەی ئینگلیزی- ئەمریکایی دا. ئیلیۆت لەم گوتارەدا دوو خاڵی تایبەت ئەخاتە بەرسەرنج. ئەو جەخت لەسەر ئەوە ئەکات کە پێویستە نووسەران هەستی مێژوویان هەبێت -واتە هەستێك لەو نەریتی نووسینە کە پێویستە خۆیانی تیا جێگیر بکەن؛ ئەمەش کە وەها هەستێك ئەبێتە هۆی بەهێزبوونی پرۆسەی "ناخۆیی بوون"ی هونەرمەند؛ پرۆسەیەك کە ئەگەر هونەر بیەوێ "ناخۆیی" ببێت و "لەزانست نزیك بێتەوە" ئەبێ ببێتە خاوەنی. ئەو لەرستەیەکی بەناوبانگدا ئەنووسێ: "شیعر بەرەڵلا کردنی بێ کۆتو بەندی

عاتیفە نیە، بەڵکو دەربازبوونە لەعاتیفە؛ دەربڕینی کەسایەتی نیە، بەڵکوو دەربازبوونە لەکەسایەتیی" شاعیر(5) ئەبێتە چەشنی "ناوبژیوانی" ناخۆیی ئەزموون؛ نێواندارێك کە لە "ئاگایی" یاخود "کەسایەتیی" هونەرەوە سەرچاوە ناگرێ، بەڵکو لەشتێکەوە سەرچاوە دەگرێ کەلە کۆتاییدا "نێوانداریی دەربڕین"- واتە شیعر- و تەنیا شتێك کە حەزی ئێمەیە پێك ئەهێنێ. ئیلیۆت لەرستەیەکی بەناوبانگی تریداو لەگوتارێکی دیکەدا ("هاملێت" 1919) بەرهەمی ئەدەبی بە "هاوبەندیی بەرچاو"(6)ی ئەزموونێك دائەنێ کە بۆتە پێکهێنەری: چەشنێ بەرهەمهێنانەوەی ناخۆیی کە بابەتی سەربەخۆی سەرنجە، ئەم تێگەیینە لەگەڵ چەمکی "وێنە" کە لە تێگەیینی ئەزرا پاوەندا سەبارەت بە شیعر دەوری هەیە، هەروەها لەگەڵ چەمکەکانی ئیماژیسمو ئەزموونی شیعری خودی ئیلیۆتدا پەیوەندیەکی نەپساوەی هەیە. لەگشت ئەم روانگانەوە ئەو شتەی لەگۆڕانکاریە چەند لایەنەکانی رەخنەی نوێدا روو دەرئەخا، کارتێکەری بەرواڵەت دژ بە رۆمانتیکی بیری ئیلیۆتە (چەشنی کلاسیزمی نوێ)، جەخت کردن لەسەر "زانست" و "بەرچاوەتیی" و "ناخۆیی بوون" و "نێوانداریی دەربڕین" وەکو بابەتی تەوەریی توێژینەوە؛ هەروەها چەمکی "سوننەتی" لەبابەت بەرهەمە ئەدەبیەکان، کە لە "نێوانداریی دەربڕین"دا خۆی (نێواندارێك کە پێکهێنەری ئەو بەرهەمانەیە) بەباشترین شێوە خاوەنی "گەوهەری" ئەزموونی مرۆیین.

لەسالانی پاش شەڕی یەکەمی جیهانیدا، کاتێ ئیلیۆت ئەم بیرانەی خۆی بەرین ئەکردەوە "ئەدەبی ئینگلیزی" بە تایبەت لەزانکۆی کەمبریجدا، بوە یەکێ لەرەسەنترین وانەکانی- بەگومانی هەندێکیان، تەنیا وانەی گرنگی- هونەر.

لەگەڵ ئەم پرۆسەیەدا وەچەیەکی لاوتر لەزانکۆییەکان هاتنە سەر ئەوەی کە لەنەریتی رەخنەیی "جوانیی کەلام"(7) کەتا ئەو سەردەمە ئەدەبی ئینگلیزی لەدەوری خۆی کۆکردبوەوە تێپەڕێنن. بەواتایەك ئەتوانین بڵێین کە ئەوان یەکەمین لایەنگرانی رەخنەی "کردە" بوون کە لەدەروونی زانکۆوە کاری خۆیان دەست پێ کردو درك پێکردنە رەخنەییەکانی ئیلیۆت پتر لە هەموان ئەم تاقمەی شەیدای خۆی کرد. لەجێی خۆیدایەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەم قوتابخانەی رەخنەی نوێیە لەگەڵ مۆدێرنیزمی ئەدەبیدا هاوژینایەتی تەواوی هەبوو و لەگەڵ دامەزراندنی کارەکەیان لەسەر ئەم تاقمە بەرهەمە، ئەوانەیان وەك نموونەی توێژینەوەی کاری خۆیان دانا؛ ئەم باسە چ لەم بابەتەی ئێستا لێی ئەدوێینو چ لە بابەت شاڵاوەکانی دوایی تیۆری رەخنەیی هاوچەرخ بۆ سەر نەریتی کۆنینەو هاودەنگ بوونی لەگەڵ پۆست مۆدێرنیزمدا بەراست ئەگەرێ. رەنگە بکرێ بەئاسانی بڵێین کە ئەم بزاڤە رەخنەییە نوێیە، رەخنەی "مۆدێرنیستی" بوو.

ئای. ئا. ریچاردز، ولیەم ئێمپسن، دواتریش ف. ر. لویس لایەنگرانی سەرەکی ئەم تێگەیینە نوێیەی ئەدەبی ئینگلیزی بوون لە زانکۆی کامبریجدا. ریچاردز کە بواری کارەکەی فەلسەفە (جوانیی ناسییو دەروون ناسییو واتا ناسیی) بوو، کتێبە کاریگەرەکەی خۆی، واتە بنچینەکانی رەخنەی ئەدەبی(8) لەساڵی 1924 دا نووسی. ئەو لەم کتێبەدا هەوڵیدا بەشێوەیەکی داهێنەرانە بناغەی تیۆرێکی روون بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی پێشکەش بکات. ریچاردز بەدەربڕینی ئەم تیۆریە

که ڕەخنە ئەبێ لاسایی وردبینی زانست بکاتەوە، هەوڵیدا خوو و ڕەوشتی تایبەتی زمانی ئەدەبی دەربڕێو لەنێوان زمانی "عاتیفی" شیعرو زمانی "گەڕانەوە"ی گوتاردا جیاوازی دابنێ. (کتێبی دواییشی بەناوی زانستو شیعر(9) لەساڵی 1926دا چاپ کرا). بەرهەمی کاریگەرتری ئەو چ لەبارەی ناو و چ لەبارەی ئەزموونێك کە دەربڕە، کتێبی ڕەخنەی کردەوە(10) (1929)یە. لەم کتێبەدا نموونەگەلێکی لەهەوڵەکانی قوتابیەکانی بۆ توێژینەوەی شیعر گەلێکی کورت، کەشاعیرەکانیان دیار نەبوون پێشکەش کردو پیشانیدا کە ئامرازی ئەوان بۆ خوێندنەوەی شیعر چەندە بێ برشتەو هەوڵیدا بنچینە بنەڕەتیەکانی خوێندنەوەی شیعر دابمەزرێنێ. ڕەخنەی زانستی چ لەوڵاتە یەکگرتووەکان چ لەبەریتانیادا بوو بە ئامرازی سەرەکیو داسەپاوی ڕەخنەییو فێرکاری دەورەکانی فێرکردنی باڵا (و پاشان دواناوەندی) ی ئەدەبی ئینگلیزی -ئەم لایەنگرییە- بە گورجیو بەشێوەیەکی کاولکەر، بێ ئەوەی بچێتە قاڵبی تیۆرییەوە، وەك چەشنی ئەزموونی ڕەخنەیی بناغەیی بووە شتێکی سروشتی. بەهەرحاڵ چاکی ئەم ڕوانگەیە لەوەدا بوو کە خوێندنەوەی وردی بۆ دەقەکان پێشنیار ئەکردو تاقانەیی فیکریو مێژوویی‌یەکەی هاندەری چەشنێ دیموکراتیزە بوونی خوێندنەوەی ئەدەب بوو لە پۆلەکاندا. لەم پۆلانەدا گشت قوتابیەکان لەبەرامبەر دەقێکی "کوێر"دا لەشوێنێکی هاوساندا بوونو ئەمەش خاڵێکە کە لە باسی ڕەخنەی نوێی ئەمریکاییدا دیسان پێ لەسەری دائەگرینەوە. هەڵبەت ڕووبەڕووبوونەوەی نالەباری یارانی ئەم بیرە لەبابەت ڕەمز سڕینەوەی داهێنانی تیۆری بیست ساڵی پێشووەوە، جێی داخ بوو. ریچاردز لەساڵی 1929دا کەمبریجی بەجێ هێشت و پاشان لەزانستگەی هارڤارد خەریکی دەرس گوتنەوە بوو. کارتێکەری ئەو بەتایبەت لەکەنالی ڕەخنەی کردەوەوە گۆڕانکاریە ناوچەییەکانی ئەو وڵاتەی کە لەهەمان کاتدا ئەچوونە بەرەوە، پایەدارتر کرد.

ولیام ئێمپسن کە دەورەی لیسانسەکەی لەماتماتیکەوە بۆ ئەدەبی ئینگلیزی گۆڕیو بووە قوتابی ریچاردز، بەهۆی یەکەمین بەرهەمی بەناوی حەوت جۆر نادیاری(11) (1930) گرنگترین کەسایەتی باسەکەی ئێمەیە لەم مەیانەدا. ئەو ئەم بەرهەمەی زۆر زوو -واتە ئەوکاتەی هێشتا قوتابی ریچاردز بوو- بەخێراییەکی سەرسامکەر نووسی. تاکرێ ڕێو ڕاست ئێمپسن بخەینە جەرگەی یارانی ڕەخنەی نوێوە (بەرهەمو چالاکیەکانی دوایی ئەو ئەم بەرچەسپە پووچەڵ ئەکەنەوە)، بەڵام ئەم یەکەمین کتێبەی بەجەخت کردن لەسەر نادیاری وەك سیفەتی لەپێشی زمانی شیعریی) کاری جوانو مامۆستایانەی ئەوی لەمەیانی "ڕەخنەی کردەوە"ی داهێنەرو وردا، هەروەها جیاکردنەوەی دەقە ئەدەبیەکان لەو تێکتەندراویەی تیایدا جێگیر بوو لەپرۆسەی "خوێندنەوەی" نادیاریەکانیان، بەتایبەت لەڕەخنەی نوێدا کاریگەر بوو.

## ڕەخنەگرە نوێکانی ئەمریکا

قوتابخانەی ڕەخنەی نوێی ئەمریکا کە لەسالانی 1930 کاندا دامەزرا، بەتایبەت لەساڵەکانی 1940و 1950دا سەرکەوتوو بوو. ئەمەش بەرامبەر بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕەخنەی پیشەیی نوێ لەبەریتانیا، کە لەسەردەمی گۆڕانی "ئەدەبیاتی ئینگلیزی" دا لە ساڵەکانی نێوان دوو شەڕی جیهانیدا، بوو بە

رستەیەکی زانکۆیی. وەك شتی تری لەم چەشنە، ئەو شوێنەزاو دەربڕینانەی بوونە هۆی پەیدابوونی قوتابخانەی رەخنەی نوێ -لەرۆژانی برەویدا تا سنووری رێبەرایەتی رەوتی رەخنە- ئالۆزو لەئاکامدا نادیارە. بەلام لەم بوارەدا ئەکرێ بیروڕاگەلێ پێشکەش بکرێ، یەکەم ئەوەی کە کۆمەڵێك لە کەسایەتیە دیارەکانی ئەم قوتابخانەیە، ئەندامی دەستەیەك بوون بەناوی "وەرزێرەکانی باشوور" یان "پەنابەرەکان". ئەمانە تاقمێك بوون سوننەتی نەرم برِو سەر بە بزاڤی باشوور کە لەگەل بە پیشەسازی کردن و ماتریالیزمی سەرسەختانەی ولاتە یەکگرتووەکانو زاڵیەتی باکووردا دژایەتیان ئەکرد. بەبێ ئەوەی پێك گرتنەکە زۆر هەراو بکەینەوە، ئەکرێ چەشنێ پەیوەندی خزمایەتی لەگەل ئارنۆڵدو ئیلیۆتو دواتریش لویس دا لەبابەت دژایەتی کردنیان لەگەل ژیاری "ئانۆرگانیك"ی نوێدا دەربخەین. دووهەم، سەردەمی لوتکەی کاریگەریی رەخنەی نوێ، هاوکات بوو لەگەل شەڕی دووهەمی جیهانیو بەدوای ئەویشدا شەڕی سارد. ئەکرێ بەجوانی ببینین کە بە بالاتر دانانی دەقە ئەدەبیەکان ("رێکو پێکی"و "هاوکۆکی"و "مەزنایەتی بەخشین" بەهۆکارە ئاشکرا مێژووییو ئایدیۆلۆژیەکان) و توێژینەوەی "ناخۆیی" ئەو شتانەی ئەیانکاتە بەرهەمی مەزنی هونەری(12)، ئەکرێ دەربڕی هەولی رۆشنبیرانی بەخۆ نامۆ و وەچەیەکی پوختەی قوتابی هێمن خوازبێت بۆ دۆزینەوەی پەناگەیەك. سێهەم، لەگەل زیادبوونی لەرادەبەدەری ژمارەی قوتابیەکان لە ولاتە یەکگرتووەکان لەم سەردەمەدا کە وەچەی دووەم (چێشتی مجەور)ی ولاتە یەکگرتووەکانی دابین ئەکردە قوتابخانەی رەخنەی نوێ بەبنچینەی "رەخنەی کردەوە" کەیەوە لەڕووی ئابووری راهێنانەوە شیاو بوو (ئەم بوارەش هەبوو کە نوسخە گەلێك لەدەقە کورتەکان لەنێوان گشتیاندا بلاوبکرێتەوە)؛ هەروەها شێوەیەك بوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی لەگەل کەسانێکدا کەمێژوویەك "هاوسانیان نەبوو. بەواتایەکی تر، سروشتی نامێژوویی و "بێ لایەن"ی -تەنیا توێژنەوەی "وشەکانی سەر لاپەڕەی کاغەز"- چالاکی بەڕواڵەت یەکسان خوازانەو دێموکراتیکی هەبوو، کە لەگەل ئەزموونی نوێی ئەمریکاییەکاندا تەبا نەبوو. (فرانك لنتریچیا لەکتێبە گرنگەکەیدا بەناوی پاش رەخنەی نوێ(13) 1980، هەولیدا هێڵی گۆڕانەکانی تیۆری رەخنەیی ئەمریکا (77-1955)ی پاش "مەرگی" رەخنەی نوێ لەسالانی ناوەڕاست تاکو کۆتاییەکانی 1950 بکێشێ.)

بەلام رەخنەی نوێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی شوێنەزا کۆمەلایەتی-فەرهەنگیەکەی؛ لەبواری بەپێویست دانانو کردەوەدا بەڕوونی پێناسەکراوە: ئەم قوتابخانەیە لەگەل بواری رسکانی بەرهەمە ئەدەبیەکان -بواری مێژوویی و ژیان نامەییو رۆشنبیریو ئەم جۆرە شتانە-دا سەروکاری نیە؛ حەزی لە "بەهەلەبردنی مەبەستی نووسەر" یاخود "کارتێکەریی" نیە؛ تەنیا خۆی بە "خودی دەق" و "زمان" و رێکخستنی ئەوەوە خەریك ئەکات؛ بەدوای واتای دەقەوە نیە، بەلکوو ئەیەوێ بزانێ دەق چۆن چۆنی "خۆی دەرئەبڕێ" (بڕواننە شیعری ئارچیبالد مەکلیش بەناوی "هونەری شیعر" کە بۆخۆی یەکێکە لە بەلگە کورتەکانی رەخنەی نوێو ئاواش دەست پێ ئەکات: "شیعر نابێ واتا بەدەستەوە بدات، ئەبێ هەبێت)؛ ئەم قوتابخانەیە بەدوای ئەوەوەیە کە بزانێ چۆن بەشە جۆراوجۆرەکانی دەق پێکەوە

ئەبەستریێنەوە، دەق چـۆن "ڕێکیـەتی"و "هاوسانی" ئەدۆزێتـەوە؛ "تـەنز" وە نواندنـی دژایەتی"و "تەنشت"و "ئاماژە"و "نادیـاری"، لەخۆیدا جێدەکاتەوەو ئەتوێنێتەوە لەبنەڕەتیشدا بەدەربڕینی خودی "شیعر بوونەوە"(14) یاخود گەوهەری ڕواڵەتی خودی شیعرەوە خـەریك ئـەبێ (کە بەشێوەیەکی ئاسایی شیعرێکە، بەڵام بڕواننە بەشـی تایبـەت بـەمارك شـورەر لـە درێـژەی باسەکەدا).

**رانسۆمو بروکس**

یەکێ لەگوتارە سەرەتاییو بنچینەییەکان کـە رەخنەی نوێ چوارچێـوەی خـۆی تیـا دەرئـەخا، وتاری "کۆمپانیای گشتی رەخنە"(15) نووسینی جـان کـرۆو رانسـۆمە. (رانسـۆم لەساڵی 1941 دا کتێبێکـی بـەناوی رەخنـەی نـوێ سـەبارەت بـە ئیلیـۆتو ریچاردز و دیتران نووسیو ئـەم بزاڤـە ناوی خـۆی لـەم کتێبـەوە پـێ بـڕا.) رانسـۆم کـە یـەکێك بـوو لەئـەندامانی گرووپـی "پەنابـەران" و ویراستاری بڵاوکراوەی کنیـون ریویـو 59-1939، یاسا بنچینەییەکانی ئەم قوتابخانەیە بەم چەشنە دائـەهێنێ: "کۆمپانیـای گشـتی رەخنـە" کـاری کردەکانـە، بەتایبـەت مامۆسـتایانی ئـەدەب لـەزانکۆکانا بـە رەخنـەی ئـەدەبی "کردەوییـتر، یـاخود ورد "وسیسـتماتیك بیـت"؛ قوتابیـەکان پێویستە "خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەدەب بن، نەك تـەنیا دەربـارەی ئـەدەبیات بخوێننـەوە، ئیلیـۆت ڕاستی ئـەکرد کـە ئـەیگوت ئـەدەبی ڕۆمـانتیك لـەباری "بـەرچاوەتی" یـاخود "مـەودای جوانیـی ناسـیەوە" کـەمو کورتـە؛ رەخنـە وتەزایـەکی رەوشتیو زمانیی یاخود مێژوویی نیـە، ئەمانـەش بەتـەنیا ئـامرازی کۆمـەگین، رەخنـەگر پێویسـتە بتوانێ نەك هـەر "نـاوکی پەخشـان" کـە شیعری پێ کـەموکورت ئەکرێتـەوە پیشـان بدات؛ بـەڵکو پێویسـتە بتوانـێ پـەی بـە "جیاوازیـەکان"و "پاشماوە" یاخود بەو "چنینـە" بـەرێت کـە ئەبێتـە هـۆی ئـەوەی بابەتەکـە چلۆنایەتیـەکی شـاعیرانەو پوختـەی هـەبێت. لەڕوانگـەی رەخنـەگرێکی کـردەوە تایبەتمـەندی شـیعر لەشـێوەی نومایشـت کردنـی ئـەم چلۆنایـەتی پاشماوەیەدایە.

کلینت بروکس لەبەرهەمەکانی خۆیدا کاربردی کردەوەیی زۆربەی ئەم یاسایانەی پیشان داوە. ئەو یـەکێ لـە کەسـەیاتیە زانکۆییـەکانی گرووپـی "پەنابـەران" و ویراستاری بڵاوکراوەی سادێرن ریویو (لەگەڵ پێن ڤـارن" بـوو لەمیانـەی ساڵانی 42-1935 داو یـەکێ لـەکردەترینو دیـارترین کەسایەتیەکانی رەخنەی نوێ بوو. زوربەی کەس پیيان وایە، کە دوو بەرهـەمی هـەرەوەزیی ئـەو و ڤارن بـەناوی درکی شیعر(16) (1938) و درکـی داستان(17)(1943)، رەخنەی نوێی لەناو چـەند وەچـەی زانکۆییـەکانی ئـەدەبیات لـەزانکۆکانی ئـەمریکادا بـرەو پێداوە. بـەڵام بەرجەسـتەترین بەرهەمی ئەو لەبواری خوێندنـەوەی وردی دەقدا بـەناوی گۆڵدانـی جـوان داڕێـژراو: چـەند توێژینەوەیەك لە پێکهاتەی شیعردا(18) (1947) کـە تیـایدا وتـاری "مێژووناسـی لادێـی کیتـس: مێـژووی بـێ ژێرنـووس"(19) (1942) لەڕوانگـەی ئێمەوە بەرجەستەترین نمونەی رەخنـەی نوێیـە. بروکس نووسراوەکەی خـۆی بەهێنانـەوەی دێڕە سـەرەتاییەکانی شـیعری "هونـەری شـیعر" هۆنراوەی ئارچیباڵد مەکلیش دەسـت پـێ ئـەکات (کە لەبـەرا باسـی کـرا) بـە ئیلیـۆتو چـەمکی "هاوبەندیی بەرچاوی"ی ئەوەوە خەریك ئـەبێت؛ بابەتیـەتی ژیاننامـە پووچـەڵ ئەکاتـەوە؛ زاراوە گەلێکی وەك "تایبەتمەندی دراماتیك"و "تـەنز"و

"دژه نوێنــــی" و "چنینــــی ئورگــــانیك" لـــــه سەرتاسـەری بەرهەمەکـەیدا بـەزۆری دووپـــات ئەکاتەوە؛ بەچەشنێ خوێندنـەوەی دوورو درێژی ئەم شیعرەوە خەریك ئەبێتو سۆراخی روانگـەی "زانایانــە" و کۆتاییەکــەی لــەتوخمی تــەواو ئۆرگانیکی گشتیەتیەکەیدا ئـەکات؛ بە بـەردەوام لــە ئاســتێکی بــەرزتر لــەمێژووی راســتەقینەی "شەروئاشتی"و "زەینگەلی خاوەن کاتی ئێمە" و "گردو کۆی بێ واتای واقیعیەکان" و گشت گیری زانستیو فەلسـەفی زاڵ بـەمل جیهانی ئێمـە"دا، ستایشــی مێــژووی شــیعر ئــەکات؛ ستایشــی "روانینی شیعر بۆ دەروونی حەقیقەتی گەوهـەری ئەکات؛ بەبایەخی شیعر لەزەینی ئێمەدا پایـەدارو چەسپاو ئەکات (لەسـاڵی 1942، لەگەرماوگـەرمی کابووسی مێژووی سەردەمی شەڕ) هەر بەم هۆیـە کە وەکو گوڵدانەکەی کیتس شتێکی "زۆر بـەرزتر لە خولیـای مرۆڤانـە هەڵئـەمژێ". بـەم چەشــنە لەسەر ئەم راستیە تەنزاوییـە جـەختو پێداگری ئـەکات کە هـەموو حـەزو هەستی مـرۆڤ، پیـاو بــەبێزاری ئەهێڵێتــەوە، کەواتــە هونــەر لەهــەر گەوهـەرێك باشـترە" (بەمەبەستی خوێندنـەوەی نموونەیی کە رامان سێلدێن لەرووبەڕوو بوونەوەی قوتابخانەی رەخنەی نوێدا–بەپێی بەرهەمـەکانی بروکس– لەگـەڵ کیتـس دا پێشکەشی کـردوە، بروانــە کتێبەکــەی بـەناوی تیــۆری ئــەدەبیو رەخنەی کردەوە(20)، تەوەری 1، بەشی 2).

## هەڵەی "ئەنقەست(21) و "بزوێنەر"(22): ویلسەت وبیردزلەی

لەو رووەوە کە رەخنەی نوێ، بەپێی پێناسە، چەشنێ "کردار"، بنەما "تیۆری" یەکەی پتر لە چوارچێوەی گوتـاری کـردەوەدا دەربـڕاوە (وەك ئەو کتێبانەی ئاماژەیان بۆ کرا)، لەم مەیانەشدا، بابەتی تیۆری کـەمترە (لـەدرێژەی بابەتەکـەشدا لیویس خـۆی لەداڕشـتنی چوارچێـوەی تیـۆری پێگـەی خـۆی یـاخود خـەریکبوون بـەدەربڕینی "فەلسەفەی" ئەبوێرێ). بەڵام لەم قوتابخانەیەدا دوو نوسـراوە کۆکراوەتـەوە کـە تیـۆری رووتــنو لەباسی رەخنەی نوێدا بوونەتـە دەقـی کاریگـەر. ئــەم دوو نووســراوەیە بریتــین لــە: "هەڵـــەی ئەنقەسـت" و "هەڵـەی بزوێنـەر" نووسـراوەی و. ك. ویمســەت، مامۆســتای ئــەدەبی ئینگلــیزی زانکۆی ییڵو نووسـەری کتێبێك بـەناوی رواڵـەتی گوتار: توێژینەوە لـەواتای شیعردا(23) (1954)، ئــەم بەرهەمــە بــەهاوکاری مامۆســتای جوانیــی ناسیی، مۆنرۆسی بیردزلـەی نووسـراوە. بابـەتی هەردوو نووسراوەکە لـەژێر کـارتێکردنی ئێلیـۆتو ریچـاردز بەخسـتنەرووی پـەیوەندی "نــێرەر" (نوسەر) "هــەواڵ" (دەق) –"وەرگـر" (خوێنـەر) لەسـەرەتای کارەکـەدا سـۆراغی رەخنەیـەکی "بـەرچاو" ئەکـەن. ئـەو رەخنەیـە کـە شـتە خۆییەکانی نووسـەر ("قەسـت") و کاریگـەریی عاتیفی بەرهـەم لەسـەر خوێنـەر ("کـارتێکردن") پووچەڵ ئەکاتەوە تاکوو بەتەنیا بە لێکۆڵینەوەی "وشەکانی سەر لاپـەڕەی کاغـەز" و بەچۆنیـەتی "کارکرد"ی بەرهەمی هونەرییەوە خـەریك بێت. نووسراوەی یەکـەم لـەم بابەتـە ئەکۆڵێتـەوە کــە "شتێك بـەناوی نەخشـە یـاخود قەستی نووسـەر وەك پێوانەیەك بۆ داوەری کردن سـەبارەت بــە ســەرکەوتوویی بەرهــەمێکی ئــەدەبی، نــە لەگۆڕێدایەو نـە باشـە؛ ئەمەیە شیعر؟ جیهانێك لەوپـەڕ دەسـەڵاتی نووسـەر بـۆ قەسـت کـردن سەبارەت بە (شیعر) یان نواندنی زاڵبـوون بـەملیا "پـەیوەندی بەگشتەوە هەیە"؛ ئەمـە کـە شیعر ئەبێ لەزمان "بێژەری دراماتیك"ی دەقەوە درکی

پێ بکرێ، نەك نووسەر هەر لەسەر؛ ئەم بنەمایەش داوەری ئەکرێ کە "کارکردێکی" هەیە یان نا، تا ئەمرۆکەش زۆربەی باسە رەخنەییەکان شەیدای شوێنگەی قەست بوون لە رەخنەدا، ئەم ئاراستەیە هەروا بەردەوامە. هەڵوێستی ویمسەت وبیردزلەی هەتا رادەیەك چەمکی پاش بونیادگەری "مەرگی نووسەر" (بڕواننە تەوەرە 3) و روانگەی بونیادهەڵوەشێنەکان واتە قوتارکردنی دەق لەپەیوەندی "ئامادەبوون" و "واتا" مان بیر دەهێنێتەوە. بەڵام ئەم لێکچوونە هەر لێرەدا کۆتایی پێ دێت. چونکە رەخنەگرە نوێکان هێشتاش لەسەر ئەم بابەتە پێداگری ئەکەن، کە چەشنێ "شیعری لەخۆدا" چەسپاو و لەرووی بوون ناسیەوە پایەدارە لەگۆڕێدایە کە داوەری کۆتایی ("گوزارە") کەی خۆیەتی‌و چەشنێ رەخنەی "بەرچاو" هەڵئەگرێ. ئەم روانگەیە کوتومت دژایەتی هەیە لە تەك تێگەیینی بونیاد هەڵوەشێنەکانا کە "شیاوەتی پات بوونەوەی"(24) دەقێك لەشوێنگەی جۆراوجۆردا بەپێی خوێندنەوەی جۆراوجۆرە.

ئەم جیاوازییە لەنوسراوەی دووهەما روونتر دیارە. باسی ئەم نووسراوە ئەوەیە کە "هەڵەی کارتێکردن" نومایشت کەری چەشنێ پێکداچوونی شیعرو ئاکامەکانیەتی: "هەوڵدان بەمەبەستی دەرکێشانی پێوانەی رەخنە لەئاکامی دەروونناسانەی شیعر.. ئەگاتە تێگەیینگەری و درێژەخوازی" ئەم نووسراوەیە "بەرچاوەتی کلاسیکی" رەخنەی نوێ لەبەرامبەر "دەروونناسی خوێنەری رۆمانتیك" دا دائەنێ‌و بانگەشەی ئەوە ئەکات کە ئاکامی هەردوو هەڵەکە ئەوەیە کە "شیعر لەخۆیدا" وەك بابەتی تایبەت بەداوەری کردنی رەخنەیی تیا ئەچێت". بەواتەی رەخنەی نوێی کلاسیکە، بایەخی شیعر لەوەدایە کە بەپایەدارکردنی عاتیفەکان وشیاری درك پێ کردنی بەردەوامتری‌و لەئاکامدا هێشتنەوەی واتای روون‌و تێکتەندراوی پوختەیی‌و هاوسەنگی‌و تەنشتی شیعری، نومایشتکەری وردترین راپۆرتی عاتیفی سەر بەدابو نەریتە. بەکورتی ئەتوانین بڵێین ئەگەرچی فەرهەنگەکان گۆڕاون، شیعر ئەمێنێتەوەو دەرئەبڕێ. بەواتایەکی تر شیعر میراتی فەرهەنگیی‌و بەرهەمی هونەری پایەدارو بایەخداری ئێمەیە؛ جیاوازیە گەورەکانی زۆربەی هەڵوێستە تیۆریەکانی ئەم چەرخەش هەر لەم خاڵەدا شاردراوەتەوە.

**جوانکاریی وەك دۆزینەوە: مارك شوورەر**

لەئەنجامدا لەبواری رەخنەی نوێی ئەمریکادا پێویستە بەکورتی باسی مارك شوورەر بکەین. شوورەر مامۆستای ئەدەبیاتی ئینگلیزی برێکلی کالیفۆرنیا بوو. لەدوو نووسراوەیدا بەناوی "جوانکاری وەك دۆزینەوە"(25) (1948) و "داستان‌و چوارچێوەی پێوانە(26)" (1949) هەوڵیدا ئەزموونی رەخنەی نوێ کە لەرووبەرێکی بەرین‌و ئاڵۆزدا لەبواری شیعردا بەکارگیرابوو، بواری چیرۆکی پەخشاندا بهێنێتە ئاراوە. شوورەر لەنووسراوەی یەکەمدا ئەڵێ: "رەخنەی نوێ پیشانی داوین، کە قسەکردن سەبارەت بە ناوەرۆك بەهیچ جۆرێ بەواتای قسەکردن سەبارەت بەهونەر نیە، بەڵکو (ناوەرۆك) دەربڕینی ئەزموونە؛ تەنیا کاتێك کە باسی ناوەرۆکی بەدی هاتوو(27)، یان فۆرم، یان بەرهەمی هونەری ئەکەین وەکوو بەرهەمێکی هونەری لەپلەی رەخنەگردا جێگیر ئەبین. جیاوازی نێوان ناوەرۆك یان ئەزموون‌و ناوەرۆکی بەدی هاتوو یان هونەر، جوانکاریە. ئەو دیسان

ئەڵێت کە ئەم بابەتە لەرەخنەی رۆماندا کاری نەکردووە؛ بەجوانکاری رۆمان زمانەو "ناوەرۆکی بەدی هاتوو"شی-یان دۆزینەوەی ئەو شتەی ئەیڵێ- وەکو شیعرو تەنیا ئەتوانین بەیارمەتی ئەم "جوانکار" یە توێژینەوەی لەسەر بکەین.

شوورەر لە نووسراوەی دووهەمیا توێژینەوەکەی سەبارەت بە زمان هەراوتر ئەکاتەوەو تێگەیینی نائاگایی لەوێنەکانی خەیاڵو هێماخوازی ئەخاتەروو، کە لەوپەڕی قەستی نووسەردا لەهەموو شێوەکانی چیرۆکدا ئامادەیە- نەك، تەنیا ئەو چیرۆکانەی کە چەشنە گوتارێکی "شاعیرانە" بەرجەستە ئەکەنەوە. ئەو ئەم شتە ئەخاتە روو کە چۆنیەتی "واتای" لەبەرچاوگیراوی نووسەر کە زۆر جار لەگەڵ چەمکی رواڵەتی بابەتەکەدا دژایەتی هەیە، لەچوارچێوەی زمانێکی لێکچوودا جێگیر ئەبێ، کە دەق پێك ئەهێنێ. وەك دیارە ئەم تیۆریە لەگەڵ تیۆرییەکانی پاش بونیادگەری دوایدا چەند پەیوەندیەکی هەیە، چونکە تیۆریەکانی پاش بونیادگەریی بەچەمك گەلێکی وەك "بێدەنگیەکان" و "دابڕانەکان"و "سەرخۆشیەکان" و "دیاری" دەروونی گشت ئەو دەقانەوە خەریك ئەبن کە بەرواڵەت پایەدار ئەنوێنن. هەرچەند شوورەریش بۆخۆی لەپلەی یەکێ لەیارانی قوتابخانەی رەخنەی نوێ‌دا، بونیادی رۆمانە مۆدێرنەکان هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵام یەکپارچەیی "جوانکاریی" ئەمانە لەگەڕان بۆ زاڵکردنی "گشتیەتی خودئاگایی مودێرن.. ئاڵۆزی رۆحی مودێرن" دووپات ئەکاتەوە. رەنگە واچاك بێت کە پەیوەندی نێوان رەخنەی نوێی ئەمریکاو شوورەر فۆرمالیزمی ئاکاریی ئینگلیزی ف. ر. لیویس بدەینە بەر سەرنج کە لەهەندێ لەناوازەترین رەخنەکانیا سەبارەت بەچیرۆك لەسالانی 1930 و پاش ئەوەش، دروشمی "رۆمان وەك شیعری شانۆیی" هێنایە گۆڕێ.

**قوتابخانەی شیکاگۆ: رەوانیەتی چیرۆك**

وەك ژێرنووسێك سەبارەت بە رەخنەی نوێ‌و بەر لەوەی بچینە ناو باسی تیۆریەکانی لیویسەوە، جێی خۆیەتی ئاوڕێك لە بزاڤێکی ئەمریکایی دیکە بدەینەوە، لەمیانەی سەدەی بیستەم داو بەتایبەت لەمەیانی توێژینەوەی چیرۆکدا کاریگەر بوە: ئەم بزاڤە بە قوتابخانەی شیکاگۆی نۆ ئەرەستووییەکان(28)" ناوی دەرکردوە. نۆ ئەرەستووییەکان کە لەکۆتایی سالانی 1930 داو سەرتاسەری سالانی 1940و 1950 کاندا لەدەورەی ر. س. کرین لەزانکۆی شیکاگۆ کۆببونەوە، لەرووی تیۆرییەوە رەخنەگرانی قوتابخانەی رەخنەی نوێیان کێشایە ناو (مەیانی) بەربەرەکانیەوە، بەڵام لە توێژینەوەکانیانا سەبارەت بە بونیادی رواڵەتیی‌و پەسەندکردنی ئەم تیۆرییە ئێلیۆت کە رەخنە ئەبێ بە لێکۆڵینەوەی "شیعر وەکو شیعرەو، خەریك بیت نەك بەشتێکی ترەوە" پتر هەر تەنیا بە "لقێکی نۆکار" ی قوتابخانەی رەخنەی نوێ ئەژمێردرێن، کرینو تاقمەکەی بەپێکهێنانی بناخەیەکی تیۆری کە لەبنەڕەتا لەڕەوانی بوتیقای ئەرەستوەوە وەرگیرابوو، بەدوای ئەوەوە بوون کە لەلۆژیك‌و روونیەتی‌و سەرنجی گوماناویدا سەبارەت بە بەڵگەکان لاسایی بەرهەمەکانی ئەرستۆ بکەنەوە. ئەوان لەبابەت کەمایەسیەکانی قوتابخانەی رەخنەی نوێوە نیگەران بوون (کەماسیەگەلێ وەك پووچەڵ کردنەوەی توێژینەوەی مێژوویی، مەیل بە پێشکەش کردنی داوەری کردنی زەینی بەچەشنێ کە بەرچاو بنوێنێ، هەروەك سەرنج

راگرتنی زۆرتر لەسەر شیعر)، هەر بەم هۆیە هەوڵیان دا گەڵاڵەی بنەمای رەخنەیەکی گشتیترو بنەڕەتیتر دابڕێژن کە بەیارمەتیی میتۆدگەلی جۆراوجۆر کە بۆ هەر بابەتێکی تایبەت شیاوتر ئەنوێنێ، لەسەر جوانکاری گەلی "فرەیی خوازانەو کەرەسەیی" راوەستابێ، هەڵبژاردەگەلێك بەناوی رەخنەگرانو رەخنە: کۆنو نوێ(29) (1953، کورتو کوڵ بەپێشەکی ترینەوە) لەخۆگری نموونەگەلێکی زۆرە لەروانینی ئەوان، وەك خوێندنەوە نمونەییەکەی کرین لەتام جۆنز، بەرهەمی فیلدینگ، بەناوی "چەمکی گەڵاڵەو(30) گەڵاڵەی تام جۆنز".

بەم چەشنە، نۆئەرەستوییەکان لەتوێژینەوەی بونیاد گێڕانەوەی رۆماندا زۆرترین کاریگەریان هەبوو؛ کاریگەریەکەی ئەوان بەتایبەت لەلایەن واین. سی. بۆت-ەوە گوترایەوە کە ماوەیێك لەوەدوا هاتە سەر شانۆ، بەڵام رایگەیاند کە سەر بە ئەرەستوییەکانی شیکاگۆیە. بەرهەمەکەی بەناوی رەوانیەتی چیرۆك (1961) لەمەیانێکی بەریندا خوێندراوەتەوەو ئافەرینی لێ کراوە، هەرچەند دواییتر، تیۆری رەخنەیی هاوچەرخ، کەمایەسیو ناتەواوی (ئەو بەرهەمەی) دەرخست (بڕواننە تیۆریەکانی جمیسۆن، لاپەڕە 95، و تیۆری "معطوف" بەخوێنەر، وەرزی سێهەم). ئامانجی بۆت لێکۆڵینەوەی "هونەری پەیوەندی لەگەڵ خوێنەران بوو، واتە لێکۆڵینەوەی سەرچاوەی رەوانیی دەوروبەری نووسەری حەماسەو رۆمان یان کورتە چیرۆك، لەهەمان کاتدا، کە هەوڵی ئەوە ئەدات هوشیارانە یان ناهوشیارانە، دنیای خەیاڵیی خۆی بەسەر خوێنەردا داسەپێنێ". ئەگەرچی قوتابخانەی رەخنەی نوێ ئەم خاڵە پەسەند ئەکا کە رۆمان دەقێکی "سەربەخۆ" یە، بۆت ئەم چەمکە کلیلە بەرین ئەکاتەوە کە دەق هەڵگری "دەنگ" ێکی نووسەرانەیە(31) - "نووسەری شاراوە"(32) ("نووسەری رەسمی" یان "خودی دووهەمی" ئەو)- کە خوێنەر بەتێگەیینی خۆی لەڕوانینە دەربڕاوەکانی ناو چیرۆکەکە داینەهێنێ، کاتێ ئەم دوو وتەزایە- واتە نووسەرو "دەنگی نووسەران" لەیەك جیابوونەوە، رێگە بۆ توێژینەوەی چەمکە زۆرو جۆارو جۆرەکانی گێڕانەوە، کە پێکهێنەری دەقن ئەکرێتەوە یەکێ لەمیراتە بەنرخەکانی بۆت، جیاکردنەوەی بێژەری "متمانە پێکراو"و "متمانە پێنەکراو"ە -یەکەمیان کە بەشێوەیەکی ئاسایی یەکەم کەسە لە بایەخەکانی "نووسەری شاراوە" نزیك ئەبێتەوە؛ دووهەمیان کە زۆر جار یەکێکە لە کەسایەتیەکانی چیرۆکەکە لەم بایەخانە دوور ئەکەوێتەوە. ئەو کارەی بۆت کردی ئەمە بوو کە لەلایەکەوە کەسەرەی رواڵەتی ئامادەی بۆ توێژینەوەی "رەوانیەتی چیرۆك" بەرزکردەوە، لەلایەکی تریشەوە رەنگە بەشێوەیەکی دژاو دژ، ئەم بڕوایەی هێنایە گۆڕێ، کە ئامانجی نووسەران "داسەپاندنی" بایەخەکانیان بەسەر خوێنەرا، هەر بەم هۆیە "متمانە پێکران" شتێکی چاکە. لێرەدا شایەتی جۆرێ هاوچەشنایەتین لەنێوان ئەم روانینەو "فۆرمالیزمی ئاکاریی" لیویسدا، سەرەڕای ئەمەش بۆمان دەرئەکەوێ کە بۆچی گێڕانەوە ناسی پاش بونیادگەری پێی ناوەتە ئەوپەڕ داهێنانەوە. (لەوەرزی یەکەمو بەشی سێهەمی کتێبی تیۆری ئەدەبیو رەخنەی کردەوە، کتێبی نامەکانی ئاسپێرن(33)، بەرهەمی هونەری جیمز، بەپێی چەمکە پێشنیارییەکانی بۆت خوێندراوەتەوە).

**فۆرمالیزمی ئاکاریی: ف. ر. لیویس**

بەهۆی ئەم راستیەوە کە ف. ر. لیویس، یاخود پەیرەوی لەچاپەمەنی ئیسکروتینی (53-1923) بەگشتی (رەخنەی لیویس) لە 1970 کانداو سالانی دواییتریشدا بەلانی کەمەوە لەمەیانی ئەدەبی ئینگلیزیدا بوە تەنیا ئامانجی بیرۆکەی رەخنەگرانەی نوێ، ریمۆند ویلیامز لەکتێبی سیاسەتو ئەدەبیاتدا(1)(1979) وتری ئیگلتۆن لەکتێبی پێشەکیەك لەسەر بیرۆکەی ئەدەبی(34) (1983) شایەتیان لەسەر کارتێکردنی بەربلاوی ئەو داوە بۆ لێکۆڵینەوەکانی ئەدەبی ئینگلیزی لە 1930 کان بەدواوە، ویلیامز لەبابەت کتێبی نەریتی مەزن (1948)ی لیوسیەوە دەڵێ، لەسەرەتای 1970 کاندا، لەبواری رۆمانی ئینگلیزیدا، لیویس "بەتەواوی مەیانەکەی داگیرکردبوو. مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر ئێوە لەگەڵ کەسێکدا ئەگەر تەنانەت دوژمنی لیویسیش بوایە سەبارەت بەم باسە بدوانایە، لەراستیدا هەر ئەو تێگەیینەی ئەوی سەبارەت بە رێبازی مێژوو ساز ئەکردەوە". تری ئیگلتۆنیش بەدەربڕینێکی گشتیترەوە ئەنووسێ: هەرچەندە ئیسکروتینی بە "تێکشکاو" دابنێین یاخود "سەرکەوتوو"... ئەم راستیە هەروا بەهێز ئەمێنێتەوە کە توێژەرانی ئەدەبی ئینگلیزی لەبەریتانیای ئەمرۆدا (1983) چ بزانن و چ نەزانن، "لیویسین" و بەهۆی ئەم خۆتێهەڵخوتاندنە مێژووییەوە بەشێوەیەکی حاشاهەڵنەگر گۆڕاون.

لیویس کە زۆر لەژێر کاریگەریی ماتیو ئارنۆڵد و تی. ئێس. ئێلیۆتدا بوو (لیویس لە کتێبەکەیدا بەناوی جریوەی تازە لەشیعری ئینگلیزیدا (1932) بۆ یەکەم جار ئینگلیزیەکانی فێرکرد کە چۆن سەرزەوینی کەلاوە بخوێننەوە) وەك ریچاردزو ئێمپسۆن یەکێك بوو لەمامۆستایانی نوێی زانکۆی کەمبریج لەسالانی کۆتایی 1920 کانداو سەرەتای 1930 کاندا کە بەرنامەی دەرسی ئەدەبیاتی ئینگلیزی لەبەرەو پێرچوونی توێژینەوەی جوانی ناسیی نووسین -کە ئارتورکویلر کوچو کەسانێکی تر سەرکاروانی بوون- ئاڵو گۆڕی کردو لەناو دڵی وانەکانی لقەکانی هونەری زانکۆدا داینا. کتێبەکەی تری بەناوی راهێنانو زانکۆ(35) (1943) کە پێکهاتبوو لەکۆمەڵێ وتاری لەپێش دا چاپ بوو، لەوانیش دوو وتاری زۆر کاریگەر "گەڵاڵەیەك بۆ زانکۆیەکی ئەدەبی ئینگلیزی"و "ژیاری چڕو فەرهەنگی کەمینە" ئایەتی ئەم راستیەن کە لیویس بەو رادەیەی کە رەخنەگرە هەر بەو رادەیەش راهێنەرە. ئەم بەرهەمەو کارەکانی دواییتری بەناوی ئەدەبی ئینگلیزی لە رۆژگاری ئێمەو زانکۆدا(5) (1969)، بنچینەی زیندوو: ئەدەبی ئینگلیزیو وەکوو راهێنەری بیر(36) (1957)و بیر، واژەو داهێنان(37) (1976) سەرەرای چەسپاندنی ئەو بانگەشەی لەسەرەوە باسمان کرد ئەو راستیە ئەسەلمێنێ کە بەرهەمەکانی لیویس سروشتێکی کردەییو ئەزموونیو لەراستیدا دژ بە تیۆرییان هەیە. بۆ نموونە لەنێوان دەمەقاڵێەکی فیکری بەناوبانگدا لەگەڵ رەخنەگری ئەمریکایی، رنێ وێلك (بڕوانە وتارەکەی لیویس بەناوی "رەخنەی ئەدەبیو فەلسەفی" (1937)، لەکامان پرسیوت(38)، 1953) بۆ پشتگیری کردنی خۆ بواردن لە کۆکردنەوەی بیروڕاو بەرهەمەکانی لەچوارچێوەی تیۆریدا ئەڵێ، رەخنەو فەلسەفە چالاکی گەلێکی تەواو جیاوازنو کاری رەخنەگر ئەوەیە کە "بەچەشنێ گشتیەتی تایبەتی دژکردەوە رابگا، تاکوو بتوانێ لەسنووری یەك شیعری دیاری

کراو.. لەلیریکی هەستپێکراویەوە بچێتە ناوەوە".

لیویس هاوکات لەگەڵ سەرنووسەری چاپەمەنی ئیسکروتینیو راهێنانی چەند وەچەیەك لەقوتابیەکان کە لەوەدوا بوونە نووسەرو مامۆستا، لەپشت پرۆژەی بەرواڵەت بێلایەنی بلاوکردنەوەی کتێبی رێنومایی ئەدەبی ئینگلیزی پلیکان(39) (1954–61)دا بەهەڵەگیری بوریس فۆرد، لەحەوت بەرگدا، ئامادەبوونێکی چالاکی نواند، لیویس سەرەرای ئەمانەش چەند کتێبی لەبابەت رەخنەو بەرهەمی فەرهەنگیەوە نووسی، کە هەموویان پڕن لە "تیۆری" ئەو سەبارەت بە ئەدەبیات، هەرچەندە خۆی لەدارشتنی تیۆری لەچوارچێوەی زارەوە گەلی تاقانە ئەبوارد، هەر بەم هۆیەوە ئەبێ تیۆری ئەو لەناو بەرهەمەکانیەوە هەڵێنجێندرێ.

بەدوای ریچاردزدا، لیویس "رەخنەگرێکی کردەوەیی"یە، بەڵام بەهۆی سەرنج راگرتن لەسەر تایبەتمەندی هەستپێکراوی "خودی دەق" یاخود "وشەکانی سەرکاغەز" لەلایەن ئەوەوە ئەچێتە ناو ریزی "رەخنەگرانی نوێ" شەوە: کاری رەخنەگر خۆخەریك کردنە بە بەرهەمێکەوە کە لە بەردەمیایەتی؛ خۆ خەریك کردن وەك شتێك کە هەڵگری ئەم هۆیەبێ، کە بۆچی بەرهەمەکە بەم شێوەیە کە هەیەو نەك بەچەشنێکی دیکە. ("کارکردی رەخنە" لەکامان پرسیوت، 1952– بروانن ئەو ئاوڕدانەوەی لەناوی وتارەکەدا لە ئارنۆڵدو ئێلیۆت دراوەتەوە). بەڵام ئەم هەڵسەنگاندنە ساکارە سەبارەت بەلیویسو فۆرمالیزمو روانگەی نامێژوویی سروشتی ئەو هەڵەیە، چونکە ئاوڕدانەوەی وردی ئەو لەدەق تەنیا بەمەبەستی سەلماندنی بایەخی "ژیانی هەست پێکراو" و نزیکایەتی لەگەڵ "ئەزموون" دایە، تاکو بەم چەشنە هێزی ئاکاریی ئەم شتە بسەلمێنێ (و بەتوێژینەوەی ورد) بەرجەستە بوونی بخاتەروو. پارچە شیعرێکی لە ئێلیۆت کە لیویس ناوی کامان پرسیوتی لێوە وەرگرتوە لەبابەت ئەرکی رەخنەگر کە "شوێن هەڵگرتنی ساکاری داوەری راستەقینە ئەدوێ. ناوی "هەڵسەنگاندنی دووبارە"ش بیرهێنەرەوەی تیۆری ئێلیۆتە لەبابەت رێکو پێك کردنی "راستەقینە"ی نەریتی شیعری ئینگلیزی، رێو راست هەروا کە کتێبی نەریتی مەزنی لیویسیش بەم دیاگرامە لیویسیەوە دەست پێ ئەکات، کە رۆماننووسە گەورە ئینگلیزیەکان بریتین لە: "جین ئاستین، جۆرج ئێلیۆت، هێنری جیمزو جۆزێف کۆنراد– ئەمە ئەو پێرستەیە کەدەمو دەست ئەم بیرە لەزەینا جێ گیر ئەکات کە "داوەری راستەقینەی لیویس تا چ رادەیەك لایەنگرانەیە. جیمز و کۆنرادو "ئەدەبی ئینگلیزی"؟ بەواتەیەکی تر، یەکێ لەتەوەرە سەرەکیەکانی گەلاڵەکەی لیویس، دیاری کردنی "بەرهەمە مەزنەکان"ی ئەدەبیاتو هەلاواردنی بەرهەمە خەوشاوییەکان (وەکوو چیرۆکی "کۆمەڵ" یان "رەشۆکی") و جێگیرکردنی "نەریت" یان "پێوانە"ی ئارنۆڵدی و ئێلیۆتیە. پێویست بوونی ئەم کارە لەوێوە سەرهەڵدەدات کە هێندێ لەبەرهەمەکان ئەبێ لەدوو توێی بەرنامەی ئەدەبی ئینگلیزی زانکۆکاندا بگونجێندرێت تاکوو پرۆسەی پاڵاوتە کردن بووژاندنەوەی فەرهەنگیی بخەینەگەڕ؛ ئەمە ئەو ئەرکەیە کە ئەم دەورە زانکۆییانە بە نوێنەرایەتی لەلایەن سەلامەتی فەرهەنگیەوەلە ئەستۆیانە. ئەم چەشنە بەرهەمانە، بەتایبەت بایەخەکانی "ژیان" ئەبەنە سەر ("ژیان" یەکێکە لەزاراوە گرنگەکانی لیویس کە قەت پێناسەنەکراوە:

ئاگاداربوون لەکەرەستەکانی ژیان لە بەرامبەر هێزەکانی ماتریالیزمو بەریەریزمو پیشەسازیی خوازییو لەم چەشنە شتانەی ناو کۆمەڵێکی "تەکنۆلۆژێکی -بنتامیی"؛ بەواتەیەکی دیکە، ئەوان نوێنەری یەك "فەرهەنگی کەمینە"ن کە لەگەڵ یەك "ژیاری کۆمەڵی"دا ئەجەنگن.

رێو راست وەك چۆن حەزو شەیدایی ئاکاریی لیویس ئەو لەفۆرمالیزمی رووت یان، لەجوانیی ناسیی یارانی رەخنەی نوێ جیائەکاتەوە، تێگەیینی کۆمەڵ ناسانەو مێژوویش یەکێکی تر لەجیاوازییەکانیئەوە. لەمەیدانی شەڕی سیاسەتی فەرهەنگیدا، ئەدەبیات چەکێکەو زۆربەی بەرهەمە مەزنەکانی ئەدەبی رابردوو، شایەتێکن بۆ پتەو بوونی "ئەندام ئاسایی" فەرهەنگەکانی بەر لەپیشەسازی (لەروانگەی ئێلیۆتەوە، بەتایبەت بەرهەمەکانی بەر لە "دابڕانی ناسکی سروشت" لە سەدەی حەڤدەیەمدا). لەباری هاوسانی لەگەڵ روانگەی ئارنۆڵدو ئێلیۆت رابوردوو ئەدەبی رابووردوو، وەك پێوانەیەك "سەرزەوینی کاول"ی سەردەمی هاوچەرخ وان، هەرچەند بەرهەمی نووسەرانی "مودێرن"ی مەزنیش (بۆ نمونە ئێلیۆتو دی. ئێچ. لارنس) کە بەپێویست دژاودژو ئاڵۆزنو بەبایەخە فەرهەنگیەکان پیمل، لەدنیای دوژمنی سەدەی بیستەمدا بەنوێنەرایەتی لەلایەن "ژیان"ەوە نووسراون. لەروانگەی رەخنەگرانی نوێشەوە بەرهەمە ئەدەبیەکان دەفر گەلێکن کە بایەخە مرۆییەکان تیایدا زیندوو ئەمێننەوە؟ بەڵام لەروانگەی لیویسەوە ئەم بەرهەمانە ئەبێ لەمەیدانی ئاکاری- کۆمەڵ ناسیی سیاسەتی فەرهەنگیشدا چالاکانە بخرێنە گەڕ. کەواتە هەر بەم هۆیەشەوە کە لەگەڵاڵەکەی لیویس بەشێوەیەکی دژهەڵکەوتە خوازانەو لەباری فەرهەنگیشەوە رەشبینانەیە. کەواتە رەنگە جێگەی سەرسوڕمان نەبێت، کە ئەم روانگەیە لە سەدەی بیستەمدا تا ئەم رادەیە لەلایەن خەڵکەوە پەسەندکراوەو کاریگەری هەبووە، لەراستیشدا تا ئەم دواییانەش بەشێوەی ئاسایی "توێژینەوەی ئەدەبیات" دا ئەنرا. (لەم بارەیەوە بڕواننە رەخنەی پڕی ئەندێرسۆن لەلیویس خوازی، لەکتێبی پەلەکانی فەرهەنگیی نەتەوەیی(1)(1968) کە لەوێدا بانگەشەی ئەوە ئەکات کە رەخنەی ئەدەبی لیویسی لەنێوان سەدەی بیستەمی بەریتانیادا بۆشایی سەبارەت بەنەبوونی مارکسیزم یان کۆمەڵناسی بەریتانیایی پڕکردوە). پێویستە ئالێرەدا بۆ ریشەی نەبوونی تیۆری بگەڕێین: داڕشتنی تیۆری پێویست نیە، بەڵکو پێویستە تەنیا خۆ بە "داوەری راستەقینە" و ئاگایی ئاسایی لەسەر بنچینەی "ئەزموونی ژیاو"ەوە خەریك بکەین ("فلانی لەگەڵ فیساردا وەها پەیوەندیەکیان پێکەوە هەیە- وانیە ؟؛ فلان زۆر خایەنترە لەفیسار- بەڕای تۆ وانیە ؟" (رەخنەی ئەدەبیو فەلسەفەکە پێشتر باسی لیٚ کرا). رەخنەی لیویسی پێویستی بەتیۆری نیەو لە راستیشدا ناکرێ برژێتە ناو چوارچێوەی تیۆرییەوە. ئەم بابەتە بەشێوەیەکی دژاودژ چەند ساڵ بەردەوام خاڵی بەهێزی ئەو (چەشنە رەخنەیە)بوو.

**پەراوێزەکان:**

1-Scrutiny

2-discrimination

3-The Canon

4-پێویستە بزانین کە لەروانگەی ئێلیۆتەوە، شیعر چەشنی ئەدەبی دەسەڵاتدارە، چونکە ئەم خاڵە بوە ناوەندی پێداگریی رەخنەی ئەدەبیو

نموونەیەکە دەری ئەخات چۆن چۆنی تیۆرگەلێکی تایبەت، نزیکترین پەیوەندی لەگەڵ چەشنگەلێکی تایبەتی نووسین دائەمەزرێنێ. بڕوانە پێشەکی ئەم کتێبە.

5-Tradition and the Individual Talent

6-objective correlative

7-beuetrist

8-Principles of Literary criticism.

9-Science and poetry

10-Practical criticism

11-seven Types of Ambiguity

12-بایەخی سروشتی ئەوانە لەوەدایە کە لەبەرامبەر مێژووی مادیدا لەسەرترن. بڕوانە وتارەکەی کلینت بروکس سەبارەت بە "قەسیدەیەك بۆ گوڵدانێکی یۆنانی" بەرهەمی کیتس.

13-After the New Criticism.

14-Poem- ness

15-Criticism Inc

16-Understanding poetry

17-Understanding fiction

18-The Well- Wroughturn: studies in the structure of poetry

19-Keat's sylvan Historian: History without footnotes.

20-Practicing theory and Reading Literature

21-interntional fallacy

22-affective fallacy

23-The Verbal Icon: studies in the meaning of poetry

24-iterability

25-Technigue as Discovery

26-Fiction and the Analogical Matrin

27-achived content

28-Chicago school of neo- Aristote lians

29-critics and criticism: Ancient and Modern

30-Plot

31-authorial voice

32-im plied author author

33-reliable

34-The Aspekn papers

35-Politics and Letters

36-Litrary theory: An Introduction

37-Education and University

38-English Literture in ourtime and university

39-The Living principle: English as a Disipine of thought.

40-Thought, Words and creativity

41-The common pursuit

42-Pelican Guide to English Literature.

43-Components of the National culture

**سەرچاوە:**

راهنمای تیورەء ادبی معاصر- رامان سلدن، پیتر ویدوسون- ترجمە: عباس مخبر- چاپ دوم 1377

❑

# تیۆری ئەدەب چیە؟

■ رۆجەر ویبستەر

● و. لە ئینگلیزییەوە: پەیوەند فایەق

## ئەدەبو تیۆری ئەدەبی

لەدەست نیشانکردنی رووبەرێکدا کە پێی دەگوترێت تیۆری ئەدەبی، دەشێ وا دابنرێت کە ئەدەب خۆی دیاردەیەکی ئاسان پێناسە کراوە. بەدڵنیاییەوە زاراوەی "ئەدەب" بەردەوام بەو رێگایانە بەکاردێت کە پێشنیاری ئەوە دەکەن ئەدەب چەمکێکی گوماناویە. بۆ نموونە کتێبخانەکان سیستەمەکانی فەهرەست دروست کردنیان هەیە بۆ دەقە ئەدەبیەکان کە ئەو فەهرەستە بەئاشکرا لە جۆرەکانی تری نووسینیان جیادەکاتەوە. رۆژنامەو گۆڤارەکان لەچەند بەشێکدا کە بەئاشکرا ئەو بەشانە دیاریکراون پێداچوونەوەو خستنەرووی رۆمان و شیعر لەئەستۆ دەگرن. کۆلێژو زانکۆو خوێندنگا هونەریە جۆراوجۆرەکان تاکو ئێستاش خولی ئەدەبیان هەیە کە خوێندکارانی تایبەتی لەو خولانەدا ئامادە دەبن، هەروەها ئەگەر سەیری ئەو رێگایانە بکەین کە ئەوان تیایاندا قەوارەی نووسین بنیاد دەنێنو زاراوەکانی وەکو "ئەدەب" یان ئەدەبی "ئینگلیزی" دەسەڵاتی بەسەردا کردوون، ئەوا دەتوانین بەدڵنیاییەوە ئەو جیاوازیانە ببینین کە لەنێوان ئەکادیمیاو دامەزراوە جەماوەریەکاندا دەردەکەون. ئەم جیاوازیانەش بەپێی ئەو نێوەندانەی کە ئەدەبیان تێدا دادەنرێت دەگۆڕێن. بۆ ئەوەی بە ئاشکرا ئێمە پێشبینی گوزەر کردن بەناو هەڵبژاردەیەکی جیاوازی ئەو کتێبانەدا بکەین کە لە وێستگەی شەمەندەفەر لەبەشی کتێبی ئەدەبدان بۆ فرۆشتن کە ئەویش لەسەر بنەمای نەخشەی کۆرسێکی ئەدەبی سەدەی بیستو بەپێی ئاستو پلە دانراون. جیاوازیەکان تەنیا جیاوازی رۆشنبیری نین بەڵکو لەپاڵ ئەودا جیاوازی مێژوویشن. ئەدەب بەشێوەیەکی تەواو و بەرێگای

دیاری کراوی جۆراوجۆرو لەماوەی سەد ساڵی رابردوودا پێناسە کراوە تەنانەت لەوەشدا کە دەشێ وا دەربکەوێت کە ئەدەب نێوەندێکی گشتی یە، لە دامەزراوە ئەکادیمیەکاندا، لە نەخشەی قوتابخانەدا بۆ ئاستی خولەکانو، زۆر چەمکی جۆراوجۆری ئەدەبو بیری دژبەیەک هەن سەبارەت بەو شتانەی کە دەقێکی وەها پێکدەهێنن کە شایەنی توێژینەوە بێت بەپێی پرۆگرامێك. دامەزراوە جۆراو جۆرەکان گەڕاون بەدوای دانانی جۆرە ئەدەبێکی تایبەتیدا کە ئەو ئەدەبەش بەشێوەیەکی ئاشکرا بە بەها گەردوونیەکان رووکەش دەکەن، هەروەها توێژینەوەی ئەدەب لەژێر ناونیشانی ئەدەبی "ئینگلیزیدا" هەر لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە روونکردنەوەیەکی تەواوی ئەوەیە کە چۆن رۆشنبیری ئەکادیمی ئینگلیزی زیاتر لە (رۆشنبیری ئەکادیمی بەریتانی) بەدوای هاوشێوەکردنو رێکخستنی توێژینەوەی ئەدەبدا چووە.

کۆمەڵەی ئینگلیزی کە لە ساڵی 1907دا دامەزرا ئەو یەکە سەرەکیە بوو کە هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاستی توێژینەوەی کەلتووری ئەدەبی ئینگلیزی لەدامەزراوە پەروەردەییەکاندا دەدا، هەروەها پەرەی بەچەمکی کەلتوورو دەرئەنجامە چاکسازیە مۆراڵیەکەیشیدا کە ماتیۆ ئارنۆڵد لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەربارەی ئەو بابەتە گفتوگۆی کردووە. تێڕوانینی ئارنۆڵد بۆ کەلتوور ئەوەیە کە "کەلتوور باشترین شتە کە لە دنیادا بیری لێبکرێتەوەو بزانرێت" ئەوەش بەشێوەیەکی بەربڵاو لەمیانەی ئەدەبەوە جێبەجێ کرا. توێژینەوەی ئەدەبی کلاسیکو بەشێوەیەکی ناسەرەکیش توێژینەوەی شیعری کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای



هنری جەیمس

سەدەی بیستەم- کە زۆربەیان بەزمانو شێوازی کلاسیك بوون پێکەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەنێو بەکارهێنانی ئەفسانەی لادێو ئینگلتەرای دەرەوەی مێژوودا نقوم بوون- ئەو ناوەندە بوون بۆ کەلتوور (و. ك). شیعرەکەی رۆبەرت برەوك لەساڵی 1912دا بەناونیشانی "سەرپەرشتیاری ئەبرەشیەی دێرینی گرانشیستەر" نمونەیەکی دیاری ئەو شیعرانەیە کە "ئینگلیزێتی بوون" نیشان دەدات.

ئەم بابەتەش لەلایەن تێری ئیگلتۆنو کەسانی ترەوە گفتوگۆی لەسەر کراوە کە چۆن توێژینەوەی ئەدەبو دامەزراوی کەلتووریی ئینگلیز بووە بەجێگرەوەی ئاین لەکاتێکدا ئاین لەو سەردەمەدا بەخێرایی بەرەو لاوازبوون چووە. ئەدەب توانی هەمان جۆرە ئەزموونی (ئاین) پێشکەش بکات ئەویش لەگەڵ برەو ستاندنی دەستووری هەڵبژاردنو خوێندەواربوونی جەماوەردا کە لەو هەلومەرجەدا شتێکی گرنگ بوو دەوڵەوت بەهای تەواوی هاونیشتمانێتی

لەبابەتەکانی خۆیدا بچەسپێنێ. لەدوای دامەزراندنی "کۆمەڵەی ئینگلیزی"، راپۆرتی حکومەت لەبارەی "خوێندنی ئینگلیزیەوە لە ئینگلتەرەدا" لەساڵی 1912دا لەلایەن شاعیری ئینگلیزی پایە بەرز سێر هێنری نیوبۆڵەوە سەرۆکایەتی کرا کە ئەویش لەژێر ناونیشانی "بکەوە خۆت! بکەوە خۆت! بەشداری بکە!" ئەوەش بووە بەهۆی پتەوکردنی ناوبانگی هەڵوێستی سەرەکی ئینگلیز لەپرۆگرامی پەروەردەیدا(1).

ئێمە دەتوانین بەو جۆرە سەیری ئەدەب بکەین کە پانتاییەکە لەبارێکی پڕ لەجووڵەدایە لەچاو ئەوەی وەها سەیری بکەین کە پێکهاتەیەکی هاوشێوەیەو لەچەندین بەرهەم پێکهاتووە کە تێکڕا هەمان جۆرە خاسێتی لێکچوویان هەیەو بەڕێگایەکی لێکچووش لەلایەن هەمان جۆرە جەماوەرەوە دەخوێندرێنەوە. دیارە زاراوەکانی وەکو "ئەدەبو ئەدەبی" مانایەکی جێگیر یان تاکە مانایەکیان نیە، بەڵکو ئەم زاراوانە ئاڵۆزنو لەمانایەك زیاتریان هەیە. سەرباری ئەوەش "ئەدەب" لەهەردوو رووەوە واتە هەم وەکو جەستەی نووسینو هەم وەکو خاسێتە مۆراڵیو ئێستاتیکیەکان بەشێوەیەکی گشتی پەیوەستە بە ماناوە. هەروەها دەشێ وەکو ئەو پانتاییانەی جووڵە سەیر بکرێت کە تیایاندا ماناکان گفتوگۆ دەکرێن لەبری ئەوەی کە بەهاو حەقیقەتە گەردوونیو نازەمەنیەکان وەکو چۆن هەمیشە دادەنرێن بەهەمان شێوە بەدەست بهێنرێن.

تیۆری ئەدەبی یان تیۆرەکانی ئەدەبی رێگای جۆراو جۆری پێناسەکردنی ئەدەب پێشکەش دەکەن، یان بەلایەنی کەمەوە بیر لەوە دەکەنەوە کە دەشێ بابەتەکان لەهەوڵی چ جۆرە پێناسەکردنێکدا بن. ئەم تیۆرانە دژی یەکتر نینو رەخنەگرە نوێیەکانیش کە قسە لەسەر ئەو جەستەیەی نووسین دەکەن کە پێی دەگوترێت تیۆری ئەدەبی سەرنجی ناکۆکیەکانیان داوە، واتە ئەو هەڵوێستانەی کە لەنێوان هەڵوێستە جۆراو جۆرە تیۆریەکاندا دەبینرێن. تیۆری ئەدەبی هیچ گوشارێکی ئاسان یان توندو تۆڵی لەجۆری ئەوەی ئەدەب چیە یان دەبێ لێکۆڵینەوەی ئەدەب چی بێت پێشکەش ناکات، دیارە ئەمەش وەکو خاسێتێکی خراپی تیۆری ئەدەبی سەیر ناکرێت.

دوو خاڵی بنەڕەتی کە پەیوەندیان بەلێکۆڵینەوەی ئەدەبەوە هەیە لەتیۆری ئەدەبەوە سەرهەڵدەدەن، کە ئەوانیش بەردەوام لە دەروازە تا تیۆریەکاندا دەرنەکەوتوون. یەکەمیان: وەکو لەسەرەوەش پێشنیارم کردووە ئەدەب دەبێتە رووبەرێکی گوماناوی ناچوونیەك. لەوانەیە ئێمە زیاتر قسە لەسەر ئەدەبە ئینگلیزیەکان بکەین (نەك تەنیا ئەدەبی ئینگلیز (واتە ئەدەبی بەریتانی. و) کاتێ ئەو رێگایانە لێکدەدەینەوە کە تیایاندا ئەدەبی ئینگلیزی بەشێوەی کەلتووریو مێژوویی کاردەکات، ئەویش وەکو شێوازێك لەنووسینو مەعریفە.

دووەمیان: ئەو چالاکیانەی کە پەیوەستن بەتوژینەوەی ئەدەبەوە، لەخوێندنەوەوە بۆ رەخنە پێویستە بەردەوام جار لەدوای جار هەڵسەنگاندن بکرێنەوە.

دەشێ ئێمە گوتاری تیۆری ئەدەبی وەکو چەکێکی دوو دەم دابنێین، کە لەلایەکەوە دەتوانێت هەندێ لەگریمانەکان یان بەها نادیارەکان لەئەدەبو رەخنەی ئەدەبیدا راڤە بکات یان روون بکاتەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە پێویستە ئێمە رێگا نەدەین بەوەی کە ئەو

(راستیانەی) لەدەقە تیۆریەکانەوە دەردەکەون بەبێ دەستکاری کردن بمێننەوە. لەوانەیە ئەم دەروازەی کە زۆر جێگای سەرنجە لەگەڵ چالاکی شاراوەی لەرادەبەدەری هەڵسەنگاندن دیسانەوە هەڵسەنگاندنەوەی زاراوەکانو بڕیاردان بەسەریاندا یان ئەو بەهایانەی کە زاراوەکان دەیانگوازنەوە یەکێك بن لە خاسیەتە زۆر گشتیەکانی تیۆرە ئەدەبیەکان: ئەم تیۆرە ئەدەبیانەش مەیلیان بەلای هوشیاری تایبەتیو تەنانەت رەنگدانەوەی خوددا هەیە کە رەخنەی زۆر تەقلیدیش خۆی لیّ بەدوور گرتووە. خود هوشیاریش یان (هوشیاری تایبەتی) زیاتر لە دەوری زمان چەق دەبەستێت، واتە بەوپێیە زمانی دەق توێژینەوە دەکرێت، ئەو زمانەی کە دەهێنرێت بۆ بەرجەستەکردنی دەقەکە.

## رەخنەی ئەدەبیو تیۆری ئەدەبی

رەخنەی ئەدەبی وەکو چالاکیەکی سەرەکی پەیوەست بەلێکۆڵینەوەی ئەکادیمیانەی ئەدەبو ئەو زاراوەو رەگەزانەی خۆی بیناکردووە کە بەکاریان دێنێتو هەروەها پێویستە بدوێنرێن. رەخنەی ئەدەبی بریتیە لە پراکتیکی بەکارهێنانی زاراوەکانی وەکو دانەر، خاسیەت، یان رۆمان وەك ئەوەی پێکهاتەی دوور لە گومان بن، وەکو ئەوەی لایەنە سروشتیو پێشکەشکراوەکانی ئەدەب بن، بەهەمان ئامارژە، پێویستە بواری ئەو رەگەزانە نەدەین کە لە دەروازە تیۆریەکانەوە بەمەبەستی رێگاگرتن لەرامکردنو دەست لێدانی (دەقەکان) دەردەکەون.

دەشێ شتێکی یارمەتیدەر بێت کە لەم خاڵەدا جیاکردنەوەیەك لەنێوان چالاکیەکانی رەخنەی ئەدەبی یا پراکتیکیەکانی رەخنەی ئەدەبیو تیۆری ئەدەبیدا بکرێت چونکە ئەمانە بریتین لە پانتاییەکانی دەرئەنجامە شاراوەکان، بەقسەکردنێکی گشتیانە، ئێمە دەتوانین بڵێین رەخنەی ئەدەبی خوێندنەوەو راڤەکردنو قسەکردن لەسەر دەقێکی دیاریکراو یان چەند دەقێك کە بەئەدەب دادەنرێن لەخۆی دەگرێت. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە رەخنەی ئەدەبی ببێتە چالاکیەکی دیاری پەیوەست بەتوێژینەوەی ئەدەبی. رەخنەی ئەدەبی لەلایەن رەخنەگرانی تایبەتمەندەوە پیادە دەکرێتو بەشێوەی دەوری لە کتێبو گۆڤارەکاندا بڵاو دەکرێتەوە، هەروەك ئاشکراشە لەلایەن سەرجەم خوێندکارانی ئەدەبەوە لە وتارو لەوەڵامی پرسیاری تاقیکردنەوەکاندا یان لەتێزەکانیاندا پیادە دەکرێت.

دەرکەوتنی زیاتری ئەدەبی ئینگلیزی لەسەدەی رابردوودا بەدواداچوونی رەخنەی ئەدەبی وەکو چالاکی سەرەکی خۆی وەرگرتووە. زاراوەی رەخنە لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دەست دەکات بە بەدەست هێنانی ناوبانگێکی گرنگ ئەویش لەئاکامی پەیوەستبوونیدا بەئەدەبی ئینگلیزیو رێگا جۆراوجۆرەکاندا لەسەدەی بیستیشدا بەردەوام دەبێت.

شاعیرو رەخنەگری رۆشنبیریی سەدەی نۆزدەهەم ماتیۆ ئارنۆڵد دەستی دایە بەکارهێنانی زاراوەی "رەخنە" و جەختێکی تایبەتیشی لەسەر بەکارهێنانی دەکرد. بۆ نموونە لەساڵی 1867 لە وتارێکیدا لەسەر "وەزیفەی رەخنە لەسەردەمی ئێستا "دا (ئەو جەختکردنەی ئاشکرایە. و).

زاراوەی رەخنـــەی پراکتیکـــی لەلایـــەن رەخنەگری ئەدەبی سەدەی بیستەوە ئای. ئەی. ریچاردز ناسـێنرا. خوێندنـەوەی مەنهەجیانـەی دواتــری ئــەم جــۆرە رەخنەیــەو چالاکیــە نرخێندراوەکانی نموونەیـەکن لەسـەر ئـەوەی کـە چـۆن بـــوو بەسـیمایەکی دیـاری توێژینــەوە ئینگلیزیەکان رەخنـەگرێکی دیاری وەکـو ف. ر. لیڤز وەهـا ناسرا کـە یەکـەمین پسپۆری بـواری رەخنەیـە، بـەلام هـەندێ لەدانـەرانی بەرهەمـە ئەدەبیـەکان کـە دیسان رەخنـەی ئەدەبیشـیان نووسیوە رەخنەکانیان جێگایەکی ئـەوتۆیان نیـە لەئەدەبی ئینگلـیزیدا لەوانـەش هێنری جـەیمسو ت. س ئیللیوت.

سـەرەرای ئـەوەی کـە رەخنـە زاراوەیـەکی هێجگار مەودا فراوانەو دەروازە جۆراجۆرەکان کە پـەیوەندییان بـە هەلوێسـتە جۆراو جۆرەکانـەوە هەیـە لـەبارەی ئەدەبـەوە لـەخۆی دەگرێـت. هەروەها دوو نـەریت یـان دوو گریمـان هـەن کـەوا پێدەچێ پەیوەست بن بە پیـادەکردنی رەخنـەی ئەدەبیـەوە ئـەویش لەهـەردوو لایـەنی چـالاکی رەخنەسـازیو لـەگوتاری رەخنەیشـدا. ئـەویش یەکـەمیان ئەوەیە کە رەخنـە کـارێکی دووەمیـە بەگوێرەی ئەدەب خۆیو هەروەها پشت بەئەدەب دەبەستێت: رەخنـە پاشکۆی دەقـی ئەدەبیـە. دووەمیـان ئەوەیـە کـە راڤەکردنـە رەخنەییـەکان یـان هەلسـەنگاندنەکان وادەردەکـەون کـە بـۆ نرخاندنی ئەوە بن کە ئەو دەقی ئەدەبیانـەی کە رەخنە پێیانەوە خەریك دەبێت بێ چەندو چـوون دەقی ئەدەبین: لەکاتێکدا کە ئـەدەب رەگـەزێکی سروشتی بەلگە نەویستەو لەسەر ئـەو بنەمایـەش تێروانینە رەخنەییەکان لـەوەوە سـەرهەلدەدەن. (سەرهەلدانی روانینە رەخنەییـەکان لەدەقـەکانی ئەدەبـەوە لەبەشـی چـوارەمدا لـەژێر نـاوی ئایدۆلۆژیادا باس دەکرێن و. ك).

سـەرباری ئـەوەی هـەندێ لـەدەروازەکانی ئەدەبو رەخنەی ئەدەبی کە لەمیانـەی بەرهەمـە تیۆرییەکانــەوە پــەرەیان سـەندووە رێگـــای جۆراوجـۆر تـری بینینـی شـتەکان پێشــکەش دەکــەن. پێــش هــەموو شــتێ، جۆرەکـــانی مامەلـەکردنو رێبـازو بـەها ناشاشـکراکان لــەو گریمانانـەی سـەرەوەدا پێویستە ئـەو بەرهەمـە بەدووورو درێژی شی بکرێتەوەو دوای ئـەوەش کە بەردەوام دەبین بۆ ئەوەی بـەباش، بـەخراپ یان بەشتێکی کەی دابنێین، پێویستە لـەوە تێبگـەین کـە چــۆن ئــەو چالاکیانــە خۆیــان کاردەکــەنو چۆنیـش ئـەم هەلسـەنگاندنانە لەئاسـتی ئـەو چالاکیانـەدا دەبن. رەخنـەی ئـەدەبی سـەرباری ئەوەی کە بەگوێرەی ئەدەب شتێکی ناسەرەکیە، دیسان وەکو ئامرازێك سەیر دەکرێت بۆ بنیادنانی جەستەی نووسینو مەعریفە کە ئەو جەستەیەش وا دەردەکـەوێت کــە بابــەتی ئــەدەب بێــت بــۆ توێژینەوە. بەقسەیەکی تر ئـەدەب دەشێ وەکو بەرهـەمێك سـەیر بکرێت کە پشـت بـە رەخنــە دەبەستێت زیاتر لەهەر رێگایەکی تر.

بەدلنیاییـەوە ئـەو بارەی کـە تیایدا رەخنــە بەشـێوەیەکی کرۆنۆلۆجیکانـــەی دوور لـــەوەی بتوانرێت خۆی لێ بەدوور بگیرێت لـەگفتوگۆکردنی ئـەو دەقانـەی کـە پێیانـەوە خـەریك دەبێـت پاشکۆیە، بـەلام ئەمـە مانـای ئـەوە نیـە کـە بگوترێت رەخنە پشت بەئـەدەب دەبەستێت لەو رووەوە کە تاکە وەزیفـەی رەخنـە قسـەکردنە لەسەر دەقە ئەدەبیـەکان بـەو رێگایانـەی کـە بـۆ پێچەوانەکردنــــەوەی نـــاوەرۆکی دەقــــەکان دەردەکەون. لەوەش زیاتر دەشێ گفتوگۆی ئەوە بکرێت کە هەردوو لایەن واتـە جەسـتەی نووسین

هەر لەکۆتایی سەدەی نۆزدە بەدواوە کە لەلایەن رەخنەگرانی وەکو ماتیۆ ئارنۆڵدو ف. ڕ. لیڤزەوە دیاری کراوە لەگەڵ دەستنیشانکردنی سیفاتو خاسیەتە ئەدەبیەکانی وەکو ئیقاعو کەسێتو جیهانبینی مۆڕاڵیو.. تاد بەشێوەیەکی سەرەتایی لەمیانەی گوتارەکانی رەخنەی ئەدەبیەوە بنیاد دەنرێنو بنەماکانیان لەناو سنووری دەقە ئەدەبیەکەدا بوونیان نیە. بۆ ئەوەی رەخنە بخرێتە مەودایەکی ترەوە، دەشێ بگوترێت ئەدەبێك نیە بەبێ بوونی رەخنەی ئەدەبی.

ئەو بیروبۆچوونەی کە پێی وایە ئەدەب بوونی خۆیی هەبووە یان مانای بنەڕەتی خۆیی هەبووە بێ پەیوەستبوون بەرەخنەوە بیروبۆچوونێکە کە ماتیۆ ئارنۆڵد لە تێگەیشتنی خۆیدا بۆ "بێ بایەخێتی" رەخنە برەوی پێداو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ رەخنە "بابەتەکە وەکو ئەوەی خۆی لەراستیدا چۆنە وەها ببینێ". ئەم دیدو بۆچوونەی رەخنەگر وەکو وێنەیەکی بێبایەخ یان بێ لایەن، بەشێوەیەکی بابەتیانە بەرهەمی ئەدەبی هەڵدەسەنگێنیو یەکێك لەو خاسیەتە سەرەکیانە پێچەوانە دەکاتەوە کە پەیوەست بووە بە رەخنەی ئەدەبیەوە وەکو چالاکیەکی مەنهەجی، یان وەکو ئەوەی کە خوێندکارانی ئەدەب خراونەتە ژێر باری ئەوەی کە وەری بگرن، ئەوەش شتێکە ناتەبایە لەگەڵ روانین بۆ ئەدەبدا وەکو "ئەزموون"، وەکو پانتاییەکی زاتیو تاکەکەسی کە تیایدا "هەستکردن" حسابێکی زۆری بۆ دەکرێت، هەروەك دی. ئەیچ لۆرانس گوتی: پێویستە رەخنەگر لەهەموو روویەکی سۆزەوە زیندوو بێت(2). رەخنەی ئەدەبی وا دەردەکەوێت کە گرفتێکی بچووکی هەبووبێت لە پێکەوەبەستنی ئەم هەڵوێستە دژ بەیەکانەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هەروەك پێشتر پێشنیارم کردووە هەندێ لەتیۆردانەرانی ئەدەب (ئەدەبو ئەدەبی)و پەیوەندی رەخنەی ئەدەبی بەم بوارانەوە زۆر جیاواز دەبینن. وەکو دواتر زۆر بەدرێژی دەیبینین، ئەوان وایان سەیر کردووە کە پێویستە بڵێیت ئەدەب چیە، ئەویش بەمەبەستی دەستنیشانکردنی خاسیەتە مێژوویيو کەلتووریو مەنهەجیو زمانیەکان کە بوار بۆ ئێمە دەکەنەوە هەتا ئاخاوتن لەبارەی (ئەدەبیەوە) لەسنووری زاراوە دیاریکراوەکاندا بکەین، سەرباری ئەوەش تیۆری ئەدەبی دان بەوەدا دەنێت ئەو گریمانانەی کە هەندێ رەخنە لەبارەی نووسەرانو خوێنەرانەوە دروستیان کردووەو ئەوەشی کە ئێمە وا وەریدەگرین کە "راستی" بێت پێویستە پرسیاری لەبارەوە بکرێتو دیسانەوە دابڕێژرێتەوە، ئەم پرۆسێسەش دەشێ ئەو رێگایانە بگۆڕێت کە ئێمە پێیان دەخوێنینەوەو راڤەیان پێدەکەین.

دوای ئەوە لەوانەیە ئێمە لێرەدا بتوانین جیاوازییەك لەنێوان رەخنەی ئەدەبیو تیۆری ئەدەبیدا دروست بکەین. ئەگەر ئێمە بڵێین رەخنە خۆی بەخوێندنەوەو شیکردنەوەو روونکردنەوەو راڤەکردنی ئەو دەقانەوە خەریك دەکات کە بەشێوەیەکی ئەدەبیانە بنیاد دەنرێن، ئەوا پێویستە تیۆری ئەدەبی دوو شت ئەنجام بدات. لەحاڵەتی یەکەمدا پێویستە تیۆری ئەدەبی رەهەندێکی پێوانەییمان بۆ دەستنیشانکردنی ئەدەب پێشکەش بکات، هەروەها دەبێ بەئاگابوون لەو پێوانانە پراکتیکە رەخنەییەکانی ئێمە دەوڵەمەند بکات. هەندێ لەو پێوانانە لەگفتوگۆکانی تیۆرەکانی زماندا لەبەشی سێیەمداو هەروەها لەدەروازەی چوارەمدا کە

دەربـارەی ئایدۆلۆژیایـە لەبەشـی چوارەمـدا هەڵدەسەنگێنرێن.

لەحاڵەتی دووەمـدا دەبـێ تیـۆری ئـەدەبی لەبارەی رێبازو ئەو پێوانانـەوە ئاگادارمـان بكـات كـە دەیانخەینـە بـواری پیـادەكردنی رەخنـەی ئەدەبیـەوە، ئـەویش بـەو مەبەستەی كـە ئێمـە بەتـەنیا دەق نـەدوێنین، بـەڵكو لـەپاڵ دواندنـی دەقدا ئـەو رێگایانـەش بدوێنـین كـە دەقیـان پـێ دەخوێنینـەوەو دەقیـان پـێ راڤەدەكـەین. بـە وتەیـەكی چڕوپڕتـر پێویستە ئێمە جیاوازیـەكی زیاتر لـەنێوان تیـۆری ئـەدەبی‌و تیـۆری رەخنـەدا دروست بكەین ئەویش لەو روانگەیەوە كە تیـۆری ئـەدەبی بەشـێوەیەكی زیـاتر پەیوەسـتە بـەو تێروانینـەوە كـە "ئـەدەبو ئـەدەب" چـین، لەكاتێكدا كە تیـۆری رەخنـەیی پەیوەسـتە بـە سروشتی رەخنـەو پراكتیكی رەخنەییـەوە. ئـەم دوو لایەنە وا دەردەكەون كە بخرێنە ژێر ستوونی رەگـەزی گشـتی "تیـۆری ئەدەبییـەوە"، لەراستیشدا هەندێ لەتیۆردانەران زیاتر گفتوگۆی تیـۆری رەخنـەیی دەكـەن نـەك تیـۆری ئـەدەبی، ئەمەش ئاماژە بۆ ئاسـان كـارپێكردنی زاراوەكـان یان ئاماژە بۆ نەبوونی وردەكـاری لەبـەكارهێنانی زاراوەكـاندا دەكـات كـە بەشـێوەیەكی بـەردەوام تیۆری رەخنەیی بەرێگای دروست دوا توێژینـەوە رەخنەییـەكان كـەوتووە. بـەم شـێوەیە ئـەم دوو پانتاییـەی تیۆری بەهـەمان ئـەو رێگایـەی كـە رەخنـەی ئـەدەبی‌و تیـۆری ئـەدەبی ناشـێت بەتەواوی لێك جودا بكرێنەوە، ئەمانیش واتە ئـەو دوو پانتاییـەی تیۆریش ناشـێت پـەیوندییان بەیـەكترەوە نـەبێت. لەراسـتیدا هەریەكـەیان زانیاری دەدات بەویتریان‌و هەروەها پەیوەندیەكی پێكـەوە بەسـتراویان هەیـەو پشـت بەیـەكتر دەبەستن.

ئـەم خشـتەیەی خـوارەوە پێشـنیاری ئـەوە دەكات كە ئێمە چۆن تەسەوری پەیوەندی نێـوان ئـەدەبو رەخنـەی ئـەدەبی‌و تیـۆری ئـەدەبی دەكەین:




ئەمەش نموونەیەكی تەواوی پرۆسە ئـەدەبی‌و پرۆسە رەخنەییـەكان نـانوێنێت لـێرەدا چـەند نادیارێكی ئاشـكرا هـەن بەتایبـەتی وێنـەكانی دانـەرو خوێنـەر كـە ئاسـایی وەكـو بنەمایـەك لەتوێژینەوەی ئەدەبدا بیریان لێدەكرێتەوە.

لەوانەیە لەم خاڵەدا ئێمە تێبینی ئەوە بكـەین كە هەندێ دەروازەی تیـۆری زۆر پەیوەست نـین بـە كەسـێتی نووسـەرەوە وەكـو لەشـێوەی تەقلیدیانـەدا گرنگی پـێ دەدرا. هـەروەها ئـەو دەروازە تیۆریانە بەو جۆرە مامەڵە لەگـەڵ دانـەر ناكـات وەكـو ئـەوەی خـاڵێكی بەڵگەنەویسـتی جیابوونـەوە بێـت لەبیركردنـەوەدا دەربـارەی ئەدەب لەو روانگەیەوە كەئەدەب یان پانتاییەكە لەنووسین یان تاكە دەقێكە.

**سەرچاوە:**

Roger Webster. Studying Literary Theory, An Introduction. London. 1990. P.P.5-10

❑

# پێکهاتە شکانی دەق

■ ڕۆجەر وێبستەر

● و: م. محمد غەفور

**تیۆردانەری** فرەنسە جاك دێریدا دادەنرێت بەدامەزرێنەری سەرەکی بزاوتی ناسراو بە پێکهاتە شکانی. لە 0بونیادو زناکو یاری لەگوتارەکانی زانستە مرۆییەکاندا-1966) ئەوە دەردەخات کە لە زانستی ڕۆژئاوادا فۆرمەکانی فەلسەفەی زانین بەدەوری سەنتەرێکدا بونیاد دەنرێن وە ئەم پرۆسێسی بونیادنانە بەشێوەیەکی ئاسایی خودی خۆی جێگای سەرنج نیە: بەسروشتی بووە. گوتار یا زانین بەشێوەیەکی باو دەگەڕێتەوە بۆ سەنتەرێك بۆ (خاڵێکی ئامادەبوون، بنەڕەتێکی جێگیر)(1) ئەرکی ئەم سەنتەرە بەپێی دێریدا دوانەییە. سەنتەرێکی کارایی پێکدێنێ‌و ڕێگە بۆ زانین خۆشدەکات بۆ ئەوەی بەدەوری راستیەکی تایبەت ڕێکبخرێت‌و ئاشکراکردنی ئەوەی کە خۆی وەکو ڕەها دەنوێنێ: ڕێسایەك کە ڕێگا رەخنەگرە تەقلیدیەکان بۆ دەقە ئەدەبیەکان زۆر جار جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە داوا دەکات ببێت بەتەفسیری پرسیار هەڵنەگر، هەروەکو لەشێوەکانی تری گوتاردا دەبینرێت وەکو حوکمی یاسایی‌و تشخیصی پزیشکی. هەروەها بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر ئەرکی سنوردانان یا جێگرکردنی سنوری ماناکان‌و سنوررێژکردنی ئەو ڕێگایانەی کە دەقێك یا بواری زانینی لێ وەدەرك دەکرێ لەئەستۆ دەگرێ، بۆ ئەوەی هەر زیاد بونێکی خێراو سەربەستی یاری مانا نەهێڵرێت. مانا دەخرێتە سیستەمی زانینەوە بۆ ئەوەی گوتارێك حەقیقەتەکەی خۆی پێك بێنێ یا ڕەوا بکات، وە ئەو ڕێگایانەی کە ئەمەی لێوە دەخرێنە بەردەست نەکرێنە جێگای سەرنج. گەشەکردنی ئەوەی کە بە دیسپلین (نظام)ەکانی ئەکادیمی ناسراون خەسڵەتێکی گرنگی ئەو پرۆسێسە مێژووییەیە کە ژمارەیەك بواری ناسەربەخۆ بەشێوەیەکی ڕێژەی سەربەخۆو

پشت بەخۆبوون. لەبەر ئەوە حەقیقەتە ئەدەبییەکان بەجیا هەڵئەسەنگێنران لەسەر بنەمای ئەو رێسا رەخنەگرە ئەدەبیانەی کە لەتوانایاندایە پێناسەی (صادقیەت) بکەنو هەڵیشی سەنگێنن.

بەهەمان شێوە حەقیقەتی مێژوییش بینادەکرێت بەهۆی ئەو رێسایانەوە کە لەلایەن فەیلەسوفەکانی مێژووەوە دیاری دەکرێن، بەم شێوەیە زانین خۆی رەوا دەکات. لەراستیدا یەك خەسڵەتی زمانو زانین سروشتی گێڕوتنەکەیانە وتنی هەمان شت ئەگەر تارادەیەك بەمەبەستی جیاشبێت. ئەمە پێشنیاری ئەوە ناکات کە بوارە ناجێگیرەکان ئەرك لەئەستۆ دەگرن بەتەواوی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەهەر یەکێکی تر (وەپێشنیاری ئەوەش ناکات) کە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە هەڵاوێردەرن. بۆ نمونە تایبەتمەندییەکانی مێژوو هەندێ جار بەکاردەهێنرێن بۆ جەخت کردن لەسەر دراسەی ئەدەبی بەپێی نمونەکەی درێریدا دیسپلینەکان فۆرمە هەمەکییە وێکچووەکانی بونیادکاری دەکەن بەهاوبەش بۆ ئەوەی فۆرمەکانی زانین هاوبەشبێت ئەگەر نا ناوەرۆکەکانیان، بەشێوەیەکی تر لێرەدا جۆرێك پشت بەستن بەخۆ هەیە سەبارەت بەزانین هەروەکو لەبەشە تایبەتیەکانیدا پۆلێندەکرێت.

لای درێدا رەگەزی گرنگی ئەم پرۆسێسە ئەوەیە کە زاراوەی لۆگۆسێنتریزم (logocentrism) بەکاردەهێنێ، کە بریتیە لەبەیەکەوەبەستنی لۆگۆ (logo)ی یۆنانی بەمانای زمان هەروەها بەمانای لۆجیكو عەقڵیش دێت وە ئەمە لەکەلتوری رۆژئاوادا وەکو سەنتەر یان جەوهەرە بۆ ماناو زانین. زمان رێگامان پێ دەدات بەنزیکەی بۆ بیناکردنی ناکۆتا سەنتەرگەلی مانا لەبەئاگای ناسنامەی تاکی خۆمانەوە بۆ سەنتەرگەلی دەستەجەمعەی زیاتری نەتەوەیی. بۆ نمونە ئەدەبی ئینگلیزی جەوهەری بیناکردنی ئەفسانەی ئینگلیزیو سەنتەری ناسنامەی کەلتوری وڵاتەکەیە. ئاینی رۆژئاوا بە سەنتەری بیرۆکەی خودا دادەنرێت لەگەڵ ژمارەیەك لقە سەنتەر کە ئەرکی هێشتنەوەی دوا سەنتەری بوون یا ئامادەبون لەئەستۆ دەگرن. لەکاتێکدا سەنتەرێك پرسیاری لەسەر ئەکرێ یان دەگۆڕدرێ ئەوا لەبەرامبەردا سەنتەرێکی نوێ بینا دەکرێت. هەروەکو پێناسەکردنەوەی دەروون لەلایەن فرۆیدەوە کە لەئاکامدا چەمکی نەست جێگەی نمونەی تەقلیدی عەقڵو هۆش دەگرێتەوە. وا دەردەکەوێت کە بیرکردنەوەو قسەکردن یا نوسین مەحاڵبێت بەبێ هەبوونی هەندێ جۆری سەنتەریزمی ناوەکی لەگوتارەکەماندا، زمان بەشێوەیەکی مێژووی دەستەڵاتی ئامادەبوونی پێبەخشراوە: دێریدا ئەوە روون دەکاتەوە کە بەرزنرخاندنی ئاخاوتن بەسەر وشەی نوسراو (نوسین) لەلایەن ئەفلاتۆنەوە رێگەیەکە بۆ بەخشینی باوەڕپێکراوێتی (موثوقیەت) بەزمانو جێگربوونی لەلای قسەکەرێکی تاك، بەم شێوەیە زمان بنەڕەتی ئەوەی لەهەر ساتەوەختێکی تایبەتدا بەمانایەکی تایبەتی پێدەدرێت(2). بەهەمان شێوە بەسەرزمانی نوسینیشدا جێبەجێ کرا بەراڤەکردنی دەقەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان لەسەر بنەمای نیازەکانی نوسەرو دۆزینەوەی شوێنی نوسین لەتۆرەکان یا لەچوارچێوەکانی مەرجەعدا کە لەهەوڵی مانەوەی ماناکانیاندان لەجێگای خۆیدا. دێریدا پێشنیار دەکات کە مانا لە حەقیقەتدا تاکو جێگیر نین بەڵکو بەبەردەوامی لەزیادبوونو گۆڕاندان جا ئەگەر لەزمانی

ئاخاوتندا بێ یا لەنوسیندا. بۆیە (دێریدا) زاراوەی پەرتبوون بۆ ئەم پەرشو بڵاوی‌و هاتوچونەی ماناکان بەکاردێنێ کە لەهەر جۆرێکی دەقەوە دێنە ئاراوە.

دێریدا زاراوەی (جیاوازی) بەمانا فەرەنسیەکەی بەکاردەهێنێ بۆ وێناکردنی چۆنیەتی کارکردنی ماناو بناغەدانانی پرۆژێکتی پێکهاتەشکانی. سەرەتا جیاوازی (Differance) (لای دێریدا) بەجیاوازی (difference) لە سیستەمی جیاوازیەکانەوە کەتێروانینی سۆسیۆیە بۆ زمان دارێژراوە، وەردەگێرێت. بەپێی سیستەمی جیاوازیەکان ئێمە دەتوانین وشەکان‌و مانا پەیوەندیدارەکانیان جیابکەینەوە بەهۆی سیستەمی جیاوازیە دەنگیەکانەوەو تێگەیشتن لەوەی کە شتێك شتێکی تر نیە. لەبەر ئەوە (dog) (سەگ) (hog) (بەراز) (bag) نیە. لای سۆسیۆ پەیوەندی نێوان دال‌و مەدلول جێگیرە (لەبەر ئەوە) سیستەمی جیاوازیە فۆنەتیکی‌و سیمانتیکیەکان بەرێگەیەکی رێك‌و بێ کێشە ئامێز کاریان کردووە. بەڵام لای دێریدا زۆر کێشە ئامێزە: مانا هەمیشە لەبارێکی ناجێگیرو ناکۆك دایە. لەکاتێکدا ئێمە بیر لەسەگ (dog) دەکەینەوە بیر لەوەش دەکەینەوە کەونیە: پشیلەیەك، بەرازێك‌و چی‌و چی نیە. بەشێوەیەکی تر لەکاتێکدا ئێمە هەوڵ ئەدەین مانایەك جێگرکەین، هەندێ شتی تاك‌و ایجابی بنوێنێت بەبێ دەنگی یا بەنەفی‌کردنی ئەو فیگەرە یا مانا دژ یا جیاوازانە کە دەخرێنە بەرامبەر، دەستەبەردەبێت. بیرۆکەی (باش) مان نیە بەبێ دژەکەی (خراپ) وە بیرۆکەی (پیاو)و (پیاوەتی)مان نیە بەبێ (ژن)و (ژنێتی).

بەشێوەیەکی راستر مانایەك یا بەهایەکی تایبەتی دەردەبڕێت بەڵام گرنگتر رووبەرەکانی جیاوازیەکە دەوری دەدەن. بەم رێگەیە، دێریدا ئەوە رون دەکاتەوە کە دەقەکان سەبارەت بەوانەن کەوا دەردەکەوێت سەبارەت بەوان نەبێت وە (دێریدا) بۆ خاڵە لاوازەکان دەگەڕێت یاخود بۆ تێکشکاندنی شوێنی دەرخستنی ئەوی دی کە دەق پەردەپۆشی دەکا.

لێرەدا کە پارکی مانسفیدڵد (ی جەین ئۆستن) بەنمونە وەردەگرین تێبینی ئەوە دەکەین کە ئارەزووی جنسی بەراشکاوی ناونەهێنرێت هەرچەندە هەرەشەیەکی بەردەوامە بۆسەر جۆری یاسا کۆمەڵی‌و پەیوەندیە خێزانیەکان کە بەرێگەیەکی ئەخلاقی‌و ئۆماڵی بینادەکرێت. بەڵام ئەو دیمەنەی کە فانی (fanny) دادەنیشێت لەدەرەوەی دەروازەکانی چونە ناو ئەو بێشەڵانە کە کارەکتەرەکانی تر دزەیان کردۆتە ناوی وادەردەکەوێت کە بزوێنەری ئەگەری ئارەزووی جنسی بێت.

کاروباری جنسی‌یەکان تاپۆ یەکن، بابەتێکی دەرنەبڕێنەرە لەدەقدا وە زۆر بەکورتی ناو ئەهێنرێت بەڵام زۆر گرنگن بۆ ئەوەی یاسای ئەخلاقی لەجێی خۆیدا بمێنێتەوە. بەشێوەیەك بابەتی (پارکی مانسفیلد) ئەوەندەی نائەخلاقیەتە ئەوەندەش ئەخلاقیەتە.

بەڵام نائەخلاقی بەناونەهێنراوی‌و بێ دەنگی دەمێنێتەوە بەمەش زمان‌و هەڵسوکەوتی ئەخلاقیەت دیاری دەکرێت. دێریدا زاراوەی ئاپۆریا (aporia) بۆ جۆری ئەم تێکشکاندنە کە ئەوی دی مانا دەردەخات، بەکاردەهێنێ: لەیۆنانیدا (دەبڵ) یا (ئاڵۆزی)یە. دێریدا ئەوە دەردەخات کە هەندێ دەق (ئەوی دی) یەکانیان ئاشکرا دەکەن‌و ئەو رێگایانەی کە مانای تێدا بینادەکرێت‌و بە سەنتەر دەکرێت بەشێوەیەکی خود هوشیاری بەهۆی ئەو (تناقضە)

خۆرسکی‌یانەوە کە لەسەری بەندن روون دەبێتەوە ئەمە حاڵەتێکی تایبەتە بە دەقە ئەدەبیە تایبەتەکانەوە کە نەك تەنها مانا دادەنێن بەڵکو ئەو رێگایانەش کە مانای تێدا بە بەرهەم دەهێنرێن ئەمەش لەفۆرمەکانی تری گوتار ناچێت.

مانایەکی تری جیاوازی لای دێریدا (دواخستنە) کە لە (differer)ی فەرەنسیەوە هاتووە کە بە مانای (دوابخرێت) هەروەها (جیابکرێتەوە) دێت. ئەو بیرۆکەی کە مانا لەکۆتای نایە، بەتەواوی نایەتەدی بەڵکو هەمیشە لەپشت ئێمەوە دوادەخرێت، دیاری دەکرێت لێرەدا. وشەکان بەوشەکانی تر هەروەها ئەمانەش لەبەرامبەردا بەوشەکانی تر پێناسە دەکرێت لەبەر ئەوە ئێمە ناگەین بەمانای تەواو بەدی هاتوو نادواخەری. ئەمە تاڕادەیەك وەکو یاری کردنی لویس کارۆڵە بەمانای مانا لە (Alices' Adventure in wonderland)دا:

لەکاتێکدا مارچ هار بەئەلایس دەڵێت (پێویستە بڵێی مەبەستت چی‌یە) وە ئەویش وەڵام دەداتەوە (مەبەستم لەوەیە کە دەیڵێم، خۆت ئەزانی ئەمەش هەمان شتە) بۆ ئەمە هارتەر وەڵام دەداتەوە (تەنها تۆزێکیش هەمان شت نیە) لەراستیدا ئەلایس لەهەوڵداندا بۆ دەست گرتن بەسەرزماندا زنجیرەیەکی مانا کۆنترۆڵنەکرێنەرو زۆربووەکان دەبزوێنێ. ماناکان دەستیان بەسەردا ناگیرێ: بە هۆی زۆر سروشتی‌یەکەیەوە مانا هەمیشە دەشێ بەهەندێ ئاراستەی تردا بڕوات زیاتر لەوەی کە بەشێوەیەکی چاوەڕوانکراو بۆی دادەنرێتو بەردەوامی پێ دەدرێت. دووبارە پێ دەچێ دەقە ئەدەبیەکان بەخود ئاگاییەوە ئەمە بەکاربهێنن بۆ ئەوەی حاڵەتی هەبوونی زیاتر لەمانایەکو هەتا ئاستە زیاتر ئاڵۆزەکانی ماناش دەربکەوێت لەدەقدا. دێریدا گرنگی تایبەت بەنوسینی جۆیس دەدات بەتایبەتی لەبەشەکانی (رۆمانی) (یولیسیس)و (بەئاگا هاتنەوەی فینگن) کە وا دەردەکەوێت ماتە ووزە لەماندا بەرەڵا بکرێت تا ئەو رادەی جێگای وێناکردنە. ناکۆتا داسەپان دارژانی زمانو مانا لەدوایدا بریتیە لەتەقینەوەی تەواوی یاری مانا کە بەشێوەیەکی نۆرماڵی کۆنترۆڵ کراوەو دەستی بەسەر داگیراوە لەگوتاری تەقلیدی‌دا، وەکو ئەوەی ماتە وزە لە ئەتۆمەکانی گەردیلە زمانەوانیەکاندا دۆزرابێتنەوە. مەودای پەیوەندیەکان کە بەهۆی یەك رستەوە پەیدا دەبن هەندێ شت لەم بارەوە روون دەکەنەوە بەتایبەتی ئەگەر ئێمە ئەو دێڕە کراوەو داخراوانەی نۆڤل وەربگرین کە یەکانگیر دەبن بۆ پێك هێنانی یەکەیەکی سینتاکتیکی. وە بەم شێوەیە رێسایەکی داخراو پێشنیار دەکات کە لێرەدا هیچ کۆتاییەك نیە بۆ ئیبدال (permufations)ەکانی ماناکە بکرێن بەهۆکار لەزمانو هۆشدا. وەکو ئەو دەقەی کە بەشێوەیەکی ناکۆتا بەردەوام دەبێت لەدەست پێ‌کردندا کۆتاییەو لەکۆتایدا دەست پێ‌کردنە تێڕوانینێکی لەم جۆرە پرسیارگەلێکی گرنگ دەوروژێنێ سەبارەت بە سروشتی رەخنەگەری‌و تەفسیرکردن. بیرۆکەی دۆزینەوەی تەفسیرێکی راستو پرسیار هەڵنەگر بەدوو رێگە لاوازتر دەکرێت. یەکەم لەبەر ئەوەی زمان کە پێکهێنەری دەقە لەکۆتای نایەو کۆنترۆڵ ناکرێت بەڵکو هەمیشە پڕ دەبێت لەمانای جیاواز: زمان موعەرەزە بۆ پەرتبوون (dissemination) هەرچەندە لەوانەیە زۆر لەدامەزراوەکان هەوڵبدەن بۆ سنوردانان یا جێگیرکردنی ئەو رێگایانەی کە دەقێکی پێ دەخوێندرێتەوە.

دووەم زمانی رەخنەگەری یا تەفسیرکردن. خودی خۆی پشت بەهەلومەرجەکانی (جیاوازی) دەبەستێت وە زیاتر هەوڵی برانەوەیەکی تایبەت دەدات، ئەو مانایانەی تر کە دەردە هاوێژرێن زیاتر لەهەوڵی گوێ بیست بوندان. ئەوەی بوترێت لەوێدا هیچ چەوت خوێندنەوە یان چەوت تەفسیرکردن نیە: بەرێگەیەك پێکهاتە شکانی خوازی ئەمەریکی پۆل دیمان وتویەتی (هەموو خوێندنەوەیە چەوت خوێندنەوەیە) بەپێی چەمکی زمان لای دێریدا هەر مانایەك دەبێت رەوابێت وەکو لۆگۆسینتەریزم (logoceterism) رێگا نادات. بەجۆرێکی تر زمان بەهۆی سروشتی یەکەیەوە مانابەخشە. ئەوەی جێگای مشتومڕە ئەو مانایانەیە کە جێگای پاساون- ئەوانەی پەسەند دەکرێنو ئەوانەی دەردەهاوژرێن. کورتە چیرۆکی (فیگەر لەفەرشدا)ی هێنری جەیمس (The Figure inthe carpet) Henry James لەلایەن رەخنەگرە پێکهاتەشکانی خوازەکانەوە بەجۆرێکی ئیگزیمپلم (exemplum) دادەنرێتو دەکرێ بەو رێگەیەی چۆن راوبۆچونێك دەدرێت لەسەر پاڵنەر بۆ دۆزینەوەی مانا یا راڤەی رەها لەدەقێکدا، بخوێندرێتەوە لەچیرۆکەکەدا رەخنەگرێکی لاو لەلایەن نوسەری نۆڤلیك ڤێرکار (Vereker) کە کارەکانی زۆر جێگای سەرنجیەتی بەڵام لەگەڵ خوێنەرەکانی تردا بەتەواوی تێیناگەن، پێی دەگوترێت کە فیگەر یا رێسایەکی گومان هەڵنەگر لە نۆڤلەکەیدا حەشاردراوە. هەرچۆنێکبێ ڤێرکار دەمرێت پێش ئەوەی تەئکید لەنهێنی یەکە بکاتەوە، بۆیە دووا راڤەی چاوەڕوانکراو بەنادیاری دەمێنێتەوە یاخود دوا دەخرێت. چیرۆکەکە بەگەلێ رێگەی جیاواز خوێندراوەتەوە. وە وەکو کلیلێك دەبینرێت بۆچونە ناو گێڕانەوەی تایبەت بەخەیاڵی جەیمس- لەراستیدا بۆ تەفسیرکردنی دەقە ئەدەبیەکان بەشێوەیەکی گشتی-لەوەدا کە هەندێ جار بیری لێ دەکرێتەوە بەوەی کە خاوەنی دوا مانایا سەنتەری راستیە. ئەمە وەکو نمایشێکی بیرۆکەی دواخستن لای دێریدا دەبینرێت- کە مانای تەواو هەمیشە رادەکات. زۆری مشتومڕ لەسەر ئەم تێکستە وا دەردەکەوێت راوبۆچونێکبێت لەسەر سروشتی تەفسیر کردن: لەوەی کە هەر جۆرێکی دەق بەتایبەتی دەقە ئەدەبیەکان ناتوانرێت بەردەوامی پێ بدرێت (بهێڵرێتەوە) لە سیستەمێکی جێگیر کراوداوە مانایەکی رەها سنورداری تێدانیە.

**سەرچاوە:** رۆجەر وێبستەر (تیۆری ئەدەبی).

**پەراوێز:**

1-Jacques Derrida structure sish and play in the Discourtes of the human science Clondn Routhedge 1978).

2-ئەفلاتون لە (فایدروسدا) ئەوە رون دەکاتەوە کە ئاخاوتن بالآترە لەنوسین لەبەر ئامادەبونی قسەکەر پێ دەچێ وشەکان کەمتر چەوت تەفسیر بکرێتو دەقی نوسین زیاتر ئاوەڵایە بۆ تەفسیر.؟

3-exemplum ئیگزێمپلم جۆرێکی کورتە چیرۆکە کە خاڵێکی ئەخلاقی دەردەخات.



# دەربارەی ئایتماتۆف

ئەحمەد پوری
و. لە فارسییەوە: فەرشید شەریفی

**چەنگیز ئایتماتۆف،** لە ساڵی 1928 لە گوندی "شێکر"ی سەر بەناوچەی قرقیزستانی شورەوی هاتۆتە دنیاوە. سەرەتا لە ئەنستیتۆی کشتوکاڵی قرقیزستاندا، خوێندنی تەواو کرد و پاشان بۆ خوێندن لەرشتەی ئەدەبیات، چوو بۆ مۆسکۆ، دەورەی ئەم رشتەیەی لە ئەنستیتۆی "ماکسیم گورگی"دا، تەواو کرد.

یەکەمین کورتە چیرۆکی بەناوی "زونیدۆی رۆژنامەنووس" لەساڵی 1953دا، چاپ کرا، و رۆمانە چکۆڵەکەی، واتە "جەمیلە" کە لەساڵی 1958 دا چاپ کرا، بووبەهۆی ئەوە کەبە عینوانی نوسەرێکی بەتوانا، ناوبانگ دەربکات. "لویی ئاراگۆن" شاعیری بەناوبانگی فەرەنسەیی، رۆمانی جەمیلەی بەجوانترین چیرۆکی ئەویندارانەی دنیای ناوزەد کردو هەر خۆی وەریگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی. هەندێ لە



ئاسەوارەکانی بریتین لە: "رووبەڕوو"، "یەکەمین مامۆستا"، "دایك"، "سنەوبەرە بچوکەکەم لەدەسماڵێکی سووردا"، "ماڵ ئاوا ئەی گولساری"، "پاپۆڕی سپی"، "سەگێکی ئەبڵەق، کە لە قەراخ دەریادا، رای ئەکرد"، "کلنگهای زود

پرواز (The Early Cranes)"، "رۆژێك بەدرێژایی سەدەیەك" و شانۆگەری یەك بەناوی "سەركەوتن بەسەر فوجی یامادا"، كە بەهاوكاری "موحەمەد جانۆف" نوسەری قەزاقستانی، نوسیویەتی.

ئەو هەنوكە، لەسەر دواهەمین رۆمانی خۆی بەناوی "باكێرەی پیرۆز" كار ئەكات، ئایتماتوف، بۆ خوێنەرە ئێرانیەكان ناوێكی ئاشنایە و زۆربەی ئاسەوارەكانی وەرگێڕاونەتە سەر زمانی فارسی.

چیرۆكەكانی ئایتماتوف، لەبارەی ژیانی گوندنشینە قرقێزەكان و دەرگیریەكانی ئەوانە. بەڵام هەر بەو شێوەیەی كە خۆی لەم وتوویژەدا، ئەهێنێتەوە بیرمان، ئەم بابەتانەی كردۆتە دەسمایەیەك بۆ خستنە روی مەسەلە بنەڕەتی و قوڵەكانی مرۆڤ، ئایتماتوف بەدوای ئینسانێكی ئایدیالدا، ئەگەڕێ كە پەروەردەی كۆمەڵگایەكی بێ خەوش و دوور لەنابەرابەری وستەمە. ورد بونەوەو روانینی رەخنەگرانەی ئەو، لە كەموكوریەكانی سیستەمی وڵاتەكەی و بەریەرەكانێی بێ وچان لەدژی "جەزمیەت"، بوروكراسی، ریاو دوڕویی لە كۆمەڵگاكەی خۆی، ئەویان لەریزی یەكێك لە ئاڵا هەڵگرانی رۆشنبیری ئەندێشەی نوێی شورەوی داناوە.

بەرەی ئەمڕۆی شورەوی ئەو بەعینوانی یەكێك لە گەورەترین و بەشەرەف ترین نوێنەرانی ئەدەبیاتی شورەوی ئەناسن. ئاسەوارەكانی ئەو هەمیشە بە زۆرترین تیراژ چاپ ئەكرێن و بەردەوام داواكاریان زۆر ئەبێ.

ئەم وتوویژە لەلایەن "لیۆچنكۆ" رەخنەگرو رۆژنامەنووسی روسی‌یەوە ئەنجام دراوەو لەدەقی ئینگلیزی گۆڤاری ئەدەبیاتی شورەوی، ژمارە 4 ساڵی 1977 وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.

* * *

## "وت و ویژ لەگەڵ چەنگیز ئایتماتۆف"

-دواهەمین رۆمانتان "كلنگهای زود پرواز (The Early Cranes)ە" كەسەبارەت بەشەڕە. بۆچی دیسان خۆتان سەرقاڵ كردوە بەنوسین لەسەر بابەتی شەڕ؟

ئایا هەندێ لەو مەسەلانەی كە پەیوەستن بەژیانی ئەمڕۆ، ئێوەی مەجبور كرد، شەڕ هەڵبژێرن؟

*ئایتماتۆف: مەبەستم ئەوە بوو ئینسانێك پیشان بدەم كە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ دەرگیری شەڕە. لەم زەمینەشەوە بە ئەندازەی پێویست، چیرۆك نوسراوە...

رووبەڕووبونەوەبەم شێوەیە لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا، هەنوكە بە بیروڕای من سەرنج راكێش ترین و پڕمایەترین رووبەڕووبونەوەیە لەگەڵ ئەدەبیاتی جیهاندا. تەسەوری خەڵكی بەگشتی لەشەڕ، هەمیشە هێڵی پێشەوەی جەنگە.

بەڵام زۆر لایەنی دیكەش هەیە كە ئەكرێت لەرێگەی ئەوانەوە باس لەسەر شەڕبكرێت. هەوڵ ئەدەم كە بیروڕاكەم بەشێوەیەكی باشتر بخەمەڕوو. من ئاگایانەو رەنگە نائاگایانەش، خوازیاری ئەوە بووم، سەبارەت بەوەی كە چۆن پیاوێكی لاو دەرگیری شەڕ ئەبێت، چیرۆكێك بنوسم. ئەمە خاڵی دەست پێكردن بوو. پاشان هەستم بە ئەركێكی گەورەتر كرد، لەبەرانبەر خۆمدا. ویستم ئەوە پیشان بدەم كە شەڕ، چەند روخێنەر و وێران كەریش بێت، هێشتا ناتوانێت ئینسان لەبەین بەرێت. ئەمە راستە كەشەڕ ئەتوانێت ژیانی خەڵكی تاڵ و ناخۆش بكات و ئینسانەكانیش هان ئەدات كە تەنها، بۆ خۆیان شەڕ بكەن و هەروەها ئەمەش راستە كە لەشەڕدا، هێزە ئەهریمەنیەكانی توندو تیژی و ناپاكی ئەگەنە ئەوپەڕی لوتكەی خۆیان، بەڵام ئەمەش لەشەڕدا هەیە كە هێزە ئینسانیەكان رەنگە بۆ رووبەڕبوون لەگەڵ سروشتە روخێنەرەكەی

شەڕدا، لەدڵی ئینسانەکاندا شکۆفە ئەکات و میکانیزمی بەرگری کردن لەبەرانبەر ناپاکیدا، ئەهێنێتە ئاراوە، ئەمرۆ بابەتی بێ بەزەیی و دڵرەقی، بنەمای سەرەکی هونەرو ئەدەبیاتی بیانییە- بەتایبەت لە سینەماو شانۆدا- ئامرازە ڕاگەیاندنە بەکۆمەڵەکان، بە پیشاندانی توندوتیژی فیزیکی بەهەموو شێوەکانیەوە، بۆ نمونە، وەك تاوانباری، ئەشکەنجە، خوێن ڕشتن‌و هەوڵ دان بۆ جولاندنی غەریزەکانی ئینسان، زیاترین بەهرە لەم بابەتە وەرئەگرن. دیاردەیەکی بەم جۆرە، مایەی نیگەرانی‌و ترس هێنەرە. ئەمە رێگە گەلێکی دڵنیایە بۆ کایەکردن لەگەڵ عاتیفە ئینسانیەکان و گۆڕانی هونەر بە جۆرە هیپنۆتیزمێك، بۆ پەیدا بوونی کاریگەرییەکی کوێر کوێرانە.

بەلام بەبیروڕای من، ژیانی ئاسایی خەڵکی، بەعینوانی خاڵی بەرەو پێش چونی هەڵبژێری. من لایەنگری هونەری ئاساییم، نەك هونەری دێوانەیی و توندو تیژی. ئەومەسەلەیەی کە بەشێوەیەکی گرنگ، خۆی ئەخاتە ڕوو، ئەمەیە کەئینسان تاچ رادەیەك ئینسانە. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە هەوڵ ئەدەم بیخەمە ڕوو. لە "کلنگهای زود پرواز (The Early Cranes)"دا، (هەڵبەتە بۆ ئەوکەسانەی کە خۆشیان ئەوێت) هەولم داوە ئاماژە بکەم بەبایەخە بەرزە ئینسانیەکان، بەتایبەت لە قۆناغە تاریك و ناڵەبارەکانی مێژوودا.

—کاتێ کە ئەڵێین "کلنگهای زود پرواز (The Early Cranes) قسە لەسەر شەڕ ئەکات، مەبەستەکەمان زۆرگشتییە. باشتروایە کە بڵێین ئەم ئاسەوارە، کاریگەری ساڵەکانی شەڕ دەر ئەخات لەسەر ژیانی لاوێتیتان. وە بە هۆی ئەوەی کە کاریگەریەکانی سەردەمی منالی و لاوێتی، گرنگییەکی زۆریان هەیە بۆ خولقاندنی ئاسەوارێك،

—ئەمەوێ بپرسم: سەرەڕای ئەوە کە نیوەی دنیا گەڕاون، ئایا هەر ئەم کاریگەریانەیە، کە هانتان ئەدات لەبارەی گوندەکەتان: "شێکر" بنوسن؟

ئایتماتۆف: کاریگەریەکانی سەردەمی منالی‌و لاوێتی، بەڕاستی بە مەبەستی داهێنان بۆ نوسەرێك، گرنگییەکی زۆریان هەیە. ئەو کاریگەریانە، وەك کانی یا "بیرێکی پیرۆز"ن کە نوسەر هەمیشە، بیرکردنەوەکان‌و تەسەورەکانی خەڵکی لەوێوە هەڵەئێنجێ. ئینسان لەتەمەنەکانی منالی و لاوێتیدا، توانایی‌یەکی تایبەتی هەیە بۆ تێگەیشتن و جەزب کردنی جوانیەکانی دنیا. ئیدی دواتر دەرفەتێك بۆ پاك راگرتنی ئەو جوانیانە نامێنێتەوە. وە، ئینسان زۆرکەم هەست بە هێمنی دەرونی ئەکات. لەبەر ئەوەی کە منال، زیاتر لەگێژاوی خەیاڵدایە و توانایی‌یەکی زۆری بۆ ئیحساس کردن هەیە، و ئەتوانرێ بە ئینسانێکی کامل لەقەلەم بدرێت.

کاتێ کە "کلنگهای زودپرواز (The Early Cranes)"، "جەمیلە"، "پاپۆری سپی"م ئەخوێندەوە: لەبەر خۆمەوە وام بیر ئەکردەوە کە بەبێ کەڵك وەرگرتن لەو "کانیە پیرۆز"ە ناتوانرێت بەشێکی زۆر لەوێنەکان و وردەکاریە ڕاچڵەکێنەرەکانی ژیانی ڕۆژانە لەم ئاسەوارانەدا، بهێنرێتە بەرچاو.

ئایتماتۆف: گاشە بەردێك بەناوی "زین"ەوە کە لەسەری دائەنیشتم و واتەسەورم ئەکرد خەریکم لە روبارە نائارامەکەی "کورکورو"دا، مەلە ئەکەم، لەڕاستیدا ئێستاش هەر ئەو شوێنەماوە. هەڵبەتە هەمیشە تەسەورەکانی سەردەمی منالی ئاوێتە ئەبن لەگەڵ وێنا ڕاستەقینەکاندا و پاشان بەشێوەیەکی ئاشکرا لەدنیای منالیمەوە سەرچاوەیان گرتووە. سەبارەت بە گرنگێتی سەردەمی منالی بۆ نوسەر، وتاری زۆر نوسراوە. کەواتە، لێرەدا نامەوێ ئەم مەسەلەیە زیاتر ڕاڤەبکەم. من سەفەرم کردوە بۆ ئەو وڵاتە دورو نامۆیانەی کە بەمنالی ئارەزوی بینینیانم هەبوو، وەك ئەفریقاو هیندستان. لەوسەفەرانەدا هەولم داوە تا ئەو

جێگایەی بۆم ئەلوێ، سەیر بکەمو تێبگەم. بەڵام ئێستا بۆ وێناکردنەوەی ئەوشتانەی کە بینیومـە، مـەجبورم بەزەحمـەتێکی زۆرەوە گوشار بخەمـە سەرحافیزەی خۆم.

—وادەرئەکەوێت کە ئەم مەسـەلەیەش گرنگی خۆی هەیە کە ئێوە سەردەمی منالێتان لە گوندی "شێکر"دا، بەسەر بردوە، نەك لەشـاردا، چونکـە لەشاردا منـاڵ وابەستـەیە بەبەسالا چووەکـانو نەزم و رێك و پێکی‌یەکی زۆری هەیە.

ئایتمـاتوف: لـە رۆژنامـەی "لیـترا چرنایـا گازتا"دا نوسیم کـە کورەکـەم نـاتوانێت هێلکـەی کـەو پـەرەسـێلکە لەیـەك جیابکاتــەوە، ئەمـە دروستە کە شارنشینی ئەبێتە هـۆی گەشـەکردنی فیکـری ئینسـانەکان، بـەڵام لەهــەمانکاتیش دا شارنشینەکان شتێکیان لەدەستداوە ئەوان فـێری مەسەلە گەلێکی ئاڵۆز ئەبن بـەڵام ئەمـە هـەمووی ئەوشتانە نیە کە لە ژیاندا پێویستمان پێیەتی.

لەشـاردا، ئینسـان دروسـت لەوکاتــەدا کــە بەشێوەیەکی تایبەت ئامادەیی هەیە بۆ ئـەوەی کە ژیـان، کاریگـەری لەسـەردابنێت، زۆر کـەم لـە بوونی سروشت، سەوزەگیا، گـوڵ، کێـو، بـاڵندەو ئاژەڵەکان ئاگایە. کەواتـە لەبەرانبـەر ئەوانـەدا کەمتەرخەمی ئەکات. هەڵبەتـە شـێوازە نوێکـانی ژیان خۆشحاڵم ئەکات، بـەڵام لـەم شـێوازانەش دا هەندێ جـار لەدەسـت دانـی هـەندێ شـت ئەبێتـە مایەی نیگـەرانیم. ئەمـە زۆر سـەرنج راکێشـە کـە هاووڵاتیــەکانم خوێندەواربــوونو لەتـــەکنیك و هونـەردا لێهاتوویی‌یان بەدەست هێنــاوە، بـەڵام ئەمــەش خەفــەت هێنــەرە کــە ئــەوان یەکـــەم، خەریکن سوننەتە نەتەوەیی پڕ بـەهاکانی خۆیـان فەرامۆش ئەکەنو دووهەم، بایـەخی پێویست بـۆ میراتی کولتوری خۆیـان، دانـانێن. من لـە ژیـانی خۆمدا لەگەڵ ئینسانێکی نەخوێندەواردا رووبەڕوو بومەتـــەوە، کـــە پابـــەندبوون بـــە ئەســـڵە ئینســـانیەکانی خۆیـــان، بـــە بـــەرزترین شێوەکانیانەوە. هـەر لەبەر ئەوەیـە کـە من لـە ئاسەوارەکانمدا، زیاتر پشت بەو جۆرە ئینسانانە ئەبەستم کـە باش ئەیانناسـم و لــە حـافیزەمدا بـەعینوانی ئینسـانانێکی بـەتواناو خـاوەن ئەسـڵ گەلێکی بەرزی ئاکاری ماونەتەوە.

گوندێکــی گــەورەی قرقــیز، ســـەرچاوەی داهێنانێکی گەورەیە بۆمن، ژیانی گوندنشینەکان، گەلاڵـەکان، کەسـایەتیەکانو وێنایــەکی زۆری خستەبەردەستم. کەواتە، شێکر هەر بەو شێوەی کەلـەرابردووە لـە حافیزەمداماوەتـەوە، ئـەتوانم بیکەم بـەناوەندی مەسـەلە دەرونیـەکانی ئـەمڕۆ. هەڵبەت ئـەمڕۆ، شێکر بەتـەواوەتی گـۆڕاوەو بـێ هاوتاشە. بەڵام ئەبێ دووپاتی بکەمەوە، کاتێ کە بیر لە رابردوی ئەکەمەوە، هەستێکی خەماوی دام ئەگرێت.

—ئایا ئێستا سەردانی شێکر ئەکەن؟

ئایتماتۆف: ساڵی دوو، سێ جار.

ئایـا کاریگـەری ئـەم چاوپـێ کەوتنانـە، کـە رەسەیەکی خام ئەخاتە بەردەستان بۆ نوسین؟

ئایتماتۆف: من هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەبارەی شێکرەوە بنوسم، چونکـە بـە بیروڕای من هونـەر هەمیشە ئەبێ، کەرەسەخامەکان بگۆڕێـت. دروست لەبـەر ئەو هۆکارانەشـە کـە ئـەتوانێت، نـاوی هونـەر لـە خۆبگرێت.

—مەبەستم لەکەرەسەی خام، بەتەواوی مانای وشـەکە، تایبـەت بـە ئاسـەوارێکی هونـەری نیـە. مەبەستم جـۆرە خـاڵێکی بــەرەو پێـش چـونو بەشێوەیەکی مەجازی تێکەڵاوێك لەمێژوو زمانە.

ئایتمـاتۆف: لـەو بڕوایــەدام کــە ئــەبێ هــەر نوسەرێك خاوەنی خاڵی بەرەو پێش چون یاخاڵی رووبەڕووبوونـەوە بێت لەگـەڵ راسـتیدا. ئـەبێ هەموو ئەزمونەکان ئاوێتەی یەکدی بکرێن. ئەگەر بەزمانی بازرگانی قسەبکەین، ئەبێ بڵێم کە شێکر سەرمایەی سەرەکی منەو زۆرشتی دیکـە لای من بـەعینوانی سـەرچاوەکانی داهێنـانی لاوەکـی لــە قەڵـەم ئـەدرێن. هەرچـەندە زەمـان زیـاتر تـێ ئەپـەڕێت، رۆڵـی ئـەم سـەرچاوە لاوەکیانـە لـە ئاسەوارەکانم دا زیاترە ئەبێت.

—ئەمانەڕاستن، بەڵام ئەمەش بەتەواوەتی ئاشکرایەکە ئێوە لەلێکدانەوەی ژیان، لەشێکردا، نەتەنها بۆ خستنە ڕووی مەسەلە ناوچەیییەکان سەرکەوتن بەدەست ئەهێنن، بەڵکو ئەتوانن مەسەلە جیهانیەکانیش بخەنە ڕوو. تاسەو خۆشی "لویی ئاراگۆن"م دێتەوە بیر کە چۆن جەمیلەی وەرگێڕایە سەرزمانی فەرەنسی و بە باشترین چیرۆکی ئەویندارانەی دنیای ناوزەدکرد. ئاسەوارەکانی دیکەشتان نەتەنها لەم وڵاتەدا، بەڵکو لەشوێنانی تری دنیاشدا شەوق و ئافەرینێکی زۆریان بەدەست هێناوە، کەواتە، ئەو پردەی کە شێکر ئەبەستێت بەشوێنانی دیکەی دنیاوە، زۆر پتەوە. ئایا کاتێ کەجەمیلەتان ئەنوسی، لەم مەسەلەیە بەئاگابوون؟

ئایتماتۆف: ئاگایی؟. من هەمیشە دڵنیابوم کە مەسەلەکانی شێکر، ئەبێ لەدڵی هونەرمەنددا ڕەخنەبکەن تا بایەخێکی جیهانی بەدەست بێنێت. لەهەر حاڵەتێکی تایبەت دا، مەسەلە گەلێك لەئارادان‌و ئەکرێت بەشێوەیەك بوترێن کە بەهای جیهانی‌یان دەربکەوێت.

—ئایا لای ئێوە، ئۆستورەکان، لەبەر ئەوەی کە بەهایەکی جیهانی ئەبەخشن بەچیرۆکەکانتان، بە پردێکی دیکە لەقەڵەم نادرێن؟

ئایتماتۆف: بۆچی ئۆستورەکان؟

—بۆ ئەوەی کە بونیادی ئەوان، فۆرمێکی جیهانی‌یان لەناوخۆدا حەشاردراوەو ئەتوانن ئەهادەکان و ئیستیعارەکانیان لێ وەربگرن.

ئایتماتۆف: نەخێر. ئۆستورەکان بایەخێکی جیهانی بەچیرۆکەکان نابەخشن، ئەمە دەرك کردنی یاسا گشتیە سروشتیەکانە کە ئەم کارە ئەکات، ئایا تێ ئەگەن مەبەستم چیە؟ بەشێکی زۆر لەخەڵکی حیکایەت و ئەفسانە گەلی کۆمەڵایەتی‌و هەروەها ئۆستورە گەلێکی زۆریان لەبەرەو هەموو وردەکاریەکانیشیان لەبیرە، بەڵام نوسەر هەروەها پێویستی هەیە بەوکولتورە هاوچەرخەی خۆی، تا ئاگایییەکانی خۆی ببەستێت بەهەموو ئەزمونەکانی کولتوری ڕابردووە، ئەگەر ئەمرۆ "جەمیلە"و "چاوی وشتر"م نوسیبایە، هەمو شتێکم بەشێوەیەکی ئاڵۆزتر بەیان ئەکرد.

—لە ئاسەوارێکدا، ئەکرێت بەشێوە گەلێکی زۆرەوە، کەڵك لەفۆلکلۆر وەربگیرێت، بۆ نموونە لە "ماڵ ئاوائەی گولساری"، "چارەنوسی وەك یەکی ناتابای"، "گولساری"، دەربڕینێکی شاعیرانەی دۆزیبۆوە. چیرۆکی ڕاچڵەکێنەری "کەڵی دایك لە پاپۆڕی سپی‌دا" بەشێوەیەکی غەریزی، شێوەی جۆرە خواست‌و بانگهێشتێکی ئاکاری لەخۆی گرتبوو بۆ ڕێزنان بەسوننەتەکان‌و بیرۆکەکانی پێشینیان. ئەگەر ئەم سوننەت‌و بیرۆکانە بخرێنە ژێرپێ، یا لەبەرانبەریانەوە کەمتەرخەمی بکرێت، ئینسان لەبەین ئەچێت.

—پێناسەتان بۆ شیعری حەماسی چیە؟

ئایتماتۆف: شیعری حەماسی هەمیشە لەزەینم دایە. من ئەوە بەدیاردەیەکی چەند لایەنەو ڕەنگاوڕەنگی عەقڵی خەڵکی ئەزانم، بەڵام هەر بەو شێوەی کە هەیە لە چیرۆکەکانم دا بەکاری ناهێنم، بەڵکو هەوڵ ئەدەم بەشێوەیەکی گۆڕدراو و هاوتاکراو، کەڵکی لێ وەربگرم.

ئەنگیزەکانی من جیاوازن، لە قۆناغی یەکەم دا، حەماسە بۆمن وەك ئامرازێك وایە. لە "ماڵ ئاوائەی گولساری"و "گۆرانیەکەی ڕاوچی"دا، ئامرازێکە کەتوخمە تراژیدیەکانی ژیانی پاڵەوانی چیرۆکەکان و حاڵەتی ڕۆحی و هەروەها تورەیی عاتیفی ئەو پاڵەوانە، ئەهێنێتەوە بیر. لە "پاپۆڕی سپی"دا، حەماسە، چەمکێکی سەرەکی بەدەست ئەهێنێت‌و ئەندێشە بنەڕەتیەکەی چیرۆکەکە دروست ئەکات.

بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت لە پێشەوە ئەوە دیاری بکرێت کە لە چیرۆکدا، چ کەڵکێك لەحەماسە وەرئەگیرێت، هەر حاڵەتێکی تایبەت پێویستی بەهەڵس‌و کەوت و ڕێگاچارەیەکی تازەی هەیە، وە ئاشکرایە کە ئەم هەڵس‌و کەوتانە گرێ دراوە بەتێ ڕوانینی کەسایەتیەکان و هەروەها ئەوەی کە ئایا حەماسەلای ئەوان

ریشەیەکی کولتوری هەیە یا، نا. ئایا ئەوانو دایك و باوك و هەروەها باوباپیرانیان شتێك دەربارەی "ماناس"ەوە ئەزانن؟

ئایا شیعری حەماسی، بەشێکە لەدنیای ئەوانو لەگەڵ پەروەردەکردنو بیرکردنەوەیاندا هەم ئاهەنگە یا، نا؟ ئەگەر من رۆمانێك لەبارەی "ئاکادمیسین کورچاتۆف"ەوە بنوسم بەدوری ئەزانم کە کەڵك لە فۆرمی حەماسی وەربگرم.

هەندێ جار لە چیرۆکەکانم دا، کەڵك لەو لایەنە نادیارانەی ئاوەزی خەڵکی بەگشتی وەرئەگرم کە هیچ تەبایییەکیان نیە لەگەڵ بیروڕای خۆمو پاڵەوانەکانی چیرۆکەکانم. ئەم کارە لەکاتێك دا ئەنجام ئەدەم کە ئەمەوێ مەسەلەیەکی گشتی بخەمەڕوو.

-بۆتێکەڵ کردنی فۆلکلۆر و ئەدەبیات، بەبیروڕای ئێوە، چ رەوشێك زیاترین رەنگدانەوەی هەیە؟ بەهرە وەرگرتن لە پەخشانێك کە تیایدا لەئاخافتنی عامیانە کەڵك وەرگیراوە، کەسایەتیە فۆلکلۆریەکان هەر بەو شێوەی کەهەن، بەشداریان تێدا کردوە، یا بەکارهێنانی توخمەکانو بونیادە ئۆستورەییەکان، بۆخستنە روی توخمە بنەڕەتیەکانی وجودی مرۆڤایەتی لەو بارودۆخو دەرگیریانەی دنیای ئەمڕۆدا؟

ئایتماتۆف: بەبیروڕای من، خاڵی دووهەم رەنگدانەوەی زیاتری هەیە. بەدڵنیایییەوە سەبکی ریوایی ئۆستورەیەك، بەراستی سەبکێکی ناماقوڵ و ناشیرینە. لەکاتێك دا، توخمە جیاوازە ئۆستورەییەکان، ئەو توانایییە بە ئینسان ئەدەن کە بۆ جاری دووهەم لە روداوەکان وردببێتەوەو پێوەندییەکی ئاڵۆزو تەنانەت هەندێ جار دژ بەیەکیان تێدا بدۆزێتەوە، کە هەر ئەم پێوەندیانە ئەگەڕێنەوە سەر توخمەسەرەتاییو بنەڕەتیەکانی ئینسان.

-لەجەمیلەدا چوونە دەرەوەی "دانیار" و "جەمیلە" لە گونددا، دەرکردنی ئادەمو حەوامان لەبەهەشت، ئەهێنێتەوە بیر کە ئیدی بۆیان بوویوو بەجێگایەکی خراپ و شەکەت هێنەر. بەکارهێنانی شتێکی لەو جۆرە، سەرنج راکێشە ئایا ئەوەتان لە ئاسەوارێکی ئەدەبی بەئیلهام وەرگرتوە، یامن ئەوشتانەیان تیا ئەبینم کە خودی ئێوەش لێیان بێ ئاگان؟

ئایتماتۆف: خاڵێکی سەرنج راکێشتان خستەڕوو. لەوانەیە ئاگایی لە ئۆستورەکانی مەسیحیەت، لە خوێندنەوەی جەمیلەدا، جۆرە تێگەیێشتنێکی ئاوا ئاسان بکات بەڵام ناتوانم بڵێم لەکاتی نوسینی جەمیلەدا، ئاوا بیرکردنەوەیەکم هەبووە.

-ئایا مەبەستان ئەوەیە کە ئەمە تەنها رێکەوتێکی ئاسایی بوو کە ئەفسانەی کتێبی پیرۆز و جەمیلە لەیەك ئەچن.

ئایتماتۆف: بەئەگەرێکی بەهێزەوە، بەڵێ. رۆژێك لێیان پرسیم کە بۆچی عینوانی داستانەکەم کە لە گۆڤارێکدا بەشێوەی "پاپۆڕی سپی (بەدوای چیرۆکەکەدا)" چاپ کرابو، بەڵام کاتێ کە بەشێوەی کتێب چاپ بوو، گۆڕانم بەسەردا هێنا و گۆڕیم بە "بەدوای چیرۆکەکەدا (پاپۆڕی سپی)". جێ گۆڕکێی ئەم عینوانو ژێر عینوانە، بەشێوەیەکی نادیار گۆڕانێکی لە قسەدا دروست کرد کە لە نمادەوە بۆ ئاکام بوو، هەروەها لە ئامانجەوە بۆ واقیعەت و لەچیرۆکیشەوە بۆنەو شتانەی کە بەدوای چیرۆکەکەدا، بەسەر قارەمانەکانمدا دێت.

لەراستیدا، رون کردنەوەی مەسەلەکە زۆر ئاسانە. کاتێ کە داستانەکەم ئەبرد بۆلای "ئەلکساندر تواردۆفسکی" کە لە گۆڤاری "نۆڤی میر"دا بوو، وتی: ناونیشانی "بەدوای چیرۆکەکەدا" زۆر قەراردادی و دوا کەوتوانەیە. لە جیاتی ئەوە، "پاپۆڕی سپی" پێشنیار کرد، بەڵام من ناونیشانەکەی پێشوم لەبەر ئەوە خۆش ئەوێ کە دروست ترە.

-بەڵام ئەمە بۆ ئەو رەخنەگرانەی کە بەدوای کەشف کردنی ئەو هۆکارانەدا ئەگەڕێن کە، ئەبنە هۆی گۆڕانی شتێك لەلایەن نوسەرەوە و

ئەیانەوێ بزانن کە نوسەر لەم ئاسەوارەدا لەژێر کاریگەری چ هۆکارانێك دا بوە، ئەتوانێ بەکەڵك بێت. بەڵام بابگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان لەبارەی شیعری حەماسی یەوە. سەرەڕای ئەوەش کە سوننەتە سەرزارەکیەکان ئاسەوارەکانتان و هەروەها ئەوشتانەی کە لە"ماناس"ەوە وەرتان گرتوە، قسەمان کرد، ئەمەوێ ئێستا قامك بخەمە سەر مەسەلەیەکی دیکە. لە ئاسەوارەکانی ئێوەدا، فۆلکلۆر هێندە تێکەڵ بەراستیەکانی ژیانی ئەمڕۆ بووە کە ناتوانین، پەی بەتوڕەبونی ئەو راستیانەی ببەین کە ئاوێنە نمادینەکەی ئەفسانە، پیشانیان ئەدات. بۆنمونە، لەبارەی "کەڵی دایك"ەوە ناتوانرێ بوترێت ئەوشتەی کە "مامون" بەکوڕەکە ئەیڵێت، ئایا دوپات کردنەوەی راستیەکانن یا، نا؟! بەڵام بە بیروڕای من چیرۆکی نمادین لەژیانی راستەقینەدا، زیاتر بەشێوەی تراژێدییەك دەر ئەکەوێت نەك تەمسیلێکی فێرکاری. پیرەمێردەکە لە چیرۆکەکەدا بە تەواوەتی ئەوکارەی ئەنجام ئەدات کە قەدەغەکراوە لێی. وە بە خراپ ترین بەڵگە واتە، لە بەر خاتری کچە چارە رەشەکەو نەوەکەیەتی کە بیرەوەری باب و باپیران و هەروەها بڕواکان و ویژدانی خۆی ئەخاتە ژێرپێ. بەم شێوەیە تراژێدی نەتەنها بایەخی نێو نەتەوەیی پەیدا ئەکات، بەڵکو وەك ئاسەوارەکانی "پوشکین" و "شکسپێر" تایبەتمەندییەکی ئینسانی لە خۆ ئەگرێت. ئێمەی لە خۆدەئاڵێنێ، عاتیفەکانمان ئەجوڵێنێت و بە هێزێکی یەکجار گەورە. ئەمانباتە دڵی ئەم مەسەلانەوە، تێکەڵاوێکی بەم شێوەیە، لە فەلسەفەو عاتیفە تەواو شکسپێریەکان، بەعینوانی نوێخوازو هەروەها، پەیڕەوی سوننەتەکانی ریالیستە گەورەکان، ناوزەدتان ئەکات.

لەناو کلاسیکەکان دا، لەروی سەبك، حاڵەتو هەروەها شێوەی رەخنەکردن لە دنیای کەسایەتیەکان، خۆتان بەکام یەك لەوانە نزیکتر ئەزانن؟ ئایا چ کەسێك ناوزەد ئەکەن بە عینوانی مامۆستای خۆتان؟

ئایتماتۆف: ئێوە باسێکی یەکجار زۆرتان کردو لەم باسانەدا، ئاماژەشتان کرد بە سوننەتەکان و داهێنانە شکسپێریەکان. بەڵام لەراستیدا بەر لە هەمووشت ئەمەوێ ئەوە لەبارەی "مامون"ەوە بڵێم کە، ناکۆکم لەگەڵ بیروڕاکانی ئێوەدا. "مامون" تەنها لەبەرخاتری کچەکەی ونەوەکەی نەبوو کە سوننەتەکان‌و بیرەوەری باب و باپیرانی خۆی خستە ژێرپێ، من لایەنی کۆمەڵایەتی مەسەلەکەیشم لەبەرچاو گرتبوو. مامون لەنێوان دوو هەڵبژاردنی تایبەت دا، گیری کردبوو.

–بەڵام منیش کاتێ کە لە بارەی تراژێدییەوە قسە ئەکەم، لایەنە کۆمەڵایەتیەکانیش فەرامۆش ناکەم. مەگەر نا؟ ئایا ئەمە خۆی بەشێك لە تراژێدی نیە؟

ئایتماتۆف: بەڵام من ئەمویست ئەوە پیشان بدەم کە تەواوی ئەنگیزەکان، لەوانەیە ئەنگیزە کۆمەڵایەتیەکانیش، چونەتە ناو یەکەوە. ئەمویست ئەوە بڵێم کە کۆمەڵگا، هێشتا ئەبێ هەوڵێکی زۆر بدات تا ئەو سەربەخۆو بەختەوەر و ئازادبکات. ئەمە وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکەتان بوو. بەڵام بۆ پرسیارە دووهەمینەکەتان، بۆ من سەختە کە یەکێك لە کلاسیکەکان هەڵبژێرم. ئێستا ئیدی "تولستۆی"، "چیخۆف"، "داستایوفسکی"، یەکەیەکی گەورەی ئەزمونیان بۆ دروست کردوم. هەر لەم روەوە من کلاسیکەکان بە هەتاوێك ئەزانم کە لە خۆیانەوە روناکایی پەخش ئەکەنەوە. "توماس مان"، شکسپێر، داستایوفسکی، بەشێکن لەم هەتاوە، بەڵام رێگەکانی گەیشتنی تیشکەکانی ئەم هەتاوە بەمن، زۆر گرنگ نیە.

–بەڵام کاتێ کە ئێوە خۆتان لەبارەی "سوننەتەکان" و"داهێنانەکان"ەوە قسەئەکەن چ بەرداشتێکتان هەیە؟

ئایتماتۆف: لەو بڕوایەدام کە پرسیارێکی بێ مانایە. ئەگەر ئاسەوارێك باش بنوسرێت، هەروەها جوانکاریەکانی خۆیشی لەگەڵایە. ئەدەبیاتیش وەك ژیان هەرچی بەرەو پێشتر ئەچێت، ئاڵۆزیەکی تایبەت بەخۆی بەدەست ئەهێنێت. نوسەرانی شورەوی ساڵەکانی 1930 لەبەر چاو بگرن. ئەوان بەرواڵەت هەر ئەو مەسەلە کۆمەڵایەتیو ئەدەبیانەیان هەبوو کە ئێمە ئەمڕۆ روبەڕوویانین. بەڵام ئەوان تەنها ئەتوانن لەباس کردن لەسەر مەسەلە هاوبەشەکانی سیستمێکی کۆمەڵایەتی، لەگەڵ ئێمەدا هاوبیروڕابن. لەبەر ئەوەی کە ژیان بەرەو پێش ئەچێت و رۆژ بەڕۆژ ئاڵۆزتر ئەبێت و بەدوای خۆیدا، هەندێ مەسەلەی تازە ئەهێنێتە ئاراوە، ئەوان نەیانئەتوانی دەرك بەو شتانەی بکەن کە ئێمە لەساڵەکانی بۆ نمونە، حەفتادا، رووبەڕوویانین. بۆ نمونە ئەو مەسەلانەی کە "تریفۆنۆف" رووبەڕوویانە، لەگەڵ ئەو مەسەلانەی کە "سرافیمۆویچ" رووبەڕوویانە، بە هیچ جۆرێك لەیەك ناچن. بەتەواوەتی تێ گەیشتنی ئەمە ئاسانە کە لەو سەردەمەدا، بارودۆخێکی جیاواز لەئارادا بوو. مەبەست لەمەسەلەی ئاسایشی مادی شتێکی دیکە بوو. شەڕێکی چینایەتی لەئارادا بوو ئەوەش بەڕێکەوت نەبو کە "سرافیمۆویچ" بەشان وباڵی دوژمنە چینایەتیە تایبەتەکاندا هەڵدێت و بەخەڵکیان ئەناسێنێت. یا یەکێك لەکەسایەتیەکانی "شۆلۆخۆف" بەناوی "لێستنیتسکی" لەبەر چاو بگرن: "گریگوری مێلێخۆف" تەنها ئەیداتە بەر تازیانە و هیچی دیکە. ئیدی هیچ ئاگاییەکمان نیە لەدەرون‌و دنیای دەرونی ئەو و پێویستیش ناکات بیزانین. وە یا دوژمنانی چینایەتی لە "زەوی تازە ئاواکراو" لەبەرچاوبگرن. هەمووشتێك لەبارەیانەوە دیاری کراوو ئاشکرایە. بەڵام ساڵانێکی دواتر "سێرگی زالیگین" سەرلەنوێ ئەمانباتەوە سەر ئەو بابەتانەی پێشو، بەڵام ئەم جارە ئەو شتانەمان پیشان ئەدات کە لەو سەردەمانەدا نە ئەبینران.

–ئایا مەبەستان ئەوەیە کەلەمێژوودا، رەوەندێك هەیە کە بە شێوەیەکی بەردەوام، بە رەچاوکردنی یاساکانی سەردەمی ئێمەو هەروەها ئایندەش، رابردووی دورونزیك تەفسیر ئەکات؟

ئایتماتۆف: بەڵێ و لەوانەشە هەر بەهۆی ئەم جۆرە تەفسیرانەوە، کارانێکی زۆر باشتر لەوەی کە ئێمە ئەمڕۆ ئەنوسین، بێتە ئاراوە. رابردوو وەك ئاوێکی شڵەژاوە کە بەتێپەڕینی زەمان تارماییەکانی لەبەین ئەچن و رسوباتەکانیشی وردەوردە ئەنیشن. شتێکی تێدا ئەتوێتەوەو، لە یەك وتەدا، هەمو شتێك جێگای راستەقینەی خۆی ئەدۆزێتەوە.

کاتێ کە ئەڵێم ژیان بەرەو کامڵ بوون ئەچێت، چەند مەسەلەی جیاواز لەبەرچاو ئەگرم. بۆ نمونە، مەسەلەی ئاشتی نەتەنها مەسەلەیەکی سیاسیە بەڵکو لاپەڕەیەکی تازەیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا و ئینسان مەجبورئەکات هەندێ لە مەسەلە مێژوویی، فەلسەفی، کۆمەڵایەتیەکان‌و هەروەها چەمکی ئینسان گرایی لەدەلاقەیەکی ترەوە تەفسیر بکات. ئەمڕۆیش وەك رابردوو، لەلایەکەوە نارەزایی خۆمان بەرانبەرچەمکی ئەبستراکت و ناکۆمەڵایەتی ئینسان گرایی، دەر ئەبرین و لەلایەکی تریشەوە، چەمکێکی بەربڵاوترمان لەچاو رابردوودا هەیە لەمەڕ ئینسانیەت. لەو بڕوایەدام زۆربەی هاوکارە بیانیەکانیشمان پەیان بردوە بەم مەسەلەیە. بەتایبەت ئەتوانین لەنوسەرانێکی گەورە وەك "کورت ڤۆنیگوت"و "گابریل گارسیا مارکێز" ناوبەرین. نەتەنها بە داهێنانەکانی ئێمە بەڵکو بە داهێنانەکانی ئەوانیش بووە کە ئێستا ئێمە بەدوای دۆزینەوەی خاڵە هاوبەشەکانی پێوەندیەکاندا، ئەگەڕێن. هەڵبەتە ئەمە بەم مانایە نیە کە جۆرە سازشێکی ئایدیۆلۆجیکی قبوڵ بکەین و ئیدی دەورانی هەم گرایی دەستی پێکردوە. نەخێر. بەڵام دەورانێکی تازەی مێژویی

دەستی پێکردوە، یەکەمین هەنگاو هەڵگیراوە. هەڵبەتە بەزاڵ بوون بەسەر ناکۆکیە نەتەوەییو کۆمەڵایەتیو حکومەتیەکاندا، هەوڵ ئەدەین قسەبکەین لەسەر مەسەلە جیهانیەکانی مرۆڤ وەك، شەڕو ئاشتی. ئێستا ئیدی بەتەواوەتی، تێ گەیشتن لەم مەسەلەیە ئاسانە کە مەترسی، تەنها هێرشی دەوڵەتێك بۆ سەردەوڵەتێکی دیکە نیە، بەڵکو لەوانەیە شارستانێتیمان لەبەین بچێت. دنیا ئێستا خەریکە لەسەر هەندێ بناغەی دیکەوە، دائەمەزرێت لە پێوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا، هەندێ ئەسڵی دیکە دەرئەکەون. ریشەی دەرکەوتنی روانگە تازەکان لەئاسەوارە هونەریەکانی هەندێ لەنوسەرانی ئەمڕۆ، هەر لێرەوە سەرچاوەیان گرتوە.

ساڵی رابردوو لە تورکیا بووم. ئەمەش بڵێم کە ئەدەبیاتی تورکیا، کاریگەرییەکی لە ڕادەبەدەری لەسەرم داناوە. ئەدەبیاتی تورکیا لەوانەیە بە پشتگیری ئەدەبیاتی ئێران و عەرەب، دەورە پڕ بایەخەکانی خۆی تێپەڕ ئەکات. لەبەشێکی زۆری ئاسەوارەکانی نوسەرانی ئەمڕۆی تورکیا، تێڕوانینی رۆشن بیران و لاوان، لەمەڕ سیستمێکی تازەی کۆمەڵایەتی رەنگیداوەتەوە. من خۆم لەوێ ئەوەم ئەبینی کە خەڵکانێکی زۆر، سوشیالیزمیان ستایش ئەکردو سوشیالیزمیان بەدوایین رێگای پێش کەوتنی کۆمەڵەکان ئەزانیو لەو بڕوایەدا بوون کەئیدی، سەرمایەداری پێی ناوەتە دەورانی هەڵوەشانەوە. ئەوان ئایندە لە سوشیالیزم دا ئەبینن. لەوانە ئەتوانین لە نوسەرانی وەك "یاشار کەماڵ"، عەزیز نەسین"و "بکیربیلدیز" ناوبەرین. لە شاعیرە گەورەکانی هاوچەرخ ئەتوانم "پابلونرودا"و "نازم حکمەت" ناوبەرم. ئەوان ئەستێرە گەلێکی پرشنگداری ئەدەبیاتی ئەمڕۆن و سەرگوزشتە تراژێدیەکانیان ئەتوانێت بەشێوە گەلێکی جۆراوجۆر کەڵکی لێ وەربگیرێت. زەمان تێپەڕیوەو ئاسەوارەکانی نازم حکمەت بەشێوەیەکی بەربڵاو لە تورکیا چاپ ئەکرێن. ئەو

ئێستا ئاڵا هەڵگری کولتوری نەتەوەیی هاوچەرخە، هیچ رۆژنامەو چاپەمەنییەك نابینرێت کە چاپ کردنی وتارێك لەبارەی ئەوەوە بەشانازییەك بۆ خۆی لەقەڵەم نەدات. شیعری ئەو، هی هەمومانەو کولتوری تورکی بەبێ ناوبردنی ئەو هیچ مانایەکی نیە. تەنانەت چاپەمەنیە کۆنەپەرەستەکانیش دەرکیان بەم مەسەلەیە کردوە.

–ئایا زۆر سەردانی تورکیا ئەکەن؟

ئایتماتۆف: من وتووێژی زۆرم ئەنجام داوە لەگەڵ نوێنەرە فەرهەنگیەکانی تورکیا، بەڵام تەنها یەکجار چومەتە تورکیا. لە حاڵی حازردا، شانۆگەری "فوجییاما" لەوێ پرۆڤە ئەکرێتو "کلنگهای زود پرواز (The Early Cranes)" خەریکە بڵاو ئەبێتەوە. سەرجەم لەوێ هەشت دانە لە ئاسەوارەکانم چاپ کراون.

–ئەگەر بگەڕێینەوە سەر وێنەی ئەو هەتاوەی کە سومبولێك بوو لە فەرهەنگی تێکەڵاوی چەند میللەتێك و ئێوە کاریگەریتان لێ وەرگرت، ئەتوانین ئاسەوارەکانی ئێوە بەبەرهەمی کولتوری نێو نەتەوەیی بزانین، بەتایبەت کە ئێوە بەدوو زمانیش قسە ئەکەن.

ئایتماتۆف: بەڵێ و بێ گومان من نمونەیەك لە تێکەڵاوی دوو کولتورم. هەرچی زەمان تێ ئەپەڕێت، بڕوام بەوە زیاتر ئەبێت کە من لە ژێر کاریگەری ئەدەبیات و زمانی روسی، خەریکە ئاوێتە بم لەگەڵ کولتورە میراتەکەیخۆمدا.

ئەمە راستییەکیئاشکرایە کە دیاردە سەرنج راکێشەکان، لەسنورەکانی بەیەك گەیشتنەوەدا، دێنە ئارامی. قسەکردن بەدوو زمان، فۆرمێکی تازەیە لە کولتوری نەتەوەیی، بەڵام ناگایی لەزمانێکی نەتەوەیی، ئیدی ئومێدێك ناهێڵێتەوە بۆ مانەوەو سەربەخۆبوونی ئەو کولتورە.

قسەکردن بەدوو زمان ئەبێ یارمەتی بدات بۆ پێش کەوتنی کولتورە نەتەوەییەکان، نەك لەناویان ببات. چونکە زمانی هەر کۆمەڵێك، گەنجینەیەکی بەنرخە کەلەلایەن بلیمەتەکانی ئەو

کۆمەڵەوە، هاتۆتە ئاراوە. زمانەکان ئەتوانن لەناوبچن- هەر بەو شێوەیەی کە زۆرێکیان لەناو چوون- بەڵام پێک هاتنی زمانێکی تازە شتێکی‌زۆر دوورە. سەردەمی پێك هاتنی زمان بۆ هەمیشە تێ پەڕیوە. ئەبێ ئەوەی کە هەمانە بپارێزین، چونکە گەنجینەیەکی جیهانی‌یە.

-ئایا ئەتوانن پێمان بڵێن بیروڕاتان بەگشتی سەبارەت بە جیهان چیە؟ چ گەش بینی‌و رەش بینی گەلێکتان هەیە؟ ئایاکاتێ کە خەریکی نوسینن لەم مەسەلانە ئاگاییتان هەیە، یاداوەریەکانی نوسەرێتیتان. لەخۆتانەوە سەرچاوەیان گرتوە؟

ئایتماتۆف: بەدوری ئەزانم کە بتوانرێ تەنها بەیارمەتی عەقڵ، کەسایەتیەکان بدۆزرێنەوە. سەبارەت بە چۆنیەتی دروست بوونی‌کەسایەتی، ئەبێ بڵێم کە هەنوکە، وەسف کردنی پاڵەوانەکان، لەزمانی سێهەم کەسەوە زیاتر رازیم ئەکات. ئەم کارە ئەبێتە هۆی ئەوە کەخۆم هەڵیان سەنگێنم. لەم رێگایەوە ئەتوانم یەکپارچەبوونی راستیەکان پیشان بدەم. لەو چیرۆکانەی کە لەزمانی یەکەم کەسەوە بەیان ئەکرێن، دەستو قاچی نوسەر یەکجار بەسراوەتەوە. نوسەر ئەبێ لەدروست کردنی کەسایەتی‌دا، ئەکتەر و هەروەها مامۆستا بێت، ئەو ئەبێ بەهرە مەندبێت لەتوانای تێروانینێکی کارامەو بە ئەزمون. ئەمە دروستە کە ئەو، فریشتە یا بونەوەرێکی پیرۆز نیەو چەند سستی‌یەکی ئینسانی ئەتوانن رەخنە بکەن لە کەسایەتی‌و کردەوەکانی ئەودا، بەڵام ئەبێ هەمیشە بەرەو بەرزایی بچێت. ئەم مەسەلە زۆر گرنگە. هەڵبەتە گومان لەوە دانیە کەئەگەر ژیانی راستەقینەی نوسەر، هەم ئاهەنگ بێت لەگەڵ ئامانجەکانی‌دا، داواکاری زۆر ئەبێت، بەڵام ناتوانێت بۆ هەمیشە پابەندبێت بەیاساوە. ئەم مەسەلەیە هەرگیز بەسادەگی دووکەرەت دوو $(2\times2=4)$ نیە کە ئەکاتە چوار، بەڵکو هێندە ئاڵۆزە کە ئەبێ بەماتماتیکێکی قورستر، چارەسەر بکرێت. لە ئاسەوارەکانی ئێوەدا پاڵەوانی"ئەرێتی"و "نەرێتی" چ رۆڵێکی هەیە لەبەیان کردنی بیرکردنەوەکان وبڕواکانتدا؟ هەندێ‌لە رەخنە گران لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئەمڕۆ ئیدی بەشێوەیەکی ئاشکرا، رووبەڕووبوونی کەسایەتی "ئەرێتی"و "نەرێتی" ناخرێتەڕوو، بەڵکو نووسەر بەدوای ئەسڵی چاکەو خراپەدا ئەگەرێت لەئینساندا. وا دێتە بەرچاو، کە "مامون" و "کورو‌ی" کەی تۆ پشتگیری ئەم بیروڕایە ئەکەن.

ئایتماتۆف: ئەمەوێ هەندێ قسەبکەم لەبارەی کامڵ بونی پاڵەوان لە چیرۆکدا. بەڕەچاوکردنی ئەوەی کە کۆمەڵگاکەمان پێش کەوتووەو لایەنە کۆمەڵایەتی‌و مێژوییەکان، ئاڵۆزتر بونەتەوە، بەڵام ئەو توخمانەی کە لەتایبەتمەندیەکانی ساڵە سەرەتاییەکانی شەڕ بوون‌و هەروەها راپەڕینی رۆمانتیکی ئەو سەردەمەیان پیشان ئەداو، لە خوێنەریشدا ئاوا هەستێکیان ئەهێنایە ئاراوە، سەرەڕای ئەوەش کە هێشتا لەبەین نەچوون، ئیدی بایەخی پێشوی خۆیان لە دەستداوە. ئێە لەرۆمانتیزمێکی خاوەن پاڵەوانانێکی بەهێز، تورەو ئایدیالەوە، بەرەو ریالیزمێکی قوڵ و هەست پێ‌کراو، لە جوڵانەوەدا بووین.

ئەدەبیات ئەبێ بە لێبوردنێکی‌تەواوەوە، خاچەکەی خۆی بخاتە سەرشان و بەشێوەیەك رەخنە بکات لە ئاڵۆزیەکانی ژیان، کە ئینسان نەتەنها بتوانێت باشترین وبالاترین بایەخەکانی خۆی و هەروەها کۆمەڵگا بناسێت، بەڵکو هەست بە بەرپرسایەتی بکات لە بەرانبەریان وشەڕبکات لە پێناویان دا.

**سەرچاوە:**

دەگفتگو- احمد پوری- چاپ اول 69 تهران



# لە ئەدەبی گەلانەوە

- سێ شەممەی تەڕ (چیرۆک)
- پەیڤین لەگەڵ دیوارەکانی زیندانی شتامهایم (سێ کورتە چیرۆک)



- وێرانە خاک (شیعر)

# سێ شەممەی تەڕ

■ چیرۆکی: بیژەنی نەجدی

● و. لەفارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

سێ شەممە تەڕ بوو، مەلیحە بەچەترێکی شینو چارشێوێکەوە کە لە تێکڕای ئەندامە لاوازەکانی ئاڵا بوو، بەو کۆڵانەدا تێپەڕی کە وەکو خەو و مۆتەکەکانی پێچو پلوچ بوو. باران لەگەڵ خوڕەی پلوسکو چەترو ئەسفالتدا ئەباری. لەپشتی پەنجەرەکانی ئەمبەرو ئەوبەری کۆڵانەکەوە پەردەیەك لەگەرمایی کورەکان هەڵواسرابوو هەواکەش بۆنی نەوتو کۆتەرەی سوتاوی لێئەهات.

مەلیحە چارشێوەکەی تاسەر چاوە بێ کلو بێ ئارایشتەکەی هێنابووە خوارێ. بەهەسکە هەسکی هەناسەو تەقەی پاژنەی پێڵاوەکانیدا هەر ئەتوت هەڵدێ. پاییز خۆی ئەکێشا بەشینی چەترەکەداو چارشێوەکەی لە ئەندامەکانی لەشی مەلیحە دوور ئەخستەوەو چەترەکەی لەدەست ڕائەکێشا. کراسە ئوتو نەکراوەکەی مەلیحە کە بۆنی نەفتالینی لێئەهات لەچارشێوەکەیەوە هاتبووە دەرێ، پڕ بوو لەگەڵا نارنجو لەوێوە بۆنی بارانو نەفتالین ئەگەیشتە سەر پێستە بیستو چوار ساڵانەکەی. پێستێك کە هەرگیز لەپی دەستی پیاوێکی بەرنەکەوتووە. ئەگەر یەکێك هەڵمی سەر پەنجەرەکانی بسڕیایە ئەیتوانی ئافرەتێك بەدیبکات کە سوچێکی چارشێوەکەی بەدان گرتووەو بەدەست چەترێکی هەڵگەڕاوەشەوە گیری خواردووە. بۆیە مەلیحە دەسکی چەترەکەی بەرداو بەهەردوو دەست پەلاماری چارشێوە هەڵبڕاوەکەی داو چووەوە نێوی.

با چەترەکەی بەرەو دیوارەکە هەڵداو بەقیرەتاوەکەیدا دا، ئەوەندەش لەگەڵ خۆیدا بردی تا کێشای بەدار تەلێکداو چەند دانە لە فەنەرەکانی شکان، لایەکیش لەپارچە شینە تەڕەکەی شیڕەی هات. لە دارتەلەکەشەوە بەرەو درەختێکی ئەوسەری کۆڵانەکە چوو.

شیرەی دادڕانــی پارچــەو خرمــەی شـکانی ئێسقانەکانی چەترەکە پەنجـەرە بـە پەنجـەرە دوورکەوتـەوە، لـەدەروازەی ئاوەڵـەیماڵێکــەوە سـەگێکی کوڵـە هاتــەدەرێ. وەڕە وەڕ شـــوێن چەترەکە کەوت. باران وەکو خوێن لە برینـەکانی چەترەکە ئەچۆڕایـەوە. چەترەکـە بـەر درەختێك کەوتو هەر لەوێشداو لەژێر دەستو پێـی پـاییزدا بێ گیـانو بێحـاڵ، بێنـەوەی لەچـەترێکی شـینو کراوە بچــێ لێیکـەوت. سـەگەکە بـە دەوریــدا سوڕایەوە، دووبـارە چـەند جارێك وەڕیو ئینجـا بێدەنـگ بـوو، گەڕایـەوە، هەرسێ چوار هــەنگاو جـارێکیش لای ئـەکردەوەو سـەیری چەترەکـەی ئـەکرد کــەچی نـەتای پەنجەرەیـەك کرایـــەوە، نەکەس هەڵمی سەر پەنجەرەیەکی سڕی.

چەترەکـە گوێـی لەنوشـتانەوەی فەنـەرەکانی خۆی نەبوو خەریك بوو ئـەمردو ئیـتر نـەیدەتوانی بـارانێك بـیر بێنێتـەوە. تــەنیا یادگـارێکی دوورو کەمێ گەرمی بەرەدەستی مەلیحـە نـەبێ، هێشتا بە چەترەکەوە مابوەوە کـە ئـەویش خـەریك بـوو ئارامو هێدی هێدی، ئـارام ئـارامو هێدی لـە بـیر ئەچووەوە. یادگارێك کە هەر ئەو بەیانییە لەپشـت دەروازە زەبەلاحەکانی ئیڤینەوە هـاتبووە دەرێ. ئەو ڕۆژە دەستی ئافرەتێکی ژێر چاو هەڵئاوسـاو و دەموچـاو هەڵئـەگرتووی شـڵ، کـە ڕەنگـە ئـەو شـڵییە هـەر بەسـەر توێکڵـی سـێوەوە ببیـنرێ، بێبەزەییانە ئافرەتەکەیان پیرتر ئەنواند، دەسکی چەترەکەی توند گرتبوو و شـینایییەکی کەڵەگـەت لــەنێوان پەنجەکانییــەوە دائــەچۆڕا. کۆمـــەڵێك لەچـەند پــەیامنێرێك ئــاڵابوون: یــانی بەراسـتی ئەمڕۆ هەموویان بەر ئەدەن؟

—بەڵێ ناچارن.

خانم شانێکی نـابوو بـە پـەرژینە تـەزیوەکـەی نێوان زینـدانو خەڵکەکـەوە، چـەند شیشـێکیش ئـەولاتر مەلیحـە چـاوی بڕیبـووە ئـەو دەرگـا ئاسـنینەی کـە ڕۆژ لەبەشـی لای ژوورویـەوە سپیایی‌دا بوو.

قەرەوڵێك* هەواڵنێرەکانی لە پلیکانەکانی لای پەرژینەکــەوە ئەهێنایــە خــوارەوە. دەنگـــی هەناسەی شاری تاران ئەگەیشتە گوێ.

دەستەیەك دەستیان بەچاویاندا ئەهێنا وەکـو ئـەوەی لەهەوایـــەکی پـــڕ لەکــەفی ســابوندا لەتەپۆڵکەکانی دەوروبەرو تەلبەندەکان رامابێتن.

مەلیحـە هەرکـە وێنـەگرەکانی دیـت دەسـتی بەدەموچاوییەوە گرت، فلاشەکان بروسکە لەسەر بروسـکە هەڵئـەبوونو ئەکوژانـەوە. ڕۆژی دوایــی وێنـەی خـانم لەلاپـەڕەی یەکــەمی ڕۆژنامەیــەکدا تــۆزێ لـــەولای مەلیحـــەوە دەرکـــەوتبوو. لەرۆژنامەیـــەکی تـــردا وێنەیـــەکی گـــەورەی دەروازەکـانی زینـدانی ئیڤـین چـاپ کرابـوو کـە لەگـەڵ تێپــەڕبوونی سـاڵانی 1324 تـا 1375 ئەکرایەوە.

خەڵك شالاویان برد، مەلیحە لەروخساری یەکە یەکەیان وردبوەوە. لەسەرماکەی دەوروبەریدا کە لەم کاتەدا بەریەیان بەجێهێشتبوو، و لـەناو ئـەو هــەموو چاوانـەی راهـاتبوون بـەدیوارو سـەرپایی‌و شیشـی قەرەوێڵـەو ژمـاردنی لـەبن نــەهاتووی موزاییلو ڕۆژەکـانی سـاڵ نـەیتوانی سـیاوەش بدۆزێتـەوە، (حـەوت سـاڵ لەمەوبـەر سیاوەشـی رەیحـانی، بـاوکی مەلیحــە، لەپشـت عــەمارێکی زیندانەکە کـە پـەتاتــەی تیـابوو بەکۆڵەکەیـەکی دارینــەوە بەســترابوەوەو گوللـــەباران کرابـــوو، هەڵبەتە دوای ئـەوە سۆندەی ئاویـان خستبووە سەر کۆڵەکەکەو شتبوویان، بارانیش نەیهێشـتبوو

---

* قـــەرەوڵ: لەبەرامبــەر/ وشـــەی "گروهبـــان" بەکارهاتووە کە بەمانای "عەریف" دێت.

خوێنی سەر ئالفی تەنیشت کۆڵەکەکە بمەێی).
خۆ مەلیحەش نەئیەتوانی لەمبەر پەرژینەکانەوە نە عەماری پەتاتەکە ونە ئالفەکە ببینێ، هەروەکو چۆن هێشتا چەترەکەی نەدیبوو.

—خانم چەترەکەی وەکو پێیو وەکو گۆچان بردە پێشەوە. لە پلیکانە چیمەنتۆیەکان چووە سەرێو بەر لەوەی بداتە هاوەی گریان قیژاندی. ئەمیر حوسێن، ئەمیر حوسێن، من لێرەم.

لاوێك کە تازە سمێڵی بۆرکردبوو، بەناو ژنەکاندا ئەڕۆشتو رێگای ئەکردەوە خانم گەیشتە هەمان ئەو پلیکانەی مەلیحەی لەسەر وەستابوو، گەنجەکە وەك ئەوەی ئاو لابدا دڕی بەشانی خەڵکەکە ئەداو بەدەستی ئاوەڵاوە بەرەو پێشەوە ئەچوو.

—ئەمیر حوسێن.

خانم پلیکانێك هاتە خوارەوە، لایەگی چارشێوەکەی کە بەسەر چیمەنتۆکەدا ئەخشا لەقاچەکانییەوە ئالاو هەڵئەنگوت، مەلیحە خۆی بۆ هەڵداو بن باڵی گرت.

ئەمیر حوسێن هاواری کرد: دایە، وریابە.

خانم کەوتە سەر دەستی مەلیحە، بەر لەوەش ئەمیر حوسێن لەباوەش بگرێ چەترەکەیدا بە مەلیحەو وتی: ئادەی دایکەکەم، یەك دەقە ئەمەم بۆ بگرە، ئینجا سەروچاوی هەڵسو لەگەردنو یەخەی کراوەی کراسەکەی ئەمیر حوسێن کە هێشتا بۆنی پەتۆکانی ئێڤینی لێئەهات. باوەشیان بەیەکدا کردو لەسەر رۆژێك لەرۆژەکانی کۆتایی پاییزی 1357 دا خلۆر بوونەوەو دورکەوتنەوە، بێئەوەی کەسیان گوێیان لەمەلیحە بێ کە ئەیوت: خانم چەترەکەت.. خانم.. چەتر..

قەرەوڵێك بڵند گۆیەکی بەدەستەوە بوو، ئەیووت "تکایە سوارین.. دەی فەرموون. بەرەو ئوتوبوسەکە.. خێراکە، ئاغا گیان خێر."

مەلیحە لەخەڵکەکەی ئەپرسی: ئەی ئەوانی تر کوان؟

چەترەکەی گرتبوو بە بەرسنگییەوەو رووی ئەکردە هەموو ژنو پیاوێکی نزیکی خۆیو ئەیووت: ئەی ئەوانی تر، ئەوانی تریان لەکوێن؟

ئەوەندەی وت تا لەدواییدا ناچار بوو شانی هەمان قەرەوڵ بگرێو رایتەکێنێو بپرسێ: ئیتر نەما؟ هەر ئەوەندەیە..؟

قەرەوڵەکە رووی بەرەو زیندانەکە وەرگێڕا

لەویەریشەوە دەروازەکەی ئێڤین کەوەکو برینێکی کۆن، برینێکی وشك، برینێك کە خوێنەکەی گیرسابێتەوە، کرابوەوە.. سیاوەش لەسەر هەمان ئەو پێیانەی کەشکوو توانایان تێدا پیر ببوون، وەستابوو، هەر هەمان ئەو مل پێچە سپیو درێژەشی لەمل ئالاندبوو کە سالانێك لەمەوبەر شەوی گرتنەکەی لەپەنای کراسەکەی مەلیحەوە بەعەلاگە دارینەکەوە بوو، و هەڵیگرتبوو. بەدرێژایی ئەو سالانە هەرچی مەلیحە سەری بپەرژایە کراسەکەی ئەهێناو نەفتالینی لێئەداو دیسان هەڵیئەواسییەوە. هەر بەهەمان عەلاگەو لەپەنای هەمان شاڵە درێژەکەوە کە ئێستاکە سیاوەش خەریکە لەناو سپێتێکەیدا لەم نزیك ئەبێتەوە. بە ئەسپایی وتی: بابە سڵاو.

ئەیزانی تا ئەگا بەوەی دەست بەسەرو چاوی باوکیدا بهێنێ ئەبێ ماوەیەکی دوورودرێژی نێوان راستیو خەون ببڕێ.

ئوتوبوسەکە رۆشتبوو.. دوو سێ کەس یارمەتی مەلیحەیاندا تاوەکو لەپشتی باوکییەوە سواری مینیبوسێك ببێ کە شۆفێرەکەی

لەئاوێنەکەدا چاوی بڕیبووە چاوەکانی مەلیحەو نەیئەتوانی تێبگات ئاخۆ موسافیرەکەی ئەیەوێ بگری یان پێشتر گریاوە.

هەرکە ئوتومبیلەکە کەوتە کار تەپۆڵکەکانی ئیڤینیش کەوتنە جموجۆڵ. قولیپی چاودێرێکە بەخۆیو پرۆجەکتەرە کوژاوەکەیەوە دوور ئەکەوتەوە، درەختەکانیش پێ بەپێی مینیبوسەکە کەوتنەڕێ. ریزێ تەلبەند بەسەر بازنەیەکدا خولایەوەو نوکە تیژەکانی بەو دڵۆپە بارانانەدا کە نەئەبارینو مەلیحە پێی وابوو ئەبارێ، رۆچون. شوفێرەکە مینیبوسەکەی خستە باری سەرەو خواری، شوشەی تەنیشت روخساری مەلیحە بێ تەپەو بێ قولیپو بێ تەلبەند مایەوە.

—تەواو بوو، بابە.

—چی تەواو بوو.

—ئێستا ئەگەینە لای ئەو دیوارانەی کە خەڵك زۆر شتیان لەسەر نوسیون.

—دیوار.. دیوار، دیوار.

باوکە سەری داخستبوو، سەیری نینۆکەکانی ئەکرد.

مەلیحە تالای پردی تەجریش ورتەی لێوە نەهات.

—جگەرە ئەکێشی؟

مینیبوسەکە لەسەر پردەکە بەتەنیشت تانکێکدا تێپەڕی کە سەربازێك لەسەر لووتەکەی دانیشتبوو، جگەرەی ئەکێشا، شوفێرەکە مشتێ دوکەڵی دی کە بێ بۆنی توتنو لەگەڵ کۆکەکۆکی موسافیرەکەیدا نیشتە سەر ئاوێنەی مینیبوسەکە. لەپەنای ئاوێنەکەدا بینایەکی بەرز ئەسووتا. قرمەی دەستڕێژ ئەهات. مەلیحە داوای لەباوکی کرد چاویلکە لەچاو بکاتو سەیری ئەو وردە شوشە نیۆنانە بکات کە پێی نوسرابوو "بانکی صادرات" و ئەڕژانە سەر شۆستەکە.

—تکایە رایگرە.

دابەزینو شۆفێرەکە نەیتوانی بۆ ئەو شتەی لەئوتومبیلەکە دائەبەزی وشەیەك لەوشەی تەنیایی باشتری بۆ بدۆزێتەوە، هەروەك چۆن رێبوارانی سەر شۆستەکە نەیانتوانی تێبگەن کە پیاوێك بێنەوەی هەبێ، قۆڵی لەقۆڵی ژنێکدایەو بەلایاندا تێئەپەڕن.

—ماندوو بووی بابە؟

—زۆری ماوە؟

—خەریکین ئەگەین.

—گەڕەکەکەی خۆمان چاکتر نەبوو؟

لەدوای دایکم.. (تۆش خۆ نەبوویت) ئیتر خۆم لەو ژوورانەدا پێ نەئەگیرا، نەمئەزانی چی لەو شرو شاتاڵانەی دایکم بکەم. تادوای چلەکەش دەنگی کۆکینەکەی لەماڵ نەرەوییبوەوە، هەر لەبەر ئەوە بوو هاتمە ئێرە، ئێستا ئەگەینێ، لە پێشدا باپیرە نەیئەهێشت، پاشان وتی:

"خۆت چۆنت پێخۆشە وابکە".

دایکم دوکتۆرەکان وتبوویان لووە..

—لوو نا، وەرهەم.

—لوو هەر هەمان وەرهەمە، ئیتر بابە.

—نا.

مەلیحە لای دەرگایەك وەستا. تا کلیلەکەی دۆزییەوە، چەندی ئەم گیرفانو ئەو گیرفان کرد، ئەیزانی هەرکە دەرگاکە بکاتەوە ئەبێ دووبارە بەلای ئەو جلانەیدا تێپەڕێ کە کەوتونەتە سەر زەویو بەسەر ئەو رۆژنامانەی پرشو بڵاو بوونەتەوەو بەلای وێنەی خۆی لەئاوێنەکەداو بەلای ئەو تەپڵەکانەی پڕن لە قونچەکە جگەرەو لەژێر چوارچێوەیەکی چکۆلەدا دانیشێ کە بەدیوارەکەوە هەڵواسراوەو لێی نوسراوە:

"لەمندا ئاوا بە ئەی پیرەخۆر". کلیلەکەی چەرخاندو چووە حەوشە.

چەترەکەی هەڵداو لەمدیوی پارچە شینەکەوە روانییە ئاسمان. ئاسمان ئەوەندە نزم بوو کە مەلیحە ئەیتوانی مشتێکی لێهەڵگرێو بۆنی پێوە بکات. بەچەترەکەوە چووە ژوورەکەوە. پەردەکەو ئاوێنەکە بەقەد یەك شین ببوون. بێئەوەی چەترەکە ببەستێ خستییە سەرمێزەکە.

لەوسەری مێزەکەوە سوراحییەك بێئەوەی دڵۆپێك ئاوی تێدابێت پڕبوو لەئاو.

مەلیحە مل پێچەکەی لە باوکی وەرگرتو لەپەنای کراسەکەی خۆیەوە هەڵیواسی، کە قۆڵێکی لەعەلاگە دارینەکەوە شۆڕ ببوەوەو بەشانی سیاوەشەوە لکابوو، ئێستا ئیتر بۆنی عەمارە پەتاتەکانی ئیڤینو نەفتالینی کراسێکی ژنانە تێکەڵ ببوون. مەلیحە وتی: ئێوە قەیرێك راکشێن، منیش سەماوەرەکە هەڵئەکەم، پاشان دائەنیشن، قسە ئەکەین.

لەدەرەوەی پەنجەرەکە، ئاخری ئەو بارانە باری کە پاییز لەبەیانییەوە تا ئەو ساتە بۆ بارینی ئەمدەستو ئەو دەستی کردبوو. مەلیحە رادیۆکەی هەڵکرد. رۆژنامەکانی چەند رۆژ لەمەوبەری نایەسەر مێزەکە. کراسەکەی گۆڕیو وتی: خۆتان سەرقاڵ کەن تا من بچم بەشوێن باپیرەدا.

لە سێ شەممەیەکی تەڕداو لەژێر چەترێکی شینو بەچارشێوێکەوە کە بەسەر ئەندامە لاوازەکەیدا رژا بوو، لەماڵ چووە دەرەوە، باران بەدەنگی پارچە مشماکەوە ئەبارییە سەر چەترەکە. پاییز خۆی لەشینی ئەدا. با چارشێوەکەی لەئەندامەکانی مەلیحە دوور ئەخستەوەو چەترەکەی لەدەستی ئەفڕاند، ئەویش نەئەیتوانی چەترەکەو چارشێوەکە راگرێو نەئەشیویست لەباپیرە زیاتر کەس بەو کراسەوە ببینێ کە پڕە لەگوڵە نارنج. دەسکی چەترەکەی بەردا. لەوسەری کۆلانەکەدا سواری تەکسییەك بوو، هەتاکو گەیشتە ماڵی باپیرەش گوێی بۆ ئاژیری ئوتومبیلەکان شل کرد کە لەسەرتاسەری تاراندا ئەبیسترا، بێئەوەی دەنگی شکاندنی چەترێ ببیسترێ. هەرکە باپیرەش دەرگاکەی کردەوە مەلیحە، وای هەست کرد دەنگی ئاژیرەکان تەواو بوونو شتێکیش لەم دنیایەدا هەیە ناوی بزەیە.

—سڵاو

باپیرە بە بزەیەکەوە وتی: سڵاوو سندان. لەبەیانییەوە تا ئێستا چاوەڕێت ئەکەم.

مەلیحە بەرەو لای ئاوێنەکە رۆشتو قژەکەی بەخاولی وشك کردەوە، شانەی کردو وەکو حەوت ساڵ لەمەوبەری خۆی بەسنگی پیاوە پیرەکەوە نوساند.

—باپیرە، هەموویان بەردان، هەموویان..

—ئەزانم، سەعاتێ لەمەوبەر BBC وتی.

—بەڵام من خۆیانم دی، دیمن..

—لەکوێ

—لەبەر دەروازەکەی ئیڤین.

—لەوێ چیت ئەکرد؟

—چیم ئەکرد؟ چووم بەشوێن..

—دانیشە مەلیحە، دەقەیەك دانیشە.

—ژاوە ژاوێك بوو، پەیامنێر، وێنەگر.

وتم دانیشە مەلیحە

مەلیحە لەسەر زەوی دانیشت، قژەکانی لەسەر چاوی لابرد، دەستێکی بەکراسەکەیدا هێنا.

—چ هەڵەیەکی گەورە بوو. ئەم هەموو ساڵە رەشم پۆشی.

باپیره رووی وەرگێڕا.

-خۆت مەخەڵەتێنە، مەلیحە گیان.

لەژوورەکەدا پیاسەی کرد.

-دەستێ بدە لەم کورسییە. تۆ دەستی پێدا بهێنە، یاڵلادەی، کەسی لەسەر دانیشتووە..؟ نە.. سەیری سەر قەرەوێڵەکە کە، کەس لەسەری خەوتووە؟ کەس نییە مەلیحە گیان.. کەس، هەموویان مردن.. دایکت.. سیاوەش..

مەلیحە وتی: جیاوازییان هەیە، دایکمان بەدەستی خۆمان ناشت، وانییە؟ چاومان لێبوو کەشتیانەوە، وانییە؟ بەڵام ئەوسا کەس سیاوەشی نیشان دان؟ بەزیندوویی؟ بەمردوویی..؟ لەم چەند ساڵەدا کەس گۆڕێ. شتێ. کێلێ، هیچ شتێکی نیشان نەداین.

باپیرە وتی: بڕۆ لەوسەر سەلاجەیە حەبی ڤالیۆمەکەمم بۆ بهێنە..

لەدوای ڤالیۆمەکە، باپیرە، لەدوای پەرداخە ئاوەکە، باپیرە، لەپاش ئەو سەرمایەی لەگەروویەوە چووە خوارێ، باپیرە وتی: راستییەکەی ئەوەیە کە ئەو مردووە.

مەلیحەوتی: راستییەکەی ئەوەیە کە من ئەمرۆ لەوێ بووم.

-دەی جا چی؟

-نازانم، بەڵام بەم چاوانەی خۆم خەڵکم دی مناڵەکانیان، مێردەکانیان لەباوەش کردو رۆشتن لەدواییدا منیش دەستەکانم ئاوەڵە کرد، لەسۆراخی کەسێك یان شتێکدا، کەچی سەیرم کرد چەترێکم لەدەستدایە، لەباوەشم کرد. خەونێکی شین بوو، یەگجار شین. لەگەڵ خۆمدا بردمەوە بۆ ماڵەوە، بۆیەکیش دووایین.

-کەواتە تۆ ئێستا چەترێکت هەیە کە هەم راستیو هەم خەونی تۆیە.

-نەخێر، سەعاتێ لەمەوبەر کە لەماڵ هاتمە دەرەوە، شەستەو رەهێڵەیەکی سەیر بوو، چەترەکە هەڵگەڕایەوە. منیش فڕێمدا.

-بۆچی؟

-چونکە ئەو لەراستیدا هەر چەتر بوو. تێئەگەی باپیرە؟ دووبارە ببوەوە بەچەتر.

هەموو کردەو کۆشەی مەلیحە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو گریانەی وا بارانەو باران تا ماڵی باپیرە لەگەڵیدا هاتبوو، کۆتایی هات

-ئەبێ بڕۆم.. ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.

باپیرە جلەکانی لەبەرکرد.

-هەستە بابڕۆین.

هەردووکیان لەتارانێکدا کە سێ شەممەیەکی لەبیرکراوی هەبوو، بەو شەقامانەدا رابوردن کە لە سۆنگەی مانگرتنەکانەوە تاوێ کارەبایان هەبوو و تاوێ نەبوو. تاوێ تاریکو تاوێکیش بە ئەندازەی دارتەلێك روناك بوو، بۆیە مەلیحەو باپیرە نەیانتوانی تەرمی چەترەکە لەژێر هیچ درەختێکی کۆڵانەکەدا بدۆزنەوە..ئێستا ئیتر چەترەکەش بووە بە سیاوەش.



# پەیڤین لەگەڵ دیوارەکانی زیندانی شتامهایم

■ کریستینیا برۆکنەر

● و. لە ئەڵمانییەوە: دکتۆر هەژار مەعروف

ئەم سێ چیرۆکەی ژنە نووسەری ئەڵمانی – کریستینیا برۆکنەر– بەشێکن لەو ئەدەبەی لەلایەکەوە ئامادەگیەکی زیندوی ژنە لەبوارە هەرە دیارو سەختەکانی ژیانو، ئەو گیانەیشە کە بەردەوام ڕۆحی خۆخوازی ئەم ڕەگەزە ڕەت دەکاتەوە لەبەرانبەر ڕووداوە هەرە درامیەکانی ژیانو کارەساتەکانیدا، لەلاکەی تریشەوە وەك کارێکی هونەری دەست بردنە بۆ مێژووی ژیانی ئەو ژنانەی کە لە واقیعدا بەرجەستە بوون، دیارە (دەست بردن بۆ مێژوو یان کەسانی ناو مێژوو)و ڕەخساندنیان بۆ کاری ئەدەبیو هونەری لەخۆیدا کارێکی ئەستەمەو، هەوڵی زیندوکردنەوەی ئەو سەردەمو کەسانە ئاسان گیرنیە.

لەم سێ چیرۆکەدا کەسە سەرەکیەکان (دیزدەمونەی شکسپیرو کلیومنستراو هیلینی هۆمیرۆس) جارێکی تر دێنەوە ناو گۆرەپانی ڕووداوەکانو بەڕاشکاوی چ وەك ژنو چ وەك مرۆڤ لەنهێنیەکانی خۆیان دەدوێن. کلیومنسترا ناپاکی لەئاگامێمنونی سەرکردەو مێردی دەکاتو دەیشی کوژێت، ئێستا لەگەڵ لاواندنەوەی لاشەکەیدا هەموو رازو نیازەکانی کۆنو تازەی نێوان خۆیو ئەودا هەڵدەڕێژێت. ئێستا ناترسێت پێ لەناپاکیەکانی بنێت، چونکە ئەو دەسەڵاتەی بەسەریەوە هەبوو لەبەردەستیا مردوەو ناتوانێت لەتەنیا درۆیەکیش پەشیمانی بکاتەوە.

دیزدەمونەیش لەوپەڕی نائومێدیدا هێشتا ئوتێلۆی ڕەشی خۆش دەوێتو لەبەر

پەنجەرەشو مەرگاویەکانیدا متو چاو پڕ لەبەزەییە، دەیش زانێت ئۆتێلۆ عەبدێکی زەلیلی بازوە بەهێزەکانیەتی نەك عەقڵێکی ناوازە. پێشیی دەڵێت: ئۆتێلۆ تۆ خەڵەتاویت، تۆ خانە گومانێکی کەم عەقڵێت "تۆ بەکوتە پەڕۆیەك مەڵخەڵاتاویت کە مرۆڤ بۆ کەپو پاکردنەوە، تەوێڵ وشك کردنەوەو ئەسرین سڕین بەکاری دێنێت"

لەگەڵ ئەم کەسە زیندوانەی نێو شانۆگەری قوله رەشەکەی ڤینیسیا -ئۆتێلۆ- و داستانی -ئەلیازە-دا بڕۆکنەری چیرۆکنوس باس لەکچێکی خەبات گێڕی ئەم سەردەمەیش دەکات کە سەر بە ڕێکخراوێکی قەدەغەکراوەو، دژی دەسەڵاتی ئەڵمانیای سالانی سەرەتای حەفتایە، پاشان "گودرون ئینسیلن"ی کچو ئازا دەگیرێو فەرمانی کوشتنی بەسەردا دەدرێ، دیالۆژەکانی لەگەڵ دیواری ژووری زیندانی "شتامهلیم"دا دەبنە دەقی بیروڕاکانی.

ئەم چیرۆکانە لەزمانە ئەسڵیەکەوە کە ئەڵمانیە کراونەتە کوردی.

هاورێمان دکتۆر (هەژار مەعروف) بەزمانە پاراوەکەی وەری گێڕاونو پێشکەشی ئەو ژنە کوردانەی کردوە کە کەس بەهاوارو فریادیاندا نەگەیشتو ئەو "لەیلا زانایە"ی جەنگەڵێك لەپیاوانی ئەندامی پەرلەمانی تورکیای لەرەگو ریشەوە لەرزاند.

ئەم چیرۆکانە بەشێکن لەو پێنج چیرۆکەی کە بەهەمان ریتمو مەبەست نووسراونو لەناميلكەيەكدان کە زۆر کەم کەوتۆتە بەردەستی خوێنەرانی کوردستان. بۆیە بەپێویستمان زانی ئەوسێ چیرۆکەی لێ هەڵبژێرین.

**سەردەم**

-1-

## بۆ "گودرون ئینسلین" پەیکەر ناتاشرێت!

### *"پەیڤین لەگەڵ دیوارەکانی زیندانی شتامهایم"دا*

**ناساندن:**

گودرون کیژی قەشەیەکی ئەڵمانی بوو کە زمانو ئەدەبی ئەڵمانیو ئینگلیزیو فەلسەفەی خوێندبوو. یەکێ لەتوێریستانو کادیرە رابەرییەکانی ڕێکخراوی چەکدارو قەدەغەکراوی "باڵی سوپای سوور -بوو کە لای خۆمان بە بادەرماینهۆف ناسرابوو-" کە لە ساڵانی 968-970دا دروستکرابوو. پاشی چەندین هەڵمەتی چەکدارانە بۆ سەر دامودەزگا سیاسیو ئابوورییەکانی ئەوسای ئاڵمانیای رۆژئاوا، لە 976/10/18 لەگەڵ سەرکردەکانی دیکەی ئەو ڕێکخراوەدا: "بادەر" و "ماینهۆف"و "ڤاسپە" حوکمی زیندانی هەتا مردن دران. گودرونو بادەر ڤاسپە، لەزیندانی شتایمهایمدا لە 976/10/18دا خۆیان کوشت. ماینهۆفیش لەهەمان زینداندداو پێش ئەوان لە 76/5/19 خۆی کوشت.

لە ئەڵمانیادا هەندێك را هەن کە ئەوان خۆیان نەکوشتووە بەڵکو لە لایەن پۆلیسو ئاسایشی ئەڵمانیاوە کوژراون. ئەو قسانەی لەنێو کەوانەدان قسەی خوازراوی کەسانی ترن، وەکو باوك یان مێردی گودرون، یان لە رۆژنامەو کتێبی وەك ئینجیل خوازراون کە گودرون لەمناڵیدا لەقەشەی باوکییەوە فێریان بووەو فێریانکراوە،.

شایزە: وشەیەکی ئەڵمانییەو بەمانای "گو" دێت، لەکاتی تورەییو کەللەییبووندا زۆر بەکاردەبرێت، هەر وەکو خۆی بە ئەڵمانی هێشتمەوە.

* * *

**دەمەوێ** قسە بکەم، کاتێك کە من خۆم دەمەوێ، نەك کاتێك ئێوە دەتانەوێ، ئێوەی شایزە!. کاتێك کە من لەگەڵ دیوارەکان دەدوێم! هەموان هەمیشە، بەس لەگەڵ دیوارەکان دەدوێن!. بۆچی بە گورەوییەوە هاتوچۆدەکەم؟ چونکە چی دی ناتوانم دەنگی هەنگاوەکانم ببیستم، تەپ، تەپ، تەپ. وەك پشیلەیەك بەئەسپایی دەکشێمو ئینجا تەکانێكو قەڵەمبازێك دەدەم! حەیوانی دڕندەی رامنەکراو لە پشتی شیشەوە. ئێمە دەتانگەزینو بەنینۆك دتانڕوشێنینو دەڕێینە سەرتان.

(گەورە دڕندەی ژمارە.. لە شتامهایمەوە): ڕۆژانە لەبەرنامەی ئێوارانیهەر سێ کەناڵی تەلەفزیۆنی ئەڵمانیادا. هەر قەفەزی پێڕەوکەی منداڵان کەمبوو. ئەرێ بۆ داوای هەقی هاتنەژوورەوەیان لێناکەن؟.

گشتیان خۆیان بەسەر ئێمەوە قەڵەو دەکەن: پاسەوانەکان، حاکمەکان، ڕۆژنامەنووسەکانو وێنەگرەکان. لەپێش هەمووشیانەوە خەڵکی تەماشاکەر. تەنانەت کرێی هونەرەکەشمان پێ ڕەوا نابینن. چەندین ساڵە لەپێناوی ئێوەدا ڕۆژنامەکانتان پڕ پڕ دەکەین، بۆ ئێوە قازانجمان لەتێچوونمان زۆرترە، ئەی ئاغای springer(1) دوازدە ملیۆن تێچووی بەندیخانەی شتامهایم!. ئەی سەرهەواڵێکی گەورەو زەقی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی Bild(2) چەن پارەی پێ پەیدا دەکەن؟ ئێوە بەدیواران دەورمان دەگرن بەڵام ناتوانن لەدەلاقەو پەنجەرە دوورمانبخەنەوە. هەرچەندە ئێستا ناتوانین دەس بوەشێنین، وەلێ هێشتا هەر ئێمەین سەرتۆپی زرتو زەقی هەواڵەکان: "ئەڵمانیا لە شتامهایمەوە حوکمدەکرێ!". شایزە! ئێوەی دێڵە بەراز قسەتان لەگەڵ ناکەم. ئیدی قسەی لەگەڵ کەس ناکەم. هێشتا دیوارەکانی زیندان لەگوێی ئێوە باشترن. قسە نەکرێو خواردن نەخورێ، گوێ بۆ هیچ نەگیردرێ، هیچ لەمەڕ خۆ نەدرکێندرێ، نە مێز بکرێو نەگوو. خیشکردنو مانگرتنی هەمەلایەنیو تەواو. ویستم خۆم بخۆمەوەو هیچ نەدرکێنم، کەچی میزدانم توندو گرژ بوو. "برۆ بۆ ئاودەس، گودرون، پێش ئەوەی ماڵ جێبێڵی!". من چی دی هەست بە هیچ ناکەم!. هیچ دەنگێ نابیستم. لێدەگەڕێم تا هەموویان بەریز بێن: باوك، دایك، خوشكو برایان، تەواو بەسییە ئیتر! ئەگەر دەرزیی قەوانەکەم لەباڵم بچەقێنم هیچ خوێنی لێنایەت. دەشێ لەسێرکدا بازی بکەمو بهێڵم بەمشار بمکەنە دوو کەرتەوە.

من بڕوام بە شۆڕش هەیە. ئا، هەرچییەك بێت مرۆڤ دەبێ وەك دوا شت بیڵێت.

ئەوەی داخۆ کەسێك دەیبیسێت یان نا! "باوکمان لەئاسمان هەموو شتێك دەبیستێ، جگەرگۆشەکەم!". بەڵێ، بابە! من بەسەر ویژدانی قەڵەوتانەوە دەبمە بار. ئێوە لەمردنی من گوناهبارن. ئەوی ئێوە دەیکەن کۆکوژییە. کۆمەڵ تاك دەکوژێ!. خۆ من جارێ هەناسە دەدەم هەناسەم گا نوزەی دێتو گا فیشکە. هەناسە هەڵمژە. هەناسە بدەرەوە. هەناسە رابگرە. لەدیوارە وە بۆ دیوار پێنج هەناسە، بەسێو بەدوو هەناسەش هەر دەبێت. تیشکی گڵۆپی "نیۆن" کە چاوانم دەسووتێنێتەوە، وەك ئەوەی شیوەنم کردبێت. "تەنانەت فرمێسکیشت وشکە". باشە بۆ رستە پوچو بێ ماناکانتم لەیاد ناچێت ڤەسپەڕ؟(3) لێرەش پێڵوی چاوم بەمێڵی ئەستوور و رەش دەکێشم. رووم موڵکی خۆمە. ئێوە بەجۆرێکی تر منتان دەسگیر نابێت، وەکو

ژنە نەجیبزادەکان لەژێر تەوری سەرپەڕاندندا(4) (لە پێشدا ئارایشت دەکەن ئەوجا نارنجۆک دەخەنە گیرفانیان). ئێ باشە ئینجا چی بووە؟ جەنابی ئاغای springer، ئەمە لەگەڵ کێدا ناگونجێت؟ سەروسیمای تیرۆریستیمان لەگەڵتانا ناگونجێت؟ دەتانەوێت هەموومان بترنجێننە نێو رۆبو جلوبەرگی یەکجۆرو رەنگە رەسمییەوە؟. مرۆڤ دەشێ بەزەیی بەژنانی پاسەواندا بێتەوە کە بەدرێژایی ژیانیان لە شتامهایم، هەموو رۆژێك بۆ زیندان دێنو لێی دەچنەدەرێ. دەتوانیت وشەی بەزەیی لەگەنجینەی وشەکانت دەراوێژیو بیسرپیتەوە، گودرون. توانای بەزەییهاتنەوەت نەماوە. لەرۆژی یەکەمدا حەزم دەکرد گازم بگرتایە لەگۆشتی سپیی باڵتان، بەلام تەنیا ددانم لێ کرۆژتن، بۆ ئەوەی وریای خۆتان بن.

خەزوورم: شاعیری ئەڵمانزمان، ڤیل ڤیسپەر will vesper!.. "هایلگ فاتەر لاند، ئین گیڤارن داینە زۆنە زش ئۆم دش شارن". "موقەددەس باوکی نیشتمان، لەمەترسییەکاندا کوڕانت لەدەورت کۆدەبنەوە". ئەی رات بەرانبەر کچانی باوکی نیشتمانی موقەدەس چییە هەی نازیی بەراز! بەگۆرانییەکانت خەڵکت بێ ئەقڵ کردنو فریوت دان. مەسەلەی بەختەوەری بۆ من هەرگیز پرسێك نەبوو. ئێوە هەی بێ ئابڕووەکان!.

ئا، دایە، من باڵی خۆم دەمژم، ئەگەرچی سەد را لێمت قەدەغە کرد. پەڵەی شینی سەر جەستەی دوای گەمەو دەسبازیی ناو جێگا، من خۆم بۆ خۆمی دروست دەکەم. من چی دی بە کەسەوە پەیوەندیدار نیم. من چی دی کچی قەشەی canstatt نیم، خوشکی براو خوشکەکانم نییم، من هەرگیز ژنی نووسەری بەهرەمەند – Ward Vesp Ber نەبووم، من نە مامۆستامو نە دایکی منداڵێکیش! ئێوە ئەگەر بتانەوێ حاڵی بنو تێبگەن! چۆنییەتی پەیوەندیی من لەگەڵ Andreas Bader، کێشەی شەخسی منە نەك ئێوە.

کاتێك کە لە مردندام، هەر کاتێك مردم-کاتەکان لەرووی رێزمانییەوە راست بەکاربێنە، گودرون! دەشێ خەم بۆ کچی گومڕاتان بخۆنو نوێژ بۆ مردوو بکەن، کە خوا بەزەیی پێدابێتەوە. ئامین.

"مرۆڤ بۆی هەیە لەدادڕەوی عەدالەتی ئەم دونیایە خۆی بێبەری بکات، بەلام بۆی نییە لە لێبوردنو بەزەیی خودا خۆی بێبەش بکات". بۆچی ناتوانم قسەکانی باوکم وەك گژوگیای بێسوود لەریشە هەڵکێشم؟ "خوا رووناکیی رووی گەشی خۆی بەسەرتدا پەخشبکاتەوەو بەزەیی پێتدا بێتەوە". بەسەر کچەکەتدا تاڤو تیشکی چرای نیۆن پەخشندەبێتەوە، بابە! من پێویستم بە بەزەیی ئێوە نییە!

من دەرێیمە سەر ئەو وشانەی لەسەکۆی کلێساوە دێنو ئینجا سەر ئەوانەش کە لەسەکۆی گەورە کلێساوە دێن! ئیتر هیچ بۆم گرنگ نییە شایزە بڵێم، بەلام ئەمیش چی دی ئاسودەو رازییم ناکات. ئا بەمە قایلیت دایە؟! چ چاوەڕوانیو ئومێدێك لەدڵو دەروونتاندا پەنگی خواردبووە کاتێك ئەو کۆشە منداڵەتان بەرهەمهێنا، خۆ ئێوە دڵو دەروونتان هەمیشە پەنگاوی دەرنەبڕین بوو! منداڵانی پاکو بێگەردی خوا؟ ئەی من منداڵەکەم چۆن لەهەمبەر ئەم دونیایەدا بپارێزم؟ خەڵك منداڵ چۆن بەخێو دەکەن؟ باشتر وا نەبوو کە لە پێناوی کۆرپەکەی منو هەموو زارۆکانی دوارۆژدا ئەم دونیایە بگۆڕین؟ سکپڕبوونو سکپڕی، منداڵبوونو شیردان، ئەمانە گشت بۆ خۆدۆزینەوەی من گرنگ بوون! "ناوی منداڵەکە: Felix. پیشەی باوك:

رووناکبیرێکی تێکچوو، مردن بە خۆهەڵواسین. پیشەی دایك: تیرۆریست، مرۆڤکوژ، ئاگرنێرەوە، ئێستا لە شتامهایم".

مـن ئیدی کاردانـەوەم نییـە. وشـە زەقـەکان کارم تێناکەن. هەست بـە هیـچ ناکـەم. ئـەی هەستی خۆرسکی دایکایەتیم بۆ سرتەو جوڵەی لێنایەت؟. من سەهۆڵ ئاسا رچیوم. با بمبەستن، هـەتا بتـوانم دوای سـەد سـاڵی تـر ببینم لـە بزووتنەوەکەمان(5) -بزووتنەوەی خوێندکاران- چ دەرهاتو چ ئەنجامێکیدا بەدەستەوە، ژمارەی مێژوویەك، ناوێك، گودرون ئۆلریکاو ئەندریاسی موقەدەس. هەموو موقەددەسەکان لەشتامهایم.

مـنو ڤاسپەر بەخۆمانو گرێی دەروونیی باوکمانەوە، Felix یش بە خۆیو گرێی دەروونیی باوکو دایکییەوە، ئا بەمجۆرە مرۆڤ هەر دەبێت شێت بێت. "لەنێوانی شێتیو ژیرییـدا، تـەنیا دیوارێکی تەنگ هەیە!"

گوایە من بە سۆزو عاتیفە سیاسەت دەکەم؟ تۆ دژی ئەمەیت؟ ئەی تۆ چی لەمێشکتدا هەیە؟ تۆ بەسەر کاغەزدا دەلیکێنی، تۆی ئەدیبی میز بەخۆداکەر! تۆ خولقێنەری منالێك بویتو باوك نەبوویت، منیش منالێکم بە زگ هەلگرتو دایك نەبووم. ئەو ساتانەی بەردەوام دەتگوت: دەبێت بنوسـم! دیالیکتیکـە نەفرەتییەکـەت، سەفەرکردن، جێهێشتن، گەیشتن، فڕین، نیشتنەوە، خەوبینین، جرتو فرت، تێکچونو بەلەسەبوون، تۆی چەپەڵو شێت! تەرەقـەی رەشیشم جارێك بۆ جەنابیشت داگیرسان. ئەوەی تۆ پێویستت بوو کچێکی شەهوەتباز بوو بۆ ناو جێ. رقم دەبێتەوە! رقم دەبێتەوە! جگە لە کینەو رقلێبوون هیچی ترت لەباردا نەبوو. رق لە باوكو باوکی نیشتمانو لەخەڵك کە بۆ سوکایەتیپێکردن ناوی لەوەرخۆرت لێنابوون.

خۆی کەسی خۆشناوێ، بەڵام دەیەوێ خەڵك خۆشیانبووێتو منی بۆ مێشکیش بەگەرمی بەپیرتەوە هاتم. "منت خۆشدەوێ؟ تا دوا هەناسەو بۆ هەمیشە منت خۆشدەوێ؟" ئا ئەم ئاشتبوونەوە نەفرەتییە بەهۆی پێکەوە جنسکردن.

"نەتدەتوانی ئاگات لەمنداڵەکە بوایە لەکاتێکدا پۆلیسەکان منیان دەسگیر کرد؟"

جەنابی سەرۆك تۆ لەگەڵ رووناکبیراندا دەدوێی، واز لە تەشەرەکانت بێنە! نەمتوانی منداڵەکەم لەگەڵ خۆمدا بۆ زیندان بهێنم، هەروەها نەمتوانی لەگەڵ خۆشمدا دەربازی بکەم. لەم بەسەرهاتەی تایبەت بە من، Herodes(5) عەودالی گیانی دایکی منداڵەکە بوو، نەوەك منداڵەکە، باوکە! ئەم وێنە نەعلەتییانە چین کە بۆمیان دەنێرن. من چی دی نامەوێ کەس ببینم! ئەم لیکرشتنەی بەدەم گریانەوە: هێشتا یەکەم هاوینمانت لەبیر ماوە؟ قەنەفەی نێو پارکەکەی Tubingen(6) تۆلە هیچ حالی نەبوویت. چەند بەیانێك بلاوبێتەوە. مەسەلە هەر ئەوە بوو و تەواو، کاغەز. دەشێ مرۆڤ بەهەمان رەوش کۆلارەی کاغەزین بەرزبکاتەوە. جگە لە کاغەزو بۆمبا دەشێ رێگای تری لێکتر تێگەیشتنو حالیبوون هەبێت. دەبێت ئەو شتانەی لای خاوەنەکانیان بەنرخو خۆشەویستن، یان لێیان زەوت بکرێن یان وردوخاش بکرێنو تێکشکێنرێن: دەسەلاتەکەیانو پارەکەیان، دە ئیتر لەمە حالی بنو تێبگەن! "تێکدەرو روخێنەر بوون لە دروستکەربوونو بونیادنەر بوون ساناو ئاسانترن". نامەوێ لەمەڕ چارەنوسی منالەکە هیچ بیر بکەمەوە کە چی لێدەردەچێت.

جگەرگۆشەکەمم کردە قوربانی لەپێناوی ئایدیاو بیرێکی مەزن، ئا،.. مرۆڤ دەتوانێت ئاوا بڵێت، جێی خۆیەتی ئەم رستەیە بەکاربێنم. بزووتنەوەی خوێندکاران. شەپۆلی بەسیاسیی بوون کە لێوەی تۆفانو زریانێك هاتووەتە کایەوە، کە سەرتاسەر جیهانی رۆژاوای گرتووەتەوە. "گوێبگرە، رۆڵە گوێبگرە، چ رەشەبایەك هەڵیکردووە!". من نامەوێ لەتەوژمی ئێوەدا مەلە بکەم، من نامەوێ دژی تەوژمەکە مەلە بکەم، من دیوارو بەربەستێکم لەتەوژمی کاتدا! ئا ئەم حەماسو هەژانە بێبناغەیەم لەتۆ وەرگرتووەو لەتۆوە فێری بووم، بابە!

"بۆچی لەناو تیرۆریستەکاندا ژنان زۆرن؟" وەك بڵێی ئێستا ئەمە چ رۆڵێکی هەبێت؟ پیاوان= ژنان. ئێمە بوونەوەرانێکین، نەنێرینە، نە مێینە، راونراوینو لەتەنگاودان، بەردەوام یا تەڵەکە لە بەرپێماندایە، یان کەوتوینەتە نێویو گرتووینی، مێشکمان تەنیا پلانی راکردنو دەربازبوونو رزگارکردنی هاوخەباتەکانمانی تێدایە. هەستو شعوریش لەناڵیندایەو هاوار دەکات، ئیتر بەسە. "ئیدی خەڵك ناتوانن هەموو شتێ لەگەڵ ژناندا بکەن، بەڵام ژنان ئەتوانن هەموو شتێك بکەن". تێگەیشتن؟ سەرکێشی دەکەینو یاخیدەبین وەك پیاوان، بۆمبا دەتەقێنینەوە وەك پیاوان ئێمە لەوان نەترسو بەجەرگترین. ئێمە هیچمان نییە هەتا لەدەستی بدەینو بیدۆڕێنین.

"پۆلیسەکان بەرازن، دەتوانرێو نارەوا نییە تەقەیان لێبکرێت".

ئێ باشە ئۆلریکا! ئەم رستەیە بووە بەسەر دێڕی رۆژنامەکانو قسەی سەرزاران! وەك داڵ خۆیاندا بەسەریاو ئاپوورەیان لێدا، خۆراکێکی دۆزراوە بوو. دەشێو لەتواناداهەیە تەقە لەداڵیش بکرێت. هەر کە مرۆڤ سەردەقەکەی شکاند، ئیدی کەسێك نییە کە نەتوانرێت تەقەی لێ بکرێت.

"پێویستیی لەسەرخۆکردنەوەو بەرگری لەخۆکردن چەندین سەدەیە لەژناندا کەڵەکە بووەو پەنگی خواردووەتەوە". خۆ ئێوە تەنیا بە زەبروزەنگ توانیوتانە سیستمی سەرمایەداریتان رابگرنو بیهێڵنەوە. زارۆکان تا دەکەونە گیانەڵا لەلایەن باوكو دایکیانەوە، لێیاندەدرێتو دارکاریدەکرێن. سەدان هەزار بەهۆی هەڵە تەکنیکیەکانەوە لەرووداوی هاتوچۆدا دەمرن.

هۆی خۆکوشتنو مردنی ئالوودەبووانی مەشروبو مادە بێهۆشکەرەکان، بارودۆخە بەدو نالەبارەکانن. چونکە مرۆڤ چی دی ناتوانێت بەم رەوشە درێژە بەژیان بدات، تێگەیشتن؟

بۆ وا دەشیرێنیو هاوار دەکەیت، تاوان وە پاڵنراو گودرون؟ بۆچی دروشمەکان بەنەرەنەڕ ئاراستەی دیوارەکان دەکەیت؟ میکرۆفۆنەکان، کەوەك سیسرك لەگۆشەو پەنای ژوورەکەتدا جێمان بۆ ساز کردونو چاندوومانن، گوێیان قورس نییە.

من هەتا دان لەزارمدا نامێنێت دەقیژێنم! ئێمە خۆمان هاوێشتە سەر چەرخی مێژوو، بەڵام لەنێوان تەڵەکانیدا گیرمان کردووە، گیرمان خواردووە. شایزە! ئەم زۆر بڵێییە بەوێناندنو لێکچواندنی ئایدیاو چەمکەکان. وەك کچی قەشەیەکی ناوچەی شتوتگارت. ئەو رووە گەشو گەنجو دەربڕەی گودرون ئێنسلین! هەموو رووە سفتو لوسەکانی کچانی سەر تابلۆی بەدواگەڕانی پۆلیسدا! ئێ..؟ هیچ هەیە؟ بەدواگەڕەکان، شکاتکەرەکان، پارێزەرەکان- گشتیان ئەو پیاوانەن کە راوی چەند نێچیرە ژنێکی کەم دەکەن. "ئێمە شەهیدانی بزووتنەوەیەکی

فیکریی مەزنین! مرۆڤ تەنێ کاتێ دەتوانێ ترسی لە بۆمباکان بشکێ، کە خۆی بیانهاوێژێ". خراپ نییە گودرون! لە ژێر زەمینی خۆپاراستن لە بۆمباباران، کە منداڵ بووم گوایە گەلێك جاران بەحەماسەوە هاواری بۆمبام کردووە. بۆمبا! بۆمبا!. "سێ جار حوکمی زیندان تا مردن. وەك ئەندامی گروپێك، نارەواو چەپەڵانە، بە پاڵنەرێکی نزمو ناجوامێرانە مرۆڤی کوشتووەو هەوڵی کوشتنی داوە".

چیتر – هیچی تر ماوە؟ ئێوە شایزە، ئێوەی نەفرەتلێکراو شایزە! ئێمە تاوانکەرنین، ئێمە سیاسەت بەکەرەسەو پێکارێکی تر دەکەین، بەهەمان رەوشو لەبەر هەمان ئەو هۆیانە ئێوەش شەڕەکان بەرپا دەکەن.

دەتوانن دادگاییمان بکەن، دەتوانن حوکمی سزا بەسەرماندا دابڕن، بەڵام ناتوانن سیاسەت لەمەسەلەکەمان دەرهاوێژن، تاوانکارییی ئێمە سیاسییە، سیاسەتەکەی ئێوەش تاوانکارییە. ئێمە لە پۆلیس خوڕترو بەهێزتر بووین. تیرۆریستەکانی ئیمرۆ، سیاسییەکانی سبەینێن. سیاسەت لەناو هۆڵی دادگایشدا پیادە دەکرێت! سیاسەت لەهەموو شوێنێکدا هەیەو پیادە دەکرێت، لەجێی خەوتندا، لە باخچەی ماڵانداو لەقوتابخانەدا. لەگشت شوێنێکدا دەچەوسێنرێتەوە، ئەشکەنجە دەدرێ، دەسەڵات دەسەپێنرێو پیادە دەکرێ. تیرۆر! گودرون، لاتینییەکەی کە Terrere ە بیگۆڕە بۆ ئالمانی! ماناکەی: تۆقین، تۆقاندن، تیرۆراندن یانی تیرۆر بکەن، ترسو لەرز پەخشکەنەوە، بچەوسێننەوەو تەجاوزی فیکری بکەن.

بەڵام خۆ کە ئێمە چەکی خەباتمان کردە شان تەنیا لەدژی سەروەریو ئاغایەتی سودی سەرمایە بوو. بەپێی ئەم یاسایە هاتینە کۆڕی خەباتەوە.

جارێکی تر دەیڵێمەوە: ئێمە گیراوی سیاسیین! ئێمە تاوانکارنین! حاڵی بوون؟ پرسیارت لێدەکەم جەنابی باڵاترین حاکم، حوکمی ئەبەدیی ئەو گیراوەی مان لەخواردن دەگرێت چەند دەخایەنێت؟ کە هەردەم دەتوانن بەخۆراکاوی نێو شوشە رایبگرنو بە زیندویی بیهێڵنەوە؟ ئەی چ دەکەن ئەگەر خۆم هەڵواسمو بخنکێنم؟ دەتانەوێت سێ جار بمکوژن؟

زیندانیکردنی تەنیاییو هەڵاوێردانی گیراوان، ئەشکەنجەن! من خۆم رۆژی مردن بۆ خۆم دیاریدەکەم. ئێوە هیچ دەسەڵاتێکتان بەسەر ئێمەدا نیە. بە زۆر خواردن کردنە ناو زارو گەروو دەماری خوێن؟ دە جارێکیش خۆراك بدەنە ئەوانەی دەیانەوێ بخۆنو نییانە بیخۆن!. ملیۆنان مرۆڤ برسییانە. دەتانەوێ بەم دادگایی کردنەی ئێمە خەڵك سەرگەرم بکەنو دیدیان وەربگێڕن هەتا موشەكو بۆمبا ئەتۆمییەکانتان نەبینن، ئەو موشەکانەی کە دەتوانن بەهۆیانەوە هەمووان –گشت– هەموو لەناوبەرن. کوژرانی ئەو چەند کەسە کەمەش دەدەنەوە بەرووماندا و تاوانبارمان دەکەن. حیسابەکەتان راست نایەتەوەو لەنگە.

گودرون ئێنسلین بۆچ مانی لەنان گرتووە؟ ئەو ئیتر ناتوانێت نان بخوات، ناتوانێت چەناگەی لێکتر بترازێنێتو زار بکاتەوە، بە ددانەکانی دەهاڕێو دەکرۆژێ. زارۆکان لە "بیافرا"ی ئافریقا، لە سۆنگە هەژاریدا برسیین. من برسیمە، تۆ برسیتە، گشت برسیین. "ئێمە برسیو تینوو عەدالەتی تۆین"(7). مرۆڤ منداڵی خۆی بە چاوەڕووانییەکی ئاوا زۆرو بەرزەوە پەروەردەو

گۆشکرد. سیاسییه ناودارو ناسراوەکان هاتوچۆی ماڵی باوکو دایکی کردن.

که خەڵك ئێمەی بیرچۆوە؟ که ئیتر هیچ کەس نەهاتە قاوشەکەمان؟ که تەنانەت بۆ داڵەکانیش بەهاو گرنگیمان لەدەستدا؟ که خەڵك مردوو ئاسا قروقەپی لێکردین، ئینجا ئیتر ئێمە بەڕاستی مردووین.

چەنی تر دەخایەنێت که هێشتا خەڵك دەزانن گودرون ئێنسلین کێ بوو؟

ڕۆزا لۆکسۆمبۆرگی ساڵانی هەفتا! که مرۆڤ بەکامی هەموو ئاواتەکانی گەیشت، ئەوەی وەك دوا ئەنجام بۆی دەمێنێتەوە هەر خۆکوشتنە!

ددانی پێدا بنێن که لێمان دەترسێن! که دەتانەوێ لەناومان بەرن، وەك ژنانی جادوگەر بمانسووتێنن. "مادەی تەقینەوە لەبری مادەی دەرسگوتنەوە" -بەسەرهاتی ژنە مامۆستایەك تایبەت بە Stern(9) هەی بەرازینە چەند پارە دەدەن؟ "ئەو وشانە بژمێرن که مامۆستاکەتان حەزی لێیان بوو، زۆرجار لەسەر زاری بوون: ئێستا- خێرا- بۆ پێشەوە- بەڕێگاوە- دەمودەس- عەفەوی- ئیمرۆ- لە ڕەگوڕیشەوە. کێتان وشەی تری لەم بابەتە دەزانێت؟"

"مردن وەك دوا ڕووداوی گرنگو مانادار" گودرون ئێنسلین وەك ناونیشانی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە. دوا شریت لەخانەی مەرگەوە. هێشتا پێویستتان بەناونیشانی بچوکتر هەیە؟ دوا خواستی، ئارایشتو ڕتوشکردنی برژانگی چاو بوو. ئەوی دەئاخافێو قساندەکا نەمردووە. من هێشتا دەژیم! و هیچ کەسێکیش وشەو هەنگاوەکانم نابیستێ. بخەون! بخەون خەوی مرۆڤە دادپەروەرو بەویژدانەکان! بەڵام سبەینێ زوو ئارامیو پشووتان دوایی دێتو ئینجا سەرەی ئێمەیە، هەرسێکمان، بۆ ئارامی پشوودان.

هەر کەسێ حوکمی مردنی بەسەردا درابێت، دەتوانێت پێشی پیادەکردنی حوکمەکەی، دوا خواستو داوای خۆی لای ئەو قەشەیە دەربڕێ کە بە هەموو گیراوێك دەڵێ: "با.. خۆ هەوڵدەدەم لێتتێبگەم"، من ئەگەر ئەمەم بتوانیایە. بەڵام ددانەکانم بۆ نەترازان.

که ئەم جۆرە کەسانە دەبینم، چەناگەم ڕەقو کلۆم دەبێت. گرژبوونێکی ئاوا توند! با لە گۆڕێکی هاوبەشدا بمانێژن! گوێتان لێیە؟ ئێوە... بەدو ناڕەسەنەکان! پێکەوە تورماندەنە چاڵێکەوە! ئیتر لێرە دەربازبوونمان بۆ نییە. ئێرە دوایین تەڵەیە. ئێستا ئیدی لەژێر دەستانداین. براڤۆ!

هۆی مردن" خنکان بەهەڵواسین "خۆی بە بنمیچەکەدا هەڵاوسی". ئەمە لەلادێدا باوە. منی کچە قەشەیەکی گوندی، نەکایەنو نە گوریس، بەڵام وایەری قەوانەکەو دەلاقەیەکی بەخاچ داخراو. ئەمە لە مێژە قسەی لێکراوەو بڕیاری لەسەر دراوە. سیستمێکی بنچاوکردنو کۆنترۆڵتان کارایی لەدەستداوە. لەئێوە زرنگو زیرەکترین. ناتوانن لە یەکترمان جیابکەنەوە. تەنیا مردن دەتوانێ لەیەکترمان جیابکاتەوە. بەڵکو ئەمیش نا!

جاران دەمزانی ژیانی ڕاستو باش دەبێ چۆن بێت. ئێستاش بیر لە ماڵێك دەکەمەوە کە حەشارگەی خۆشاردنەوە نەبێت، بیر لە موچەی نێردراو بۆ بانکەکەم دەکەمەوە نەك لە بانك بڕین، با سەعاتی چەڵەمە زەنگ لێبداو منیش هەڵدەستمو ئاوێك بەخۆدا دەکەم، Felixی کوڕم دەگۆڕمو کاکاوی بۆ دەکوڵێنم، دەیبەم بۆ قوتابخانە- کە بەسەر جادەکەدا دەڕۆیت، ئاگادار بە! -ڕستەی ڕاهێنان بەقوتابیەکان دەنووسم، لەژووری مامۆستایان قاوە

دەخۆمەوەو لەمەڕ بەرنامەی تەلەفزیۆن دەدوێمو هەروەها دەربارەی پشووی ساڵانە لەدوورگەی Silt. ئێمە پارە دەخەینە لاوەو خریدەکەینەوە بۆ دروستکردنی خانوویەك لە سەوزەڵانی دەرەوەی شاردا. دڵم تێکهەڵدێت، رشانەوەم دێت! دەمرشێنێتەوە، دەرشێمەوە بەسەرتاندا!!!

پەیکەر بۆ گودرون ئێنسلین دروست ناکرێت. لەکتێبی مێژوودا بە دێڕێکیش باسی ناکرێت. "لەنێوانی ژیریو شێتیدا تەنیا دیوارێکی تەنك هەیە". بەپێی پەتی دەڕۆم، دایە! ئەو گۆرەوییە خورییانەی کە بەتایبەت بۆ منت چنیبوون، دامکەندن، میزدانم بەهۆی زەویی کۆنکرێتی ژێرمەوە سەرما لێیدەدات. دەمەوێت پێیە رووتەکانم بەسەر خاكو خۆڵدا بڕوات، یاخود بەسەر گژوگیادا، گژوگیایەکی شەونماوی.

*پەراوێزەکان:*

1-Springer: خاوەنی گەورەترین یەکێتیی کۆمپانیاکانی چاپو بڵاوکردنەوەی رۆژنامەو گۆڤارو کتێب بوو پاش جەنگی جیهانیی دووەم لەئەڵمانیاداو ساڵی 1985 لە بەرلین مردووە.

2-Bild: وێنە- رۆژنامەیەکی زۆر هەرزانو سەرتاسەری ئەڵمانیایە کە رۆژی "8" ملیۆنی لێ دەفرۆشرێت. زۆتر چینی کرێکارو رەشوڕووت دەیکڕێت، ئەگەرچی زۆر درۆو دەلەسە بڵاودەکاتەوەو داکۆکی تەواو لە سیستمی سەرمایەداری دەکات.

3-ڤەسپەر: مێردی گودرون ئینسلین بوو.

4-ئاماژەیە بۆ ئیعدامو سەرپەڕاندنی کەسانی ئۆرستۆکراتی لە سەردەمی شۆڕشی گەورەی فەرەنسای ساڵی 1798دا، کە بەرەنگی زەردو ترسو لەرزەوە رووبەڕووی ئیعدام دەبوون.

5-بزووتنەوەیەکی بەربڵاوی خوێندکاران بوو لە ساڵانی شەستەکاندا. داواکانی لەسەرەتادا ریفۆرم بوو لە سیستەمی خوێندنو پەروەردە لەزانکۆو قوتابخانەکاندا دواتر ئاگر ئاسا تەشەنەی کردو بوویە بزووتنەوەیەکی جەماوەریی فراوان کە داوای گۆڕانی ریشەیی لە سیستەمی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتیی ئەڵمانیای رۆژئاوادا دەکرد. رێکخراوی بادەرماینهۆف لە 968دا لە کاتی دامرکانەوەو ئاوابوونی ئەم بزووتنەوەیەدا دروستکراو بە رەسمی لە 997دا هەڵوەشاندنەوەی خۆی راگەیاند.

6-Herodes پاشای جولەکە لە فەلەستین، لەسەردەمی زایینی پێغەمبەر عیسادا. بەپێی ئینجیل: هێرۆدیس فەرمانی کوشتنی هەموو ئەو منداڵە کوڕانەی لەشاری بەیتلەحم دەرکرد کە تەمەنیان لە دوو ساڵ کەمتر بوو بەئامانجی ئەوەی عیساشی بەریکەوێتو لەناو بچێت، کە تازە هەواڵی لەدایکبوون وەکو موعجیزەیەك بەر گوێی هێرۆدیس کەوتبوو، بەڵام نەیدەزانی کام منداڵەیە.

7-Tubingen: ئەو شارەی ئەڵمانیایە کە گودرون دانیشگای تێدا تەواو کردووە.

8-لە ئینجیل وەرگیراوەو گودرون بەمنداڵی لەباوکییەوە فێری بووە.

9-stern: هەفتەنامەیەکی زۆر بڵاو و ناودارە.

- 2-

## ئێستا شادمانیت ئاگامێمنۆنی بێگیان؟

## "قسەی نەگێڕدراوەی کلیۆمنسترا لەسەر دارەمەیتی پاشای Mykene"

***ناساندن:***

بەپێی گێڕانەوەی "هۆمیرۆس"ی شاعیری یۆنانی لەداستانی "ئەلیازە"دا، ئەگامێمنون میری میرنشینی Mykene لە یۆنانی کۆنداو سەرداری شەڕی درێژخایەنی "تەروادە" بوو. و لەکاتێك لەو شەڕە گەڕاوەتەوە ماڵێ، لەلایەن

کلیۆمنسترای ژنیو Agisthی دۆستی ژنەکەیەوە دەکوژرێت. Parisی شازادەی تەروادە، هێلینای ژنی میری میرنشینی Spartaی یۆنانی دەفرێنیو ئەمە دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی تەروادە. تەروادە ئەو شارە کۆنە بووە کە هێلینای فرێندراوی تێدا دەستبەسەر بووە. هێلینا خوشکی کلیۆمنسترا بووە.

ئاگامێمنون ویستوویەتی بەشەڕ ئەم هێلینایە رزگار بکاتو هێرشی بۆ تەروادە بردووە. وێرانەو کەلاوەکانی تەروادە دەکەوێتە سەر کەناری تەنگەی ناوی "دەردەنیل"ی تورکیای ئەمڕۆ.

مایینی "تەروادە"ش هەر لەمەوە هاتووەو یەکێك بووە لە رووداوەکانی ئەم شەڕە. فانتازیای نووسەر لەشەقەی باڵ دەداتو بۆ پتر لە سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا دەمانگێڕێتەوە. رووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو سەردەمە تەمومژاوییە گرێدراونەتەوە بە رووداوە رۆژانەکانی ژیانی ئیمڕۆی مرۆڤو لەجوغزی نێوەڕۆکگەلێکی سەرەکیو گشتیدا تێیاندەڕوانێ، وەك: ئاشتی، شەڕ، دەسەڵاتخوازی، ئەڤین، ژنو پیاو، سێکس، ژینخوازیو مەرگخوازی.. هتد.

نووسەر، لەبری کلیۆمنسترا دەکەوێتە دووان، بەڵام چ دووانێك..

* * *

**لێمگەڕێن** با لەگەڵیدا بەتەنیابم! ئەو مێردم بوو، کە مردووە ئیتر ترستان لەچییە بەسەری بێت؟ نەکا.. دووجار بیکوژم؟ ئەو شایەنی ئەوە بوو دوو جار بکوژرایە.

ئاگامێمنون! تۆ خۆت گوتت: لای بنەماڵەی ئێمە تەنیا یەك شت هەیە: بکوژیت یان بکوژرێیت. پێمگوتیت؛ باشە دە بمکوژە! بەڵام بەمە دەتکەمە پیاوکوژ! کەچی ئەمێستا پێچەوانەکەی روویدا.

هەروەها وتیشت: بەکەس مەڵێ شادمانە، هەتا نەمرێت. ئێستا ئیتر شادمانیت؟ ئەم بەیانییە جوانە. ئەگامێمنون! هەرگیز بۆت دەرکەوتووە کە دەشێ بەیانییەك جوان بێت؟ نیوەڕوان سێبەری دار زەیتونەکە دەزانیت؟ پیاوانی کۆشکەکەت دەستی درود بەرزدەکەنەوەو سڵاوت لێدەکەن، لێدەگەڕێیت بەردەوام وشەی نوێ بەکاربێنن: هایل! زیگ! (1) زۆیس(2) ئاگامێمنون! باشە بۆ بە: بەیانیت باش سڵاوت لێناکەن؟ شتێکی زۆرە ئەگەر ئەم بەیانییەش خۆش بێت. من رۆژانێکی هێندە زۆر خۆشیم لەژیان نەدیوە، ئاگامێمنون!. من دەبوایە لەودیوی دیوارەکانی Mykene وە بەدوای بەختیاریدا بگەڕامایە. بەزەیم پێتدا نایەتەوە، ئاگامێمنون. سەگەکەت مردووە، هیچ سەگێك ئەوەندە زۆر نازی!! من چی تر ئەو ژنە نیم کە جاران لەسەر گاشە بەردەکان دەوەستاو چاوەڕێی دەکرد. رقم لە زەریا دەبێتەوە!، رقم لەوە دەبێتەوە کە لە لێواری زەریادا راوەستمو بەدوای ئەو بەلەمانەدا بڕوانم، کە دەڕۆنو ناگەڕێنەوە، ئەگەریش گەڕانەوە دە ساڵیان پێدەوێ، دە ساڵ، زۆر درەنگە، درەنگ! کاتێك خەڵك هەواڵی گەڕانەوەی بەلەمەکانتیان راگەیاند، ئەمن پشت لە زەریا راوەستابووم، mykeneم بینی ببوە کەلاوەو وێرانە، پەیکەرە شێری بەر دەروازەکەت وردو خاشو چاوبازەڵە لەسەر گوڕت سەوز بووە. رقم لە زەریا دەبۆوە بۆیە لەناوی گەرماوەکەدا خنکاندمیت. ئاگر توخمی پێکهێنەری تۆیەو هی منیش ئاو، تۆ ئاگر دەنێیتەوەو ئەزیش لەئاودا دەخنکێنم.

ڕووناکیی مەشخەڵی ئاگرم بینی. دەشتو دەر ...ەسوتان، شاخ بە شاخ دەسوتاو درودی ...اگرینیان بۆ یەکتر دەنارد. بۆ هەر لایەك ملت ...ەنا، ئاگرت لەپێشی خۆت بەردەدا. بە ئاگر ...ۆڤ هیچ پەیامێکی خۆش ڕاناگەیەنێ.

لەوێدا، لەتابوتەکەتداو لەهۆڵی گەورەی کۆشکەکەتدا درێژ بوویت. هەرگیز گوێت لێنەگرتم، ئەمێستا گوێم بۆ ڕادێرە، باش گوێم بۆ ڕادێرە، ئاگامێمنونی مردوو!. خەڵك، لەسەر ئەوەی کە ئایا Agisth ئەم کارەی ئەنجامدا یاخود من، قسەو باس دەکەنو ڕای جیاوازیان هەیە. لەدڵدا سەد جاران خۆزگەم بۆ مەرگت خواستووە. تەماو نیازی ئەنجامدانی کارێك حسێبە، نەك خودی ئەنجامدانەکە. ئەز ئیسفەنجێکم تژی لە کینەو ڕق وای لەو کەسەی کە دەیگوشێت! تەزو بەلەشمدا دێت، ئاگامێمنوون!

من لەو ژنانە نیم کە بەمێردەکانیان دەڵێن: "یابێ قەڵغانەکەت ناگەڕێیتەوە، یان بەکوژراوی لەسەر قەڵغانەکەت درێژ دەبیت". بە Orestی کوڕم گوت: "ئەگەر قەڵغانەکەت بووە کۆسپو تەگەرەی ڕێگەڕۆیشتنت، لەنێو گژوگیادا توڕیدە". لەمەڕ Orest، دەڵێن گوایە نایەوێت ئازاری مێشێکیش بدات. ئێ بۆچی ئازاری بدات؟ مێشەکان دوایی تۆڵە لە کلیۆمنسترای دایکی دەکەنەوە تکام لێکردیت تا لەبری چەپاوی ڕاووڕووت، هەندێ تۆو گوڵم لە تەرواده بۆ بهێنێت. تۆوەکان دەرسکێنو گەورەدەبنو دەگەشێنەوە. ئەو گوڵانە بۆ باخچەو تەبارەکانم، باخچەکانی کلیۆمنسترا کە ئێستاکە بوونەتە شەخەڵو وێرانە. ئەو باخچەیەی کە دەبوایە منداڵانو نەوەکانمان گەمەیان تێدا بکردایە.

منداڵەکانم، من بە زگ هەڵمگرتنو هێنامنە دونیاوە. دایەن خۆراکی دانێو بێخەمی کردن، کەچی ئەوان دایەنیان خۆشدەویست نەوەك دایکیان منیش هەروەها دایەنەکەم خۆشدەویست نەوەك دایکم.

دوژمنایێتی لەنێوانی باوکو کوڕ، دایکو کچدا باوە. لای خواکانیش هەر وەهایە. ئێمە دوژمنمان بەخێوکرد کە دەیانەوێت لەناومان بەرن. هەژاران، منداڵەکانیان بەخاوەنو گەورە دەکەن چونکە لەکاتی پیریو کەنەفتیدا دەیانژێنن.

لەکۆچەو کۆڵانانو لەسەر گردۆڵکەو بەرزاییەکاندا گەلێکم دیتن، ئاگامێمنون!. چۆن دەکاریت فەرمانڕەوایی بەسەر کەسێکدا بکەیت کە نایناسیت؟. لەدەوڵەتێکدا دەبێت هەموان یەکتر بناسن، هەم گوێڕایەڵانو هەم حوکمڕان. مرۆڤ دەبێت گوێی بۆ هەموو دەنگێك ئاوەڵابێتو هەموو دەنگێك ببیسێت. بەڵام هێشتا هەندەك هەن بە دەنگی بەرز قسەدەکەنو هەندیکیش نزم، هەندێکی تریش قسان ناکەن. پیاوان لە Agora(3)دا تەنیا بۆ قسەکردن کۆدەبنەوەو بەس. بۆ یۆنانییەکان، ئاخافتن وەك هەناسەدانە، ئەوی هەناسە بدات، قسەدەکات، دەتەوێت بزانیت ئەمە قسەی کێیە؟ تۆ ئەو کەسە ناناسیت، نا، کەسیان ناناسیت! تۆ هەروەها ژنەکانیشت ناناسیت، ئەوان دەچنە سەر کانیی یاوەکو سەر ڕووبار. لەوێ قسان دەکەن، جلکو سیپاڵانیش دەشۆرنو ئاویش دەهێنن. ئەوان کارکردنو قسەکردنیان یەکن. وەك پەلەوری مەلان دەجریوێنن، وەڵێ ساتێ پاشا دێت ماتو بێدەنگ دەبن.

ژیانی ژنو مێردیم لەگەڵ تۆدا ساتێك کۆتایی هات کە "ئیفیگێنی"ی کیژمانت لەپێناوی توندەبادا کردە قوربانی تا بەلەمەکانتان

بگەێنێتە تەرەوادە. بۆ لێنەگەڕایت "هێلینا"ی خوشکم لەتەرەوادە بمێنێتەوە؟ ئەو کەسەی جوان بێت، ئیتر بێ گوناهە؟ بۆ ئەوەی کێلگەکانت وێران نەبن، جەنگت بەسەر دەریادا بۆ ولاتێکی دوور گواستەوە. مەلبەندەکەت پارێزراو هیچی بەسەر نەهات. عەردەژیانو شەڕەکان، بومەلەرزەکان بەس نین؟ کەلاوەو وێرانەکان بەس نین؟ مردووەکان بەس نین؟ زەبروزەنگی خواکان، زەبروزەنگی پیاوان! ئێوەش دەتانەوێ رێك لاسایی خواکان بکەنەوە ئەو شەڕو کوشتارەی پیاوان شەرەفدار دەکات، شەڕی شەرەف! ئاگامێمنون! بۆمی روونبکەرەوە: ئەمە چ شەرەفێکی تێدایە کاتێك پیاوێك پیاوێکی تر دەکوژێت.؟ ئەو بەمە سووکایەتی بەدایکی دەکات کە بەدونیای هێناوە، بە باوکی کە خولقاندوویەتی، بەژنەکەی کە خۆشیدەوێت. خۆشەویست ئاگامێمنون! خۆشمویستیت ئەگەرچی مێردی یەکەمو منالە نۆبەرەکەمت کوشت. تۆڵەی گوناە بەگوناە دەسەنرێت. دەست لەمە هەلبگرن! بەسییە ئیتر دەسهەلگرنو وازبێنن!

ئەز کلیۆمنسترا، خوشکی "هێلینا"ی جوان، خەلکی سپارتا!

ئەز کلیۆمنسترای دایکی سێ کیژو کوڕێك.

ئەز کلیۆمنسترای یاری رەدووکەوتووی Agisth!

ئەز هەر ژنی ئاگامێمنون نەبووم! گەلێکم هەولدا تا ناوەکەم لەگەڵ شتێکی جواندا باس بکرێت: ئەستێرانی ئاسمان، باخچەو تەلانەکانم، چینیو دەفرێك، بەلام دەفرەکە وردو خاش بوو، پارچەکانی پەرشو بلاو بوون. پلوسکی شەستەباران پاشماوەی باخچەکانم وێران دەکاتو خەلك تاسەی بینینی پشتێنی کلیۆمنسترا لەئاسماندا ناکات.

ئایا کوشتنی Kassandra(4) کارێکی بێمانا بوو؟ بە Agisthم گوت: وازی لێبێنە با بۆخی بژی. دوور نییە Orest حەزی لێبکاتو دلۆڤانی بێت، ئەوان هاوتەمەنن. لەوانە بوو دلی لێی بچووبا، ئەوی تۆ خۆشت بویستایە، Orestیش خۆشیدەویست، حەزو خولیای ئەو تۆلە سەندنەوەیە. هیچکەسێك وانێکی ماسیگرو هینی شوانو یارۆی گۆزەکەر ناکوژێت، ئەمانە بەهای کوشتنیان نییەو بۆ کوشتن ناشێن. ئەمانە لەتۆلەو غەزەبی خواکان پارێزراون. بەختەوەریی هەژاران لە گومناوی‌و نادیارییاندایە.

ئەگەر تەنیا یەکجار لەگەڕانەوەتدا کچە کۆیلەیەکت لەگەڵ خۆتدا نەهێنابا!. بۆچی قەلا بۆ خۆتان دروست دەکەن، کە پێتان خۆشترە لە نێو زکی تاریکی بەلەماندا بمێننەوەو لەژێر رەشمالاندا بژین؟ بۆ پاراستنی تالانی‌و چەپاو، تەنیا گەنجینەو ئەمبارێکت بەس بوو. بۆچی کچۆلە کۆیلەکانت بە ئەمبارو گەنجینەکەت ناسپێریت، هەتا کەسێ دەستیان بۆ نەبات؟ وادەزانیت چ شتێکم لەمەڕ کیژی گەورە قەشەی تەرەوادە نەبیستووەو نایزانم؟ یان هەر هیچ دەربارەی کۆیلە کیژۆلەی ئاخیل؟ Kasandra دوایین یارت بوو بۆیە پێویست بوو بیکوژین.

کێ دەیەوێت پێشبینی ئەوە بکات کە لەداهاتوودا چی روودەدات؟ هیچ کەسێك! گوێت لێیە؟ ئەز دەلێم هیچ کەس! ئەم ژنە بەدو ناکەسە هێند لەژێر لێوەوە نزا بەدەکانی بەناو کۆلانەکانی Mykeneدا پەخشکردەوە، هەتا پێشبینییەکەی وەڕاست گەڕا: Orest تۆلەی باوکی دەکاتەوەو دایکی خۆی دەکوژێت. ئێمە Kassandra مان دەمکوت کرد.

ئەوان سەعاتی پێش خۆرھەڵاتن. سەعاتی کوشتنەکە. ئەو سەعاتەی تێیدا لەرز دەتگرێت، دەزانم. لێفەیەکت دەوێت؟ سەعاتی لێکدابڕان و دواماڵاوایی. لەم سەعاتەدا ماسیگرەکەم بۆ سەر وشکانیی ئەمبەر، گێڕامییەوە.

تۆ بۆیە توانیت سەرکردایەتی شەڕەکان بکەیت، چونکە خەڵکانی تر کێڵگەکانتیان بۆ بەرھەمھێنایت، دانەوێڵەیان بۆ خڕکردیتەوە، ترێیان بۆ کردیتە شەراب، ماسییان ڕاوکرد ھەتا دەرخواردی ژن و منداڵانی بدەن، ئیدی بۆ دەبێ سەرتان سوڕبمێنێت کاتێك منداڵەکانتان لە پیاوانی تر بن؟ دەیباشە چی حیسابە، ئاگامێمنون، تۆ بێژە، چ حسابە؟ ژمارەی ئەو کوژراوانەی کە تۆ جێیاندێڵیت؟ یان ئەو کوڕانەی کە لەتۆماوی تۆن؟ ھەرکەسێك کە ڕمێکی ھەبێت، دەتوانێ بکوژێت. ھەموو پیاوێك دەتوانێت منداڵ دروست بکات.

دەڵێن گوایە مردوو پاش مردنی بۆ ماوەی سەعاتێك قسەی دەوروبەری خۆی دەبیستێت. کەواتە باش گوێبگرە! Elcktra .Agisthی کچمان بە جووتیارێکی باش و گوێڕایەڵ بەشوو دەدات، کە پیرەو ئیتر منداڵی لێناکەوێتەوە، Elektra داوای حەقبەشی خۆی لە Mykene ناکات، بەڵام داوای تۆڵە دەکات. Igiphigenie کە تۆ کردتە قوربانی و Artemis ڕزگاریکرد، ئێستا لەمیحرابی خوادا زێوانە، ئەو بەرخێکی هێورو لەسەرخۆ بوو، وەلێ تۆ وەکو حەیوانێك کردتە قوربانی، کیژی سێھەممان، Chrysosthemisی ناسك و نازدار، ھیچ ترسم لێی نییە، منداڵێکی بێدەنگو ڕووخۆشە کە تۆ بەئاستەم دەیناسیت. دەمێنێتەوە Orest کە نائارام و بێ ئۆقرەیە. مرۆڤە نائارام و بێ ئۆقرەکان ترسناکن. تۆ دەتگوت: لای بنەماڵەی ئێمە تەنیا یەك شت ھەیە، بکوژیت یان بکوژرێیت، یەکەم ئەمیان و پاشان ئەویان. ئێستاش ھەر ویستی خواکان دەکەیتە بەھانە؟ ئەی شانازییەکەت کوا، پاشای شانازیکەری نیشتمانەکەت؟

بۆچی ناڵێیت ئیرادەو ویستی خۆم بوو. ئەز ویستم تۆڵە بکەمەوە. ئەز ویستم وڵات داگیربکەم. ئەز حەزم لەشەڕەو چێژی لێوەردەگرم. ئەز ویستم کچی پاشای تەروادە لەبەرپێی خۆمدا ببینم! تۆ پێویستت بەوەیە کە ژنانی کۆیلەت لەدەوروپشت بن نەك شاژن. گوایە ئەمانە ھەمووی ویستی خواکانن؟ خوداکانن بەھانەو بیانووی پاشاکان! ئەوانە لەشەڕو پێکدادانەکاندا دەگلێن و دەگەوزێن. ئازاو جوامێرەکانن. ئەمە قسەی خۆتانە. کاتێك تەروادەییەکان ڕمەکانیان دەھاویژت، جەنابت لەکوێ بوویت؟ لەبری جەنابت کێ کەوتو گەوزا؟ چۆنە وا بەساغی گەڕاویتەوە؟

ئێستا ئیتر لەتۆ چی دەمێنێتەوە؟ دوو مشت خۆڵەمێش، پارچە وردو خاشەکان، دەروازەی نێوان دوو شێرەکە. گۆڕێ ئاگامێمنون. تۆ نەمریت دەوێ. بەڵام ئەز دەمەوێت بمرم. دەمەوێت لەبیربچمەوە. با ناوی کلیۆمنسترا بەزاری کەسدا نەیەت.

لەم دەڤەرەدا وا باوە: کاتێك لەناپاککاری و گوناھی یەکێك دەبووردرێت، کشتەکێك لە دەنکە قەزوان لەدەوری تەوێڵی دەبەسترێت. چڵی دار قەزوانێکم لەسەر جێگای خەومان دانا، تا باش بزانیت کە ھەموو شتێکیان بۆ درکاندبووم و لێشت خۆش بووم. باخێکم لە دار قەزوان بۆ بە ھەدەر دایت! بەیادی بێنەرەوە! ڕمەکەتم بەگوڵی یاسەمین داپۆشی و ڕازاندمەوە تا نەوەکو لەگزنگی بەیاندا بەیەکەم تاڤی ھەتاو بریسکە بداتو لەخەوت ڕاتپەڕێنێ. دێر ھەستایتو

رابوویت، ساتێك بەرمی گوڵرێژەوە لەژوورەکەم چوویتە دەرێ، هەموو خەڵك لە قاقای پێکەنینیان‌دا. ئاخر لەم دەڤەرەی تۆدا خەڵك زوو زوو پێناکەنن.

ئەز دەبێ چ بکەم؟ خواکانت داوای چیم لێدەکەن؟ چییان لێم دەوێت؟ خۆکوشتن؟ پەژیوانی؟ چما پەژیوانی؟ لەبەر ئەوەی یەکەم مێردمت کوشت، کە من هێشتا تازە دەگەیشتمێ؟ هەروەها منداڵە نۆبەرەکەم؟ بۆ ئەوەی کە Ipkigenicای کچمت لێسەندم؟ یان بۆ ئەوەی دەساڵان رۆشتیتو بە جێتهێشتم؟ دڵسۆزیو پابەندیی ئەو ژنەی کە تۆی خۆش ناوێت، چ سوودێکی هەیە؟ منو تۆ لەیەك گۆڕداو پێکەوە درێژ نابین. با Kasandraی جوانی لەتەرواده فرێنراو لەبەرپێتدا بنێژن.

چەندە حەزت لە: مەمکۆلانی گچکەو توندوتۆڵ، پێی ناسكو نەرم نۆڵ، پلوپۆی رێکو جوان بوو. چما خۆت هێندە جوانیت ئاغا مێمنونی پیرو کاڵ؟ ورگی قورسو داچەکاو، پشتملی ئەستورت چەوریو بەز، لاقەکانت بەدووی خۆتدا رادەکێشیت، دەستو مەچەکی هێز لێبڕاوت تەکەیان دێ. لاقە کەچو گێرەکانت لەقاڵب درابوون. پێت وایە ئەز بە مانەم نەزانیبوو؟ ئەز دەمودەست نەمبینین، بەڵام کاتێك کە بینیمن، هێشتا دەستم لەوە هەڵنەگرت کە هاوسەرەکەم خۆش بوێت. ئەز پرسیار دەکەم: کامە ژن دەتوانێت لەمەڕ خۆیەوەو دەربارەی خۆی بڵێت کە هەرگیز بیری لەکوشتن نەکردووەتەوە، هەرگیز خەونی بەکوشتنەوە نەدیتووە؟ ئەو ژنە درۆ دەکات! ئەز دەڵێم. پێش ئەوە بمکەیتە مرۆڤکوژ، سەدجاران بیرم لە کوشتن کردوەتەوە. گوناهەکەی لە ئەستۆی تۆدایە.

ئاوێنەکەم- ئەوە ئەز! ئەزی من، کە هی خۆمە. کە بەرەو تەرواده ملت نا، ئاوێنەکەت لێسەندم. بێ ئاوێنە- بێ خۆشەویستی؟ پیاوێکی تر ئاوێنەیەکی تری بەدیاری پێدام. رووخسارم رووتو قوتە، تۆ هەرگیز بەم جۆرە منت نەدیوە. خەڵك چاوەڕێی ئەوە لە شاژنێك دەکەن کە رووی خۆی ئارایشت بکات، کە رووی راستەقینەی خۆی نیشان نەدات، مەگەر خێزانەکەی لەپرسەو ماتەمینیدا بێت. بنەماڵەکەی تۆ هەمیشە لەپرسەو ماتەمینیدایە. ئێستا خۆم ئارایشت دەکەم ئاگامێمنون! هەتا نیشانی بدەم کە پرسەت بۆ ناگرم. ئەو مەمکدانە دەبەستم کە مەمکانم قوت رادەگرێت، ئەو جلو بەرگە هەڵدەبژێرم کە بەکچێنی لەبەرم دەکردن، ئەو جلەی کە درزێکی درێژی تا سەرەوە تێدا بوو.

لاقەکانم تا ژوور ئەژنۆم رووتن. ئەز بەزم پەیدا کردووەو قەڵەوم. هەرگیز منت بەگریانەوە نەدیتوە ئاگامێمنونی پیر! هەنووکە ئەسرینم دەبینیت. ئەز بۆ کلۆڵی خۆم دەگریم. تۆ ناتوانیت چی دی چاوانت لێکبنێیت. چاك بنوارە! سەردەمێك دێت کە ژنان دەنگی نارەزاییان بڵند بکەن، ئەوجا کەس داوای ئەوەیان لێناکات کە بەجوانیو لاوی بمێننەوە. ئەمەی داوای دەکەن نە خاسیو چاکەیەو نە بلیمەتیو لێهاتوویی.

دەبوایە Agisth منی فڕاندبا، وەك چۆن Parisی شازادەی تەرواده هێلینای خوشکمی فراند. ئەز ئەوەندەی هێلینا جوان نەبووم؟ جوانیی من ئەوەی نەدەهێنا شەڕی لەسەر بەرپا ببێت؟ ئێستا ئەز چی بکەمو چارم چییە.؟ پرسیار لەخواخان بکەم؟ بەڵام خۆ خواکان لەگەڵ ژناندا ناتاخەفێن، با.. خۆ ئێوەش بەمە

باوەڕدەکەن! ئەز بۆ ئەوە نوێژم کرد کە توندەبا بنیشێتەوەو بەلەمەکانتان نەگەنە تەروادە.

پێم دەڵێن گوایە نوێژەکەم بەکامی دڵ نەکردووە. بگەڕێمەوە لای شوانەیاری پێشینمو لەگەڵیا چاودێری بزنەکان بکەم؟ بەڵام خەڵکی هەر زوو دەمبیننەوە. ئەوان پێویستیان بە من هەیە وەك شایەتێك.

پاڵەوانی ناودار ئاگامێمنون بەخۆیو چاوانی ئاگرینییەوە! ئێستا کێ پێڵوی چاوانت بۆ لێکبنێت؟ Kassandra مردووە. Elektraی کچت؟ یان ئەز؟ ئەو کاتانەی کە خەونم پێوە دەبینیت- با.. با.. راست دەبیستیت ئاگامێمنون!، ئەز خەونم بەتۆوە دەبینی- کە رمەکەت هەڵگرتبوو. هەردوو رمەکەت؛ لەیادت ماوە؟ کە دەتویست یەکێکیان بەکاربێنیت، ئەوی تریانت دادەنا. بەشەو ئەمیانو کە رۆژ دەبوویەوە ئەوی تریان، با... ئاگامێمنون! با.. ئێستا هەردووکیان درێژبوونو کەوتوون.

هەر دەبوو بخنکێنرێیت بۆ ئەوەی گوێم لێبگریتو بۆ کلیۆمنسترا کاتێك تەرخان بکەیت. ئەز تەڵقینت دادەم، باش گوێ بگرە! ئەوەی پێشتر ئەنجامو چارەنووسی شەڕەکانی دەسنیشان کردووە "زۆیس" خۆیەتی. ئەمەت لە بیرکرد ئەی پاشای شانازیو بەهکەری- Mykene.؟ وای لەم ملکەچیو داماویو بێدەسەڵاتییەی ئەو پیاوەی خولیاو سەرخۆشی دەسەڵاتو فەرمانڕەواییە. تۆ پێکەرو دەسکەلایتو بەس. کەوابێت خەڵك بۆچی شکاتم لێدەکەن؟ ئەز تەنیا ئەوەم کرد کە خواکانت گەرەکیان بوو! ئەز ناتوانم چاوەڕێ بکەم. ئەز بەکەڵکی بێوەژنکۆشی نایەم. لەوانە بوو لەشەڕەکاندا بکوژرابایت، بۆیە هێندە فرمێسکم هەبوون، ئەگەری کوژرانت پێی باراندم. ئێستا تۆ پیرەمێردێکیت. کاتێك گەڕایتەوەو بینیمیت، هیچ بەزەییم بۆت نەبزووا. Kassandra لە هەمان عەرەبانەدا لەبەرپێتدا دانیشتبوو، جنێوو نزا. بەدەکانی بەدەوری خۆیدا دەپرژاندن. تەختی خەوەکەت دەسالان خاڵیو چۆڵ نەبوو. پیاوێکی تر گەرمی دەکردەوە.

هەر کە رۆژ بەسەر بەرزاییو گردەکانەوە هەڵهات، دەمامکە زێرینەکەت لەسەر دەکەن. زەرەنگەرەکەت دێتەوە یاد؟ زۆر لە بەرامبەرتا دانیشتو لەناخت وردبوویەوەو چوویە نێو ناختەوە. ئەو پێشبینی کردو تۆی بۆ هەمووان دەرخست. ئەز هەتا گەڕانەوەت، هەتا مردنت، دەبوو دەمامکەت بۆ هەڵگرمو بیپارێزم. گەلێك جاران لەئامێزمدا دامدەناو قسەم لەگەڵ دەکرد. وەك چۆن ئێستا لەگەڵ خۆتدا دەدوێم. جاران هێشتا ردێنت بەرنەدابۆوە. لەتەڕوادە سەرتاش قاتی بوو؟ ویستت بەدڵی Kassandra بێت؟ بۆ ئەوەی ژێر چەناگەی چرچو لۆچتی پێ بشاریتەوەو نەیبینێ؟ چوونکی گوێ زۆر شلدەکەیتو دەتەوێ هەموو شت ببیستیت، گوێچکەکانت رەپ راوەستاون. دەڵێن: ئەوی زۆر گوێقوڵاخ بێت، ئەوە ترسی هەیەو هەر بۆیەش گوێیەکانی وا گەورە دەبن.

گۆڕەکەت ئامادەیە، ئەشکەوتێکە بۆ زەبەلاحان. هەموو ئەو شتانەی دروستیان کردن، لەبەر زۆر گەورەییان بۆ مرۆڤ نەدەشیان. شوراکانی Mykeneتان هێند سەختو پتەو دروستکردن، کە هاوارەکان، هاوارەکانی من، نەیانتوانی بیانبڕنو ئاودیوی ئەودیو ببن. خۆرەتاو هۆڵەکانی کۆشك رووناکو گەرم ناکاتەوە. لەسەرما لەرزت لێهاتووە ئاگامێمنون؟ گەلێك جار شانازیو بەهت دەکردو خۆت هەڵدەکێشا: ئەز لەکانزام. دەباشە ژەنگ هەڵێنە.

ژەنگیش دادەڕزێو هەڵدەوەرێت. ئەز دەمەوێت ببمە خاکو خۆڵ. نە وێنەیەکی کلیۆمنسترا، نە دەمامکێك تەنیا هەواڵێك، تارماییەك کە خۆی بەسەر Mykeneدا دەکێشێت. تۆ بچوکیت ئاگامێمنون، ئایا دەتزانی کە هێندە بچوکیت؟

لەگۆڕەکەتدا کە لەشێوەی Phallus(5) دەچێت، ترس دەتگرێت. وا دەزانیت خەڵك ئەو Fallus ە ناناسێتەوە کە بەم زووانە دەبیتە دیلی؟ لەسەر گردۆلکەکە گژوگیا شین بووە. دوێنێ لەوێ بووم. بەیبوونو گوڵاڵە سوورە گەشاوەنەتەوەو خەڵك بەسەرتدا دێنو تێدەپەڕن. شەمشەمەکوێران لەگۆڕەکەتدا جێ بۆ خۆیان چێدەکەن. کاساندرای یارت پێشبینی ئەمەی بۆ نەکردیت؟ مشکو جرج، پاشتریش شوانەکان لەکاتی هەورە تریشقەدا، گۆڕەکەت دەکەنە پەناگای خۆیان. گۆڕەکەت سەرسامیان دەکاتو موچڕك بە لەشیاندا دێنێ، ئینجا مەڕو بزنەکان بەکۆمەڵ بە پرتاو خۆیان دەکەن بەناو دەرگای مەزارەکەتدا، بەپێستە چەورەکەیان دیوارەکانی دەکرێننو سافو لوسی دەکەن.

پەزەکان بەسەرتدا دەڕێن، ئاگامێمنون! شوانەکان لەبەر تاریکیو سەرما، ئاگر دەکەنەوە. لەژێر تەپو تۆزو پشقلدا مرۆڤ تەنیا دەمامکەکەت دەبینێت. خواکان پیلانی چی بۆ کلیۆمنسترا دەڕێژن؟ یەکێك لەبەرزایی زنارێکەوە تۆڕەکەی دەهاوێتە نێو زەریاکە؟ هەورە تریشقەیەك لێیدەداو دەیکوژێت؟

ماسییەکان ورد ورد گۆشتەکەم دەکرۆژن، یان داڵەکان بە دەنووك کەلاکم هەلا هەلا دەکەن؟ لێوەکانم؟ چاوەکانم؟ کرمە گۆشتخۆرەکان دەوری دەستو پەلم دەدەنو لێی دەمرۆکێن؟

کە هێشتا هەرزەکار بووم بازنێکت لەشێوەی ماردا بەدیاری پێدام، چاوەکانی دوو نقێمی سووری پێوە بوو. ئەو بازنە ئێستا لەبنی زەریاکەدا کەوتووە، لەو شوێنەی کە زۆر لەو گاشە بەردە دوور نییە کە گەلێك جار لەسەری دەوەستامو چاوەڕێم دەکرد. خەڵك، هەر ماسییەکی لەو شوێنەدا راوبکرێت نایخوات، چونکە بەگۆشتی کلیۆمنسترا ژەهراوی بووە.

رقو کینەم ئەم دەڤەرە ژەهراوی دەکات. ئایا هەنگە کێویلەکان قەدەغە دەکرێن لەوەی بێنە نێو گۆڕەکەمەوە؟ ئایا شانەی هەنگوین بە زۆر لەدەستی زارۆکان دەسەنن: نابێت بیخۆیت، هەنگوینێکی تاڵە، دەمریت! بەرقو کینەی کلیۆمنسترا ژەهراوی بووە. ئەرێ Kassandra چی تری گوت؟

لەهەر شوێنێك رقو وێرانکاری باو بێت، تەڤ هەڤیو بێ سەروبەری لەئارادایە. ئەو جۆگەیەی گەلێك جار لێی پەڕیومەتەوە، چۆڕبڕ دەبێو پڕ دەبێتەوە. هەورە تریشقان دەکەونە وێرانکردنو زەمین دەهێنرێتە هەژانو لەرزین. Mykene لەناو گڕو کلپەو زووانەی ئاگردا، لە ناودارو پەردووی وێرانیدا.

بەدایەنەکەم دەڵێم: لەکاتی ناشتندا با روخسارو تەوێڵم لەسەر خۆڵەکە دابنێن، گەڕانەوە بۆ ئامێزی پڕ بەزەییو میهرەبانی خاکو خۆڵی دایك، کاتێك منو تۆ هەردووکمان مردین، ئاگامێمنون! بکوژ و کوژراو، ئینجا حیسابمان پاك دەبێتەوەو حەق بەحەقین.

وا دونیا وردە وردە رۆشن دەبێتەوە. گزنگ هەواڵی خۆرهەڵاتن دەگەیەنێت. دەمامکەکەت هەڵگرە ئاگامێمنون. ئەزیش ئەوی خۆم هەڵدەگرم.

*پەراوێزەکان:*

1–هـایل، زیگ: دوو وشـەی ئـەڵمانین کـە بـەمانای مووقەدەسو سەرکەوتن دێنو کـاتی خـۆی سـەدان هـەزار ئەڵمانی لەکۆڕە جەماوەریـەکاندا، بـەخێرهاتنی هیتلـەرین پێدەکرد.

2–زۆیس: بەرزترینو بەدەسەڵاتترین خودا لەئەفسانە یۆنانییەکاندا.

3–Agora: گۆڕەپـانی کۆبوونـەوەی پیـاوان بـووە لـە یۆنانی کۆنـدا، کـە تێیـدا ئـاڵوگۆڕو دانوستـانی ئـابووری، کۆمەڵایەتییو راو بۆچوونی فیکریو سیاسی تیا کراوە.

4–Kassandra: کچی پاشای تەروادە بوو.

5–Phallus: کێری هەستاو کە سیمبۆلی هـێزو توانـای جەستەییو مناڵدروستکردنە لەپیاودا.

– 3 –

## ئەگەر بەقسە دەرتببڕیایە هۆ دێسدێمۆنا!

## "دوا چارەکە سەعات لەژووری خەوی "ئۆتێلۆ"ی سەرداری شەڕدا!"

*ناساندن:*

فانتازیــای ئــەم مۆنۆلۆگــەی نووســەر لەشانۆگەری "ئۆتێلۆ Othello" قولـە رەشـەکەی ڤینیســیا"ی شکســپێرەوە، هەڵــهێنجراوەو هۆنراوەتەوە. ئۆتێلۆ لەو شانۆگەرییەدا، بـەهۆی خانەگومانیو دڵپیسی لە ژنەکەی کە دێسدێمۆنا "Desdemona"ی نـاوە، دەیکوژێو پاشـان کـە پـاکیو بێگـەردیی ژنەکـەیی بـۆ ئاشکرا دەبێـت، خۆشی دەکوژێت!".

* * *

**پێشگوتن:** بێدەنگبە، ورتەت نەیە!.. نا ئۆتێلۆ، نا، بێدەنگ نابم، ئا لێرە لەژووری خەوماندا، بـۆم هەیە وەك تۆ قسان بکەم. دەتــەوێت جێگـای خۆشەویستمان بکەیتـە مـەیدانی شـەڕ؟ هـەموو شتەکان دەبێت بـە خوێـن دواییـان بێـت.؟ تـۆ سـەردارێکی شـەڕیت، ئێسـتا دەتـەوێت ببیتـە پیاوکوژ؟

خەنجەرەکەت دانێ ئۆتێلۆ! دەستم بۆ مەبە! ئائەمە دوایین کاری پاڵەوانانەت دەبێت؟

ئەو ژنە بکوژیت کە خۆشی دەوێیتو لەیەکەم هەناسەوە تا دوا هەناسە بەوەفا بووە بۆت؟ ژنێك کە نـاتوانێت بـەرگری لـەخۆی بکـات؟. چارەکـە سـەعاتێکی تـر دەتوانیـت بمکوژیـت، بـا ئـەم چارەکە سەعاتە بۆ مـن بێـت، تکـات لێدەکـەم!. من هەموو ژیانی خۆم پێشکەشی تـۆ کـرد. تـۆش چارەکە سەعاتێکم بەدیاری بـدەرێ. ئێستا رژدو چروك مەبە. زللـەت لـەو کولمـەیدا کـە گـەلێك جـاران بـەماچان داتدەپۆشـی!. شـەپازلەت لەژنێکی ڤینیسیا دا. بەراست تۆ کێیـت کـە رێـت پێدەدرێـت کـاری وەهـا بکـەیت؟ هـەر تـەنێ دەسـتانت هـەن. هـەر تـەنێ بەدەسـتانت بیردەکەیـەوەو شـعور و هەسـتت دەردەبڕیـت: ئـەها، ئـەوها دەیانکەیتـە مشـتەکۆڵە!. ئـەو دەستانە، هەمانن کە جاران بـەنازەوە لەگـەردنو ملت دەئاڵاندن؟.

دەستم بە دامێنت ئۆتێلۆ، هێزو توانات بۆ ناو دڵو کەللە سەرت بگـێڕەوە. مـرۆڤ بەمشـتەکۆڵە بەهیچ ناگات، سەردارێکی شەڕیش!.

ئـا لـەم سـەرە مـەزنو جوانـەدا هـەر هێنـدە هۆشو ئەقڵی تێدایە؟. ئـا لـەم جەستە گـەورەو جوانـەدا دڵێکی ئـەوەندە گچکە؟. تـۆ بـە کوتـە پەڕۆیــەك هەڵخڵــەتاویت کــە مــرۆڤ بــۆ کەپوپاککردنەوە، تەوێڵ وشـککردنەوەو ئەسرین سڕین بـەکاریدێنێت. گوایـە مـن کوتاڵفرۆشـێکمو کـەتانچنێکم کردووەتـە پیـاوی خـۆم؟. بـاوکت

دەسرۆکەکەی دابوویە دایکتو تۆش وەکو دیاریی بوکێنی بەمن، لەوەی زیاتر هیچی وات بۆ بەخشین نەبوو. من بەناز بەخێو کرابووم. ئۆتێلۆ. دەسرۆکەکەم هەلگرتو پاراستم، لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ "قوبروس".

دەبوا باشتری هەلگرمو بیپارێزم؟ دەشیا پێشبینیم کردبا کە کەسێك لیمی دەدزێت؟. لەکاتێکدا کە لە ماڵەکەتدا بەبازنەدزان ئابلۆقە درابووم. دەبا بمزانیبا ئەم رەهنی خۆشەویستییە دژی خۆم بە کاردێنیت؟. من خۆشباوەڕ بووم ئۆتێلۆ، خۆشبڕوا بووم!، کە نەمزانی پارچە کوتاڵێك بەسە بۆ ئەوەی تاوانی بێوەفاییم لە ئەستۆ بنێی.. بیدەیتە پاڵ من.. دێسدێمۆنا!.

ئەگەر گوناهبار بم، مردنم خانەگومانیی تۆ کەمناکاتەوە، بەلام من بێگوناهم، هەموو گوناهەکەش دەکەوێتە سەر تۆ. دوای مردنی من ناتوانیت درێژە بە ژیان بدەیت، هەر خۆیشت ناتەوێ.

ئاخ!.. ئەگەر باوکم بە کۆت و زنجیر شەتەکی بداماییەو لەپشت شیشی زینداندا توندی بکردمایە، کۆتو زنجیرەکانم دەپساندو شیشەکانم دەچەماندنەوە، تا رەدووی ئەو کەسە بکەوم کە خۆشمویست.. سپیایی بێگەردی چاوانت چاوانمی بەشەوارە خستبوو.

پێستت قاوەیی بوو وەك موسکات. لەهیچ کەسانێك نەدەچوویت کە پێشتر بینیبوومن. گشت ڤینیسیاییەکان لەبەرامبەرتا رەنگپەڕیو و ناساغ دیار بوون.

کە یەکەمجار کارە پاڵەوانییەکانت بۆ گێڕامەوە، هەناسەی قوڵو ساردم هەلکێشاو گریاشم. سەرسوڕماوت بووم، داخیشم بۆ خواردیتو ئیرەییشم پێبردیت. دڵم پڕبوو لەبەزەیی و هەمان کات لە ئیرەییش. ئەو دەمە خۆزگەم بەپیاو دەخواست. خۆزگەم دەخواست پیاوبامو دژی گشت دوژمنانی ڤینیسیا بجەنگابام. بەلام من تەنیا کیژێك بووم لە رەچەڵەکو پەروەردەیەکی باش. کە جوانیو ناسك هەستیم پێبەخشرابوو، تۆش بیانییەك بوویتو وەك پاڵەوانێك بەدیار دەکەوتیت. بەڵگەکانی خۆشەویستییم بۆت بەسنەبوون؟

بەوەی کە ئیدیعا دەکەیت گوایە دیسدێمۆنا لەگەڵتدا پاکو بەوەفا نەبووە، ئەو کەسە بریندار دەکەیتو دەیشکێنی کە دێسدێمۆنا خۆشیدەویست. وا دەزانیت کە پیاوێکی وەك "کازێو" جێگای تۆم بۆ دەگرێتەوە؟ تۆ بەهای خۆت نازانیت، ئۆتێلۆ؟ خۆشەویستیم بۆت بەنرخترى نەکردیت؟. نەتتوانیبوو هەموو بەیانییەك بڵێیت دێسدێمۆنا خۆشیدەوێم!، دێسدێمۆنا رێزم لێدەگرێت "قەدرم دەزانێت!"، کیژی ئەندامێکی ئەنجومەنی پارێزگاری شاری ڤینیسیا. خۆشەویستیی خۆمم لەبەردەم فەرمانڕەوای حکومەتی ڤینیسیادا، بێ چەندو چون پێڕانەگەیاندی؟. رەدووت نەکەوتم بۆ ئەم وڵاتە دوورە، دوور لەڤینیسیا، دوور لە کچۆڵانی هاوگەمەم، دوور لەباوکم کە تا ئێستاش عاجزو توڕەیە لێم. یان دەتەوێت هەمان سوێندە بەدەکەی باوکم کە گوایە خیانەتم لەو کردووە، بێتەدیو گوایە هەمان شتیشم لەتەك تۆشدا کردووە؟.

ئێستا هیچ ـەڵێ! با قسەکانم تەواو بکەم. دەبووایە توندتر باوەشم پێتدا بکردایە. هەموو ئێوارانێك سەرلەنوێ پێتم بگوتایە: تۆ ئەو

کەسەی دێسدێمۆنا خۆشیدەوێیت؟ پێستە تۆخەکەتی خۆشدەوێت کە وەك لمی کەناری قوبروسە. بمچپاندایە بەگوێتدا وەك چۆن کەنیزەکەکان دەچپێنن؟. کەس فێری نەکردووم تا لەمەڕ هەستو شعورم بدوێمو دەریانببڕم. "ژن دەبێ خۆ نەهێنێتە پێشەوەو کەمدوو و بێ سەروسەودا بێت". ئای ئەمە چ بێئەقڵییەکەو دەبێت چ ئەنجامێکی کوشندەی بەدوادا بێت؟!.

دەبوایە هەموو رۆژێ سەرلەنوێ پاڵەوانکاریەکانتم پەسەندو ستاییش بکردایەن؟. ناوی شەڕەکانتم بۆت بوتایەتەوە؟.

پیاوێکی بەهێزم هەڵبژاردو، ئەمێستاش چەند لاوازی ئۆتێلۆ. دڵم لێوانلێوە لەبەزەیی بۆ تۆ. من چید ئیرەییت پێنابەم. قامکەکانت لەیەکدی بڵاو دەکەیەوە؟، بەزەی منت ناوێ؟

راوەستە لەشوێنی خۆتدا!. یەك هەنگاوی تر نەهاویت!. دەتەوێت دەست لەگەردنو بینم بنێی؟ هاواری کەس ناکەم تا بێتە فریام. بەڵام بەدەنگی بەرز دەدوێم، وا دیارە تۆ کەرییت. ئەوی من دەمەوێت بیڵێم گشت کەس بۆی هەیە گوێی لێبێت. یان وا دیارە تەنیا بەوە باوەڕدەکەیت کە ئەوانی تر بەگوێتدا دەیچپێنن؟ بۆچی رەپو رەوان گشت پرسیارەکان لەخۆم ناکەیت؟. مرۆڤ نابێ قسە لەسەر یەکێکی دی بکات، دەبێ قسەی لەگەڵدا بکات!.

لەبری ئەوەی لەگەڵ دوژمنتدا -من ئێستا دوژمنی تۆم- بناخافێی پەلاماری چەکی لێدەدەیت.

هەر کەسێك لەسەر شۆستەو لەنێو کۆڵاناندا چپەیەکت بۆ بکات، بڕوای پێدەکەیت. پرسیار لەکارەکەرەکەم بکە کە ژنی "ژاگۆس"ە، لەوانەیە ئەو بەدزیەوە دەسڕۆکەکەی کردبێتە گیرفانی "کازێو". ئەم "کازێو"ە تەنانەت بۆ جارێکیش ناوی منی هێناوە؟ لە پەیوەند بە شتێك نەباشو ناشایستەدا؟. باشی بیر لێبکەوە ئۆتێلۆ، دە دەقیقە ماوە.. پرسیار لەمێشکت بکە، پرسیار لەدڵت بکە. لەوانەیە ئەمە کەتنو کاری "ژاگۆ" بێت چونکە ئیرەیی بەو دەسەڵاتو بەختیارییە دەبات کە هەتە. ئەو هەر لەسەرەتاوە کاری بەدو خەراپی سازکرد. لەمەڕ "مرۆڤناسی" هیچ زانیارییەکت نییە؟. لەپاکیی و بێگەردیی خۆتە وا خۆشباوەڕو گەوجیت؟. ژاگۆ، کازێوی گوێڕایەڵی کردە مشەوبخۆر، کازێو گوێڕایەڵەو دۆستێکی بەوەفای تۆیە، یارەکەشی "بیانکار" ناوێکە، جگە لە تۆ هەموو کەس ئەمە دەزانێت. بۆچی تۆ وەك پیاوێك بەرەوڕوو پرسیارت لەخۆی نەکرد؟.

ژاگۆ، ئەوی کازێوی کردە مشەوبخۆر. ژاگۆ لەتۆ خێراترە. زیرەکتریشە، ئەگەر کەڵەکچییەتیو فێڵبازی بەزیرەکی لە قەڵەمبدرێت. ئەو رکی لەتۆو کازێو دەبێتەوە. تۆ کازێوت لە ژاگۆ پێ نزیکو باشترە. ئەوەی کە کازێو رقی لەمنیشە، نەمدەزانی. ئەو لاوازییەکانی ئەوان دەناسێو سودی خۆی لێیان وەردەگرێ، لاوازیی کازێو مەی بوو، هی تۆش خانەگومانی. ئەرێ، ئەرێ ئۆتێلۆ، خانەگومانی لاوازییە، لاوازیی منیش ئەوە بوو کە زیاد لەپێویست پشتم بە خۆشەویستییەکەمان بەستبوو.

ئۆتێلۆو دێسدیمۆنا. دوو گەورە ئاشق!. ئەمە دوا ئامانجی بەرزو شانازیو غروری من بوو. دێسدێمۆنای سپیو ئۆتێلۆی رەشپێست. بەهەڵەدا چووبووم کە بەباشم زانی دلۆڤانیم

پێشکەشی ئەم پیاوە بیبانییە کرد، بەبێ گوێپێدانو لەبەرچاوگرتنی گشتێ لەمپەرو تەگەرەکان.

قارەمانی بەناوبانگی مەیدانەکانی جەنگ "ئۆتێلۆ" لەلایەن فەرمانڕەوای ڤینیسیاوە دەنێردرێت بۆ قوبروس بۆ پاراستنی دوورگەکەو ڤینیسیا لەتورکان. دێسدێمۆنای ئازاو بەجەرگیش لاقو تکا لەفەرمانڕەوا دەکات تا لەگەڵ ئۆتێلۆدا، وەك کەنیزەکێك ڕێگەی ڕۆیشتنی بدەن. من دانی پێدادەنێم کە ئەمە تەنیا خۆشەویستی نەبوو، بگرە لەخۆبایبوونیشی تێدا بوو، ئا لێرەدا بەلاوازیو گوناهی منیش.

ئەشقو خۆشەویستییەکەمان لە کۆسپو لەمپەرەکان بێپەروا بوو، دەبێ هەر ئێستا خۆی بسەلمێنێت. لێتدەپرسم: دەتەوێت وەکو مرۆڤکوژێك بچیتە نێو مێژوو؟!.. دەزانیت چی چاوەڕێت دەکات؟.. فەرمانڕەوا دەنێرێت بە شوێنتدا بۆ ڤینیسیاو دەتداتە دادگا، ئەگەر تا ئەوسات پیاوانی باوکم تۆڵەمیان نەسەندبوو.

ئۆتێلۆ!. ئەگەر کەڕیت، ئەگەر لەوشەکانم تێناگەیت، ئەگەر لەزمانی چاوانم، لەنیگام حاڵ نابیت، خۆ هێشتا لەزمانی دەستەکانم حاڵی دەبیت.. ها؟

بڵا، لێگەڕێ پەنجەکانم لەگەڵ پەنجەکانتدا، لێوەکانم لەتەك لێوەکانتدا بدوێن. کە چیتر باوەڕ بە وشەکان ناکەیت، دە باوەڕ بە ڕاستگۆییو ڕاستیی نیگاو سەرنجەکانم، هەردوو شانمو دەستەکانم بکە.

دەڵێن: ئەوی فرەتر یارەکەی خۆشدەوێت، فرەتریش ئێشو ئازار دەچێژێت. هێشتا من تۆم کەم خۆشویست؟ تۆ کێیت کە ڕێگای دادگایکردنت پێدەدرێت؟!.

ڕسیت داخۆ نوێژی شێوانم خوێندووە. بەڵێ ئۆتێلۆ وەکو هەموو شەوانێ نوێژم خوێند. گەلێك جارانو هەر زۆر زۆر، بێئەوەی لە ئایەتەکان رابمێنمو بیریان لێبکەمەوە، لەنوێژدا جوویمنو جوویمنەوە، و نەمزانی کە جارێك لەجاران ئاوەها بۆ کۆمەکی یەکێك دادەمێنم. لەهەموو مەترسییەکاندا ئۆتێلۆ دەمپارێزێ!، ئا ئەوە بوو سەبوورییەکەم. بەهۆی تۆوە باوکم لەم دونیا قاوی دامو لەخۆیی بێبەریکردم. تۆ شارەزای دەستووری ئایینەکەم -مەسیحیەت- نیت. من لەجیهانی خۆمدا ژیاومو تۆش لەهی خۆت. هیچکامان دەرفەتمان بۆ یەکتر نەڕەخساند تا بچێتە ناوەوەی ئەویتر. کەسمان لەدەرگای جیهانی ئەویترمانی نەدا. بەڵام من هەموو شەوانێ نوێژی خۆمم دەکرد: ئۆتێلۆ بپارێزە!، وەك فەرمانێك بەسەر خوادا دەنگیدەدایەوە، دەبوایە لەگەڵ تۆدا نوێژم بکردایە: هەردووکمان بپارێزە!. دەبوو دەستووری ئاینەکەمانم فێرکردیتایە. ئێمە کە نوێژ دەکەین: پەروەردگار، ئێوە چ بخوازن ڕوو دەدات!. بەڵام دەشێ ئەمە ویستی خوا بێت کە کەسێك من دەکوژێتو منیشی لەسەروو هەمووانەوە خۆشتر دەوێت. تۆ لەپێش چاوانم لەقەوارەی سروشتیی خۆت مەزنتر بوویت، مەزنتر لەهەموو خەڵك. تۆم لەسەر سەکۆیەکی بڵند داناو پاڵەوانێك، خوایەکم لێ خولقاندی!.

ڕووسوور هەڵگەڕاویتو تووڕەبییت ڕەویوەتەوە، ئۆتێلۆ. لەژێر پێستە تاریکەکەتەوە ڕەنگت پەڕیوەو زەرد هەڵگەڕاویت. تۆیش

پیاوێکیت وەکو پیاوانی تر. دڵناسکیتو زوو بریندار دەبیت، و منیش دەگریم، چونکە ئەوە گوناهی منە کە تۆ وەك دڵشکاو و دڵزامارێك لە پێشمدا راوەستاوی. وەلێ خۆت گچکەتر مەکەرەوە!، ئەوەتا دەبینم کە چاوەکانت چۆن بریسکەیان لێوەدێت، کاتی من بەسەرچوو ئۆتێلۆ. بۆ دواجار دەستو باسکە قورسەکانت لەگەردنم بئاڵێنە.

ئێستا سیپاڵێکم پێنیە تا تنۆکەکانی ئەسرینمی پێ بسڕم. دەسڕۆکەکەی خۆتم وێدە، وەك جاران گەلێك را ئەو کارەت کردووە. ئەرێ چ دەسڕۆکەیەکت لەچاکەتەکەتدا پێنییە؟!

مەگەر لەقوماش هەندێ دەسڕم بۆ چێنەکردیو بە نەخشو نیگار نەمرازاندنەوە؟. پارچە حەریرم بۆت هەڵبژاردو هەندێ جاریش هی لۆکە، لەدووریتدا گەلێك کاتم بۆ بیرلێکردنەوەت هەبوو.

کوا ئەو هەموو دەسڕۆکانەم، لەکوێن، چییان لێهات؟. ئەوانە رەهنی ئەوینی من بوون. دەبلێ! لەکوێت بزرکردوون؟. بەدیاریی داتن بەکێ؟.. هێدیو ئارامبە، تەواو ئارام، هێشتا هێند کات ماوە هەتا گشت گیرفانەکانت بگەڕێیت. گیرفانەکانی پانتۆڵەکەشت بگەڕێ ئۆتێلۆ!.. بگەڕێ!.. لەوانەیە.. دوور نییە وابێت، بۆ یەکێکت راوەشاندبێت.

فرمێسکی سەر کام کوڵمی ناسکت پێ سڕیوەو هەر لەوێ جێتهێشتووە؟. ئەها ئەم جۆرە دەسڕانە چەند ساناو زوو بزر دەبن. یارمەتیت بدەم بۆ دیتنەوەی؟.. بێدەنگبە!، بهێڵە تا باخەڵی چاکەتەکەت بگەڕێم هێشتا وەك هەمیشە هەروا زوو فدیلانەو ختوکەت دێ.. ئۆتێلۆ؟ دڵت توند لێدەداتو چەند گەرم! تنۆکەکان بەسەر سینگتدا دەتکێن. سەرتاپای جەستەت دەگری.

یەکەم ئێوارەمانت لە ڤینیسیا دێتەوە یاد؟ کاتێك کە دووگمەکانی جلی سەرەوەتم ترازاندو کراسو جلی ژێرەوەت لەبەردا نەبوو، ساتێك جەستە گەورەو رەشەکەتم دی- منێك کە پێشتر سینگی رووتو قووتی پیاوم نەدیتبوو- چۆن سڵەمیمەوەو ترسام. چۆن لەخۆشیدا دەبوو پێبکەنم، خۆشیی ئەوەی کە ئەوە گشت دەبێتە هی من ئینجا ئەی دوای ئەوە.. ئۆتێلۆ.. دێتەوە بیرت؟ هەرکە بیری لێدەکەمەوە سوور هەڵدەگەڕێم، وەك تۆ، وەك من، وەك ئێمە، ئۆتێلۆ، ئەها تۆ هەمدیسان لەژێر جلەکەی سەرەوەت هیچت لەبەردا نییەو رووتیت!، ئێستا ئێمە هەردوو دەبێت پێبکەنین.. ئۆ.. تێ.. لۆ!!.



# ویـــرانه خـــاك

- شیعری:ت.س.ئیللیەت
- و. لەئینگلیزییەوە: عەتا قەرەداخی



**بەچاوی خۆم بینیم سیبیلا لەقەفەزێ بچووك نرا بوو،چەند منداڵێکی راگوزار لێیان پرسی:چیت دەوێ ئەی سیبیلا.وەڵامی دانەوە:مردنم دەوێ.**

## پێشکەشە بە لێزانترین داهێنەر

## (ئەزرا پاوەند)

### 1-مردوو و ناشتن

نیسان دژوارترین مانگە،گوڵە زەنبەق
لەخاکی مردووەوە سەر دەردێنێ،یادو ئارەزوو
ئاوێزانی یەکتر دەکات، رەگی سست
بەبارانی بەهارە دەژێتەوە
زستان گەرمی کردینەوە،بەبەفری بیرچوونەوە
زەوی پۆشی،ژیانی کورتی
بە بۆدرێنی وشك خۆراك دا،
هاوین سەرسامی کردین کاتێ بەخوڕژمی بارانەوە
دای بەسەر( شتارنبرگیرس)دا، لە داڵانەکەدا راوەستاین
پاشان لەبەر تیشکی خۆردا رێگامان کرد،
بەرەو(هۆفگارتین).
قاوەمان نۆشی و بۆ ماوەی کاتژمێرێك قسەمان کرد،
هەرگیز روسی نیم، خەڵکی لیتوانیا و بەرەگەز ئەڵمانیم
کاتێ منداڵ بووین لە کۆشکی ئارکیدۆك ماینەوە،
ئامۆزاکەم لەسەر خلیسکانە هێنامیە دەرێ
من ترسام، ئەو گوتی، ماری،
ماری توند خۆت بگرە، پاشان هاتینە خوارێ.
لەقەد چیاکان، لەوێ هەست بەئازادی دەکەیت.
بەشی زۆری شەو من دەخوێنمەوە، لە زستانیشدا
دەچمە باشوور.
ئەم رەگە لێك ئاڵاوانە چین، کام لقانە
لەم پیسابییە بەبەرد بووەدا گەشە دەکەن؟ ئەی
نەوەی مرۆڤ
تۆ نە دەتوانی بدوێی، نە پێشبینی بکەی، چونکە
تۆ
تەنیا کۆمەڵێ بتی شکێنراو دەناسی، لەو داری
وشك بوو هیچ پەنایەك نابەخشێ،قالۆنچە
حەوانەوە نادا
بەردی بێ گیان خورەی ئاوی لێ نایەت،
سێبەر تەنیا لە ژێر ئەم تاشەبەردە سوورەدا
هەیە،
(وەرە ژێر سێبەری ئەم تاشەبەردە سوورە)
شتێکت نیشان دەدەم کە جیاواز بێت لەو
سێبەرەی خۆت
کە بەیانی لە دواتەوەیە و لای ئێوارانیش خۆی
هەڵدەدات
هەتا پێت بگات
پاشان لەمشتە خۆڵێکدا ترست نیشان دەدەم
بای سارد
بەرەو نیشتمان هەڵدەکات
ئەی رۆڵە ئێرلەندیەکەم
تۆ لەکوێ
چاوەروان دەکەیت؟
یەکەم شت پێشی ساڵێ گوڵە زەنبەقت
پێبەخشیم
ناویان نام کچی گوڵە زەنبەقی
- بەڵام کاتێ درەنگانێ لەباخچەی گوڵە
زەنبەق گەڕاینەوە
باسکەکانت پڕو پرچت تەڕبوو، من نەمتوانی
بدوێم
چاوانم نەیانبینی، من نە دەژیام و نە مردبووم.
لەهەموو شتێ بێئاگا بووم،
دووربینی چاوانم لەچەقی تاریکی و خامۆشی بینی
گرت
دەریاش خاڵی و فراوانە
خاتوو سۆسۆستریس فالگرەوەی بەناوبانگ
درمێ پیسی گرتووە و کەچی هێشتا
وادەناسرێ ژیرترین ئافرەتی ئەورووپایە،
بەدەستێ وەرەقەی سپی یاری کردنەوە گوتی:
ئەوە وەرەقەکانتە، دەریاوانە خنکاوەکەی
فینقی،

" ئەوانە ئەو مرواریانەن چاوانی ئەوبوون،
بڕوانە !"
ئەمەش بیلادۆنایە خانمی تاشەبەردەکان
خانمی خاوەن هەڵوێستان
ئەمەش پیاوەکەی سێ گۆچان دارە، ئەمەش
پێچکەیە
ئەمەش بازرگانە تاك چاوەکەیە، ئەمەش
وەرەقەیەکی
سپیو بەتاڵە، لەسەر ئەودیوی هەندێ شتی
هەڵگرتووە
شتێکە بۆم نیە سەرنجی بدەم. من مرۆڤە
هەڵواسراوەکە نادۆزمەوە،
لەمەرگی بەئاو خنکاندن دەترسم،
حەشامەتێ خەڵك دەبینم بەئەڵقە دەسوڕێنەوە
سوپاست دەکەم گەرهاتوو خاتوو (ئیکیۆتۆنی)
خۆشەویستتان دی
پێی بڵێن من خۆم نەخشەی بورجەکە دەهێنم
پێویستە مرۆڤ لەم رۆژگارانەدا گەلێك وریابێت.
شاری خەیاڵی
لەژێر تەمتوومانی قاوەیی بەربەیانێکی
زستانەدایە
حەشامەتێ بەسەر پردی لەندەن دا رۆیشتن،
حەشامەتێ زۆر
بیرم لەوە نەکردبووەوە کە مردن خەڵکێکی
وازۆری لەناوبردووە،
هەناسەی کورتو پچڕپچڕیان هەڵکێشا
هەریەکە دووربینی چاوانی ئاڕاستەی بەرپێی کرد
بەرەو گردەکە سەرکەوتنو بە شەقامی ویلیەم
شادا هاتنە خوارەوە
بۆ کوێ قەدیس (ماری ولنۆس) کاتی دەژمارد
لەگەڵ دەنگێکی مردووی دوا لێدانی کاتژمێر نۆدا
لەوێ کەسێکم بینی دەمناسی، رامگرت، هاوارم
لێکرد:
سیتسۆن!
تۆ ئەو کەسەی کەلە(میلانی) لەناو گەمیەکان
لەتەکمدا بووی!
ئەو لاشەی ساڵی رابردوو لەباخچەکەتدا ناشتت
دەستی کردووە بەژیانەوە؟ داخۆ ئەمساڵ گوڵ
دەگرێ؟
یان زوقمی لەناکاو خونچەی هەڵدەوەرێنێ؟
ئۆه، سەگەکە دوور لەو رابگرە، ئەو هاوڕێی
مرۆڤە،
ئەگینا جارێکی دی بەچنگەکانی
هەڵیدەگێرێتەوە،
تۆ! ئەی خوێنەری دووڕوو! -ئەی هاوشێوەم،-
ئەی ابرام!..

## 2- یاریی شەترەنج

ئەو کورسیەی کەوا لەسەری دانیشت وەکو
عەرشێکی توندو مکوومە
لەسەر مەرمەڕ بریسکەی دایەوە، لەو جێگایەدا
کەوا ئاوێنەی لەسەر دار بالا
بەتەرزی دارمێو دەوری چنرابوو
ئا لەوێوە پەیکەرێکی ئاڵتونی سەرنجیدا
(یەکێکی تریش چاوی لەودیووی باڵیەوە
حەشاردا)
کڵپەی شەمعەدانە حەوت مەشخەڵیەکەی بەدوو
ئەوەندە
رووناکی خستە سەر مێزەکە وەکو
بریسکەی گەوهەرەکانی کەبۆگەیشتن بەو
بەرزبوونەوە
لەقوتووە ئاورێشمیەکانەوە بێ پایان پرژێنران
لەبوتڵە عاجیەکانو پەرداخی رەنگاورەنگا
بۆنی تێکەڵاوی سەیری زفتو بۆدرەو
شلەی دامرکاندنەوەی -بێزارو شێواو

هەست نقومی نێو بۆنەکانە، ئەوشنە با
فنێکەی لەپەنجەرەوە هاتە ژووریٰ،هەژاو
بەرزبووەوەو کڵپەی مۆمەکان درێژە پێدەدات
دوکەڵەکەیان بەرووی سەقفە تەختەکەدا
بڵاودەبێتەوە
تاکو وێنە لەسەر ئەو سەقفە نەخشێنراوە
بجولێنن
کۆتەرە داری گەورەی دەریایی مس گرتوو
بەکڵپەی سەوزو پرتەقاڵی سووتا، بەردی رەنگاو
رەنگ چێوەی رشت
لەبەر ئەوتیشکە خەمبارەیدا دۆلفینی بەڵەک
مەلەی کردو
لەسەر ئاگردانێکی کۆن داخرا
وەکو ئەوەی پەنجەرەیەک بەسەر دیمەنی
جەنگەڵیدا بروانیٰ
دەست درێژی کردنە سەر فرۆمیل لەلایەن پاشای
بەربەرییەوە
درندانە بوو، بەڵام لەولا بولبول سەراپا بیابانی
بەئاوازی سەرپێچی پڕکردو
هێشتا هاواری دەکرد، هێشتا دنیا دوای دەکەوێت
"جەک، جەک" بۆگوێ پیسەکان
پاشماوە وشکەکانی تری زەمەن لەسەر
دیوارەکان
چەسپێنران، شێوەی روانین نزم بووەوە،
چەمایەوە
ژووری داخراوی بەبێ دەنگی پۆشی، هەنگاو
کەوتە سەرپلیکانە
لەبەر رووناکی ئاگردا، لەژێر فلچەدا، پرچەکەی
بەلای ئاگرەکەدا پەخش بوو،
لەئاخاوتندا سوور هەڵگەڕا، پاشان کەوتە
خامۆشیەکی خنکێنەرەوە
ئەمشەو مێشکم پەشێوە، بەڵێ پەشێوە، جێم
مەهێڵە

بۆم بدویٰ، بۆچی هەرگیز قسەناکەیت؟ قسەبکە
بیر لەچی دەکەیتەوە؟ چ بیرکردنەوەیەک؟ چی؟
"هەرگیز تێناگەم بیر لەچی دەکەیتەوە.
بیرکردنەوە"
بەبڕوای من ئێمە لەگەڕەکی جرجاندایین
لەو جێگایەین کەپیاوانی مردوو ئێسقانەکانیان تیا
لەدەست چوو
ئەو ژاوەژاوە چییە؟
باکە لەژێر دەرگاوە دیٰ
ئێستا ئەو ژاوەژاوە چییە؟ با– چی دەکات؟
هیچ، دیسان هیچ ناکات
تۆ هیچ نازانیت؟ داخۆ هیچ نابینیت؟
داخۆ هیچت
دێتەوە یاد؟
دێتەوە یادم
ئەوانە ئەو مروارییانەن کەچاوانی بوون
داخۆ تۆ زیندوویت یان نا؟ ئایا هیچ لەمێشکتایە؟
بەڵام
ئوئۆ ئۆئۆ ئەو ئاهەنگە شکسپیرییە
زۆر رەونەقدارە
زۆر زیرەکیە
ئێستا چی بکەم؟ من چی بکەم؟
هەمان شێوەی خۆم دەردەپەڕمە دەریٰ،
شەقامەکە دەپێوم،
بەمجۆرە بەقژی قائمقامەوە. سبەینیٰ چی
بکەین؟
بۆ هەتاهەتایە چی بکەین؟
لەسەعات (دە)دا ئاوە گەرمەکەو،
ئەگەر باران ببارێت، ئۆتۆمۆبێلە داخراوەکە
لەسەعات چواردا دیٰ،
دەبێ دەستیٰ شەترەنج بکەین،
چاوانی بیٰ پێڵو لێک دەنێین و چاوەڕوانی
لێدانێکی

دەرگاكە دەكەين،
كاتێ مێردەكەی (ليل) لەسەربازی رزگاری بوو،
من گوتم...
وشەكانم دروست نەكردووە، هەر خۆم پێم گوت
تكایە خێراكەن كات تێپەڕیوە
ئێستاكە ئەلبێرت دەگەڕێتەوە، كەمێ خۆت
ئارايشت بكە،
ئەو مەبەستیە بزانێ كەچیت بەو پارەیە كرد
كەپێی بەخشیوی
هەتا ئاقمە ددانێ بۆخۆت بكرێت، پێی
بەخشیت، من خۆم لەوێ بووم
ليل، دەبوا هەموويت هەڵبكەندايەو ئاقمێكی
جوانت بكردایە
ئەلبێرت گوتی، سوێند دەخۆم، پرکێشی ناكەم
كەسەيرت بكەم
منيش گوتم چیتر توانام نیە، بیر لەئەلبێرتی
هەژار بكەرەوە
ئەو چوار ساڵە لەریزی سوپادایە، ئێستا كاتێكی
پەسەندی دەوێت
گەرتۆ ئەو كاتەی بۆ نەرەخسێنێ، گوتم، كەسانێ
تر هەن بۆی دەرەخسێنن،
ليل گوتی: بەراست شتی وامەيە، منيش گوتم
بەڵێ شتێ لەوجۆرە هەيە،
پاشان گوتی: من دەزانم سوپاسی كێ بكەم،
ئەنجا سەرنجێ زۆر توندی لێدام
تكایە خێراكەن واكات تێپەڕی
من گوتم، ئەگەر ئارەزووشت نیە، ئەوا هەردەبێ
پەسەندی بكەی
گەرتۆ ئەوە نەكەيت واكەسانێ دی نیشانە
دەكەنو هەڵدەبژێرن
بەڵام گەر ئەلبێرت دوورە پەرێز بێت، لەبەر ئەوە
نیە كەبێ ئاگا بێت

گوتم، دەبێ شەرمەزار ببیت گەر واپیرانە خۆت
پیشان بدەيت
"ئەم ئافرەتە تەمەنی تەنیا سیو یەك ساڵانە" و
گوتی:
من توانای هیچم نەماوە، تووڕەیی كەوتە
سەرسیمایی
گووتی: حەبی ئەوان بوو، خواردم هەتاكو لەبارم
بچێت
"پێشتر پێنج منداڵی بووەو خەریك بوو بەسەر
جۆرجی گچكەوە
گیانی دەربچێت
دەرماننناسەكە گوتی: هەموو شتێ لەباری
ئاساییدایە، بەڵام من هەرگیز
نەهاتمەوە سەر، باری ئاساییم
گوتم تۆ كەڤرەیەكی تەواويت
بەهەرحاڵ ئەگەر ئەلبێرت بەتەنیا بەجێت
نەهێڵێ، ئەوە شتێكە،
ئەگەر ئێوە منداڵتان ناوێ، ژنو مێردایەتیتان
بۆچ مەبەستە؟
تكایە خێراكەن واكات تێپەڕی
ئێ، ئەو یەك شەمەیە ئەلبێرت لەماڵ بوو، گۆشتی
برژاوی بەرازيان هەبوو
داوایان لێم كرد لەوێ نانی نیوەڕۆ بخۆم هەتا
لەگەرمی ئەو گۆشتە چێژوەربگرم
تكایە خێراكەن واكات تێپەڕی
تكایە خێراكەن واكات تێپەڕی
شەوباش بێل، شەو باش لۆ، شەوباش مەی.
شەوباش
تا تا. شەو باش. شەوباش
شەوباش خانمان، شەوباش، خانمە خوێنە
شیرینەكان،
شەوباش، شەوباش.

## 3- ئامۆژگاریی ئاگرەکە

دەواری رووبارەکە دەرووخێ، دواپەنجەکانی گەڵا
دەچنەوە یەک و لەرۆخە شێدارەکەدا نقووم دەبن،
(با)کە بێ سرپە بەسەر زەویە خاکیەکەدا
تێدەپەڕێت،
پەریەکان دەرۆن
ئەی تایمزی دڵگیر، هێواش برۆ، تا گۆرانیەکەم
تەواو دەکەم
رووبارەکە بوتڵی بەتاڵ و کاغەزەی سەندەویچ و
دەستەسڕی ئاورێشمی و پاکەتی مقەباو ئاغزە
جگەرە
یان پاشماوەی تری شەوانی هاوین لەگەڵ خۆیدا
هەڵناگرێ
پەریەکان دەرۆن
هاوڕێکانیان، میراتگرە بێکارەکانی بەڕێوەبەرانی
شار
رۆیشتن و هیچ ناونیشانێکیان بەجێ نەهێشتووە
لەسەر ئاوی (ئیمان) دانیشتم و گریام
ئەی تایمزی دڵگیر، هێواش برۆ تاگۆرانیەکەم
تەواودەکەم
ئەی تایمزی دڵگیر، هێواش برۆ، تادرێژەی
نەدەمێ و دەنگ هەڵنەبڕم،
بەڵام لەدوامەوە، لەزریانێکی ساردا گوێم
لەخرەخرِی ئێسقانەکان و
قاقای پێکەنینە لەم گوێ دەڕوات بۆ ئەو گوێ
جرجێك لەسەرخۆ لەناو گیاکەوە هاتە دەرێ
پێستی چرچ و لۆچی سکی بەسەر کەناردا
دەخشان
کاتێ کەمن لەئێوارەیەکی پایزدا لەکەنداوێکی
خەماویدا
لەپشتی کارگەی کاغەزەکەوە راوم دەکرد
بیرم لەتێکشکاندنی کەشتی برا پاشاکەم و
مەرگی پاشای باوکم لەپێش ئەودا دەکردەوە،
جەستە سپیە رووتەکان لەسەر زەوی نزمی شێدار
بوون،
ئێسقانەکانیش لەهەورەبانێکی نزمی بچکۆلەی
وشکدا بوون،
تەنیا پێی جرجەکە لەم ساڵ بۆ ئەو ساڵ خشەی
لێ هەڵدەساندن
بەڵام لەدوامەوە لەم کات بۆ ئەو کات دەنگی
هۆڕین و
ئەو مانۆڕانە دەبیستم کەدەمی بەهار
(سۆینی) دەبەن بۆ خاتوو (پۆرتەر)
ئۆه تیشکی مانگەشەو دای لەخاتوو پۆرتەرو
کچەکەی
ئەوانیش لەئاوی سۆدەدا قاچیان دەشۆن
ئۆه لەو دەنگی منداڵانە لەژێر سەقفەکەدا
دەچریکێنن
تویت، تویت، تویت
جەك جەك جەك جەك جەك جەك
ئاوا بە نامروەتانە دەست درێژی کرا.
تیرۆ
شاری خەیاڵی
لەژێر تەمتوومانی قاوەیی نیوەڕۆی زستاندا
مستەر یۆ جینیدیس بازرگانی ئەزمیری تەراش
نەکردو
بەگیرفانی پڕ لەمێوژەوە
بەهاو تەئمین و کرێ رەوانەی لەندەن دەکا،
بەڵگەنامەکان دیارن
بەفەرەنسیەکی هەرەمەکی بۆ نانی نیوەڕۆ
بۆ ئوتێلی شەقامی (کانون) بانگهێشتی کردم
دوای ئەوەش بەسەربردنی پشووی کۆتایی هەفتە
لەمیترۆپۆڵ دێت.
لەکاتژمێری بولێڵدا- کاتێ چاوان و پشت لەسەر
مێز بەرز دەبنەوە

کاتێ ئامێری مرۆیی لەچاوەڕوانیدایە
هەمان شێوەی ئەو تەکسیەی کەدڵی چاوەڕوانی
لێدەدا
منی (تاریسیاس) لەنێو دوو ژیندا لەدڵە ڕاوکێدام
پیرەمێردێ بەدوو مەمکی چرچی ئافرەتانەوە،
سەرباری کوێریم
دەتوانم لەکاتژمێری بوڵێڵدا ببینم- لەو
کاتژمێرەی دەمی ئێوارەدا
کاتێ هەموو شت بۆماڵ دەگەڕێتەوە، ئەو
کاتژمێرەی کەدەریاوانەکە
لەنێو دەریاوە دەگێڕێتەوە بۆنێو ماڵی خۆی
چاپ لێدەرەکە کاتی چاخواردن دەگەڕێتەوەو
پاشماوەی خواردنی بەیانی لادەبات،
سۆپاکەی گڕدەداو خواردن لەقتوو دەردەکات
لەودیوی پەنجەرەکەوە ترسناکانە جلی وشکی
ژێرەوەی
بۆ دواتیشکی خۆر هەڵدەخات
لەسەر قەرەوێڵەکە کەشوێنی شەوانیەتی .
گۆرەوی و پاپۆچ و کافیرۆڵ و ستیانەکەی
کۆمەڵکراون.
منی تاریسیاس پیرەمێردێ بەجووتێ مەمکی
چرچەوە
لەودیمەنە حاڵی بووم و پێشبینی ئەویتریشم
کردووە،
دیسان چاوەڕوانی میوانی چاوەڕوانکراویشم
کردووە
ئەو، ئەو کوڕە لاوە سوورفولە دەگاتە جێ،
کەلای وەکیلی بینایەکی بچووک کاتبە، ڕوانینی
ئازایانەی هەیە،
کەسێکە لەهەموو لایەکەوە دڵنیایی باڵی
دەکێشێ بەسەریا
هەمان شێوەی جێگیر بوونی شەبقەیەکی
ئاورێشمی

لەسەر سەری ملیۆنەری (برادفۆرد)
وەکو پێشبینی دەکا ئەمێستا کات لەبارە
ژەمەکە کۆتایی دێت کچەش پەست و بێزارە
دەیەوێت رایبکێشێتە نێو ئەو دەستبازیانەی کە
تاکو ئێستا
گەر ئەم مەیلی لەسەر نەبووبێ، ئەنجام نەدراون
ئەگەر هەژاو بڕیاریدا، لەپڕ شاڵاوی بۆدەبا
باسکانی لەکەمەری دەئاڵێنێ، بێ ئەوەی کەئەو
بەرگری بکات
شانازی بەخۆوە کردنی کوڕە پێویستی بەهیچ
وەلامێك نیە،
بەڵکو حەزی لەپێشوازیەکی کەمتەرخەمانەیە
منی (تاریسیاس) ئازارم چەشتووە لەهەموو
ئەوشتانەی
لەسەر هەمان جێگاو چەرپا روویان دا
من ئەو کەسەبووم نزیکی (تیبە) لەبەردەم
دیوارەکەدا دانیشتم و
بەنێو نزمترینی مردوانا رێگام کرد
ئەو دوا ماچی پڕ چێژی دەکات و
رێگای رۆیشتن دەگرێتەبەر ، دەبینێ پلیکانەکان
تاریکن..
کچە دەگەڕێتەوەو بۆ ساتێ سەیری ئاوێنەکە
دەکات،
بەئاستەم ئاگای لەرۆیشتنی خۆشەویستەکەیەتی
بیرۆکەیەکی ناتەواو بەمێشکیدا تێدەپەڕێ
(چاکە، ئەوە کۆتایی هات، خۆشحاڵم بەوەی
کۆتایی پێهات)
کاتێ ئافرەتێکی دڵگیر خۆی دەداتە دەستی
گەمژەیی و
پاشان جارێکی دی بەتەنیا بەژوورەکەیدا
دەگەڕێ،
بەدەستی ئۆتۆماتیکانە پرچی رێك دەکات و
پاشان

شرێتی دەخاتە سەر گرامۆفۆنەکە
ئەم مۆسیقایە لەنزیکمەوە بەسەر ئاوەکاندا کشا
بەدرێژایی (ستراند) بەسەر شەقامی فکتۆریای
شاژنا
تۆ، شار شار، هەندێ جار نزیکی مەیخانەیەکی
کشتی
خوارەوەی شەقامی تایمز گوێم لەئاوازی خۆشی
ماندۆلین و
ئەو هەراو هوریایە کەلەبارەکەوە دێتە دەرێ
لەوێرا راوچیانی ماسی پشووی کورتی نێوەڕۆیان
بەسەر دەبەن
لەو شوێنەدا کەدیوارەکانی (ماگینۆسی شەهید)
جوانی لەباس نەهاتووی ئایۆنانەی سپی و ئاڵتونی
لەخۆدەگرن
رووبارەکە چەوری و قیر
دەردەدات
بەلەمەکان لەگەڵ شەپۆلی
گەڕاوەدا دەکشێن
چارۆکە سوورەکان
فراوانن
لەسەر تەختەی قورس چەسپکراو
بە ئاڕاستەی با دەشەکێنەوە
بەلەمەکان دەکشێن
تەختەدارەکان بەرەو رۆخەکانی
(گرینج) دەچن
بۆ ئەو دیوی دوورگەی سەگەکان
ویالا لا لیا
وەلا لا لیا لا لا
ئیلیزابێس و لیستەر
سەوڵ لێدەدەن
تەختەی دوارەی بەلەمەکە...

سەدەفەیەکی بەئاڵتون رووکەش کراوە
سوورو ئاڵتونیە
جوولەی هەڵچوون و داچوونی ئاو
گەیشتە سەر هەردوو کەنار
بای باشووری رۆژئاوا
بەڕاڕەوی ئاودا زرەی زەنگەکانی
بورجە سپیەکانی هەڵگرت
ویالا لا لیا
وەلا لا لیا لا لا
ترام و درەختەکان تۆزاوین
(هایبۆری) ژیانی پێبەخشیم، ریچمۆند و کیو
لەناویان بردم. نزیک ریچمۆند ئەژنۆکانم
بەرزکردنەوە
لەسەر پشتی تەنگەبەری بەلەمێ فرێ درام
پێیەکانم لەمۆرگەیت و دڵیشم
لەژێر پێمدا بوو، دوای رووداوەکە
ئەو گریا، بەڵێنی (سەرەتایەکی نوێی)دا
من هیچ تەعلیقێکم نەدا، دەبێ چ نکۆڵیەك بکەم؟
لەسەر لمی مۆرگەیت
دەتوانم هیچ لەگەڵ هیچدا
پێکەوە ببەستم
نینۆکە شکاوەکانی پەنجەی دەستە پیسەکان
گەلەکەم ئەو گەلە ساکارەن
چاوەڕوانی هیچ شتێ ناکەن
لا لا
پاشان من هاتم بۆ قرتاجە
دەمسوتێنێ، دەمسوتێنێ، دەمسوتێنێ
ئۆه سەروەر تۆ لەڕەگ و ریشەم هەڵدەکەنی
ئۆه سەروەر تۆش لەڕەگ و ریشەوە هەڵدەکەنی
دەمسوتێنی

## 4- مردن بەئاو

فلیباسی فینقی کەدوو هەفتەیە مردووە
هاواری نەورەسەکان و شەپۆلی قووڵی دەریاو
کەڵک و زیانی لەیاد چووەتەوە
شەپۆلێك لەژێر دەریاوە
لەسرپە سرپدا ئێسقانەکانی لێك ترازان، کاتێ دەکەوتە
سەرئاوەکەو دەکەوتەوە ژێرەوە، قۆناغەکانی پیریتی و لاویتی
خۆیی دەبری و دەکەوتە ناو گێژاوی ئاوەکەوە
جولەکە بیت یان غەیری جولەکە
ئۆ تۆ ئەی ئەو کەسەی خلۆکە دەخولێنێتەوەو
سەرنجی هەڵکردنی با دەدەی
بەو جۆرە بیر لە فلیباس بکەرەوە کەئەویش سەردەمێ
هەمان شێوەی تۆ قۆزو باڵا بەرز بووە.

## 5- ئەوەی هەورە بروسکە گوتی

دوای سورێتی تیشکی مۆم لەسەر سیما عەرەقاویەکان
دوای بێدەنگی شەختە یانەی نێو باخچەکان
دوای ئازاری سەختی نێو شوێنە بەردیەکان و
هاواری گریانی بەندیخانەو کۆشك و
دەنگدانەوەی هەورە بروسکەی بەهار
بەسەر چیا دوورەکاندا
ئەو کەسەی دەژیا ئێستا مردووە
ئێمە کەئەوسا دەژیاین
ئێستا بەکەمێ هێوریەوە دەمرین
ئێرە ئاوی لێ نیە، بەڵکو هەرتاشە بەردە
تاشە بەردی بێ ئاوو رێگای لماوی
ئەو رێگایەی لەنێو چیاکاندا دەچەمێتەوە
چیای تاشەبەرد بەڵام بەبێ ئاو
گەر ئاو هەبوایە دەوەستاین و دەمانخواردەوە
لەناو تاشە بەردا کەس ناتوانێ بوەستێ یان بیربکاتەوە،
عەرەق وشك و (پێیەکان) لەنێو لمدان
ئەگەر لەنێو تاشە بەردا تەنیا ئاو هەبێت
ئەوا دەمی مردووی چیایی بەددانی کلۆرەوە
ناتوانێ تف بکاتەوە
لێرە کەس ناتوانێ نە بوەستێ، نە ڕاکشێ، نە دانیشێ
لێرە لەم چیایانە تەنانەت بێدەنگیش بوونی نیە
بەڵکو تەنیا هەورە بروسکەی وشکی بێ باران هەیە
لێرە لەم چیایانە تەنانەت تەنیایش بوونی نیە
بەڵکو سیمای سووری تووڕە هەن لەدەرگای خانووە
قورە درز بردووەکانەوە گاڵتە دەکەن و دەمڕێنن
گەر ئاو هەبوایە
تاشەبەرد نەبوایە
گەر تاشەبەرد هەبوایەو
هەروەها ئاویش هەبوایە
ئاو و
سەرچاوەو
گۆمێك لەنێو گاشە بەرد هەبوایە
ئەگەر تەنیا خورەی ئاو هەبوایە
مێرووی دورێنە نەبوایە
گۆرانی پووش نەبوایە
بەڵکو خورەی ئاو بهاتایە کەدەدا بەسەر تاشە بەردا
لەوشوێنەوە کەملی (ترەش) لەسەر سنەوبەر
گۆرانی دەچرێت

دریپ دریپ دریپ دڕۆپ دڕۆپ دڕۆپ دڕۆپ
بەڵام ئاو نیە
سێیەمین کەس کێیە کەهەمیشە لەتەنیشتەوە
ڕێدەکات؟
کاتێ حسابی دەکەم هەر منو تۆین پێکەوە
بەڵام کاتێ سەرنجی پێشمەوە دەدەم بۆ ڕێگا
سپیەکە
بەردەوام کەسێکی تر هەیەو شان بەشانی تۆ
ڕێدەکات
دەکشێو لەنێو جلە خاکیەکەیدا خۆی پۆشیوەو
سەری پێچاوەتەوە
من نازانم داخۆ پیاوە یان ژن
- بەڵام ئەوە کێیە لەو دیووتەوە؟
ئەو دەنگە بەرزە چیە لەهەوادا؟
هاواری لاواندنەوەی دایکانەیە
ئەو حەشامەتە خڕبووەی سەریان پێچاوە کێن؟
کە لەدەشتە بێ کۆتاییەکاندا، پێ بەخاکی
فشەڵدا دەنێن
ئەو دەشتەی کەتەنیا هێڵەکانی ئاسۆ سنووری
داوە
ئەم شارە چیە لەپشت چیاکان
کەلەهەوا بنەوشەییەکەدا درز دەباو
یەکدەگرێتەوەو دەتەقێتەوە
بورجە رووخاوەکانی
ئۆرشەلیمو ئەسیناو ئەسکەندەریەو
ڤیەناو لەندەن
خەیاڵین
ئافرەتێك قژی رەشو درێژی دامێناو رێکخست
لەسەر ئەو ژێیانە مۆسیقایەکی مێواشی لێدا
شەمشەمە کوێرە بەسیمای منداڵانەیانەوە
لەڕووناکی بنەوشەیدا
زریکاندیانو باڵەکانیان دا بەیەکدا
بەسەری نەویانەوە کشانو سەریان دا
بەدیوارێکی رەشدا
بورجەکان لەهەوادا سەرەو ژێر بوون
زەنگەکانی یادوەری لێیان دا، سەعاتەکانیان
ژمارد
لەحەوزی خاڵیو لەبیرە وشکەکانەوە دەنگی
گۆرانی دەهات
لەم کونە بۆگەنەی نێوچیاکاندا
لەبەر تیشکی کزی مانگەشەودا، گیا گۆرانی
دەچڕێ
لەسەر گۆڕستانی نغرۆ، نزیکی کەنیسەکە،
کەنیسەیەکی چۆڵ هەیە، تەنیاماڵی بایە
پەنجەرەی نیە، دەرگاکەی بەم دیوەو دیودا
دەکەوێ،
ئێسقانی وشك ئازاری کەس نادات
تەنیا کەڵەشێرێك لەسەر دارکوێسە بانەکەی
نیشتەوە
قوقو ویقو قوقو ریقو
لەبزیسکەی چەخماخەیدا، پاشان بایەکی شێدار
باران دەهێنێت
(کانگا) نقووم بوو، گەڵا لوول بووەکان
چاوەڕوانی بارانیان کرد، لەوکاتەدا کەهەورە
رەشەکان
زۆر لەدوور لەسەر (هەماوەند) کۆبوونەوە
دارستانەکە چەمایەوە، بێ دەنگ سەری نەوی
کرد
پاشان هەورە بروسکە دوا
ببیەخشە ئێمە چیمان بەخشیووە؟
هاوڕێم، خوێن دڵم دەخاتە خورپە
جەسارەتی پڕلەترسی ساتی خۆبەدەستەوەدان

ئەو ساتەیە کەتەمەنی بەئاگا بوون ناتوانێ
هەرگیز بەلاوەی نێت،
بەمەو تەنیا بەمە، ئێمە هەین
ئەوەش شتێکە نە لەمردنماندا نە لەو
بیرەوەرییانەدا
دەدۆزرێتەوە کەجاڵجاڵۆکەی سوودمەند چنیونی
نە لەژێر ئەو (مۆرانەدا) کەپارێزەری رسوا
لەژووره چۆڵەکانماندا شکاندونی،
دا یەزەیتان بێتەوە: من گوێم لەدەنگی کلیلەکە
بووە
لەدەرگاکەدا جارێك و تەنیا جارێك دەسوورێتەوە
ئێمە بیر لەکلیلەکە دەکەینەوە، هەریەکە
لەبەندیخانەی خۆیدا
بیر لەکلیلەکە دە کاتەوە، هەریەکە دڵنیا بوونی
بەندێتی خۆی دەکا،
تەنیا لەڕاشکانی شەوا، سەدای (ئەثیر)
رۆحی شکستی (کۆریولانیۆس) بۆساتێ
دەژێنێتەوە
دەسەلات بکەن:
بەلەمەکە بەخۆشیەوە وەلامی
بۆ دەستی شارەزای چارۆکەو سەوڵ دایەوە
دەریاکە هێور بوو، دڵت بەخۆشیەوە وەلامی
دایەوە،
کاتێ بانگهێشت کرا، راستەوخۆ ملیدا
بۆ ئەو دەستانەی دەسەلاتیان لەدەستدابوو،
لەسەر رۆخ دانیشتم
راوەماسیم کرد، دەشتە وشکەکە لەدوامەوە بوو
داخۆ پێویست بوو بەلای کەمەوە زەویەکانی خۆم
رێکبخەم؟
پردی لەندەن هەرەس دێنێ، هەرەس دێنێ،
هەرەس دێنێ

پاشان نقومی نێو ئەو ئاگرە بێگەردە دەبێ
کەی من وەکو سواڵوم لێ دێ، سواڵو، سواڵو
میر (ئەکتینی) بورج وێران
من بەم پارچانە رێگام لەهەرەس هێنانی خۆم
گرتووە
بۆ ئەوەی لەگەڵ تۆدا بگونجێم،
دیسان (هێرۆنیمۆ) شێت بووەوە
ببەخشن، بەزەیتان بێتەوە، دەسەلات بکەن،
ئاشتی، ئاشتی، ئاشتی
تێبینی: وێرانە خاك قەسیدەیەکی فرە سەرچاوەیەو لەدەقە ئەسڵیەکەدا نەوەدونۆ پەراوێزی لەگەڵدایە کەڕووبەرێکی هاوشێوەی رووبەری قەسیدەکەیان داگیرکردووە. دیارە بێ گەڕانەوە بۆ ئەو پەراوێزانە تێگەیشتن لەقەسیدەکە کارێکی ئاسان نیە بەتایبەی بۆ وەرگێر. ئێمە بەوردی پەراوێزەکانمان لەکاتی وەرگێڕاندا تاوتوێ کردووەو سوودمان لێوەرگرتووە.
ئەو بەشانەیش کەلەقەسیدەکەدا بەزمانەکانیتر نووسراون لەگەڵ پەراوێزەکاندا کراون بەئینگلیزیو ئێمەش بۆ بەکوردی کردنیان پشتمان بەو پەراوێزانە بەستووە.
لەم وەرگێڕانەدا هەوڵمان داوە لەرۆحی شێوازەکەی ئێللیەت دوور نەکەوینەوە ئەوەندەی توانامان بەسەریدا شکابێت. دیارە ئەم شێوازەی ئێلیەت بەسەرەتای پەخشانە شیعر دادەنرێتو ئەوەندەی گرنگی بەمۆسیقای ناوەوەو پەیوەندی ئەو مۆسیقایە بە جیهانبینی دەقەکەوە دەدات ئەوەندە لەشێوەدا کارناکات، بەمانایەکیتر وێرانە خاك ئەوەندەی قەسیدەی شێوازە چەندین ئەوەندەی قەسیدەی ماناو دەلالاتی جۆراوجۆرە

کـەدەیان سـەرچاوەی ئـاینیو ئەفسـانەییو مسیۆلۆجیاو کۆمەڵایـەتیو.. ڕۆژئـاواو ڕۆژهـەڵاتی هەیە.

جێگـای خۆیـەتی ئامـاژە بـۆ ئـەوە بکـەم کەلەسەرەتای حەفتاکاندا کاك مەحمود زامدار ئەم قەسیدەی لەعەرەبیەوە کردۆتـە کـوردیو ساڵی 1975 بـەچاپی گـەیاندووە. دیـارە وەرگێڕانەکـەی ئـەو بەڕێزە لەعەرەبیەوە بووەو پێ دەچێت ئەو سـەرچاوە عەرەبیەی کەبەکاری هێنـاوە (وەکـو خۆیشـی دەڵـێ دوو سـەرچاوەی هەبووە) کەموکورتی تێدا بووە چونکە چەندین دێڕی دەقە ئینگلیزیەکە لەکوردیەکەی ئەودا نیە، یان ڕستەکان زۆر دوورن لەئینگلیزیەکەی.

بـەڵام دیـارە ئـەو کـارەی ئەوبـەڕێزە جێگـای تەقدیرو بەرز نرخاندنەو ئەم هەوڵەی ئێمەش هـەر بۆ دەوڵەمەند کردنی ئـەو هەوڵـەی ئـەوە، ڕەنگـە زمانی کوردیش تاکە زمان بێت کەتاکو ئێستا ئەم قەسـیدەی لەزمانـە ئەسـڵەکەوە بـۆ وەرنەگێڕدرابێت. (وەرگێڕ)


سەرچاوە:

1-The Norton Anthology of English Literature. (III) sixth Edition. Ed. By. Abrams and others. New York. London, 1986. p.p. 2511- 2526.

2- The faber Book of Modern Verse. Ed. By Micheal Roberts. London- 1965- p.p. 91- 104.




# گفتوگۆ



▪ گفتوگۆیەك لەگەڵ سۆلجنتسن دا

# گفتوگۆیەك لەگەڵ

# "ئەلیکسەندەر سۆلجنتسن"دا

■ سازدانی : دایڤید کویمان

● و. له عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**–ساڵی 1971 بۆ یەکەمجار رۆمانی (ئۆگۆستۆسی 1914)تان بەزمانی روسی بڵاوکردەوە، له ئێستاشدا چاپی نوێی ئەم رۆمانە بەزمانی ئینگلیزی دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران، بۆچی به پێویستتان زانی لێرەدا سێسەد لاپەڕەی دیکەی بۆ زیاد بکەن؟**

*نەسکی سەرەکی لەم زیادکردنەدا تەرخانە بۆ (لینین)، بەشەکانی تریش لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرن که ساڵ لەدوای ساڵ لام روون بووەوە. ئەویش ئەوەیە کە ناکرێت هۆکارە سەرەکیەکانی شۆڕش تەنها بەپێی هەلومەرجی جەنگی جیهانی یەکەم (1914 – 1918) لێکبدەینەوە. چونکە ئەوەی راستی بێت من سەرەتا لەو باوەڕەوە دەستم بە نوسینی ئەم رۆمانەکرد کە زۆریەی خەڵك لە خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا لەسەری کۆكو تەبا بوون، ئەویش ئەوەیە کە گۆڕانی گەورەو چارەنووسساز لەمێژووی روسیادا شۆڕشی ئۆکتۆبەر بووە. بەڵام لەدوایدا گەیشتمە ئەو راستی‌یەی کە رووداوی چارەنووسساز لەمێژووی روسیادا شۆڕشی ئۆکتۆبەر نەبووە، بەڵکو ئەوەی شایستەی ناوی شۆڕشە رواداوی شوبات بوو. ئەوەی لە ئۆکتۆبەردا رووی دا جگە لە کۆدێتایەك لەنێو دەوڵەتدا هیچی تر نەبوو. هەر بۆ نموونە بەلشەفیەکان خۆشیان تاساڵی 1918 پێیان دەوت (کۆدێتای ئۆکتۆبەر). کەچی دواتر بەشێوەیەکی نەخشە بۆڕێژراو لەیەکیەتی سۆڤیەتدا شۆڕشی شوباتیان گۆڕی بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر.

**–ئەمە مانای وایە ئەوەی بەلای ئێوەوە دابڕان لەگەڵ مێژووی روسیادا دروست دەکات شۆڕشی شوباتە نەك ئۆکتۆبەر؟**

*بێگومان، شۆڕشی شوبات زیاتر له ئۆکتۆبەر دابڕان لەگەڵ رابردوودا دروست دەکات. (رژێمی شوبات) گەر بشێت ناوێکی لەو جۆرەی لێ بنێین،

نەیتوانی لەسەر پێی خۆی بوەستێو زوو بەزوو هەرەسی هێنا. بەڵام لەکاتی کۆدێتاکەی ئۆکتۆبەردا ئەوان بەتەنها دەسەڵاتیان کۆنترۆڵکرد، ئەو دەسەڵاتەی نەلەدەست کەسدا بوو، نەهیچ کەسیش خاوەنی بوو.

**-بۆچی بریارتان دا ناوی (پێچکەی سوور) لەسەرجەم بەشەکانی ئەم رۆمانە بنێنو، ناونیشانی (گرێ)ش لەسەر هەر بەشێکی نوێی ئەم رۆمانە دابنێن؟**

*ئەوەی لێرەدا من مەبەستمە پێچکەی ماشێن نییەو لەو بارەیەوە نادوێم، بەڵکو مەبەستم لە پێچکەیەکی گەردونی زەبەلاحە، پێچکەیەکی بێ ئەندازە گەورە، کە هەر هێندەی کەوتە جوڵە ئیتر هەموو کەسێك ناچارە ببێتە گەردیلەیەك لەناویدا. ئێمە قسە لە پرۆسەیەکی زەبەلاح دەکەین، کە هەر هێندەی کەوتە جوڵە، ئیتر راگرتنی کارێکی قورس و مەحاڵ دەبێت. بەڵام بۆچی زاراوەی (گرێ)م بەکارهێناوە، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کاتێك دەستم کرد بە خوێندنەوەو تاوتوێکردنی مێژووی ساڵانی (1914 – 1922)، گەر بێتو بەدوورو درێژی باسی ئەو ماوەیەم بکردایە، ئەوا کتێبەکە لەرووی قەبارەوە زیاد لە پێویست قەبە دەبوو، بۆیە تەنها لەرووداوە گرنگانەم پێچایەوە کە چارەنووسی رووداوەکانی دواتریان پێوە بەسترابووەوە. ئەمەش روداوە یەکلایی کەرەوەکان بوون کە هەموویان گرێیەك پێکیەوە بەستبوون.

**-یەکێك لە کارەکتەرە سەرەکیەکانی ئەم رۆمانەت سەرەك وەزیرانی پێشوی روسیا (پیوتەر ستۆ لیبین)ە، کە تۆپی سەرسامیت. دەکرێت بەکورتی رۆڵی ئەم پیاوەمان لە مێژووی روسیادا بۆ باسبکەی؟**

*رەخنەگرە موحافزکارەکان (ستۆلیبین)یان بە کەسێکی ئەنارشیست لەقەڵەم دەدا، بەڵام کادیتەکان (دیموکراسیە دەستوریەکان) کە خۆیان بەلیبرالی دەزانی، لەکاتێکدا بەپێی پێودانگی ئەوروپی رادیکاڵ بوون، بە موحافیزەکاریان دەدایە قەڵەم. بەڵام لەڕاستیدا (ستۆلیبین) کابرایەکی لیبرالی بوو. چونکە ئەو لەو باوەڕەدابوو کە بەر لەوەی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی دروست بکەین، پێویستە پێش ئەو هەنگاوە هاوڵاتیانی بۆسازو ئامادەبکرێت. واتە بەر لەوەی هەموو جۆرە مافێك ببەخشینە جوتیارە نەخوێندەوارەکان، پێویستە ئاستی گوزەرانیان چاك بکەین. ئەم بۆچوونەشی بۆچونێکی زۆر بونیادنەرانەو بەجێ بوو. (ستۆلیبین) بەیەکێك لە کەسە هەرە دیارو مەزنەکانی روسیا دادەنرێت لەسەدەی بیستەمدا. بەڵام کاتێك شۆڕشی **1917** رویدا،سیستمی دیموکراسی لیبرالی شوبات لەسەر کار لابراو هەموو ریفۆرمەکانی (ستۆلیبین)یش وەلانران.

بەمجۆرە روسیایان گەڕاندەوە بۆ دواوە. ئێمە بە درێژایی حەفتا ساڵ وڵاتمان وێرانکردو هەموو شتێکمان تێکو پێکدا (ژیانو گوزەرانی میللەت، ژینگە، بنەما بایەلۆژیو، ئەخلاقی و ئابووریەکان) لەبەر ئەوە ئێستا شتێکی ئاساییە کە خەڵکی بەمەبەستی دۆزینەوەی رستێك بیروبۆچوونی بونیادنەرو چەند تێزێکی ئیجابی ئاوڕ لە رابردوو بدەنەوەو سەرەنجامیش لەم کارەیان دا رووبەڕووی ریفۆرمەکانی (ستۆلیبین)ببنەوە، کە ئەو چۆن چۆنی سەوداو مامەڵەی لەگەڵ هەلومەرجی جوتیاراندا کردووە،.

**-چۆن سەیری کەسایەتی (لینین)دەکەیت لە چوارچێوەی گشتی رۆشنبیری روسیدا؟**

*(لینین) پەیوەندیەکی لاوازی بە رۆشنبیری روسییەوە هەبوو. سەرەڕای ئەوە لە قوتابخانەکانی روسیادا خوێندنی بەزمانی روسی تەواو کردبوو، پێدەچێت هەر لەوێشدا بەرهەمە کلاسیکیە روسیەکانیشی خوێندبێتەوە، بەڵام ئەو هەواداری رۆشنبیریەکی نێونەتەوەیی بوو. چونکە لەراستیدا (لینین) بۆ خۆی بەهیچ نەتەوەیەکەوە پەیوەست نەبوو، ئەو کەسێکی ئومەمی بوو. ساڵی **1917** بەشێوەیەکی توندڕەوانە خۆی لەگەڵ باڵی چەپی شۆڕشی دیموکراسیدا دەرخست. هەر چیش لەساڵی

1917دا رویدا بەسەر کردایەتی و ڕێبەرایەتی لایەنگرانی دیموکراسی شۆڕشگێڕ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێکیان لەدەست دا. لەبەر ئەوەی وەك پێویست خۆڕاگرو دامەزراو نەبوون، هەروەك چۆن بەقەد پێویست سەرسەختو دڵڕەق نەبوون. بەڵام (لینین) تاکۆتایی سەر سەخت و خۆڕاگربوو. لێرەوە دەتوانین بڵێین سەر هەڵدانو دەرکەوتنی (لینین) لەرەوتی مێژووی روسیادامەسەلەیەکی رەتنەکراوەو حەتمی بوو.

**-(برتراند راسل)ی فەیلەسوفی بەریتانی کە خۆی بەبێ بڕوا ناودەبرد، کاتێك دیداری (لینین)ی کردبوو وتی: لەنێوان سەرجەم ئەوکەسانەیدیدەنیم کردون (لینین) گەورەترین خراپەکارێکە چاوم پێی کەوتبێ و مرۆڤێکی ئێجگار بەدگومانە، تۆپێت وایە (لینین) کەسێکی شەڕانگێز و خراپەکار بووبێت؟**

*من بۆخۆم هەرگیز (لینین)م نەبینیوەو چاوم پێی نەکەوتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم کە (لینین) بێ ئەندازە مرۆڤێکی بەدگومان بوو.

**-مەبەستتان لەوشەی (بەدگومان) چییە؟**

*مەبەستم نەبوونی هیچ جۆرە سۆز و بەزەییەکە، نەبوونی هیچ هەستێکی مرۆڤانەیە لەکاتی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵك و جەماوەردا. هەروەها بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەدەبوون. بۆیە هەرکەسێك سەرپێچی بڕیارەکانی بکردایەو شوێنی نەکەوتایە وەك (مەنشەفیەکان) ئەوا دەکەوتە هێرش بردنە سەریان و هەموو جۆرە ناوو ناتۆرە یەکی لێ دەنان. (لینین) رقێکی زۆری لەمەنشەفیەکان بوو. تەنانەت بەبێ ئەوەی وشەی (شەڕو خراپە) بەمانا میتافیزیکییە بەربڵاوەکەشی بەکار نەبەین، ئەوا دەتوانین ئەم زاراوەیە بەمانا ئاساییە رۆژانەکەی بۆ کەسێکی وەکو (لینین) بەکار بهێنین.

**-لەو بڕوایەدایت رۆژێك لە رۆژان رۆمانی (پێچکەی سوور) بەبێ کەموکوڕیو بەشێوەیەکی تەواو لەیەکیەتی سۆڤیەتدا لەچاپ بدرێت؟**

*بێگومان، من بەدرێژایی پەنجاو سێ ساڵ سەرقاڵی ئەم پرۆژەیە بووم. هەموو ئەوشتانەی بیرم لێ دەکردەوە و لەمێشکمدا بوو، خستومەتە دوتوێی ئەم کتێبەوە. بۆیە گەر بەر لە چاپکردنو بڵاوکردنەوەی (پێچکەی سوور) ناچار کرام بگەڕێمەوە یەکیەتی سۆڤیەت، ئەوە وەك کەسێکی کەڕولاڵم لێ دێت. چونکە کەس لە هەڵوێستم حاڵی نابێتو لەوشتە ئاگادارنابن کەمن بەدرێژایی ئەو ساڵانە بیرم لێ کردۆتەوە. تەنها ئەو کاتەیش قسە کردنو گفتوگۆ لەگەڵ یەکدا مومکین دەبێت کە خەڵکی ئەم بەرهەمە بخوێننەوە. بۆیە بە پێویستی دەزانم بەر لە گەڕانەوەم ئەم کتێبەم لە گشت کتێبخانەکانی یەکیەتی سۆڤیەتدا دەست بکەوێتو بکەوێتە بەردەستی سەرجەم خوێنەران... دواجار دەبێت ئەوەیش بڵێم کە بڕیاری گەڕانەوە لەدەست خۆمدانییە، چونکە تا ئێستاش ئەوتۆمەتی خیانەتی گەورەیەی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەت دابوویانە پاڵم، هەروەکی خۆی ماوەو هیچ دەسکارییەکی نەکراوە. دەسەڵاتدارانی یەکیەتی سۆڤیەت منیان بە تۆمەتی خیانەتکردن لە نیشتمان تاوانبارکرد، هەر بۆیە لەبری ئەوەی لەسەر ئەو تاوانە گوللە بارانم بکەن، بڕیاریان دا لەوڵات دەرم بکەنو رووەو تاراوگەوەدەریان نام.

**-تۆ خۆت ئەوەت راگەیاندبوو کە نووسەرێکی لە چوارچێوەی کەلەپووری روسیداو، بەپێی پێودانگی نوسەرانی روسیای سەدەی نۆزدە دەنووسیت، مەبەستتان لەمەچییە؟**

*ئەمە هەرگیز مانای ئەوە ناگەیەنێت کەمن راستەو خۆ شوێن هەمان تەرزی سەدەی نۆزدەهەم دەکەومو لاسای هەمان شێوازە هونەرییەکانی ئەو قۆناغە دەکەمەوە. نەخێر هەرگیز، لەبەر ئەوەی ئەوەی لای من هەیە

مادەیەکی ئاسایی نی یە، کەرەستەیەکە رەگەزی هونەری تایبەتی و شێوازێکی هونەریی تایبەتمەند دەخوازێت. مەبەستم لەوەها راگەیاندنێکیش ئەوەبوو، تابەردەوام بم لەسەر لە ئەستۆگرتنی ئەو بەرپرسی یە بەرامبەر بەخوێنەرو، بەرامبەر بە وڵاتەکەمو، بەرامبەر بە خودی خۆشم. ئەمەش ئەوبەرپرسیارییەیە کە بەیەکێك لەبنەما سەرەکیەکانی ئەدەبی روسی دادەنرێت لەسەدەی رابردوودا. لەبەر ئەوەی نوسەرانی ئەو سەدەیە بەهەستکردنێکی زۆرو بەوپەڕی بەرپرسییەوە دەیان نووسیو، بەتەنها بۆکات بەسەر بردن نەیان دەنووسی.

**-نووسەری ئەمریکی (هنری جیمس) لە شوێنێکدا وتبووی: رۆمانە روسیەکان (بەقەبارە گەورەو بێ کەڵك و لاوازن) ئەو داستانەی ئێوەش کەبەناوی (پێچکەی سوور)ەوەیە هەزاران لاپەرە دەبێت، واتە لە (شەڕو ئاشتی)یەکەی (تۆلستۆی) زۆر گەورە تر دەبێت. لەبارودۆخی ژیانو ئەدەبی روسیدا چی هەیە کە قەبارەیەکی گەورەی لەوجۆرە بۆ نووسینی رۆمان بخوازێت، گەر بێتو ئەمە لەگەڵ ئەو رۆمانانەدا بەراوردبکرێت کە لەوڵاتانی تردا دەنوسرێت؟**

*بەڵێ من دان بەوەدا دەنێم کە رۆمانەکانم قەبارەیان ئێجگار گەورەیە... بەڵام وتەیەکی گرنگ هەیە دەڵێت: ئەوەی مێژووی خۆی بیردەچێتەوە مەحکومە بەوەی سەرلەنوێ دووبارەی بکاتەوە. کاتێك ئێمە مێژووی خۆمان بەباشی نەناسین و بێ ئاگابین لێی، ئەوا بێگومان- سەرلەنوێ- دەست بە دووبارەکردنەوە هەمان هەڵەکانی رابردوو، هەمان قوربانیو سەرەڕۆییەکانی پێشوودەکەینەوە. ئەم بەرهەمەی من کتێبێك نییە بەئاسانی بخوێنرێتەوە، یان کتێبێك بێت بۆکات بەسەر بردن.. خوێندنەوەی ئەم کتێبە بەمانای شارەزابوونو حاڵی بوونە لەمێژووی خۆمان. من لەوباوەڕەدام خوێنەران پێویستیەکی زۆریان بە خوێندنەوەی ئەم کتێبەهەیە، لەپێناو تێگەیشتن شارەزابوون لەمێژووی خۆیان.

**-ئەمەمانای وایە کەبەلای ئێوەوە ئەدەب لە ئێستاشدا هەروەك سەردەمی رابردوو، هەڵگری پەیامێکی ئەخلاقی و فەلسەفی و سیاسی بەرزبێت؟**

*بەڵێ، لە روسیادا هەمیشە کار بەم شێوەیە بووە.

**-بەردەوام بە (تۆلستۆی)و (دێستەیەڤسکی) بەراورد دەکرێیت، ئەمەش لەو رووەوەی کە تۆش وەك ئەوان هەمان چارەسەری ئەدەبی و فیکری بۆ کاراکتەری رۆمانە کانتان دەدۆزنەوە، پەیوەندیت بە هەردووکیانەوە چۆنە؟**

*رێزێکی زۆرم هەیە بۆ هەردووکیان.. من هەست بەنزیکایەتیەکی روحی دەکەم لەگە هەردووکیاندا. بەڵام ئەم هەستەم جیاوازەو لەیەکێکیانەوە بۆ ئەوی تریان دەگۆڕێت. لە روی فۆرم و گێڕانەوەو خستنە رووی بابەتەکانەوە لە (تۆڵستۆی)یەوە نزیکم، بەڵام لەروی تێگەیشتنم دەربارەی تەفسیرکردنی رۆحیانەم بۆ مێژوو، ئەوا لە (دێستەیەڤیسکی)یەوە نزیکترم.

**-سەرەتا هەستان بەوە دەکردو پێشبینی ئەوەتان دەکرد لە ئایندەدا دەبن بەچی، واتە ئێوە لەو بڕوایەدا بوون کە پێویستە شتێکی گرنگ بنووسنو جیهانی لەبارەوە لێ ئاگادار بکەنەوە؟**

*پێموایە جۆرە هەستکردنێکی وامەبێت، بەڵام بێ ئەوەی بزانین هەستێکی وا لە کوێوە سەچاوە دەگرێت. ئەگەرچی ئەمەشتێکەو بەراستی لای هەموو کەسێك هەیە... من لەتەمەنی نۆ ساڵیمەوە پێشبینی ئەوەم دەکرد کە دەبمە نووسەر، بەڵام نەمدەزانی چی دەنووسمو، لەبارەی چ شتێکەوە دەنووسم. دوای ئەوەی شۆڕش بەرپابوو هۆگری بابەتی شۆڕشگێڕانە بوومو، لەسەرەتای ساڵی 1936 وە کاتێك لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا بووم دوودڵ نەبووم لەو بابەتانەی لەبارەیانەوە دەنووسم، بڕواشم وابوو کە هیچ کەس ناتوانێت لە

هەڵوێستێکی وا ساردم کاتەوەو رێگام پێ بگۆڕێت. زۆرجار هەستێکی سەیر لەناخەوە داماندەگرێت.. بۆ نموونە جارێکیان دەستمکرد بە باسکردنی ژەنەراڵ (ئەلیکسەندەر کرایمۆف)، ئەو ژەنەراڵەی هیچ شتێکم لەبارەیەوە نەدەزانی، لە رەشنووسەکەمدا باسێکی سەرەتایم لەمەڕ کەسێتی ئەوەوە نووسی. پاش ئەوە بۆم دەرکەوت کتومت ئەو پیاوە وەك خۆی چۆن هەیە ئاوە ها باسم کردووە، وەك ئەوەی لەوەویەر بینیبێتم. بۆیە دەڵێم ئەوەی کە رووی‌دا مایەی سەرسوڕمان بوو.

**-لەتافی لاویەتیدا باوەڕت بەکۆمۆنیزم هەبوو، وەك ئەندامێکیش کارت لە رێکخراوی لاوان (الکمسمول) دا دەکرد. بەڵام دواتر بوویتە مەسیحیەکی خاوەن بڕوا، ئەم گۆڕانکاریە چۆن رووی‌دا؟**

*رێگەم بدە تا ئەم پرسیارەت راست کەمەوە. من بۆخۆم لەکەش‌و هەوایەکی ئایینی‌دا گەورەبووم‌و دایك‌و باوکیشیم بەڕۆحێکی مەسیحیانە پەروەردەیان کردم. هەر بۆیە تاتەمەنی هەژدەساڵی دژ بە پەروەردەو فێر کردنی سۆڤیەتی بووم. لەم رووەوە دەبوو ئەم بۆچونەم لەخەڵکی بشارمەوەو دەری نەبڕم. بەڵام لەدوایدا هێزوکاریگەری شاڵاوی مارکسیزم لە یەکیەتی سۆڤیەتدا هێدی هێدی شوێن‌و جێی خۆی لەمێشك و دەروونی لاواندا کردەوە.. بۆیە لەتەمەنی هەژدە ساڵیمەوە گۆڕانێکی (ناوەکیم) بەسەرداهات‌و لەودەمەوە بوومە کەسێکی مارکسی -لینینی‌و، قەناعەتی تەواویشم پێی هەبوو، تاقۆناغی زانکۆو سەردەمی جەنگ و ساتەوەختی زیندانی کردنم بەو شێوەیە مامەوە بەڵام کاتێك لە زینداندا خەڵکی هەمە جۆرم بینی، بۆم دەرکەوت کە بۆچوونەکانم بنەمایەکی هێندە پتەوو بەهێزیان نی‌یەو، رەنگە لەکاتی دیالۆگ‌و مشتومڕدا خۆیان رانەگرن‌و هێزی رووبەڕووبوونەوەو بەرپەرچدانەوەیان نەبێت.. بۆیە ناچاربووم دەست بەرداری بیرکردنەوەیەکی لەوجۆرەبم‌و وەلاوەی بنێم، پاشان گەڕامەوە سەر ئەوەی لەمنداڵیدا باوەڕم پێی هەبوو. ئەمەش پتر لەساڵێکی خایاند. لەم رووەوە خەڵکی دیکەش کاریگەریان لەسەرم هەبوو. بەڵام هاوکات هۆیەکی کەش هەبوو هانی ئەوەی دام تابگەڕێمەوە سەر ئەوەی لەرابردوودا باوەڕم پێی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کەمن درکم بەو حەقیقەتە دەکردو لەوە بەئاگابووم کەوا دەمرم. مەبەستمە بڵێم کەمن لەمردنەوە نزیك بووم (سۆلجنیتسین لێرەدا مەبەستی توشبونیەتی بەنەخۆشی شێرپەنجە) ئەمەش زۆر بەتوندی رایچڵەکاندم. کاتێك لەتەمەنی سی‌وچوار ساڵی‌دا بووم لەوە ئاگادارکرامەوە کە لە توانادانی‌یە رزگارم کەن‌و مسۆگەر دەمرم. بەڵام دوای ئەوە سەرلەنوێ گەڕامەوە ئامێزی ژیان. ئەم گۆڕانانەش هەمیشە کاریگەریەکی زۆرو بەهێزیان بەسەر بیروباوەڕو قەناعەتی مرۆڤەوە دەبێت.

**-راوبۆچونتان سەبارەت بە بیروباوەڕی مەسیحیەت لە چوارچێوەی کڵێسای خۆرهەڵاتی روسی‌دا، هانی هەندێك لەرەخنەگرانی‌دا کەتۆمەتی جۆراوجۆری وەك شۆفێنیزم و دەمارگیریی نەتەوایەتی بدەنە پاڵتان، ئایا تۆ نەتەوە پەرستێکی روسیت، لای ئێوە ئەمە چ مانایەکی هەیە؟**

*بەکورتی پێتی بڵێم من بۆخۆم سەرم لەم شتانە دەسوڕمێت، چەندین تۆمەت‌و بوختانیان بۆ هەڵبەستووم، ئێستا هەندێکیانت بۆ باس دەکەم: پێیان وتبووم گوایە من یەکێکم لەلایەنگرانی حوکمی (سیۆکراتی) و خوازیاری ئەوەم دەوڵەت‌و دام‌و دەزگاکانی دەوڵەت لەڕێی کاربەدەستانی کڵێساوە بەڕێوە ببرێن، لەکاتێکدا من هیچ شتێکی وەهام نەوتووە. یان دەڵێن تۆ یادی سەردەمی قەیسەری دەکەیت‌و خوازیاری ئەوەیت روسیای هاوچەرخی کۆمۆنیستی بگەڕێتەوە دۆخی جارانی (سەردەمی قەیسەری) ئەمەش بەچاوپۆشین لەوەی کە بەتەنها شێت دەتوانێت بڕوای بەئەگەری گەڕانەوەیەکی لەوجۆرە هەبێت رووەورابردوو، دەڵێم بەچاوپۆشین نەمە دەتوانم بڵێم کەمن لەم رووەوە لە هیچ جێگەیەکدا هیچ شتێکی وام لەم بارەیەوە نەنووسیوە، هەرگیز نەشم وتووە مالکیەت

سستمێکی بێ خەوش و میسالیيە. کەچی هەموو ئەمانەیان داوەتە پاڵ من. ئەویش تەنها لەبەرئەوەی لەیەکیەتی سۆڤیەتدا خەڵکی لەوقەناعەتەدان (نیکۆلای دووەم) کەدوایەمین قەیسەری روسیایە لەمرۆڤ کەمتربووە، واتا لەمەیمونێك زیاتر نەبووە. بەڵام من وەکی مرۆڤێك لەبارەیەوە نووسیومەو حسابی ئینسانم بۆ کردووە. رونتر بڵێم من لەم رووەوە خۆم لە دیدو بۆچوونە باوەکان پاراستووەو لێیان دوورکەوتوومەتەوە. خەڵکانێك هەن سەرەرای تەواوی هۆشیاری و بەئاگاییان، کەچی شتەکان دەشێوێنن‌و هەندێکیش ئەوەندە خۆیانی پێوەماندووناکەن تالە راستی‌و دروستی زانیاریەکان بپێچنەوە. کە ئەمەش شتێکەمایەی سەرسامی‌یەو، من بۆ خۆم شەرمم پێی دێت. هەروەها دەکرێت هەمان شت سەبارەت بەتاوانبارکردنم وەك ناسیۆناستێکی توندرەو بوترێت.

من کەسێکی نیشتمان پەروەرم و نیشتمانەکەی خۆمم خۆشدەوێت. ئاواتەخوازی ئەوەشم ولاتە نەخۆش‌و پەککەوتەکەم، ئەو ولاتەی بەدرێژایی حەفتاساڵ وێرانیان کردو، ئێستاش لەسەر لێوارەکانی مردندا راوەستاوە، خوازیاری ئەوەم سەرلەنوێ ببوژێتەوەو ژیانی بەبەردابێتەوە. هەموو ئەمانەش هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کەمن نەتەوە پەرستێکی توندرەوبم. لەم رووەوە ناشمەوێت هیچ کەس نیگەران کەم و کەسیش لەخۆم برەنجێنم. هەموو ولاتێك نیشتمان پەروەرانی خۆی هەیەو خاوەنی نیشتمان پەروەرانی خۆیەتی، ئەوانەی هەمیشەو بەردەوام نیگەرانن و دەستیان لەسەر دڵیانە سەبارەت بە چارەنووس‌و ئایندەی نیشتمانەکەیان.

**—چۆن دەڕوانیتە ئەو شاڵاوو هێرشانەی نەیارەکانت دەیکەنە سەر دیدو بۆچوونەکانت، هەڵوێستێکی‌وا چۆن لێکدەدەیتەوە؟**

*ئەوکاردانەوانەی لەبەرامبەر بۆچوونەکانمدا هەن لە ئەوروپا جیاوازو هەمە جۆرەن، بەڵام لەیەکیەتی سۆڤیەت‌و ئەمریکادا، رێك هەموو ئەوباری سەرنجانەی سەبارەت بەمن لەئارەدان بەشێوەیەکی رەها یەك شت‌و هەموویان لەیەك دەچن.

هێندەی پەیوەندی بەیەکیەتی سۆڤیەتەوە هەبێت بەئاسانی تێی دەگەم، لەبەرئەوەی لەسۆڤیەتدا هەمووشتێك پەیوەستە بە بڕیارو فەرمانەکانی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستەوە. بەڵام لەئەمریکادا لەم رووەوە (مۆد) گرنگیەکی زۆرو بەرچاوی هەیە. واتە ئەگەر (با)ی ئەو دیدوبۆچونانەی کەباوە رووەو لایەك هەڵبکات ئەوا هەموان بەو ئاراستەیەدا دەنووسن‌و بەکۆی دەنگ هەمان شت دەڵێنەوە، ئەمەش بۆخۆی جێی سەرسوڕمانە.

ساڵی **1978** لە زانکۆی هارڤەرد لێکچەرێکم پێشکەشکرد، تیایدا باسم لە خاڵە سلبی‌یەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکی‌کرد، ئەمەش لەوباوەڕو قەناعەتەوەکە دیموکراسیەت تینووی رەخنەیەو پێویستی زۆریشی پێیەتی. بەڵام رۆژنامەگەری ئەمریکی هەڵوێستێکی لەوجۆرەی پێ قبوڵنی‌یەو، نایەوێت مامەڵەی لەگەڵدا بکات. بەرامبەر بەوبۆچوونانەم رۆژنامەکان وەڵامێکی زۆر توندوتیژیان دامەوە. بۆیە لەو ساتەوە من بومەتە دوژمنی رۆژنامە ئەمریکیەکان، هەر لەبەر ئەوەی‌مەسەلەیەکی لەو جۆرەم وروژاندووە..

نارەزایی هەندێك گەیشتە ئاستێك تالە رۆژنامەکان بپرسن بۆچی لێپرسراوانی ئەمریکا وابەخێرایی رێگایان لەبەردەم (سۆلجنیتسین) کرۆدۆتەوە بێتە ولاتەکەمانەوە؟ لەکاتێکدا پێویست بوو رێگەی پێ نەدرێت‌و مافی نیشتەجێبوونی نەدرێتێ. لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێم کە ئەم هەڵوێستەی ئەمریکیەکان بۆمن مایەی پەژارەو دڵتەنگی بوو.. لەبەر ئەوەی جەوهەری ئەو باسەی من لە هارڤەردا پێشکەشم کرد پەیوەندی بەدابەشبوونی جیهانەوە هەبوو، ئەو جیهانەی کەلێنێکی تێکەوتووەو بەیەکگرتووی نەماوەتەوەو، بەیەك ئاراستەدا رەوت ناکات (ئەمەش بۆخۆی بەلای بیری ئەمریکی بەتایبەتی و خۆرئاوا بەگشتی

بیرۆکەیەکی تازەبوو). هەڵەی خۆرئاواش لەم رووەوە -کەئەمە دەسپێکی باسەکەی من بوو- ئەوەیە کەهەموو شتێك بەپێی پێودانگی شارستانی خۆی دەپێوێو، لەم رووەوەش حوکم بەسەر ژیارەکانی تردا دەدات کەتاچەند پابەندی دیدو بۆچوونەکانی خۆرئاوابن. هەربۆیە ئەوانەی لەگەڵ جیهانبینی خۆرئاوادا کۆك نەبن‌و هەڵگری هەمان دیدوبۆچوونەکانی ئەونەبن، ئەوا چەندین تۆمەتی جۆراوجۆری وەك (دواکەوتوو، کۆنەپەرست‌و، سست‌و نەبزۆکیان) دەدرێتە پاڵ. ئەمەش لەخۆیدا بۆچونێکی پڕمەترسیەو پێویستە وەلاوە بنرێ‌و ئافەرۆز بکرێت.

**-لەم رۆژانەدا گۆڕانکاری زۆر گرنگ لەیەکیەتی سۆڤیەت‌و سەرجەم وڵاتانی کۆمۆنستی‌دا روو دەدات، بۆچی لەبەرامبەر ئەم گۆڕانکاریانەدا هەڵوێستی بێ دەنگیتان وەرگرتووە؟**

*گەر بێتو من هەر لەسەرەتای ئەم رووداوانەوە هەڵوێستی بێ دەنگیم وەرگرتایە، ئەوابێ گومان وەها هەڵوێستێك جێی گومان‌و مایەی سەرسوڕمان دەبوو. بەڵام من هەر لە ساڵی 1983 وە و بەر لەوەی هیچ شتێك سەبارەت بەم مەسەلەیە لە ئارەدا بێت لەئاست ئەو رووداوانەدا بێ‌دەنگ بووم‌و هەڵوێستی بێ دەنگیم هەڵبژارد. چونکە نەدەکرا واز لە نووسینی کارەکانم بهێنم‌و ببمە قسەکەرێکی سیاسی. کارێکی لەوجۆرەش ویست و ئارەزووی من نەبوو، نەشم دەویست لەو کارەوە بگلێم، بەڵکو ئەوەی مەبستەتی من بوو ئەوەبوو لەنووسین بەردەوام بم‌و کارەکانم تەواو بکەم.. من هەنووکە تەمەنم زیاد لەحەفتا ساڵەو پیرو کەنفت بووم‌و، دەرفەتی زۆرم بە دەستەوە نەماوە.

**-ئێوە جارێك باستان لەوەکردبوو کەوا ژیانی رۆحی خۆرئاوا لەم سێ‌سەد ساڵەی رابردوودا رووەو ناهەمواری چووە، مەبەستان لەمە چی‌یە؟**

*لە خۆرئاوادا پەرەسەندن‌و پێشکەوتنێکی تەکنۆلۆژی بەرفراوان لە ئارەدایە، بەڵام ئەمە وەکی پێویست هاوشانی گەشەی ئینسانی نی‌یە. ئەمەش کێشەیەکی ئاڵۆز و دژواری هەموو شارستانیەتێکی ئینسانی‌یە. لە ژیاری خۆرئاواداو لەگەڵ پەرەسەندنی رەوتی ئەقڵانی و زانستی‌دا، بەهاو خەسڵەتە ئەخلاقیە دروستەکان لەناچوون‌و بزربوون. هەموو ئەمەش لەو سێ‌سەد ساڵەی مێژووی ژیاری خۆرئاوادا رویدا. ئێستا خەڵکی ئەرکێکی کەم‌و مافێکی زۆرو زەبەندییان هەیە. پێویستە بەشێوەیەکی یەکسان مامەڵە لەگەڵ ئەرك و مافەکاندا بکەین. ئەمە ئەگەر هاتوو لە یاساشدا نەهاتبێ و یاسا خۆشی بەوە ناچارمان نەکات، ئەوا پێویستە لەسەرمان خۆمانی لەگەڵدا رابهێنین.

**-شۆرەت و ناوبانگی ئێوە بەو نوسین‌و بەرهەمانەوە پەیوەستە کە تایبەتن بەگۆلاگەکانی سۆڤیەتەوە، ئێستا پێت وایە گەر ئەزموونی خۆت لەو کەمپانەدا نەبوایە وابەئاسانی شارەزای ژیانی سۆڤەتیەکان نەدەبوویت. کارێکی لەو جۆەش بەبێ ئەزموون‌و تاقیکردنەوەی خۆت لەو بوارەدا دەستەبەر نەدەبوو؟**

*بەڵێ وایە. چونکە هەمیشە خەسڵەتەکانی مرۆڤ لەم بارودۆخە ناهەموارانەدا بەشێوەیەکی باشتر دەردەکەوێ‌و ئاشکرا دەبێت. من خۆش بەخت بووم بەوەی لەو کەمپانەدا بووم، لەوەش خۆشبەختی تر ئەوەبوو کەتوانیم لەوێدا بەزیندویەتی بمێنمەوەو ژیانم لەدەست نەدەم...

<u>*پەراوێز:*</u>

دەقی ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ گەورە رۆمان نووسی روسیادا ئەلکسەندە سۆلجنیتسین (1918 – 1994) پەیامنێری گۆڤاری (تایم)ی ئەمریکی (دایڤید کویمان) لەساڵی 1989 دا سازی داوە، ئەوکاتەی کە گەرمەی گۆڕانکاریەکانی ناو یەکیەتی سۆڤیەتی وولاتانی ئەوروپای خۆرهەلات بوو.



# فایلی ژمارە



## کارل پۆپەر و کۆمەڵگای کراوە

# کـــارل پـــۆپـــەر

■ حوسێن بەشیریە

● و. لەفارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

**کارل رایمۆند پۆپــەر** (1913–1994) پـتر وەك فەیلەســوفی زانســت و زانـــین نـــاس (ئەپیستمۆلۆجیست) ناوبـانگی دەرکـــردووە. کاریگەریی زانستیانەی پۆپەر، بەتایبەتی لەبواری میتۆدۆلۆجیای زانستیدا، فراوانەو جێی متمانـەی زانایـانی بـوارە جیاجیاکـانی زانسـتە. پۆپـــەر لەنەمسـا هاتـە دونیـاوەو، لـەزانکۆی ڤیـەننا ماتماتیك و فیزیاو دەروونناسیی خوێند. لەتافی لاویـدا لەسیاسـەتدا چـالاك بـوو و مـەیلی سۆشیالیستیشی هەبوو. لـەو سەروەختەدا، ئـەو لـە ڕووی زانستی و فەلسـەفییەوە ڕەخنـەی لـە پۆزیتیڤـیزمی مـەنتیقی (LOGICAL POSITIVISM)ی گرووپی ئەڵقەی ڤیەننا دەگرت. ئەم ڕەخنانەشی لەیەکەمین کتێبی گرنگیدا لـەژێر ناوی لۆجیکی دۆزینەوەی زانستی The Logic of Scientific Dicsovery (1934)دا بڵاوکردەوە، کە ئەڵقـەی ڤیـەننا خۆیـان بۆیـان لەچاپدا.

بـە زیـادبوونی دەسـەڵات و سـەرکەوتنی فاشیزم، پۆپـەر نەمسـای جێهێشـت وبـەرەو نیوزلـەند ڕۆیو، لەساڵانی 1937–1945دا لـەوێ خـۆی بـە وانەوتنـەوەوە خـەریك کـرد. لـەم ماوەیەدا، کـارە سـەرەکیەکەی خـۆی نووسـی، کەبریتی‌یـە لـە کتێبـی "کۆمـەڵگای کـراوەو دوژمنەکانی". (The Open Society and Its Enemies).

پـاش کۆتاییـهاتنی جـەنگ، لـە ئینگلتـەرە نشـیتەجێ بـوو و، لـەوێ بـوو بـە مامۆسـتای فەلسـەفەی زانست و لۆجیکی زانکۆی لـەندەن. لەساڵی 1957دا کتێبی (هـەژاریی مێژووگـەرایی The Poverty of Historicism) لـە 1963دا کتێبـی (مەزەنـەکان و پوچەڵکردنـەوەکان

Congectures and Refutations)و، لەساڵی 1972 یشدا (زانینی بابەتیانە: نزیکبوونەوەیەکی گۆڕانخوازانە Obgective Knowlege: An Evolutionary Approach)ی نووسی.

پۆپەر لەم کتێبانەیدا شوێن پێی ئەنجامگیرییەکانی پێشووی خۆی هەڵگرت لە ڕەخنەگرتنیدا لەپۆزیتیڤیزم و ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی ئەوەی کە مێژوو خاوەنی کۆمەڵێك یاسای تایبەت بەخۆی بێت.

بۆچوونی سەرەکیی ئەو بریتییە لە ڕەتکردنەوەی میتۆدی (ئیستیقراء) لەزانستە ئەزموونگەرەکاندا، کە بەو پێیە گریمانە زانستیەکان بە بینینی پۆزەتیڤانە دەسەلمێنرێن. لێکۆڵینەوەکانی پۆپەر بوونەتە مایەی مشتومڕی فراوان لەنێوان لایەنگرانی پۆزیتیڤیزم و مارکسیزمدا. پۆپەر لەبواری بیری سیاسیداو لە ڕوانگەیەکی زانستیو فەلسەفییەوە بەرگریی لە لیبرالیزم و دیموکراسی کردووەو، لەڕێی بڕوابوونی بە پرەنسیپی نایەقین (یان گومان) (uncertainty principle)ەوە لەفەلسەفەو فیزیادا؛ جەختی لە ئازادبوونی مێژوو لەکۆتی یاساو مەحاڵبوونی پێشبینیکردنی ئاینده کرد.

لەکارە سەرەکیەکانی تری ئەو، پێویستە ناوی (پاشکۆی لۆجیکی دۆزینەوەی زانستی) بهێنین کە بریتییە لە سێ بەرگ:

(ریالیزم و ئامانجی زانست Realism and the Aim of Science) 1983، (جیهانی کراوە: بەڵگەیەك بۆ ناحەتمێتی The Open Universe: An Argument for indeterminism) 1982، (تیۆرەی کوانتۆم و جیاوازیی بۆچوون لەفیزیادا Quantum Theory and the Schism in physics) 1982.



بەشێوەیەکی گشتی پۆپەر بەرگریکاری هزری ئازادیی سیاسیو کێبەرکێی ئازادەو، تیۆریستی ئەندازیاری کۆمەڵایەتیی هەنگاو بەهەنگاو و، بەرگریکاری کۆمەڵگای کراوەو، دژی مێژووگەراییو هەموو جۆرە ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشخوازانەو یۆتۆپیاییە. هەروەها شیکردنەوە گفتوگۆئامێزو نوێیەکانی پۆپەر لە مەڕ بیروڕاکانی فەیلەسوفە سیاسییەکانی کۆن، بەتایبەتیش ئەفلاتون و هیگل، ئەویان خستۆتە ریزی ڕاڤەکەرە ناودارەکانی فەلسەفەی سیاسییەوە. بۆ ناسینی هزری سیاسیی پۆپەر دەبێ لە بەرگرییەکانیدا لە لیبرالیزم، بۆی بگەڕێین. بەڵام لەبەر ئەوەی لیبرالیزمیش لای پۆپەر پەیوەستە بە تیۆرەکانییەوە سەبارەت بە زانست، بۆیە دەبێ لەناو تیۆرەی گشتیی ئەودا دەربارەی گەوهەری زانین و ئازادی و ئەقڵانیەتی هزرو کاری ئادەمیزاد؛ لە بەرگریکردنی لە لیبرالیزم بکۆڵینەوە.

## فەلسەفەومیتۆدی زانست

لەدەسکەوتە سەرەکیەکانی تیۆرەی زانست لای پۆپەر دۆزینەوەی وەڵامە بۆ گرفتی (ئیستیقراء) لەزانستدا، کە لە زەمانی "دیڤید هیوم"ەوە گومانێکی بنەڕەتیی لە بونیادی زانستی ئەزموونگەرادا دروستکردووە. لە سەردەمی فرانسیس بیکۆنەوە زانستی ئەزموونگەراو یاساخواز پشتی بە پرنسیپی (ئیستیقراء) بەستبوو: "تیۆرەی نادروست

دەربارەی زانست کە بە بیکۆن دەستیپێکردبوو.. تیۆرە (یەکی) پشتبەستوو بەوەی کە زانستە سروشتیەکان هەموویان کۆمەڵێك زانستی (ئیستیقرائی)ن."(1) بەلام هیوم گومانی لەم پرنسیپەکردبو، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لە رووی لۆجیکیەوە ناتوانین ئەو یاسایانەی سەبارەت مەسەلە ئەزموونگەراکانی رابردوو راست بوون، لەئایندەشدا هەر بە راستیان بزانین.

"زانست نە ئیستیقرائیەو نە پشت بە ئەزموون و بینین دەبەستێ، هیوم ئەم ئەفسانەیەی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە."(2) بەم پێیە زانستی ئەزموونگەرای ئیستیقرائیی یاساخواز لە رووی لۆجیکی و ئەزموونیەوە بونیادێکی تۆکمەی نیە، لەبەر ئەوەی ئیستیقراء لە لۆجیك و ئەزموونەوە ئەنجامگیری ناکرێ. پۆپەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە راستی‌ی یاسا ئیستیقرائیە ئاشکراکان (وەکو هیوم دەیگوت) قابیلی سەلماندن نین، بەلام هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە ناکرێ رەتیانبکەینەوە، بەڵکو دەبێ لە رێی تاقیکردنەوەوە هەڵبسەنگێنرێن (و لە روانگەی چوونیەکی‌ی ئەزموونیەوە دەوڵەمەندتر بن) تا بتوانین ئەوانە رەتبکەینەوە، یان بەدرۆیان بخەینەوە. بەرامبەر رەخنەکەی هیوم، پۆپەر لەو بروایەدایە کە "ئێمە بەبێ ئەوەی چاوەڕێی ئەوەبین کە دووپاتبوونەوەی رووداوەکان و کاریگەرییان لە سەرمان هەندێ رێسا بە سەرماندا بسەپێنن، کارایانە هەوڵدەدەین ئێمە رێسا بەسەر جیهاندا بسەپێنین. هەوڵدەدەین چوونیەکیەکانی ناو جیهان بدۆزینەوەو، بەگوێرەی ئەو یاسایانەی خۆمان دامانهێناون روونیان بکەینەوە. بە بێ ئەوەی چاوەڕێی هەندێ سەرەتابین بەرەو ئەنجامەکان دەبزوێین. ئەگەر تاقیکردنەوە نادروستیی ئەوانە بخاتە روو؛ دەشێ هەمان ئەو ئەنجامانە بخەینەلاوە."(3) کەواتە دەبێ تیۆرە زانستیەکان بە جۆرێك رێکبخەین کە بە ئاسانی قابیلی رەخنەو پووچەڵکردنەوە بن. زانین و زانست لەڕێی پووچەڵکردنەوە refutation و رەخنە critque وە بەرەو پێشەو دەچن. بە دەربڕینێکی دی، هەوڵدانی فیکری بۆ پووچەڵکردنەوەی تیۆرەکان دەبێتە مایەی گەشەسەندنی زانست. دەبێ پووچەڵئامێزی falsifability (واتە بوونی توانای پووچەڵبوونەوە-و-) بکەینە سیفەتی جیاکەرەوەی مەسەلە ئەزموونیەکان لە نائەزموونیەکان و، توانستی جیاکردنەوەی زانست لە نیمچە زانست pseudosciensce. لە رەوتی پێشکەوتنی زانستدا ئەو مەزەنانەی لە روونکردنەوەی مەسەلەکاندا رۆڵدەبینن لێدەدرێن و، پاشان ئەو مەزەنانە لەڕێی تاقیکردنەوەوە پووچەڵ دەکرێنەوە. بەم پێیە گەشەسەندنی زانست دەرئەنجامی رەوتی لابردنی هەڵە error elimination یە.

هەر بۆیە زانستی کامڵ و بێ خەوش نیە، زانست دەرئەنجامی رەخنەو پووچەڵکردنەوەیە. بەپێچەوانەی رای باوی پۆزیتیڤیستەکان، زانست لەڕێی سەلماندنی تیۆرەکانەوە گەشە ناکات، بەڵکو لەڕێی رەخنەگرتن لێیانەوەو پیاچوونەوەی تازەیاندا. "مامەڵەی زانستی رەخنەگرانەیە، کاری بە سەلماندن نیە، بە دوای ئەزموونە سەرەکیەکاندا دەگەڕێت، ئەو ئەزموونانەی کە دەشێ ئەو تیۆرەیە پووچەڵبکەنەوە کە دەمانەوێ تاقی بکەینەوە، بەلام هەرگیز ناتوانێ بیسەلمێنێت."(4)

بۆیە زانست و زانینی زانستیانە ماهیەتێکی بێ برانەوەو بێ کۆتایی و مەزەنە ئاسایان هەیە. ناکرێ هیچ تیۆرەیەکی زانستی بە تیۆرەیەکی تەواو دروست و راستەقینە بژمێرین. بە تەنها دەتوانین بڵێین کە ئەزموون لایەنگرێتی. "وێنەی گشتیی زانست لەوەدایە کە ئێمە مەسەلەیەکی بەرچاو دەگرین، پاشان بێ سڵکردنەوەو ئازایانە تیۆرەیەك وەکو رێگەچارەیەکی کاتی پێشنیاز دەکەین. ئینجا ئەوپەڕی توانای رەخنەگرتنی خۆمان لەتیۆرەکە دەخەینە کار، واتە هەوڵدەدەین ئەو تیۆرەیە رەت و پووچەڵبکەینەوە. خۆ گەر لە رەت و پووچەڵکردنەوەیدا سەرکەوتوو بووین؛ ئەوا تیۆرەیەکی دی دەخەینە روو، دیسان ئەویش دەخەینە بەر رەخنە... دەتوانین تەواوی رەوتی زانست لەم وشانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە: مەزەنەی ئازایانە لە ژێر پیاچوونەوەی رەخنەی توندو لەگەڵ تاقیکردنەوەی سەختدا."(5) بەمجۆرەو، بە گوێرەی پرنسیپی پووچەڵکردنەوە، لە هەر زەمینەیەکدا ئەگەری دۆزینەوەی تیۆرەیەکی پێشکەوتووتر دەبێ. خاڵی گرنگ لەتیۆرەی زانستی پۆپەردا ئەوەیە کە تیۆرە زانستیەکان بەرئەنجامی مەزەنەن و، لە راستیدا ئیستیقراء رۆڵی لە بەرهەمهێنانیاندا نیە. ئەزموون و تاقیکردنەوەکان نەك هەر بناغەی تیۆرەکانن، بەڵکو لەبەر رۆشنایی ئەواندایە کە تیۆرەکان مانا پەیدا دەکەن و، تیۆریست پاش مەزەنەو را دەستیان دەداتێ. "تیۆرەی مەزەنەو پووچەڵکردنەوە ئەوە پیشاندەدات کە بۆچی هەوڵی ئێمە بۆ سەپاندنی بەیانکردنی تیۆرییانە بەسەر جیهاندا بە شێوەیەکی لۆجیکیانە دەبێتە مایەی بینینی* چوونیەکیەکان.. تیۆرە



زانستیەکان پوختەی بینینەکان نین، بەڵکو داهێنراون، مەزەنەی بێباکن کە بۆ تاقیکردنەوە دەخرێنە روو؛ تا ئەگەر لەگەڵ بینینەکان (ی دواتر)دا ناکۆك بوون، لاببرێن."(6) لەراستیدا ئیستیقراء پرۆسەیەکی دەروونییە نەك لۆجیکی. تیۆرە نوێیەکان بەرەنجامی ئەزموون و ئیستیقراء نین؛ بەڵکو هی رەخنە لەو تیۆرانەی کە لە ئارادان و، بە دەستهێنانی هەر تیۆرەیەکی نوێ لە رێی مەزەنە **intuition** وە دەبێ. لە راستیدا تیۆرە لە رووی کاتیشەوە پێش بینین دەکەوێ "لە بنەڕەتدا بینینی بێ لایەنانە نیە. هەر بینینێك چالاکیەکی ئامانجدارە.. کە لە مەسەلەو بارودۆخە چاوەڕوانکراوەکانەوە (یان ئەوەی دواتر ناوم نا "ئاسۆی چاوەڕوانی") سەرچاوە دەگرێ. شتێك نیە ناوی ئەزموونی کارتێکراو بێت.. مەزەنە یان گریمانە دەبێ پێش بینین و پەیبردن بکەوێ: ئێمە چاوەڕوانیی خۆڕسکی (فطری) و زانینی خۆڕسکیی شاراوەمان هەیە."(7) بە کورتی پرۆسەی بەرهەمهێنانی زانست لە ئەزموون و بینینەوە بۆ تیۆرە بە دەست نایەت، بەڵکو لە تیۆرەوە بۆ ئەزموون و بینین.

بە شێوەیەکی گشتی وەکو بینیمان پۆپەر ئیستیقراء بەجیاکەرەوەی زانست لە نازانست یا نیمچە زانست نازانێت. بە رای ئەو ئەوەی زانست لە نازانست جیادەکاتەوە هەڵەئامێزی **fallibility** و پووچەڵئامێزیی حوکمەکانە، لەبەر ئەوەی بە تەنها ئەو حوکمانەی ئامادەگیی رەتکردنەوەیان

تیایە؛ ئەزموونئامێز **testable** ن. ڕەتکردنەوەو پووچەڵکردنەوەی تیۆرەکان زەینی زانستی دەوڵەمەند دەکات. گریمانە پووچەڵئامێزەکان کە ئەگەری بەدرۆخستنەوەیان زیاترە لە سەلماندنی ڕاستییان دەبنە مایەی وروژاندنی وتوویژو پشکنینی زانستییانە. هەر لەبەر ئەمەشە بە ڕای پۆپەر جەختکردنەوەو سەلماندن نا، بەڵکو پووچەڵکردنەوەی تیۆرەو گریمانە ڕێی بەرینی زانست هەموار دەکات. بۆیە دەبێ کەموکورتییەکانی ئەو گریمانانە بدۆزینەوە، ئەوەش کاری ڕەخنەیە. وەکو پۆپەر دەڵێت "لە قۆناغی پێش زانستدا ئێمە ئەو بیرۆکەیەمان پێ خۆش نیە کە دەڵی دەشێت ئێمە هەڵەبین.

بەمجۆرە تا ئەو جێیەی کە لە تواناماندا بێ بەشێوەیەکی دۆگماتیکیانە مەزەنەکانی خۆمان دەپارێزین. بەڵام لەسەر ئاستی زانستی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئێمە بەدوای هەڵەکانی خۆماندا دەگەڕێین."(8) لە ئەنجامیشدا دەگەینە تیۆرەی باشتر. تیۆرەی باشتریش ئەو تیۆرەیەیە کە لەگەڵ ئەوەشدا پلەوپایەی تیۆرەکانی پێش خۆی ڕووندەکاتەوە، دژیان دەوەستێتەوە.

"پێشکەوتنی زانستی بریتی نیە لە کۆکردنەوەی هەرچی زیاتری شتە بینراوەکانە، بەڵکو بریتی‌یە لە ڕەتکردنەوەی تیۆرەی لاوازترو دانانی تیۆرەی باشتر لەجێیان و، بەتایبەتیش ئەو تیۆرانەی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دەوڵەمەندترن."(9) بەمجۆرە تەنها دەتوانین ئەوە بڵێین کە تیۆرەی نوێ لە ڕووی ڕوونکردنەوەوە بە شێوەیەکی کاتی لە تیۆرە کۆنەکان بەهێز ترە. هەر تیۆرەیەك دەبێ تا ئەوپەڕی بە ڕوونی بخرێتە ڕوو تا بتوانین پووچەڵبیکەینەوە. ئەو تیۆرانەی پووچەڵئامێز نین نازانستین، بەم پێیە پووچەڵئامێزی توانستی تیۆرەی زانستیە. تیۆرەی زانستی دەبێ ئامادەگیی ڕەتکردنەوەو پووچەڵکردنەوەی لە ناو هەناوی خۆیدا هەڵگرتبێت. لەتیۆرەدا جیهان بە داخراوی دەبینین، لەکاتێکا کە دونیای ئەزموون کراوەیە. لەبەر ئەوە هەر تیۆرەیەك لافی ئەوە لێبدات کە تەواوی ئەزموونی ئێستاو ئاینده ڕووندەکاتەوە (هەرچەندە توانایەکی وەها لە ڕوونکردنەوەدا دەبێتە مایەی خۆشحاڵی بۆ لایەنگرانی ئەو تیۆرەیە) ئەوا هەمان لافلێدان بەڵگەی نازانستێتی‌و هەڵەیی ئەو تیۆرەیەیە. بۆ نموونە مارکسیستەکان بەردەوام هەوڵیانداوە لە ڕێی تازەکردنەوەی بیروبۆچوونەکانیانەوە بنەماکانی ئەو تیۆرەیە لە مەترسیی پووچەڵکردنەوەو ڕەتکردنەوە بپارێزن. ئەوان ئەو بنەمایانە بە کۆمەڵێك بنەما دەزانن کە قابیلی پووچەڵکردنەوە نین، لەکاتێکا تیۆرەی زانستی ئەو تیۆرەیەیە کە توانستی پووچەڵبوونەوەی لەگەڵ خۆیدا پێ بێت.

بەمجۆرەپۆپەر بە پێچەوانەی پۆزیتیڤیستە لۆجیکیەکانی ئەڵقەی ڤیەنناوە، تیۆرە نازانستیەکان بە بێ مانا **meaningless** و ئافەرۆزکراو لە قەڵەم نادات. بە ڕای ئەو دەشێ تیۆرە نازانستیەکان ڕێك بکرێن و ئەزموونئامێز بن. "دروستکردنی تیۆرەیەك یان گریمانەیەك هەمیشە یەك قۆناغی دۆگماتیکی‌و زیاتریش قۆناغێکی ڕەخنەگرانە دەگرێتە خۆی."(10) زۆربەی تیۆرە گەورەکان کە لە ڕیزی ئاسەوارە دیارەکانی هۆشی مرۆڤایەتیدان لە کۆمەڵێك دۆگمای کۆنترەوە هاتوون کە کەوتوونەتە بەر ڕەخنەلێگرتن.(11) "قۆناغی ڕەخنەیی نایەتەدی، تەنها کاتێك نەبێت کە پێشتر قۆناغێکی

دۆگماتیکی هەبوویێت کە بە درێژایی ئـەو قۆناغە شتێك- چاوەڕوانییەك، مەسەلەیەکی ڕێکوپێك لە ڕەفتاردا- فۆرمەلـە بێـت تـا قۆنـاغی لابردنـی هەڵەکان شیاوو کارا بێـت"(12)، بـەڵام تەنـها بـە شێوازی ڕەخنەییانە، واتە شێوازی لابردنی هەڵە، دەتوانین لەوە تێبگەین کە مەزەنەی دۆگماتیکی دروست بووە یان نەء.

بەمجۆرە توانستیی جیاکردنەوەی زانسـت لـە نازانست مانادار بوون Meaningfulی حوکمەکان نیـە، بـەڵکو تەنـها قبووڵکردنـی ڕەتکردنـەوە توانسـتی پووچەڵکردنـەوەی ئەوانـە. "کاتـێ پۆزیتیڤیستەکان پێوەری قبووڵکردنی سـەلماندن demonstrable و مانـاداری بـە پێـوەری جیاکردنـەوە (ی حوکمـە زانسـتیەکان لـە نازانستیەکان) بەکاردەبەن، ئەوان لەو مەسـەلەیە بێئاگا دەکات کـە مـن پووچەڵئامێز تەنـها وەکـو توانسـتی جیاکردنـەوە بـەکاردەهێنم نـەك وەك پێوەری مانـاداری."(13) تیـۆرە میتـافیزیکیو نازانستیو یان نیمچە زانستیەکان مانایـان هەیـە، بـەڵام قـابیلی تاقیکردنـەوەو هـەروەها پووچەڵکردنەوە نین. لێرەدا جیاوازیی بۆچوونی پۆپـەر لەگـەڵ پۆزیتیڤیسـتە لۆجیکیـەکاندا بەتەواوی دەردەکەوێت. بەم پێیە، تیـۆرە نیمچە زانستیەکان یـان نازانستیەکان بـێ نـرخ و بـێ مانانین. "تێپەڕین لـە میتافیزیکە وە بۆ زانست جووڵەیەکی قەڵەمبازانەو کتوپڕانە نیە: ئەوەی تا دوێنێ هزرێکی میتافیزیکی بووە دەشێ سـبەینێ بگـۆڕێ بـۆ تیۆرەیـەکی زانسـتیی ئەزموونئامێز."(14) هەروەها پۆپەر دەڵێت: "من تیـۆرە میتافیزیکیـەکان بـە هاوشـانی تیـۆرە زانستیەکان دەزانم.. کە توانرا بـە شـێوەیەکی ئـەقڵانی ڕەخنـە لـە تیۆرەیـەکی میتـافیزیکی



بگـیرێ، پێویسـتە لافـی ڕاستێتیشـی بـە جیـددی وەربگـیرێ."(15) تـا دەڵێـت: "لەوانەیـە.. بتوانیـن لـە میتـافیزکدا پێوەرێـك بـۆ جیاکردنـەوەی سیسـتمە میتافیزیکیـە بـێ بایەخـەکان لـەو سیسـتمانە بدۆزینـەوە کـە شـایانی لێتۆژینـەوەو ڕامـانن. خواستی ڕاستەقینەی ئـەهلی میتافیزیك ئەوەیە کە تەواوی ڕەهەندو لایەنە ڕاستەقینەکانی جیهان لـە وێنەیەکدا کۆبکەنـەوە.. کەواتـە پێوەرەکـە لێرەدا دیسانەوە هـەمان پێوەری زانسـتەکانە. ئـەوەی ئایـا وێنـە (یـەکی جیـهانی) شـایانی لێتۆژینەوەو لێکۆڵینەوەیـە یـان نـەء، بـەڕای مـن پەیوەندیی بەوەوە هەیە کـە ئایـا دەبێتـە مایـەی ڕەخنەی ئەقڵانیو کۆشش بۆ تێپەڕین لـە خـودو گەیشتن بە وێنەیەکی باشتر یان نەء."(16)

لێکۆڵینەوەی پۆپەر سەبارەت میتۆدی زانست و گرنگیی ڕەخنـە؛ پەیوەسـتە بەتیۆرەکەیـەوە سەبارەت سێ جیهانەکە: جیهانی یەکەم، جیهانی شتومەکەکان و دیاردە بابـەتیو ماتەرییەکانـە، جیهانی دووەم، جیهانی خودیو نێـو خودەکانـە، جیـهانی سـێیەم، جیـهانی دروسـتکراوە بابەتییـەکانی خـودو ئـەقڵی مرۆڤـەیان (شـتە) مەعقولەکان (ئەم جیهانە مرۆڤ دروستیکردووە، بـەڵام پێـی سـەربەخۆ دەبێـت). جیـهانی مەعقولەکان بریتیە لـە زمـان، ئـەدەب، هونـەر، فەلسـەفە، ئـایین، مافـەکان، ئاکـار، زانسـت، حکومـەت و دەزگا کۆمەڵایەتیـەکانی دی کـە لـە فۆرمـی بابـەتی و ماتـەریدا وەکـو کتێـب تۆمـار کراون. مرۆڤ ئەم جیهانەی دروستکردووە، بـەڵام

وەکو مەسەلەیەکی بابەتی دەیخاتە بەر رامان و رەخنەو لێکۆڵینەوە. هەریەك لە بەشەکانی جیهانی مەعقولەکان سەربوردەو مێژووی تایبەتیی خۆی بووە. ئەم جیهانە بەری کاری مرۆڤە، بەڵام بەرەنجامی پلانو نەخشەیەکی پێشوەخت نیە. بەرەو پێشچوونی جیهانی (شتە) مەعقولەکان بەرهەمی رەخنەو مەزەنەو پووچەڵکردنەوەیەو، پێشینەی رەخنەی ئەقڵانی دەگەڕێتەوە بۆ ژیاری یۆنان.(17)

سێ جیهانەکەی پۆپەر پەیوەندیی نزیکیان بەیەکەوە هەیە، ئەم پەیوەندییەش بنچینەی تیۆرەکەی ئەوە سەبارەت نایەقین و کرانەوە. جیهانی یەکەم داخراو نیە، بەڵکو لە ژێر کاریگەریی بەردەوامی جیهانی دووەمدایە. جیهانی دووەمیش لەگەڵ جیهانی سێیەمدا لە مامەڵەیەکی بەردەوامدایە. هەروەها جیهانی سێیەمیش کاریگەری لەجیهانی یەکەم دەکات. "هیچ هۆیەکی روون بۆ رەتکردنەوەی کرانەوەی جیهان و ئەو راستییە نەخراوەتە روو کە بەردەوام شتی تەواو تازە لە حاڵەتی نەشونمادان و ، هەروەها هیچ هۆیەکی دروستیش نیە بۆ ئەوەی سێبەری گومان بخاتە سەر ئازادیو توانای داهێنانی مرۆڤ. پرنسیپی نایەقین بەس نیە، بۆ تێگەیشتن لە ئازادی، مرۆڤ پێویستی بەشتی دیکەیە. ئێمە پێویستمان بە بیرۆکەی کرانەوەی جیهانی یەکەم بە رووی جیهانی دووەمداو جیهانی دووەم بە رووی جیهانی سێیەمداو کرانەوەی خۆیيو سەربەخۆی جیهانی سێیەمە."(18)

بە رای پۆپەر کاتێ زانین و زانستی مرۆیی بەردەوام ناتەواو بێو لەگەڵ جیهانی یەکەمدا ئاوێتە بێت، کەواتە ئەو جیهانەی کە زانین و زانستی مرۆییش دەگرێتە خۆی دەبێ بەردەوام کراوەبێت. بێگومان پرنسیپی نایەقین و کرانەوەی جیهان لەگەڵ پرنسیپی پووچەڵئامێزیدا پەیوەندییەکی سەرەکیان هەیە، لەبەر ئەوەی مەعریفەی زانستی لە رێی مەزەنەو پووچەڵکردنەوەوە گەشە دەکات. بە گوتەی ئەو "گەر سروشت بەتەواوی حەتمی بووایە، دەبوولە بواری کارەکانی مرۆڤیش بەو جۆرە بووایە. لەو حاڵەتەشدا ئیدی کارێك لەگۆڕێ نەدەبوو، بەتەنها رواڵەتی کار لەمیاندا بوو."(19)

پۆپەر حەتمیەتی زانستی، کە تونرەوترین شێوەی لەتیۆرەی لاپلاسدا خرابووە روو، بە "سەختترین و جیددیترین کێشە لە رێی روونکردنەوەی ئازادی، داهێنان، و بەرپرسیی مرۆڤ و بەرگریکردن لێیان"(20) لەقەڵەم دەدا. پۆپەر حەتمیەتی زانستیی بە تیۆریەك دەزانی کە بە گوێرەی ئەو "بونیادی جیهان بەجۆرێکە، گەر بێتو ئێمە وەسفێکی تەواو وردمان سەبارەت بەسەرهاتەکانی رابردوو لەبەر دەستدا بێت و ئاگاداری تەواوی یاساکانی سروشت بین، ئەوا ئەوکات بە شێوەیەکی ئەقڵانی و لەوپەڕی پلەی وردیدا دەکرێ هەموو رووداوێك پێشبینی بکەین".(21) بەڵام تیۆرەیەکی وەها هەم نا ئەزموونئامێزو هەم نا- پووچەڵئامێزیشە. حەتمیەت نەگەری هەموو جۆرە داهێنان و ئازادییەك رەتدەکاتەوە. وەکو پۆپەر دەڵێت "خولقاندنی کارێکی نوێی وەکو سیمفۆنیای "جی مینۆر"ی موزارت لەلایەن زانایەکی فیزیاوە یان فیزیۆلۆجیستێکەوە کە لەتوانای بەدەنی موزارت، بە تایبەتیش لە مێشکی ئەو و ژینگەی ماددیی ئەو بکۆڵێتەوە؛ شتێك نیە پێشبینی بکرێ"(22) تیۆرەی حەتمیەتی زانستی

"دەمانگەیەنێتە ئەو رایەی کە ملیارەها ساڵ لە مەوبەر؛ لە ناو گەردیلەکانی جیهانی یەکەمدا شیعری هۆمیرۆس و فەلسەفەی ئەفلاتون و سیمفۆنیەکانی بتهۆڤن هەبوون."(23)

چەمکی جیهانی سێیەم لەفیکری پۆپەردا پەیوەندییەکی نزیکی بە چەمکی "زانستی بابەتی" یەوە هەیە. هەر رەخنەگرتنێك لەتیۆرەکان دەبێ بەر لە پشکینن و تاقیکردنەوە، لە فۆرمی بابەتیانەی زماندا ئاشکرا بێت. هزر تا ئەو دەمەی نابێتە شتێکی بابەتیو تەنها لە جیهانی دووەم، واتە جیهانی خۆددایە، قابیلی رەخنە لێگرتن و پشکنین نیە، بەم پێیە بەیانکردنی روون و ئازادی رەخنەکان و هزرەکان، بەرەو جیهانی سێیەم رێ خۆشدەکات. تەنانەت ئەگەر زانایەك تیۆرەکەی خۆی تاقی کردبێتەوەو سەلماندبێتی، تا ئەو دەمەی ئەو تیۆرەیە لەرێی تاقیکردنەوەی تری گشتیترەوە نەسەلمێنرێ بە بەشێك لە زانستی بابەتیو جیهانی سێیەم ناژمێردرێ. زانست بە تەنها کاتێ بابەتیە کە بەشێك بێت لە جیهانی سێیەم و پەیوەست بێت بە هەموانەوە. بەم پێیە زانست بەشێك نیە لە جیهانی دووەم. جیهانی زانست جیهانێکی بابەتیە کە لە دەرەوەی خودەکاندا بوونی هەیە. "زانین و مەعریفەی زانستی بەتەنها ئەوە نیە کە لە مانا باوەکەیدا هەیەو کە لە رستەی (من دەزانم) وەدەر دەکەوێ. زانین بەمانای (من دەزانم)، پەیوەستە.. بە جیهانی خودەکانەوە، لە کاتێکا زانین (مەعریفە)ی زانستی، پەیوەستە.. بەجیهانی تیۆرە بابەتیەکانەوە."(24).

زانست لەروانگەی پۆپەرەوە پرۆسەیەکی پێشکەوتنخوازانەیەو، لە ئەنجامی کاردانەوە بەرامبەر مەسەلەو کێشە باوەکانەوە بەرەو پێشەوە دەچێت. بۆیە پەیوەندییەك لەنێوان رەوتی گەشەسەندنی زانست و پرۆسەی پێشکەوتنخوازانەی



ژیاندا هەیە. "بێگومان دیاردەی زانست و زانینی مرۆیی گەورەترین پەرجوو (موعجیزە)ن لەم جیهانەدا."(25) تیۆرەسازیی زانستی لای مرۆڤ وەکو توانای ئامرازسازی وایە لای گیانەوەران کە بۆ خۆگونجان لەگەڵ دەوروبەردا روودەدات. "تەواوی بوونەوەرەکان شەوو رۆژ بەردەوام بۆ چارەسەری کێشە لە ململانێدان."(26) لە قۆناغە بەرزەکانی پێشکەوتندا، شێوازی رەخنەگرانەی لابردنی بەردەوامی هەڵەکان زیاتر دەردەکەوێت. تیۆرەکان، وەکو ئامرازەکان لە جیهانی یەکەمدا، دەبنە مایەی گۆڕان. تەواوی بەرهەمەکانی جیهانی سێیەم و، لەنێوانیاندا زانست، لەمیانی هەندێ قۆناغی پێشکەوتندا پەیدا دەبن و، بەرەنجامی رەتکردنەوەو چاك کردن و رەخنەو پشکنینی بەردەوامن. ناتوانین هیچ رۆڵێك لەوانە بە پێی نموونەیەکی دیاریکراو بینا بکەینەوە. هیچکاتێك و لە هیچ بوارێکدا ناتوانین لە سفرەوە دەست پێ بکەینەوە. ئێمە لە هەموو شتەکاندا میراتگری رابردووین و پشت بە داب و نەریتەکان دەبەستین، گەرچی رێی پێشکەوتن لە پێداچوونەوەو بیرکردنەوەی نوێدایە(27).

بە کورتی لە روانگەی پۆپەرەوە "بنەمای ئەزموونگەرییانەی زانستی بابەتی هیچ جۆرە رەهایی "موتڵەق" ێك شك نابات. زانست لەسەر تاوێرە بەرد بینا نەکراوە. ساختومانی تیۆرە

زانستیەکان لە سەر زۆنگاو پەیدا دەبن و، وەکو ساختومانێکە کە لەسەر پایەیەکی گڵ وەستابێت. گڵەکان لە سەرەوە دەڕژێنە ناو زۆنگاوەکەوە، بەڵام هەرگیز ناگەنە پایەو بنەمایەکی (لە پێشدا دراو)و سروشتی. کاتێ ڕێ لە ڕژانی زیاتری گڵ و خۆڵەکە دەگرین، لەبەر ئەوە نیە کە گەیشتووینەتە زەوییەکی پتەو و قایم. ئێمە تەنها کاتێ ڕێك و ڕاست دەوەستێن کە دڵنیا بین خاك و خۆڵەکە هێند پتەوە کە ساختومانەکە ڕابگرێ"(28) لەشوێنێکی دیکەدا پۆپەر دەڵێت: "دەبێ بیرۆکەی بوونی سەرچاوەی ئامانجداری زانین بخەینە لاوەو دان بەوەدا بنێین کە تەواوی زانین مرۆییە، ئەم زانینەش ئاوێتەیەکە لە هەڵەو دەمارگیری و خەون و ئومێدەکانمان. ئێمە تەنها ئەوەمان لە دەست دێ کوێرانە بەرەو حەقیقەت بجمێین، هەرچەند حەقیقەت لێشمانەوە دوور بێت.. لە هەموو بوارەکانی زانست و زانین دا هیچ بیانوویەك نیە لە دەرەوەی رەخنەدا بێت.. حەقیقەت لە دەرەوەی چوارچێوەی توانای مرۆڤدایەو، پێویستە نرخ بۆ ئەم قسەیە دابنێین، لەبەر ئەوە بەبێ ئەمە هیچ پێوەرێکی بابەتی بۆ لێکۆڵینەوەو رەخنەی مەزەنەکانمان نیە.."(29)

سەبارەت رەتکردنەوەی رەوت و ئایدیۆلۆژییە شۆرشگێڕو مێژووگەراکان یەکێك لە دوا ئامانجەکانی "کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی" روونکردنەوەی بنەما فەلسەفیەکانی تۆتالیتاریزم و فاشیزم و هۆیەکانی هۆگریو مەیلی رەشەخەڵکە بە لایاندا. گرنگترین هۆی سایکۆلۆجی و سۆسیۆلۆجیی دروستبوونی تۆتالیتاریزم هەڵاتنی خەڵکی رەمەکیە لە ترسی ئازادی و بەرپرسیاریی نەخوازراو و، حەزیان بە ئاسایش. پاش ئەوەی مرۆڤ کۆمەڵگای تەقلیدیی دەسەڵاتگەرو داخراوی تێپەڕاندو دەستی بە نەریتی رەخنەگرانە کرد، کۆمەڵێك هەلومەرج و پێداویستیی نوێ هاتنە ئاراوە کە بوونە مایەی شڵەژان و گرژیی قووڵ لە مرۆڤدا، بە جۆرێك کە ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ناو رەحمی هەستکردن بە ئاسایشی لە مرۆڤدا بێدار کردەوە، ئەو هەستەی کە جاران هەیبوو. لە کۆمەڵگای مۆدێرندا نەریت و زنجیرەی پلەوپایەو ئایین وەکو پشتیوانێك بۆ هەستکردن بە ئاسایش لای ئادەمیزاد هەرەسدێنن. توانای رەخنەگرتن و لێکۆڵینەوەو هەڵبژاردنی رێگا جۆراوجۆرو بێ پێشینەکانی ژیان دێتە ئاراوەو، گومان لە بەڵگەنەویستە کۆنەکان دەکرێ. کۆمەڵگا لە ژێر کاریگەریی گوشارەکانی ژیاردا بەرەو لێکترازان دەچێت و، ئەوکات تاکە کەس و کۆمەڵگا لە بیرکردنەوەی ئازاد (free thinking) ەوە بۆ دۆگماتیزم (dogmatism) و لەئازادیشەوە بۆ هەستکردن بە ئاسایش پەنا دەبات. رەگوریشەی مەیلی ئادەمیزاد بۆ کۆمەڵگای داخراو، کە لە زووەوە بەرامبەر مەیلی ئادەمیزاد بۆ ژیارو ئازادیو رەخنە پەیدا بووە، هەر ئەمەیە، واتە خۆزیای یۆتۆپیای ئاسایشبەخش، خۆزیای کۆمەڵگایەکی داخراو و دوور لە دەستی ئازادیی بیرو رەخنە. دواکەوتنخوازیو یۆتۆپیاخوازی، واتە پەنابردنە بەر داب و نەریتەکانی کۆن و، گەڕان بە دوای یۆتیۆپیادا لە ئایندەدا، هەردووکیان لەیەك شتەوە سەرچاوە دەگرن و، هەردووکیان بۆ بنبڕکردنی بیری ئازاد پەنا دەبەنە بەر توندوتیژی. هەردووکیان دژی گۆڕان و خوازیاری کۆمەڵگایەکی وەستاون. ئەنجامی هەردووکیان بە تۆتالیتاریزم (راست و چەپی) دەشکێتەوە کە

ڕواڵەتی کردەییان فاشیزم و هەروەها کۆمۆنیزمە.
بە ڕای پۆپەر هەندێ لە داناترین و هۆشمەندترین فەیلەسووفەکان لە ڕوانگەیەکی مرۆڤدۆستانەو بە نیازپاکیەوە، واتە بە مەبەستی چاککردنی کۆمەڵگای مرۆیی، نەخشەکێشی بنەڕەتیی کۆمەڵگای داخراو و دوژمنی کۆمەڵگای کراوەو ئازادیو ڕەخنەو گۆڕانکاری بوون. بە ڕای پۆپەر پێشەنگی فەیلەسووفە دواکەوتنخوازەکان ئەفلاتونە و گرنگترین بیرمەندی یۆتۆپیاش مارکسە. پۆپەر بە پێچەوانەی ڕەخنەگرانی ڕابردووەوە، خۆی لە قەرەی خاڵی لاوازیی هزری ئەم فەیلەسووفانە نادات، بەڵکو ڕووبەڕووی خاڵی هێزیان دەبێتەوە. لە کاتی پێویستیشدا بە مەبەستی خستنەڕووی ئەو خاڵی هێزانە لۆجیکی دەروونیی ئەو فەلسەفانە بینا دەکاتەوەو وایلێدەکات قابیلی بەرگری بێت و، خۆی لەوە دەپارێزێت کە جەخت لە خاڵی لاوازیی بکات. بەمجۆرە کاتێ ڕەخنە لە پایە پتەو و بەڵگە بونیادییەکانی ئەم فەلسەفانە دەگرێت، ئیدی بەڵگەیەك لە دەستی لایەنگرانی ئەو فەلسەفانەدا نامێنێتەوە.

پۆپەر لە هزری ئەفلاتون و ئەرستۆدا بەدوا ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕانەی تۆتالیتاریزم و ڕێبازی مێژووگەراییدا دەگەڕێت، دەسەڵاتگەرایی ئەفلاتون و ڕێبازی گەوهەرگەرایی essentialism لای ئەرستۆ بناغەی ئەو دوو شتەن. فەلسەفەی یۆتۆپیای ئەفلاتون فەلسەفەیەکە بۆ پارێزگاریکردن لە کۆمەڵگای داخراو و دەوڵەتی تۆتالیتارو ڕێگرتن لە گۆڕینیان. ئەفلاتون و ئەرستۆ بانگەشەیان بۆ فەلسەفەیەکی غەیبگۆیانە oracular دەکرد کە هیگل میراتگری بوو. "جۆری هزری سکولائیو



عیرفانی (ی)و نائومێدی لە خۆبەستنەوە بە شتێکەوە هەمووی ئەنجامە حەتمیەکانی ڕێبازی گەوهەرگەرایی ئەفلاتونو ئەرستۆن و، یاخیبوونی ئاشکرای ئەفلاتون لە ڕاست ئازادیدا دەگۆڕێن بۆ یاخیبوونی نهێنیی ئەرستۆ بەرامبەر بە ئەقڵ."(30) ئەم دووانە ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبوو لە سەرهەڵدانی فەلسەفەی هیگلدا کە باوکی مێژووگەراییو تۆتالیتاریزمی ئەمڕۆیە"(31). لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا "کڵێسا شوێن پێی تۆتالیتاریزمی ئەفلاتونیو ئەرستۆیی هەڵگرت و، دوا جار ئەمە لە پشکنینی بیروباوەڕەکاندا گەیشتە چڵەپۆپە. بە تایبەتیش سەرچاوەی پشکنینی بیروباوەڕەکان تیۆرەی ئەفلاتونی بوو."(32) پاش ئەوە، فەلسەفەی هیگل سەرچاوەی هەموو ڕێبازە مێژووگەراکانە لەم سەردەمەدا. "باڵی چەپی توندڕەوی مارکسیستەکان و میانڕەوە پارێزکارەکان و فاشیستە ڕاسترەوە توندڕەوەکان، هەموویان (فەلسەفەی) هیگل بە بنەمای فەلسەفەی سیاسیی خۆیان دادەنێن."(33)

"هیگل.. سەرلەنوێ وێناکردنەکانی ئەفلاتونی کەشفکردەوە کە پاڵپشتی یاخیبوونی هەمیشەیی بوون بەرامبەر ئەقڵو ئازادی. فەلسەفەی هیگل وەکو دووبارە لە دایکبوونەوەی تیرە پەرستیە... وەکو دەڵێن، ئەو ئەڵقەی ونبووی نێوان ئەفلاتون و شێوەی ئەمڕۆی تۆتالیتاریزمە. پەیڕەویکارانی ئەمڕۆی تۆتالیتاریزم.. هەموو لە فەزای داخراوی فەلسەفەی هیگڵدا پەروەردە بوون و، فێری ئەوە

بوون کە دەوڵەت و مێژوو و نەتەوە بپەرستن."(34) هیگل بە فەلسەفەکەی ئامانجەکانی شۆڕشی فەرەنسای شێواندو، وەکو فەیلەسوفی رەسمیو خزمەتگوزاری دەوڵەتی پروس "خواو پروسی پێکەوە پاساو دەدایەوە"(35) ئەو "لە سەرێکەوە پەرستنی ئەفلاتونیانەو پروسیانەی دەوڵەت و، لە سەرێکی تریشەوە پەرستنی مێژوو و کۆیلایەتی بەرامبەر بە سەرکەوتن لە مێژوودا دەخاتە جێی فاکتەری ئازادیخوازی لە نەتەوەپەروەریدا"(36) و "هێشتاش لە چاخی ئێمەدا رێبازی مێژووگەرایی شێتانەی هیگل وەکو ئەو پەیینە وایە کە دەبێتە مایەی گەشەسەندنی خێرای تۆتالیتاریزم.(37) نزیکەی زۆربەی واتا گرنگەکانی تۆتالیتاریزمی ئەمڕۆ راستەوخۆ لە هیگلەوە بە میراتی ماونەتەوە."(38) ئەم واتایانەش بریتین لە: ناسیونالیزم بە مانا نەژاد پەرستیەکەی، بەرز ڕاگرتنی دەوڵەت و جەنگ، بە دوور ڕاگرتنی دەوڵەت لە بەرپرسیاریی ئاکاری، یەکێتیی ستەم و هەق، ستایشی رابەران و کەسێتیە جیهان- مێژووییەکان (world- historical personality). سەرەنجام پۆپەر گوتەکەی شۆپنهاوەر والێدەکات: "ئەگەر رۆژێك لە رۆژان ویستت لاوێك گەمژە بکەیت و بە تەواوەتی توانای بیرکردنەوەی لێ بسەنیتەوە، باشترین شت ئەوەیە کە کتێبەکانی هیگلی بدەیتێ تا بیانخوێنێتەوە"(39).

پێدەچێ ئەو حوکمەی پۆپەر بەسەر مارکسدا دەیدات، بە بەراورد لەگەڵ راوبۆچوونە وروژێنەرەکانیدا دەربارەی هیگل؛ هاوسەنگتر و رەواتر و تەنانەت هاوڕایانەش بێت، پۆپەر لە نێوان بیروڕای مارکس و مارکسیستەکاندا جیاوازی دەکات. بە رای پۆپەر مارکسیزم "پوختترین و ، پێشکەوتووترین و خەتەرناکترین شێوەی رێبازی مێژووگەرایی بووە."(40) بە رای ئەو مارکسیزم و فاشیزم هەردووکیان لەیەك سەرەتاوە سەرچاوە دەگرن، هەرچەندە "مارکس تیۆرەکەی خۆی تاقیکردەوەو، گەرچی لە تیۆرە سەرەکیەکانیدا بە هەڵەدا چوو، بەڵام تاقیکردنەوەکەی بێهوودە نەبوو."(41) بەڵام "مارکس وێڕای هەموو شایستەییەکان، پێغەمبەرێکی درۆزن بوو. ئەو رەوتی مێژووی پێشبینی کردو، پێشبینیەکانیشی راست دەرنەچوون.. ئەو دەیان خەڵکی هۆشمەندی گومڕا کردو، وایلێکردن باوەڕ بهێنن بەوەی کە رێگای زانستیانە بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا پێشبینیی مێژووییە. ئەو لەبەر ئەوەی لە رێبازی هیگلدا پەروەردە بوو بوو، زۆر لە ژێر کاریگەریی جیاوازیی کۆنی نێوان چەمکی شتnoumanon و دەرکەوتن appaearanceداو هەروەها جیاوازیی نێوان راستەقینە (گەوهەری) substantial و ناگەوهەری accidentalدا بوو. ئەو هەستیدەکرد پێشکەوتن (وجیاوازیی)ی لە چاو هیگل (و کانت)دا ئەوە بوو کە چەمکی شت ین راستەقینەی لەگەڵ جیهانی ماتەریدا (وەکو پرۆسەی میتابۆلیزم لای مرۆڤ) بەیەك شت دەزانی، هەروەها (دەرکەوتن)یشی لەگەڵ جیهانی ئایدیاکان یان وێناکاندا هەر بەیەك شت دەزانی"(42) بەڕای پۆپەر "مارکس جەختی لەوە کردۆتەوە کە لە نێوان شێوازی پەتیی مێژووگەرایانەی خۆیو هەرجۆرە بەرنامەڕێژییەکی ئابووریدا بە مەبەستی بەرنامەڕێژیی ئەفلانی، چوونیەکی هەیە.")43)

هەر ئەمەش، ریشەی لەبەرچاونەگرتنی گرنگیی سیاسەتە. "تیۆرەی ئەو (مارکس) سەبارەت بە بێ توانایی هەر بەشێك لە سیاسیەت و، باوەڕی سەبارەت بە دیموکراسی (وەمك شێوەیەك لە دیکتاتۆریەتی چینایەتی) بەڕای من نەك هەر هەڵە، بەڵکو هەڵەیەکی کوشندەشە.(44) بەپێی تیۆرەکەی مارکس خۆی (بە پێچەوانەی مارکسیستەکان) ئێمە ناتوانین بەخواست و ویستی خۆمان باری ئابووری بگۆڕین، وەکو ئەو ریفۆرمەی دەتوانین لە بواری حقوقدا ئەنجامیبدەین. سیاسەت هیچی پێ ناکرێ ئەوە نەبێت کە "ژانی لە دایکبوون کورتترو ئاسانتر بکات."(45) لە ئەنجامی تێڕوانینی بە کەمزانینانەی مارکسەوە بۆ دەسەڵاتی سیاسی، نەك هەر لە داڕشتنی تیۆرەیەك سەبارەت گرنگترین هۆی هێزەکەی چاککردنی باری هەژاران خۆی خافڵکردووە، بەڵکو لە گەورەترین مەترسی هێزەکیش بۆ سەر ئازادیی مرۆڤیش. تێڕوانینی سادەو ساکاری ئەو سەبارەت بەوەی کە لە کۆمەڵگای بێ چین Classless society دا دەسەڵاتی سیاسی هیچ رۆڵێکی نیەو دەوڵەت رۆڵی خۆی لە دەستدەدات و "سیس دەبێتەوەو وشك هەڵدێ" بە ئاشکرا نیشانەی ئەوەیە کە ئەو هەرگیز لەوە تێنەگەیشتووە کە دەسەڵاتی سیاسی دەتوانێ چی لە پێناوی ئازادیو مرۆڤایەتیدا بکات و دەشبێ بیکات."(46)

بە ڕای پۆپەر پێشبینیکردنی هاتنی کۆمەڵگای بێ چین نەك بە تەنها لەگەڵ ئەو شتانەدا وێکنایەتەوە کە مارکس خستوونیەتە ڕوو، بەڵکو "بۆ زۆربەی خەڵك جۆرە هەلاتنێکەو، رێ خۆشدەکات بۆ هەلاتن لە بەرپرسیارییەکانی ئێستە (و هەڵگرتنیان) بۆ بەهەشتێك لە



ئایندەدا.(47) "لە رووی سیاسەتی کردەییشەوە زیانبارترین فاکتەر لە مارکسیزمدا پێشبینیەی شۆڕشێکە کە دەشێ توندوتیژ بێت(48).

بەڕای پۆپەر "هۆی شکستی ئەو (مارکس) وەکو پێغەمبەرێك و پێشبینێك رێبازی مێژووگەراییەکەیەتی، واتە ئەو راستیەی کە ئەگەر ئەمڕۆ شتێك ببینین وەکو مەیلێك یان رەوتێکی مێژوویی خۆی بنوێنێت، ناتوانین ئەوە بزانین کە ئایا سبەینێش هەر بەو جۆرە خۆی دەنوێنێت یان نەء."(49) لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پۆپەر دەرهەق بە بیروبۆچوونەکانی مارکس لایەنی راست لە دەست نادات و، رایدەگەیەنێت: "لە ناکۆکیی نێوان ئایدیالیزم و ماتێریالیزمدا زیاتر لەگەڵ مارکسدا یەکدەگرمەوە. ئامانجی من پیشاندانی ئەو خاڵە بوو کە لەگەڵ هەموو ئەو گرنگیەی کە دەشی هەیبێت، نابێ لێکدانەوەی ماتێریالیستیانەی مارکس بۆ مێژوو زۆر بەجیددی بگرین."(50) هەروەها دەڵێت: "بە بڕوای من باوەڕی مارکس لە بنەڕەتدا باوەڕ بووە بە کۆمەڵگای کراوە.(51) بە پێی پرنسیپە ئاکارییەکانی مارکس کۆمەڵێك چەمکی وەکو ئازادیو یەکسانی لە هەموو شتێکی دی گرنگتر بوو(52). (تەنانەت "دەتوانین کاریگەریی مارکس لە ئایینی مەسیحدا) (لەڕووی ریفۆرمە ئاکاریەکانەوە) بشوبهێنین بە کاریگەرەی لۆتەر لە مەزهەبی کاسۆلیکدا.. مارکسیزمی سەرەتایی بەو وردبینیو پێگیرییە کردەییەی کە بۆ مەسەلە ئاکارییەکان تەرخانیکردبوو، هەروەها ئەو جەختەی کە لەسەر

کردەوە دەیکرد لەبری قسە، دەشێ گرنگترین هزری ریفۆرمسازانەی ئەمرۆی ئێمەی هێنابێتە گۆڕێ."(53) بەڕای پۆپەر ئەگەر لەو (مارکس) یان بپرسیبایە: (ئایا ئێمە دەبێ خولقێنەری چارەنووسی خۆمان بین یان تەنها بە پێشبینیکردنی قەناعەت بکەین؟) ئەو خولقاندنی بەسەر پێشبینیدا پەسەند دەکرد."(54) لەگەڵ هەموو ئەمانەدا پۆپەر لە دوا شیکردنەوەدا رای وایە کە "لەنێوان کارایی خوازی **activism** ی مارکس و باوەڕیدا بە مێژووگەرایی درزێکی گەورە هەیەو، تیۆرەکەشی سەبارەت بەوەی کە چارێکی دی نیە جگە لە تەسلیمبوون بە هێزە نائەقڵانیەکانی مێژوو ئەو درزە بەرینتر دەکات.(55) مارکس مێژووگەرایی لە هیگڵەوە وەرگرت، بەڵام دواتر بەم سنورەوە نەوەستاو، رێی دا تا مێژووگەرایی بەسەر کارایی خوازی (یان باوەڕی ئەو بە کاریگەریی کار) دا زاڵ بێت."(56)

بەکورتی گرنگترین لافی مارکسیزم ئەوەیە کە مێژوو و کۆمەڵگا ملکەچی کۆمەڵێك یاسای زانستیی حەتمین و دەکرێ لەسەر بناغەی ئەو یاسانە پێشبینیی ئایندەی مێژوو و کۆمەڵگای مرۆیی بکەین. ئەنجامدانی کاری پێچەوانە بەکارکردی ئەم یاسایانە ئەستەمە، ئەمەشە مانای سۆسیالیزمی زانستی بەرامبەر سۆسیالیزمی یۆتۆپیایی. بێگومان پۆپەر هزری مارکسی بە یۆتۆپیایی لە قەڵەم دەدا، هەرچەندە مارکسیزمی سەدەی بیستەم لە قاڵبی کۆمۆنیزمدا خەسڵەتێکی وەهای بەخۆوە گرتووە. پۆپەر نکوولی لە زانستێتیی هزری مارکس ناکات، واتە بە رەچاوکردنی ئەوەی کە ماهیەتێکی یاسایانەی هەیە بە ناپووچەڵئامێزی نازانێت. هەر بۆیە بە رای ئەو پێویستە بیروڕاکانی مارکس تاقیبکرێنەوە، کە تاقیش کراونەتەوەو پووچەڵ و رەتیش کراونەتەوە. بەمجۆرە، بە پێچەوانەی راو پێشبینییەکانی مارکس، لە وڵاتە پێشکەوتووە پیشەسازییەکاندا کۆمۆنیزم پەیدا نەبوو، پرۆلیتاریا لە شۆڕشە کۆمۆنیستیەکانی سەدەی بیستەمدا رۆڵی نەبوو، کرێکاران لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا خۆشگوزەرانتر بوون و هۆشیاریی چینایەتییان لە دەست داوە، کۆمەڵگای سەرمایەداریی پێشکەوتوو بەسەر دوو جەمسەری بۆرژوازیو پرۆلیتاریادا دابەش نەبووە، بەڵکو چینی ناوەڕاست گەشەی کردووە. بەم پێیە تیۆرە زانستیەکەی مارکس پووچەڵ بۆتەوە. "مارکسیزمی زانستی مرد، بەڵام دوو شت تیایدا دەبێ بە زیندوویی بمێننەوە: یەکێکیان هەستکردن بە بەرپرسیارێتیی کۆمەڵایەتیەو، ئەوی تریان عیشقە بۆ ئازادی."(57)

بە رای پۆپەر مارکسیزم بە تەنها نموونەیەکە لە تیۆرەکانی مێژووگەرایی.

بەپێی ئەمجۆرە تیۆرانە مێژوو بە گوێرەی کۆمەڵێك یاسای ناچاریو حەتمی کۆمەڵێك قۆناغ دەبڕێو، بە پێی هەمان ئەو یاسانە ئایندەی کۆمەڵگا قابیلی پێشبینیکردنە. تەواوی ئەو تیۆرانەی دەیانەوێ لە پرۆسەی مێژوودا شوێن پێی ئاقارە حەتمیەکان هەڵگرن؛ مێژووگەران. لە دیدگایەکی وەهاوە مێژوو گشتێکە کە بە پێی کۆمەڵێك یاسای گشتگیر بەشەکانی پێکەوە بەستراونەتەوە. لە دیدی پۆپەرەوە ئایدیۆلۆژییە شۆڕشگێڕەکان هەم مێژووگەران و هەم گشتگەرا **holist**. لەو روانگەیەشەوە کە مێژوو بە هاوتای پلان و نەخشەکانیان دەزانن، ئامانجێك یان یۆتیۆپیایەکیشی بۆ وێنا دەکەن. بە رای پۆپەر

تیۆره مێژووگەرا میتافیزیکیو فەلسەفیو زانستیەکان، پۆپەر بڕوای وایە کە گۆڕان لە مێژوودا ملکەچی یاسای حەتمی نیە، بەڵکو ئەنجامی هەوڵی ئێمەیە بۆ چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکان. مێژوو خۆی لە خۆیدا بەدیهێنەری مەبەست و ئامانج و ئاقارێك نیە. کارەکانی ئێمە ئەو شتانەی پێ دەبەخشێت. هەڵبەت گەشەسەندن و گۆڕانی مێژوو پەیوەستە بە گەشەسەندن و گۆڕانی زانینی ئێمەوە، بەڵام شێوەی پێشکەوتنی ئەو زانینەی ئێمە لە ئایندەدا شتێك نیە قابیلی پێشبینیکردن بێت. هەر کەسێ بتوانێ ئەمڕۆ لە ڕێی ئەو هۆیە زانستییانەوە کە لە بەردەستدان دۆزینەوەکانی سبەینێ پێشبینی بکات، لەهەمان کاتدا دەتوانێ دەستی بەو دۆزینەوانە بگات، ئەمەش مانای کۆتایی ڕەوتی گەشەسەندنی مەعریفەیە، ئەگینا ئەوانە بە دۆزینەوە لە قەڵەم نادرێن. لە پەراوێزی ئەم چەمکە گشتیەدا، ئەستەمیی پێشبینیکردنی گۆڕانەکانی کۆمەڵگاو بەرنامەڕێژیی تەواو بۆ کۆمەڵگا دەبینینەوە. کارەکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتیو، کاری سیاسی بە شێوەیەکی تایبەتی، ئاسەواری وایان هەیە کە لە دەرەوەی نیازی بکەرەکانیانن.

لە ڕوانگەی ڕەخنەییانەی پۆپەرەوە، ڕوانینە یۆتۆپیایی یا شۆڕشگێڕەکان بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی، یان ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی (ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی–و–) پشت بە نیمچە زانست یان هزری نائەقڵانی دەبەستێ. هەر لەبەر ئەمەشە کە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئایدیۆلۆژیا گشتگیرو یۆتۆپیاییو مێژووگەراکان کارەساتاویو موسیبەتبارە. هەرچۆن هەموو یاسایەکی سروشتی نادۆگماتیك و پووچەڵنامێزە، بەهەمان



شێوە یاساو گریمانە سۆسیۆلۆجیەکانیش. تەنانەت کاتێ بەڵگەی سەلمێنەری زۆریش هەن، دەبێ ملکەچی ئەزموونی پووچەڵکردنەوە بن.
لێرەوە دەردەکەوێ کە وەدیهاتنی خواستە یۆتۆپیاییەکان بۆ بیناکردنەوەی تەواوی کۆمەڵگا شتێکی ئەستەمە لەڕووی لۆجیکیەوە. "لەبەر زۆر هۆ ناتوانرێ هەموو یا نزیکەی هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان ڕێك بخرێتەوە، لانی کەم لەبەر ئەوەی بە پراکتیك کردنی هەر سیستمێکی تازە بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا، کۆمەڵێك پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نوێ دێتە ئاراوە کە دیسانەوە دەبێ ڕێکبخرێنەوە."(58) ئەوەش کە ڕوانینی یۆتۆپیاییانە بۆ ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی لەڕووی لۆجیکیەوە ئەستەمە؛ لە کەموکورتیی ڕوانینە گشتگەراکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا دەردەکەوێ، لەبەر ئەوەی ئەم زانستانە خەسڵەتی هەڵبژاردن و بەشەکی (جزئی) انەی بینینەکان لەبەرچاو ناگرن و، لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگا وەکو گشتێك ڕەچاو دەکەن.

پۆپەر لەنێوان ڕێگەچارەی ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی یۆتۆپیایی یا گشتگیرو ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی پلە بە پلە (تدریجی)دا، تەنها دووەمیان بە شیاو دەزانێ. ئەوانەی باوەڕیان بە یۆتۆپیا هەیە "ئەوەی کە لە بنەڕەتدا پلە بە پلەیە بێ بیرکردنەوەو ناشیانە بەکاریدەهێنن."(59) ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی گشتگیر یا یۆتۆپیایی، تیۆرەیەکی سەبارەت بە کۆمەڵگاو بەشە دیاریکەرەکانی لە پشتەوەیە کە

پشت بە مەزنە دەبەستێت. بەرامبەر بەمەش، ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی پلە بە پلە پێویستە هەلومەرجە پێویستەکان لە روانگەی ئەزموونگەرییانەوە رەچاو بکات. ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی بە بێ توانای رەخنەگرتن لە ئامانج و میتۆدەکانی کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە. "پێشکەوتن و پەرەسەندن وابەستەن بە فاکتەرە سیاسییەکانەوە؛ واتە بەو دەزگایانەوە بەستراونەتەوە کە پارێزەری ئازادیی مرۆڤن."(60) پێویستە توانای رەخنەگرتن لە سیاسەتەکانی حکومەت بۆ بەدەستهێنانی هەر جۆرە ئەندازیارییەکی کۆمەڵایەتی پارێزراو بێت. هەروەکو بینیشمان ئەم چەمکە بەرهەمی تیۆرەی پۆپەرە سەبارەت گەشەی زانست وەکو پرۆسەی لابردنی هەڵە. جگە لەوە رەخنەگرتن لە سیاستەکانی حکومەت لەبەر هەندێ هۆی تریش هەر پێویستە، لەو هۆیانەش ئەوەی کە کاری سیاسی بەردەوام ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. پۆپەر کۆمەڵێك هۆ بۆ رەتکردنەوەی ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی گشتگیر لە پێوانە فراوانەکەیدا دەهێنێتەوە: یەکەم ئەوەی کە لەمجۆرە ئەندازیارییە کۆمەڵایەتییەدا، لەبەر ئەوەی بەردەوام دەسپێشخەریی زۆرو فراوان دەکرێ؛ ناتوانین بە ئاسانی ئەوە دەسنیشان بکەین کە کام دەسپێشخەری لە رووداونی ئەنجامەکاندا کاریگەر بووە، بەمجۆرە ئەم تەرزە میتۆدە بەدەستهێنانی زانستی ئەزموونگەرییانە سەبارەت ژیانی کۆمەڵایەتی بە ئەستەم دەهێنێتە دی. بە رای پۆپەر تەنانەت ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی پلە بە پلەش بەردەوام نابێتە مایەی وەدەستهێنانی زانینی ئەزموونگەرییانەی پێویست سەبارەت بە کۆمەڵگا. "زۆربەی تاقیکردنەوە زۆر پێویستەکان، لەگەڵ ئەوەشدا کە یۆتۆپیایی نین و ماهیەتێکی پلە بە پلەیان هەیە، بۆ ماوەیەکی زۆر لە سنووری خەون و خەیاڵدا دەمێننەوە. لەکاردا دەبێ (ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی) پشت بەو تاقیکردنەوانە ببەستێت کە لە زەیندا تاقی کراونەتەوە..."(61) بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە شێوازێکی باشتر لە ئەندازەی کۆمەڵایەتیی پلە بە پلە لە ئارادایە. دووەم ئەوەیە کە بە رای پۆپەر بەرنامەرێژی و ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی گشتگیر یا یۆتۆپیایی دژ بە ئامانجەکانی خۆیانن و، یان بە دەربڕینێکی باشتر ناتوانن رێ لە دژایەتیکردنی ئامانجەکانی خۆیان بگرن. بە شێوەیەکی گشتی هەوڵدان بۆ بیناکردنەوەی گشتیی کۆمەڵگا بەرەو رووی گەلێ ناکۆکیی گەورە دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندییە جێگیرەکانی گروپە کۆمەڵایەتییەکاندا بەیەکدا دێن، جگە لەوە کۆکبوونی رای گشتی لەسەر ئامانجەکانی ئەمجۆرە دەسپێشخەرییە یۆتۆپیاییو گشتگیرانە گەلێ دوورە. دەرئەنجام ئەندازیارە کۆمەڵایەتییەکان یا شۆڕشگێڕەکان دەبێ نەیارەکانیان سەرکوت بکەن، یانیش بەزۆر ملیان پێ کەچ بکەن. بەمجۆرەش حکومەت ماهیەتێکی دەسەڵاتگەرایانە بەخۆوە دەگرێت و، ناچار دەبێت هەموو جۆرە رەخنەو نەیارییەك سەرکوت بکات. حکومەتێکی لەمجۆرە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگادا لەدەست دەدات و، تەنانەت ناتوانێ لە سنووری گونجاندنی خۆی لەبەرنامە رەچاوکراوەکانیدا بگات. شۆڕشگێڕان لە ئەنجامدا دەگۆڕێن بۆ چینێکی ئۆرستۆکراتی نوێو، ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕانە وەکو پەردەیەك بۆ شاردنەوەی ئیمتیازاتەکانی خۆیان بەکاردێنن:

"ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕانه دەبێ بە تلیاکی خەڵك." کاتێ شۆڕشگێڕان بۆ رزگارکردنی بەرنامە شۆڕشگێڕو یۆتۆپیاییەکانی خۆیان تەواو دەسەڵات دەخەنە دەستی خۆیانەوە، بۆ پاراستنی ئەو دەسەڵاتە دەست بە هەندێ کاری پەلە یان بەرنامەڕێژیی (بەرنامە رێژی نەکراو) دەکەن. بەمجۆرە ئەندازیاریی کۆمەڵایەتیی یۆتۆپیایی دەبێتە مایەی دژایەتیکردنی ئامانجەکانی خۆی.

ئایدیۆلۆژیا یۆتۆپیاییو شۆڕشگێڕەکانیش کە ئامانجیان دامەزراندنی جیهانێکی داهێنراو و بێ وێنەیە؛ ئایدیۆلۆژیگەلێکی خەیاڵین، لەبەر ئەوەی شتێك کە تەواو نوێو بێ وێنە بێت ئەستەمە، هەموو ئایندەیەك رەگوریشەی لە ئێستاو رابوردوودا هەیە. دروستکردنی یۆتۆپیایەك کە نموونەی نەبێت ئەستەمە. لەبەر ئەوەی تاقە شتێك کە ئێمە دەتوانین بە راستی ئەنجامیبدەین؛ ئەوەیە کە لەسەر باروودۆخی هەنووکە کار بکەین و گۆڕانکاریی تێدا ئەنجامبدەین. چ شۆڕشگێڕان و چ ئەوانەی باوەڕیان بە یۆتۆپیا هەیە بە گۆڕانی بەشەکی (جزئی) قایل نین و ، خوازیاری گۆڕینی تەواوی بونیاد کۆمەڵگان. بە مانایەکی دی دوچاری ئەو دژایەتی (تناقض)ە بوون لەگەڵ خۆیاندا کە دەیانەوێ بەر لەوەی بەشێك لە شتەکان بگۆڕن، تەواوی سیستمەکە هەڵاوگێڕ بکەن. جگە لەوە شۆڕشگێڕان و لایەنگرانی یۆتۆپیا لافی ئەمە لێدەدەن کە ئاگاداری و زانینی تەواویان سەبارەت بە کۆمەڵگا لایە، کە ئەمەش شتێکە ئەقڵ نایبڕێت. هەروەها ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت مێژوو ئامانجێکی هەیە؛ بێ بناغەیە، چونکە دوای ئەو شتەی کە بە ئامانجی مێژوو لە قەڵەم



دەدرێ، دیسانەوە گۆڕانی دیو ئامانجی دی دێتە گۆڕێ. بەم پێیە مێژوو داخراو نیەو، ناتوانین بیوەستێنین. تا بەرەو پێشەوە بچین ئاسۆی نوێ دەکرێتەوەو، هەرگیز ناتوانین بگەینە کەناری ئارامیو کۆتایی ئاسۆ. دژایەتیەکی تریش لە ئارادایەو، ئەویش ئەوەیە کە شۆڕشگێڕان و خەون و خەیاڵەکانیان دەکەونە ژێر کاریگەریی کۆمەڵگاو باروودۆخی باوەوەو، بەمجۆرە بەو شتەی کە بەشێکە لە باروودۆخی باو ناکرێ باروودۆخی باو لەناو ببرێ. هێنانە ئاراوەی کۆمەڵگایەکی تەواو نوێو بێ نموونە وابەستەیە بە لەنێوبردنی ئەو باروودۆخەوە کە لەگۆڕێدایە، بەڵام تێکدانی باروودۆخی باویش واتە ئەستەمبوونی هەر کارێك، بەم پێیە رێگەیەکی دیکە نیە جگە لە کارو بزاوتی هەنگاو بەهەنگاو (کە تێکڕا دەبنە هۆی گۆڕانی بنەڕەتیو بناغەیی). تەنانەت ئەگەر بکرێ تەواوی کۆمەڵگا بە پێی پلان و نەخشەیەك بینابکرێتەوە، دیسانەوە ئەو کارە لە دەستی پلانڕێژو نەخشەسازەکان دەردەچێت و، لە ژێر کاریگەریی گۆڕانە ناچارییەکاندا دەگۆڕێت. بە شێوەیەکی گشتی لە روانگەی پۆپەرەوە گۆڕانی شۆڕشگێڕانەو سەرتاپاگیرو رادیکال لەو کۆمەڵگایانەدا کە دامو دەزگای پێویستیان تیا نیە بۆ رەخنەگرتنی ئازادانە لە سیاسەتەکانی حکومەت، زۆر دژوارە.

هەلومەرجی گونجاو بۆ رەخنەیەکی وەها لە سیاسەت و حکومەتدا هاوتەریبە بە رەوتی

چارەسەری کێشەکە لە ڕێی لابردنی هەڵەوە لە زانستدا. لە دیدگای پۆپەرەوە هەلومەرجی ڕەخنەی زانستیو لابردنی هەڵە بە تەنها لە حکومەتە دیموکرات و لیبراڵەکاندا قابیلی ئەنجامدانەو، گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانە لم هەلومەرجانەدا دەبێتە مایەی کەموکورتی و نارێکی.

## سەبارەت بەرگریکردن لە دیموکراسیو کۆمەڵگای کراوە

هەروەکو بە روونی بینیمان، تیۆرەی سیاسیو کۆمەڵایەتیی کارل پۆپەر لە تیۆرە ئەپیستمۆلجیەکەوە سەرچاوە دەگرێ، کە بناغەی فەلسەفیی ئەوە. بابەتی سەرەکیی کتێبی (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی) ئەوەیە کە دەبێ لە بیروڕاو تیۆرە فەلسەفیەکاندا بەدوا ڕەگوریشەی سیستمە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکاندا بگەڕێین. بەڕای ئەو دەبێ ئەو پرنسیپانەی کە سەبارەت تیۆرە زانستیو میتافیزیکیەکان بەکاردەبرێن بە هەمان ئەندازە سەبارەت تیۆرە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانیش بەکار ببرێن. ئەنجامگیرییەکانی هەردوو کتێبی (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی)و (هەژاریی مێژووگەرایی) لەتیۆرەی ئەپستمۆلۆجیی کتێبی (لۆجیکی دۆزینەوەی زانستی)یەوە سەرچاوەیان گرتووە. ڕەخنەگرتنی ئەقڵانیش کە بناغەی گەشەسەندنی زانستە، خەسڵەتی سەرەکیی کۆمەڵگای کراوەیە.

پۆپەر لە کتێبی (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی)دا بە شێوەیەکی سادە بەرگریی لە دیموکراسی، یان بە واتایەکی دی بە سۆسیال–دیموکراسی کردووە. بە گوێرەی فەلسەفەی میتۆدۆلۆجییانەی ئەو، واتە (لابردنی هەڵە)، باشترین شێواز بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی باشتر چارەسەرکردنی هەنگاو بە هەنگاوی ئەو مەسەلانەیە کە دوچاری کۆمەڵگا بوون. هەروەکو چۆن لە زانستدا پێشکەوتن پێویستی بە ڕەخنەلێگرتنی بەردەوام هەیە، لە سیاسەت و کۆمەڵگاشدا ڕێی گەشەسەندن و پێشکەوتن بەستراوەتەوە بە ئازادیی ڕەخنە لێگرتن و پێشنیازکردن و ڕێگە چارەی جۆراوجۆرو چارەسەرکردنی کێشەکان و گۆڕانکارییەوە لەسەر ئەم بنەمایانە. بۆ گەڕان بەدوا نهێنیی پێشکەوتنی دیموکراسیەکانی خۆرئاوادا دەبێ لە پێشزەمینەی هزری ئازادیو ڕەخنەلێگرتن بکۆڵینەوە؛ نەك لە سامان و سەرچاوە سروشتیەکانی ئەو دیموکراسییانە. بەدەربڕینێکی دی؛ دیموکراسی هۆی سەرەکیی گەشەسەندن و پێشکەوتنی ئابووریی خۆرئاوا بووە. دیموکراسی ئەو بوارە دەڕەخسێنێت کە سیاسەتەکانی دەوڵەت وەکو کۆمەڵێك گریمانە وەربگیرێن کە پێویستە بەردەوام بکەونە ژێر دەستکاریو ریفۆرمەوە. دارشتنی سیاسەت خۆی لەخۆیدا هەندێ مەسەلەی پێشبینی نەکراو دەگرێتە خۆی و، چەند بیرکردنەوەی پێشوەخت و لێکۆڵینەوەو ڕەخنەش دەربارەی پتر بێت ئەگەری سەرکەوتوویی زیاترە. ڕەخنەلێگرتن ئەگەری لابردنی هەڵە زیاتر دەکات. لە دارشتنی سیاسەتدا بەتەنها نیازپاکی بەس نیە و،هەمیشە دەبێ بڕیارە سیاسیەکان تاقیبکرێنەوە، نەك بەو مەبەستەی ڕادەی سەرکەوتووییان ئاشکرا بێت، بەڵکو بە مەبەستی دیاریکردنی ناتەواوی و خەوشەکانیان. بە پێچەوانەوە، سیاسەتمەداران

جەخت لەسەر بەڵگەی سەرکەوتووییەکانیان دەکەن و، لە گەڕان بەدوای هەڵەی بڕیارەکانیاندا خۆیان دەپارێزن، ئەمەش خۆی گرنگترین هۆی نشوستیو شکستە.

لە بڕیارە سیاسییەکاندا، هەروەکو تیۆرە زانستیەکان، هەڵە کاتێ ئاشکرا دەبێت کە رەخنە هەبێت، ئەمەش پێویستی بە بوونی (کۆمەڵگای کراوە) و فرەجۆرە. کۆمەڵگای کراوە کۆمەڵگایەکە کە تیایدا سیاسەتەکانی دەوڵەت بە پێی رەخنەلێگرتنی بەردەوام راست دەکرێتەوەو دەگۆڕێن. هەڵبەت گۆڕان لە سیاسەتەکاندا پێویستی بە گۆڕان لە تاقمی دەسەڵاتداردا هەیە. بۆیە بوونی ئۆپۆزسیۆنی رێکخراوو ئەگەری گواستنەوەی ئاشتیئامێزانەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە گروپێکەوە بۆ گروپێکی دی مەرجی هاتنەدیی کۆمەڵگای کراوەیە. بەم پێیە دیموکراسی وەکو شێوازێك تەنها بەو مانایەی کە زۆرینە حوکمڕانەکان هەڵدەبژێرن، دیموکراسییەکی راستەقینە نییە. دەش زۆربەی خەڵك کەسانێك هەڵبژێرن کە دژ بە کۆمەڵگای کراوەو، دام و دەزگای مەدەنی و ئازاد و، رەخنەلێگرتن بن، هەروەکو لەو دیکتاتۆریەتانەدا روویانداوە کە بە ناوی شۆڕشەوە حوکمیان کردووە. ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە دیموکراسی تێگەیشتنێکی رواڵەتی‌یە. دەشێ کۆمەڵگای کراوە نەك هەر لەسەر دەستی دیکتاتۆران و کەمینەی حوکمڕان؛ بەڵکو لەسەر دەستی زۆرینەش گورزی لێ بوەشێنرێ. بەم پێیە بەڕاستی دەکرێ بەرامبەر بەو زۆرینانەش بەرگری لە کۆمەڵگای کراوەو دام و دەزگا ئازادە دیموکراتەکان بکرێ. هەیدێ ئەوانەی کە فریودەری خەڵکن و ئەو



دیکتاتۆرانەش کە بە شێوازی تایبەتیی خۆیان وایان لە زۆربەی خەڵك کردووە کە لەگەڵیاندا بن و، بەناوی پاراستنی بەرژەوەندیی خەڵکەوە کۆمەڵگای کراوەو دام و دەزگا دیموکراتەکانیان لەناو بردووە. بێگومان مەرجی سەرەکیی کۆمەڵگای کراوە لێکبوردنی سیاسییە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لێبوردن بەرامبەر بەو گروپانەی کە دژی لێکبوردنی دیموکراسین زیان بە بونیادی کۆمەڵگای کراوە دەگەیەنێت. بەم پێیە لەکاتی پێوست و لەکاتی بوونی هەڕەشەی ترسناکدا، پێویستە دوژمنانی لێکبوردن و لایەنگرانی توندوتیژی سەرکوت بکرێن.

لە رووی سیاسەتە ئابوورییەکانەوە پۆپەر لایەنگری جۆرە سۆسیال دیموکراسیەکە. بەڕای ئەو ئازادیی ئابووریی بەرەڵلاو بێ سنوور زیان بە ئازادیو دیموکراسی دەگەیەنێت. پۆپەر بەرگری لە دەوڵەتی خوشگوزەرانی (رەفاه) و بوونی دامەزراوەکان بۆ پاراستنی چینەکانی خوارەوەو دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا دەکات. بە ڕای ئەو دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا شتێکی ناچاریە. دەوڵەت هەر هەڵوێستێك بگرێت، چ بە دەستێوەردان و چ بە پێچەوانەوە، هەر بە جۆرە دەستێوەردانێك دەژمێردرێ.

بەهەر شێوەیەك بێت لە سەرمایەداریی پێشکەوتووشدا ئازادیی تەواوی بازاڕی نیە، چونکە ئەگەر دەوڵەتیش دەستی تێ نەخات دەزگا پاوانکەرەکان هەلومەرجەکانی کێبەرکێی

تەواو لەناو دەبەن. بە کورتی دەوڵەت دەبێ بۆ دابینکردنی ئازادیی ئابووریی هەمووان بەرنامەڕێژی بکات و دەستێوەر بدات. بە دەربڕینێکی دی دەبێ مەبەست لە دەستێوەردانی ئابووریی دەوڵەت دابینکردنی رادەی زۆری ئازادیی ئابووری بێت. دەستێوەردانی کەمتر یا زیاتر لە رادەی پێویست بۆ گەیشتن بەم ئامانجە زیان بە ئازادی، واتە بە ئامانجی سەرەکیی ژیانی سیاسی دەگەیەنێت. لەم بارەیەوە پۆپەر ئاگادارمان دەکاتەوە کە "بێگومان گەورەترین مەترسی دەستێوەردان– بەتایبەتی دەستێوەردانی راستەوخۆ–ی زیادبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت و تەشەنەکردنی بیرۆکراسیە. ئەو شتەی کە دەبێتە مایەی زیادبوونی مەترسیش ئەوەیە کە کەمتر لایەنگرانی دەستێوەردان خەوش لەم مەسەلەیەدا دەبیننەوە... دەبێ هەم بۆ ئاسوودەیی بەرنامەڕێژی بکەین و هەم بۆ ئازادی، چونکە بە تەنها ئازادی ئاسوودەیی دابیندەکات."(62) بۆ دابینکردنی ئەم مەبەستەش پێویستە دەسەڵاتی سیاسی پەرش بێت، چونکە هەر سەنتەریزمێك بۆ دەسەڵات لەگەڵ خۆیدا مەترسیی دیکتاتۆری هەڵدەگرێت. بۆیە مەسەلەی سەرەکی لە ژیانی سیاسیدا پەیوەست نیە بە ماهیەت و ژمارەی حوکمڕانەکانەوە (وەك چۆن لە فەلسەفەی کۆندا وا دەخرایە روو)، بەڵکو مەسەلەی سەرەکی شێوازی بەکارهێنانی دەسەڵاتەو، رێگای نەهێشتنی چەوساندنەوەش بەرگرتنە لە بەکارهێنانی دەسەڵات بە شێوازێکی دیکتاتۆریانە. مەسەلەی سەرەکی بریتیە لەوەی "چۆن دەتوانین دەزگا سیاسییەکان بە جۆرێك رێك بخەین کە تەنانەت حوکمڕانە خراپ و ناشایستەکانیش نەتوانن زیان بە کۆمەڵگا بگەیەنن."(63)

لەبواری سیاسەتی ئابووریشدا دروشمی پۆپەر بەرامبەر لایەنگرانی سوودگەرایی، کە بەرگرییان لە زۆرترین شادی بۆ زۆرترین خەڵك دەکرد ئەوەیە کە دەبێ هەوڵبدەین لە هەژاریو بەدبەختیی خەڵك کەمبکەینەوە. بەواتایەکی دی لەبری تەقەللاکردن بۆ هێنانەدیی یۆتۆپیا پێویستە ئەو کەموکورتیە کۆمەڵایەتیانەی لە ئارادایە، نەیانهێڵین. ئەو لە کتێبی (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی)دا دەڵێت: لەنێو تەواوی ئامانجە سیاسییەکاندا لەوانەیە خەتەرترینیان ئامانجی شادکردن و بەختەوەرکردنی خەڵك بێت. ئەمجۆرە ئامانجە ئەنجامەکەی بە سەپاندنی بەها بالاترەکانی ئێمە بەسەر خەڵکانی تردا دەشکێتەوە، تا ئەوانیش لەو شتە بگەن کە بە بڕوای ئێمە زۆرترین بایەخی بۆ بەختەوەرکردنیان هەیە... ئامانجێکی وەها بەرەو یۆتۆپیاگەراییو ئاقارە رۆمانتیکیەکانمان دەبات. ئێمە دڵنیاین کە هەمووان لە کۆمەڵگای کامڵ و جوان و خەیاڵیی ئێمەدا بەختەوەر دەبن و، بێگومان ئەگەر یەکتریشمان خۆش بوێت ئەوا بەهەشت لەسەر رووی زەوی دەخولقێنین... بەڵام هەوڵدان بۆ خولقاندنی بەهەشت لەسەر زەوی دەبێتە مایەی خولقاندنی دۆزەخ، دەبێتە مایەی هەڵنەکردن لەگەڵ یەکتردا، شەڕی مەزهەبی لێ دەکەوێتەوەو، بەدابینکردنی قوتاربوون لەڕێی دروستکردنی دەسەڵاتی پشکنینی بیروباوەڕەوە دەشکێتەوە."(64)

بەڕای پۆپەر شێوازی هێنانەدیی یۆتۆپیاو دابینکردنی بەختەوەریی رەها بۆ خەڵك شتێکی روون نیە، بەڵام شێوازی کەمکردنەوەو لەناوبردنی کەموکورتیو گرفتە کۆمەڵایەتیەکان تاڕادەیەك روونە. کەمکردنەوەی کلۆڵیو بەڵا هاندەرێکی کردەییو عاتیفیی بەهێزتر دەخولقێنێ لای ریفۆرمیستە کۆمەڵایەتیەکان وەك لە دابینکردنی بەختەوەریو کامەرانی. کەواتە لەبری ئەوەی باس لەدابینکردنی زۆرترین شادی بۆ زۆرترین خەڵك بکەین (وەکو بنتهام وادەخوازێ)، پێویستە باس لە کەمکردنەوەی زۆرترین رادەی ئازارو کلۆڵیی خەڵك بکەین.

بۆچوونی ناکۆك لەسەر پەیوەندیی مەنتیقیانەی فەلسەفەی زانست و ئەپیستمۆلۆجیا بە هزری سیاسیی پۆپەرەوە هەیە. رەخنەگرانی پۆپەر رایان وایە کە تیۆرە زانستیەکەی ئەو (شۆڕشگێڕانەیە) (لەبەر ئەوەی جەخت لەسەر پووچەڵکردنەوە دەکات)، لەکاتێکدا کە تیۆرەی ئەندازەی هەنگاو بەهەنگاو ریفۆرمیستانەیە، بۆ نموونە یەکێك لەو رەخنەگرانە کە ناوی مایکل فریمانە رای وایە کە ئەپستمۆلۆجیای پۆپەر پووچەڵئامێزە، لەئاستی ئەپیستمۆلۆجیدا رەخنەی پۆپەر لە یۆتۆپیاگەرایی ئەوەیە کە تێڕوانینێکی وەها یاساکانی زانست رەتدەکاتەوە، بەڵام هەر بەپێی رای ئەو خۆی یاسا زانستیەکان بەردەوام نارەهاو بێ پایانن. ئەمە بۆ خۆی لە دوو سەرەوە رەخنە لە یۆتۆپیاگەرایی لاواز دەکات: یەکێکیان ئەوەیە کە لە قەڵەمدانی هەر تیۆرەیەکی کۆمەڵایەتی بە یۆتۆپیا دەبێ بەردەوام نارەها (ناقەتعی) بێت، دووەمیشیان ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی پۆپەر



خۆی جار لەسەر جار ئەوە دووپات دەکاتەوە کە مەرجی گیانی زانستیانە دۆزینەوەی بەردەوامی بەڵگەی پووچەڵکەری یاسا نارەهاکانە، بۆیە وا دێتە پێشچاو کە تیۆرە کە تیۆرەکەی ئەو سەبارەت گەشەسەندنو پێشکەوتنی زانست و زانین رێ لە تاقیکردنەوە یۆتۆپیاکانیش نەگرێت و، بگرە تەنانەت هانیشیان بدات."(65)

ئێرنست گێلنەریش کە رەخنەگرێکی ترە رای وایە کە "لەنێوان فەلسەفەی زانست و تیۆرەی کۆمەڵایەتیی پۆپەردا هەم هاوسەنگیو یەکێتیو هەم ناهاوتاییو گرژی هەیە. فەلسەفە کۆمەڵایەتیەکەی ئەو لایەنگری سیفەتی جوانی (کراوەیی)ە کە هاوتای کۆمەڵایەتیی پووچەڵئامێزیە.. بەڵام گرژییەکی ئاشکرایش هەر لە گۆڕێدایە؛ لە زانستدا (کراوەیی) واتە تا ئەوپەڕی خۆ لە قەرەی مەترسی دان، بەڵام لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکاندا پێچەوانەی ئەوە رەوایە"(66)

## پەراوێزو سەرچاوەکان:

*وشەی (بینین) لەم وەرگێڕانەدا بە مانای (مشاهده) بەکارهێنراوە.

کارل ریموند پوپر، جستجوی ناتمام، ترجمەء ایرج علی آبادی، ویراستەء ضیاء موحد، مجموعەء اندیشەهای عصرنو، تهران، سازمان انتشارات و آموزش انقلاب اسلامی، 1369، ص95.

همان، ص 97.

Karl Raimund Popper, Conjectures and Refutations: The Growth of Scientific Knowledge, London, 1972, P, 46.

جستجوی ناتمام، ص47.

Bryan Magee, Modern British Philosophy, London, 1971, P. 73.

Conjectures and Refutations, P. 46.

جستجوی ناتمام، ص63.

Modern British Philosophy, P. 73.

جستجوی ناتمام، ص69.

همان، ص55.

همان، ص59.

همان، ص63.

Quantum Theory and the Schism in Physics, 199-211.

Ibid. P.199-211.

Ibid. P.199-211.

Karl Raimund Popper, Quantum Theory and the Schism in Physics, London, 1982, P. 199-211.

بریان مگی، پوپر، ترجمه‌ء منوچهر بزرگمهر، )تهران، انتشارات خوارزمی، 1359)، فصل4.

Karl Raimund Popper, The Open Universe: An Argument for determinism, London, 1982, P.130.

Ibid, P.127.

Ibid. P. xx.

Ibid. PP.1-2

Ibid. P.41.

Ibid. P.199.PP.1270128.

Karl Raimund Popper, Objective Knowledge: An Evolutionary Approach, Oxford, 1979, P. 108.

Ibid. Preface.

Ibid. P. 242.

27– پوپر، فصل 5.

28- Karl Raimund Popper, The logic of Scientific Discovery, London, 1968, P,111.

29- Conjectures and Refutations, P.30.

30– جامعه‌ء بازو دشمنان آن، جـ 3 ص674.

31– همان، ص 675.

32– همان، ص679.

33– همان، ص 687.

34– همان، ص 688 و 689.

35– همان، ص 617.

36– همان، ص 729.

37– همان، ص 730.

38– همان، ص 735.

39– همان، ص 758.

40– جامعه‌ء بازو دشمنان آن، جـ4، ص 858.

41– همان جا.

42– همان، ص 893 و 894.

43– همان، ص 860.

44– همان، ص 911.

45– همان، ص 919.

46– همان، ص920.

47– همان، ص 941.

48– همان، ص 957.

49– همان، ص 1013.

50– همان، ص 897.

51– همان، ص 1024.

52– همان، ص 1034.

53- همان، ص 1026.

54- همان، ص 1027.

55- همان، ص 1027.

56- همان، ص 1039.

57- همان، ص 1040.

58- Karl Raimund Popper, Poverty of Historicism, London, 1957, PP. 79-80.

59- Ibid. P. 68.

60- Ibid

61- Ibid. P. 97.

62- پوپر، فصل های 6، 7.

63- همان جا.

64- Michael Freeman, "Sociology and Utopia: Some reflection on the social philosophy of Karl Popper", British Journal of Sociology, (March 1975), no. 26. PP. 31-32.

65- Ibid.

66- Ernest Gellner, The Legitimation of Belief, Camberidge, 1974, P. 172.


*ئەم باسە لەم کتێبەوە کراوە بە کوردی:

(تاریخ اندیشەهای سیاسی در قرن بیستم- جلد دوم- لیبرالیسم و محافظەکاری، حسین بشیریە- نشرنی چاپ اول 1378 (1999) تهران)

**واتای هەندێ لەو زاراوانەی کە لەم بابەتەدا هاتوون:**

زانین- مەعریفە Knowledge

تیۆرەی زانین Epestimology

زانست Science

مەزەنە Intuition



پووچەڵکردنەوە Refutation

پووچەڵئامێز Refutable

(هەر تیۆرەیەك قابیلەتی پووچەڵکردنەوە لەناوخۆیدا هەڵبگرێت).

ئەزموونئامێز Testable

(هەر تیۆرەیەك قابیلەتی تاقیکردنەوە لەناوخۆیدا هەڵبگرێت).

ئەندازاریایی کۆمەڵایەتی Social engineering

ئیستیقراء induction

(شێوازێکە لە شێوازەکانی ئیستیدلالو بریتییە لە دەستپێکردنو گواستنەوە لە تایبەتەوە بۆ گشتو، لە ئەنجامەکانەوە بۆ پرنسیپەکان و، لەدیاردەکانەوە بۆ یاساکانیان و دوو جۆر ئیستیقرائیش هەیە:

1-ئیستیقرائی تەواو Complete induction

2-ئیستیقرائی ناتەواو Incomplete induction

بوونی هێزەکی (الوجود بالقوّة) Potential entity

بەشەکی جزئي پرۆسەی لێکۆڵینەوە لە (بەش) دوە بۆ (گشت-کل).

# لێبوردن و بەرپرسیارێتیی فیکری

■ کارل پۆپەر

● و. لە عەرەبییەوە: ڕێبین هەردی

**سەرەتا** لەوە ناچێت چیدی "لێبوردن" کێشەیەك دروست بکات، لایەنی کەم لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا، لە ئەوروپاو ئەمریکای باکوورو ئوستورالیاو نیوزلەندادا. ئاشکرایە هەموو تاکەکەسێ لەکۆمەڵگا کراوەکانی ڕۆژئاوادا یان لەو کۆمەڵگایانەدا کە بەرەو کۆمەڵگای کراوە دەچن، خۆی لەهەڵوێستێکدا دەبینێتەوە کە لەلایەن کەسانی دیەوە جێی لێبوردنەو هەموو کەسێك بەگشتی زۆر زیاتر لەوەی بڕوای بە دیموکراسی هەبێت بڕوای بە لێبوردن هەیە، بێگومان خەڵکانێك کە باوەڕێکی بەتینو بەهێزی بە لێبوردن هەبێ، گرفتێکی جدی دەهێنێتە پێشێ: گرفتی ئەوەی ئایا لە پەیوەندی سۆزداریمان بە لێبوردنەوە زۆر زیاتر لە پێویست نەڕۆیشتووین. چونکە ئێمە لەترسی ئەوەی وا دەرکەوین کە کەسانی لێبوردوو نین، وامان لێهاتووە ئارەزووی فراوانی لێبوردن لەشێوە یاساییەکەیدا دەکەین بۆ ئەوەی تەنانەت ئەوانەش بگرێتەوە کە کەسانی لێبوردو نین ئەوانەی هەوڵی بلاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیەکانی لێ نەبوردن دەدەن.. ئەو ئایدیۆلۆژیانەی کە پەیڕەوی ئەو بنەمایە دەکەن کە دەڵی ئەو لایەنگرەی لە گرووپەکەی جیابێتەوە دەبێ لە ڕێی هێزەوە لەناوببرێ.. ئەو ئایدیۆلۆژیانەی سەیری جیابووەکان وەك کۆمەڵی تاوانبار دەکەن. ئا لێرەشدا من ئەم مەسەلەیە وەك یەکێك لە مەترسیە ترسناکەکان سەیر دەکەم کە بەرەو ڕوومان دەبێتەوە. ئەمەش نەك هەر لەڕووی تیوریەوە بەڵکو لەڕوی عەمەلیشەوە. لێرەشدا دەمەوێ سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشم کە ئێمە بەهۆی زیادەڕوییمان لە بیرۆکەی لێبوردندا، خۆمان لەبەردەم مەترسی لەناوبردنی ئازادیو لێبوردندا دەبینینەوە.

لــێرەدا نامــەوێ بڵێــم مەترســیەکە لەبەرچاوماندایە. بەڵام هاتنە سـەر دەسـەڵاتی دیکتاتۆریە تۆتالیتارە جیاوازەکانو دیکتاتوریاتی لینینو موسولینیو ستالین- سـەرەڕای کـەوتنی چیکۆسلۆفاکیای دیموکراسـی لەسـاڵی 1948داو داگیرکردنی لـە سـاڵی 1968دا کۆمـەڵێ نمونـەی دی، هەموو ئەمانە پیشانمان دەدەن دەشێ چی رووبداو چۆنیش رووبدا. بێگومان ئەرکی ئێمەشە لەم رووداوانـەوە فـێر ببـین: دەبـێ لـەمێژوو و لـە هەڵەکانمانەوە فێربین.

لە راستیدا ئـەو ترسە زیادەیەی هەمانە کە ئێمە بڕوامـان بـە لێبـوردن هەیـە، رەنگـە ببـین بەکەسـانێك کـە لێبــوردو نــین، بۆتــە هــۆی هەڵوێستێکی هەڵـەو پڕ مەترسی کە ناچارمـان دەکات لە هەموو شـتێ ببورین، تەنانـەت رەنگە لەکاری توندوتیژیش.. بێگومان لێبوردن بەرامبەر بە هەر شـتێکیش کـە چـەند هـەنگاوێکی کـەم لـە توندوتیژیەوە دوورە. ئەم هەڵوێستە بە شێوەیەك لە شێوەکان قـابیلی تێگەیشتنەو بگرە شـایەنی سەرسام بوونیشە. چونکە لەو دیدەوە سـەرچاوە دەگرێ کە لەپشت بناغـەی سـەرجەم بیرۆکـەی لێبوردنەوەیە: ئەو دیدەی دەڵی ئێمـە هـەموومان دەشێ هەڵە بینو بانگەشە بـۆ هەڵـە بکـەین، ئـەو دیـدەی دەڵـێ رەنگـە مـن هەڵــە بمو تـۆ راسـت بکـەیتو پێویسـتە خـۆم وافـێر بکـەم چـۆن بـەو هەستە ترسناکە هەڵخەڵەتێنە یـان بـەو بڕوایـەی پێم دەڵـێ: ئـەوە منم هەمیشە لەسـەر راستیم. پێویستە خۆم لەم هەستە بپارێزم چەند بەهێزیش بێت. چونکە تا چەند ئەم هەستە بەهێز بـێ ئـەوا زیـاتر ئـەو مەترسـیە شـاراوەیە زیـاد ئـەکات سەبارەت بەوەی بەدەستی خـۆم، خـۆم نـائومێد بکەم.. هەروەها مەترسی ئەوەی خۆشم ببم بە دەمارگیرێکی لێنەبوردە.



کـەس ئـەم شـتـەی هێندەی ڤۆڵتێر بـەڕوونی نــەبینیو کەســیش هێنـدەی ئـەو بـەجوانی دەری نــەبڕی کــاتێك نووســی (مــن لــێرەدا ئازادانــە قســەکان دەهێنمەوە)(1).

"لێبوردن چیە؟ لێبوردن دەرەنجامێکی لکاوە بـەبوونی مرۆڤایەتیمانــەوە. ئێمــە هــەموومان بەرهـەمی لاوازیـین. هـەموومان لـەرزیوینو هەڵـە دەکەین، لەبەر ئـەوە لێگـەڕێ لەیـەکدی ببوریـنو لەشێتی یـەکدی بەرامبـەر بەیـەك بەشـێوەیەکی دوولایەنە ببورین. ئەمەیە بنەمای یەکەمی یاسای سروشت و بنـەمای یەکـەمی سـەرجەم مافـەکانی مرۆڤ"

مـن زۆر بـەم دەربڕینـەی ڤۆڵتـێر سەرسـامم. بەڵگـەکانی لـێرەدا زۆر تۆکمـەنو لەسـەر ئـەو دیدەی سوکرات دامەزراوە کە دەڵێ: "مـن دەزانم کە نازانم.. زۆر بەکەم کووڕیش ئەمە دەزانم"(2). زانینی ئـەم راستیەش بەسە بـۆ ئـەوەی داوا لـە یەکدی بکەین بەشێوەیەکی دوولایەنـە لـە یـەکدی ببورین. بـەڵام گـەر هـێرش کرایـە سـەر بیرۆکـەی لێبوردن ئەوا ئەمە بەتەنیا بەس نیە.

ڤولتێر بـەڕوونی ئـەوەی دەبینـی کـە دەبـێ لێبوردن دوولایەنە بێ: واتە دەبێ لەسەر بنـەمای بەرامبــەر (تقــابل) بــێ. بــەڵام پێشــبینی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی دیموکراسی نەکرد کـە لێبوردن تیایدا دەبێ بە بنەمایەکی قبوڵکراو نـەك هـەر لـەڕووی لێبوردنـی دینیـەوە بـەڵکو لـەڕوی لێبوردنــی سیاسیشــەوە. هــەروەها پێشــبینی ئــەوەی نــەکرد کــە لــە کۆمەڵگایــەکی وادا کەمایەتیەك دروست ببێ کە ئامادە نیە هیچ شتێ

لەبەرامبەر ئەو لێبوردنەدا پێشکەش بکات کە زۆرینە پێی دەبەخشێ: کەمایەتیەك کە قبوڵی بنەماکانی لێنەبوردنو تیورەی پێویستی توندوتیژی دەکاتو بگرە هەندێکجار کاری توندوتیژیش دەکات. ئەوەندەش هۆمان لەبەردەستدایە کەوامان لێبکات بڕوا بەوە بهێنین کە ئەم کەمایەتیە گەر بۆ رۆژێکیش دەستی بەدەسەلات بگات ئەوا دیموکراسیو ئازادی قسەو لێبوردن لەناو دەبات.

گرفتەکەشمان لێرەدایە: ئایا دەبێ لەگەڵ ئەم کەمایەتیەدا لێبوردوو بین یان نەء؟ ئەگەر لێیان نەبورین ئەوا دەردەکەوێ کە نکوڵی لەبیروباوەڕە تایبەتیەکانمان دەکەین.. وا دەردەکەوێ کە پاشەکشێ دەکەین لەبەردەم لێنەبوردناو بەم شێوەیە دەبین بەکسانی دوو ڕوو. ئەگەر لێشیان بورایین ئەوا بەرپرسیار دەبین. لەبەرامبەر نەمانی دیموکراسیو نەمانی لێبوردندا.

بێگومان هیچ یەك لەو گەورە بیریارانەی بەرگری لە لێبوردن دەکەن -لە ئیراز مۆسەوە تا جۆن لۆکو ستیوارت میل- پێشبینی ئەگەری گەیشتن بە هەلۆیستێکی وا نالەباریان نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لێرەدا ئەوە بڵێم کە لۆکو میلو زوربەی ئەوانەش کە پەیڕەویان کردن، توانیان بەشێوەیەك پەرە بە تیورەی لێبوردنو دیموکراسی بدەن کە بتوانرێ بەشێوەیەکی شایستە وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە: لەم بارودۆخە تازەیەدا دەبێت چی بکرێت؟ ئەمەیش لەبەر ئەوە بوو کە ئەوان لایان روون بوو نابێت لێبووردن بێ سنووربێت.

ئاشکرایە سەبارەت بەو هەلومەرجەی ئێستامان، وەڵامەکە لەفورمە عەمەلیەکەیدا دەبێ بەم شێوەیە بێت: تا ئەوکاتەی ئەم کەمایەتیە لێنەبوردانەو وتوێژ دەکەنو تیورەکانیان وەك پێشنیارێکی عەقڵانی بڵاو دەکەنەوە، پێویستە لێگەڕێن بەوپەڕی ئازادیەوە ئەم کارە بکەن، بەڵام دەبێ سەرنجی ئەو راستیە بدەین کە لێبوردن دەبێ لەسەر بنەمایەکی دوولایەنە بێتو ئەرکی سەرشانیشمان سەبارەت بە لێبوردن لە کەمایەتیەك لەکەمایەتیەکان دەبێ لەو خاڵەدا راوەستێ کە ئەو کەمایەتیە دەست بەکاری توندوتیژ دەکات. لێرەدا پرسیارێکی تازە دێتە پێشێ. ئاخۆ کەی وتوێژی عەقڵانی تەواو دەبێو کاری توندوتیژی دەست پێدەکات؟ چونکە ئەم مەسەلەیە لەڕووی عەمەلیەوە بە ئاسانی بڕیاری لەسەر نادرێت.. کاری توندوتیژی رەنگە لەشێوەی هاندان بۆ کاری توندوتیژ یان لەشێوەی دەسیسەیەکدا دەرکەوێت بۆ رمانی دیموکراسی دەستوری. بێگومان چ هاندان بۆ توندوتیژیو چ دەسیسە کردنیش بە ئاسانی لەو جوولانانە جیاناکرێنەوە کە لێیدەبورین. ئەم مەسەلەیەش لە پەیوەندیدا بەیاساوە لە چاو زوربەی مەسەلەکانی تردا بەشتێکی رۆتین دادەنرێت. بۆ نمونە رەنگە ئەستەم بێت، کوشتنی بە ئەنقەست لەکوشتنی بێ ئەنقەرست جیابکەینەوە یان نەتوانین ناشایستەیی لە وێرانکاری بە ئەنقەست جیابکرێنەوە. من لێرەدا وای دەبینم هەلومەرجە مەعنەویو تیوریەکە لەڕووی مەبدەئیەوە زۆر روون بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زوربەی خەڵك هەست ئەکەن پێویستە لەکارەکانیاندا پەیڕەوی لێبوردن بکەن تا ئەو رادەیەی ئارەزووی بینینی جیاوازیان نامێنێ، بۆ نمونە لەنێوان حیزبێکی سیاسیدا (بەمانا دیموکراسیەکەی) وەك حیزبێك کە ئامادەیە ڕێساکانی دیموکراسی قبوڵ بکات تەنانەت گەر زورینەشی بەدەستهێنا، لەگەڵ حیزبێکی دیدا کە

بەشێوەیەکی ئاشکرا یان نهێنی دەسیسە بۆ سڕینەوەی دیموکراسی دەکات، ئەگەر حیزبێکی لەم چەشنەش لە ڕێگەی دیموکراسی یان لە ڕێگەیەکی دیەوە بۆ ئەم ئامانجە دەگەڕێت، ئەوا ئەمە هیچ لەباسەکە ناگۆڕێ. چونکە لەناوبردنی دیموکراسی لەهەموو حاڵەتەکاندا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کاری توندوتیژو نامەسئولانە. پێویستە لەسەر ئێمەش مل بۆ حیزبێکی وا نەدەین تەنانەت گەر زۆرینەش پێك بهێنی.

لەبەر دەم ئەو پرسیارەشدا کە ئایا حیزبێکی لەم چەشنە مافی ئەوەی هەیە داوامان لێبکات لێبوردوو بین لەگەڵیدا؟ بڕوام وایە تیورەکان وەلامێکی ئاشکرامان دەدەنەوە: نەخێر. ئێمە پێویستمان بە لێبوردن نیە لەژێر هەڕەشەی لێنەبوردنداو نابێ لێی ببورین بە تایبەتی ئەگەر هەڕەشەکە مەترسیدار بێ.

بێگومان ئەرکی سەرشانمانەو دەتوانین تیورەی ئەو کەسانە پوچەڵ بکەینەوە کە دەیانەوێت بەهانە بۆ کاری توندوتیژی بدۆزنەوە. ئەم تیوریانەش لەجەوهەردا بەردەوام لەیەك دەچن، سەرچاوەی ئەم تیۆرانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قسەیەی گوایە دیموکراسیو لێبوردنەکەمان کەمو کوورەو ئێمەش بووین یەکەمجار توندوتیژیمان بەکارهێناو بەدرێژایی سەردەمە جیاوازەکان بەکارمان هێناوەو کەچی بانگەشەی ئەوە دەکەین لێبوردوین. بێگومان هەمیشە ئەم جۆرە لاف لێدانانە لەئارادایە.

هەرگیز ئەو قسەیەم لەیاد ناچێت، بەتایبەتی لە ساڵەکانی **1918**و **1919**دا دەم بیست کە گوایە سەرمایەداری بەحوکمی توندوتیژی بەردەوامی بەرپرسە لەژمارەیەك لەو قوربانیانەی کە ڕۆژانە دەدرانو ژمارەیان زۆر زیاتر بوو لە قوربانیەکانی شۆڕشی سوشیالیزمی بەدرێژایی مێژووی خۆی.



ئەوەشم لەیاد نەچێ بەدرێژایی چەند هەفتەیەك خودی خۆم بڕوام بەم خورافەیە کرد بەر لەوەی بگەمە تەمەنی **17** ساڵیو بەچاوی خۆم ژمارەیەك لەقوربانیەکانی شۆڕشی سوشیالیزمی ببینم. ئەم ئەزموونەش وایلێکردم بۆ هەتاهەتایە رەخنەگرێکی توند بم دژی ئەم جۆرە قسانەو دژی هەموو ئەو سەرچاوانەش بم کە هەوڵدەدا بەهانە بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی بهێنێتەوە، ئیدی سەرچاوەکەی لەهەر لایەنێکەوە بێت. هەروەها تارادەیەك بیروڕام ئەو کاتە گۆڕی کە گوێم لە "گۆرینگ" بوو پاش هاتنە سەر حوکمی نازیەکان بەهۆی هەڵبژاردنێکی گشتیەوە، دەیگوت: ئیدی ئامادەیە پشتگیری هەموو سەربازێك لەسەربازەکانی هێزی گەردەلوول بکات کە ناچار دەبێت توندوتیژی بەکاربێنێت. دژی هەر کەسێك بێت، تەنانەت گەر هەڵەیەکی بچوکیشی کردو لەبری کەسی داواکراو و یەکێکی دی بەهەڵە دەستگیر بکات. پاشان "شەوی خەنجەرە درێژەکان" هات. ئەو شەوەی نازیەکان بەر لەڕوودانی ناویان لێنابوو.. ئەو شەوە بوو کە نازیەکان خەنجەرە درێژو دەمانچەو تفەنگەکانیان بەکارهێنا نەك دژی نەیارەکانیانو جوولەکەکان، بەڵکو دژی جەماوەریترین رابەرەکانی خۆیان (واتە) دژی نەیارەکانی هیتلەر کە لە ریزی لایەنگرانی خۆیدا بوون: لەوانەش رۆهمو زوربەی هاوڕێکانی(3). (ئەمانە بەراورد بکەن بەوەی چۆن (لەهەمان ئەو کاتانەداو بەدیاریکراوی پێش جەنگی جیهانی دووهەم بەماوەیەك) ستالین دادگاکانی بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی حەرەسی

کۆنو رابەرە شیوعیە کۆنەکانو پاش ئەمەش ژمارەیەك لەو کەسانەی بەوپەڕی دڵسۆزیەوە خزمەتیان کردبوو.. تا ئەو کاتەی چارەنووسی خۆشی -وەك هەندێك بڕوایان وایە- بەدەستی جەلادێك کۆتایی هات کە دژی دوژمنەکانی یارمەتی دابوو. هەروەها ئەمە بەراورد بکەن بەوەی چۆن رۆبسپێر دەسەڵاتی خۆی دژی هاورێکانی بەکارهێنا.. تا دواجار خۆشی چارەنووسی لەبەردەم هەمان ئەو گرۆتینەدا کۆتایی پێهات (کە هاورێکانی خۆی بۆ راپێچ کردبوو).)

لێرەوە لەپاش ئەم رووداوانەی ئەڵمانیاوە وازم لە پەیوەندی رەهای خۆم هێنا بە بنەماکانی ناتوندوتیژیەوە: چونکە بۆم ئاشکرا بوو لێبووردن سنوری هەیە. بەڵام ئەمرۆ چۆن دەتوانین وەڵامی ئەو قسەڵۆکانە بدەینەوە کە دەڵێ ئێمەی لایەنگرانی دیموکراسیو ئێمەی کە پێمان دەگوترێت "سەرمایەداران"، یەکەم کەس بووین توندوتیژیمان بەکارهێناوەو هێشتاش تا ئەمرۆ بەکاری دێنین؟

من پێم باشە وەڵامی ئەم قسەڵۆکانە بەقسەگەلێك بدەمەوە کە بڕوام بە راستی بوونیانە: پێم وایە دەبێ داوا لە نەیارەکانمان بکەین پیشانمان بدەن لەکوێدا هەڵەمان کردووەو چۆن؟ من واقعێك لەبەرچاومدایە ئەویش ئەوەیە کۆمەڵگا رۆژئاواییە دیموکراسیەکانمان، ئەو کۆمەڵگایانانەن کە زیاتر لەهەر کۆمەڵگایەکی دی ئازادیو لێبووردنو دادپەروەری تیایەو کەمتر توندوتیژی لەسەرجەم ئەو کۆمەڵگایانە تیایە کە دەیانناسین: جگە لە کۆمەڵگای ئەسکیمۆ بەر لەسەدەی بیستەم. ئەگەرچی لەم کۆمەڵگایەدا چەند حاڵەتێکی‌کوشتنی ئەنقەست و نائەنقەست هەبوو بەڵام جگە لەمە هیچ شێوەیەکی دی توندوتیژی تێدا نەبوو. ئەسکیمۆکان بەگشتی بێ حکومەت دەژیانو رەنگە بتوانین تەفسیری نەبوونی توندوتیژی لە جیهانی ئەسکیمۆدا بەوە بکەین کە ئەم گەلە لە جوگرافیەیەکی گەورەی زەویدا بڵاو بوبۆوە.

پێشتر هەمیشە گوتوومە: من سەیری کۆمەڵگاکانمان وەك باشترین کۆمەڵگا کە تا ئێستا دروستبووە، دەکەم. بەتاوانیشی دەزانم مرۆڤ ئەم راستیە نەدرکێنێو بەهەموو هێزیشیەوە نەیلێت. هەروەها پێویستە لەسەر مرۆڤ بەرەنگاری ئەو کەسانە بکات کە سوورن لەسەر ئەوەی هەندێ گەلی بچوك بەو بڕوایە نابەختەوەر بکەن کە گوایە ئێمە لەجیهانێکی ترسناکدا دەژین. لەجیهانێکدا کە دۆزەخی سەرمایەداری دەچێ. راستیەکەی ئەوەیە ئێمە لە جیهانێکی بێوێنەدا دەژین: جیهانێکی جوانو لەناو کۆمەڵگایەکی ئازادو کراوەو سەرسوڕهێنەردا. بێگومان چاوەڕێی ئەوە دەکرێت بەپێی مژدەی ئەم سەردەمە شتێکی پێچەوانەی ئەمە بگوترێ بگرە ئەمە ئەرکی رۆشنبیرە کە وا بکات- و رەخنە لەنەخۆشیەکانی کۆمەڵگاکەمانو لەستەمە کەڵەکە بوەکانی ناویو بەتایبەتی لەجیاوازیە ترسناکەکانی بگرێ (هەروەها هەڕەشەی رۆژی لە سێدارەدانمان لێبکرێ کاتێ لەسەر ئەو تاوانانە سزامان دەدەن کە کردوومانە). بەڵام من بڕوام وایە هەموو ئەمانە هەڵەن.

راستە، زۆر راستە کە کەمایەتیەکی بچوك هەیە کە زۆر دەوڵەمەندە. بەڵام ئەمە چ زیانێکی بۆ منو تۆ هەیە؟ بگرە لەوە دەچێ زۆر راست بێت کە کەس بەهۆی دەوڵەمەندی ئەم کەمایەتیەوە دووچاری ناخۆشی نەبووە ئەمە ئەگەر ئەو راستیە نەدرکێنین کە ژمارەیەك لەم

کەمایەتیە بەشێکی زۆر لە سامانەکەی بۆ کۆمەڵێ شتی وەك دامەزراندنی زانکۆکان‌و پێشکەشکردنی دەرماڵەو پشتگیرکردنی پەروەردەو دامەزراندنی پەیمانگە پسپۆڕەکان لەبواری لێکۆڵینەوەی شێرپەنجەدا بەکاردەهێنێ... ئەمانەش تەنها چەند نمونەیەکن.

لە راستیدا گەرچی کۆمەڵگاکانی ئێمەو دیموکراسیەکەمان هێشتا لە کەماڵەوە دوورە، بەڵام بەتاکە کۆمەڵگایەك دەژمێرێت کە تا رادەیەکی زۆر ئازادی تێدایەو هەوڵێکی زۆریش لەم کۆمەڵگایانەدا دەدرێ بۆ بەرژەوەندی فەقیرەکان‌و برێکی زۆریش یەکسانی لەبەردەم یاساداو برێکی زۆریش لێبوردنی تیایە. بێگومان کۆمەڵگاکەمان هیشتا زۆر دوورە لەوەی کۆمەڵگایەکی کامڵ بێت. چونکە هێشتا زۆر مادە بێهۆشکەرەکان‌و ئەلکهول‌و توتن (کە خۆی لەخۆیدا بێهۆشکەرێکی ترسناکە) بەخراپی تیا بەکار دەهێنرێ. بەڵام زۆر زەحمەتە لەم گرفتانە رزگارمان بێ مادام ئازادی ئەوەندە لامان خۆشەویستە.

لێرەدا رەنگە یەکێك وەڵامم بداتەوەو بڵێ: بەڵام ئەم مەسەلانە کۆمەڵێ نیشانەن کە ئاماژە بۆ ئەو بەدبەختیە دەکەن کە ئەوە تازەکان دەیچێژن.. بەدبەختیەك کە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی کۆمەلایەتی‌و بێ ئیشی.؟ بەڵام ئەگەر ئێوە مەبەستتان لەجیاوازی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە هەندێك کەس سامانی زیاتریان لەکەسانی دی هەیە، ئەوا دەڵێم ئەم مەسەلەیە بەلای منەوە هیچ گرنگ نیە مادام ئەو کەسانەی دی دەتوانن ژیانێکی ماقووڵ بژین. بەڵام سەبارەت بە بێ ئیشی ئەوا ئەمە مەسەلەیەکی زۆر جیاوازە.

من دەزانم بێ ئیشی شتێکی ترسناکەو نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی راستەقینەیەو بگرە



لەهەموو ئەو گرفتە کۆمەڵایەتیانە ترسناکترە کە بەرەو رووومان دەبێتەوە. بێگومان ناشزانم چۆن ئەم نەخۆشیە ترسناکە چارەسەر دەکرێ. لەناو هاورێکانماندا ئابوریزانانی بەناوبانگ هەیە.. بەڵام وابزانم پێویست ناکات بڵێم چەند بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە جیاوازیی بۆچون لە نێوانیاندا هەیە. لێرەدا من سەبارەت بەئەم گرفتە لایەنی کەم لەیەك شت دڵنیام (کە ئەویش ئەوەیە) گەر چارەسەرێکی زانراو بۆ بێ ئیشی هەبوایە ئەوا بێ ئیشی نەدەما. چونکە هیچ حکومەتێك نیە هەلی وا لەکیس خۆی بدات کە دەرفەتی بردنەوەی هەڵبژاردنی بۆ مسۆگەر دەکات کە ئەویش هەلی نەهێشتنی بێکاریە.

لێرەدا جارێکی دی دووبارەی دەکەمەوە کۆمەڵگاکەمان دوورە لەوەی کامڵ بێت. بەڵام لە دیموکراسیە رۆژئاواییەکاندا پێشوازی لەهەموو ئەو وتووێژانە دەکرێت کە لەبارەی هەڵەی کۆمەڵگاکەمانەوە ئەنجام دەدرێن‌و بگرە هەنگاوی کردەییش دەنرێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان‌و بەدوای هەنگاوی دیشدا دەگەڕێ.

حاڵەتێك کە لەسەرجەم دیموکراسیەکاندا زۆر زیاتر روودەدات بە بەراورد لەگەڵ هەر سەردەمێکی تری رابردوودا. یان هەر کۆمەڵگایەکی دیدا.

هەوڵ دەدەم لە بەرامبەر ئەو کەسانەشدا کە بروایان وایە دیموکراسیە رۆژئاواییەکان و لێبوردنەکەمان کەم و کوورە، لەرێی پرسیارێکەوە بە ویژدانەوە، وەڵام بدەمەوە: ئایا دەکرێ دیموکراسیەکەمان بە دیسپۆنیزمێکی

دەمامکدار بزانین.. تەنانەت ئەگەر بەو شێوەیەش دەرکەوێت؟ دەکرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بەم شێوەیە بدەینەوە.

با بۆ دیموکراسیەتی پراکتیزەکراو، دەسەڵاتی رای گشتی لە ئەمەریکا بەنمونە بهێنینەوە. ئەم رای گشتیە بووە هۆی ئەوەی دەوڵەت نەتوانێ چەکی ئەتۆمی لەجەنگی کۆریاو ڤیتنامدا بەکاربهێنێ... لەکاتێکدا کە رەنگە بەکارهێنانی ئەو چەکە ببوایەتە هۆی سەرکەوتنی (ئەمەریکا)، نەك نیوە تێکشکانێك لە جەنگی یەکەمداو تێکشکانێکی تەواویش لە جەنگی ڤیتنامدا. هەر ئەم رای گشتیەش بووە هۆی دەست لەکار کێشانەوەی ریچارد نیسکۆن. ئاشکرایە رای گشتی ماوەیەکی دەوێت بۆ ئەوەی دروست ببێ. بەلام توانی بۆ یەکەمجار لەمێژووداو بێ هەڵبژاردن، جەنگێك راگرێت کە بەردەوام بوو.. ئەویش تەنها لە رێگای ئەوەوە کە چیدی ئامادە نەبوو پشتگیری بکات. من هیچ رووداوێکی هاوشێوە لەمێژوودا شك نابەم بووبێتە هۆی ئەم سەرکەوتنە کە دەتوانین ناوی بنێین دەرچونێکی ئەخلاقی لەجەنگ. ئەمە دەڵێین بەلام بێ ئەوەی حوکم بەسەر ئەوەدا بدەین کە ئایا رای گشتی راستە یان نەء.. بەتایبەتی گەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کەچی لەباشوری ئاسیادا روویدا پاش ئەوەی ئەمەریکا لێی کشایەوە. ئەو نمونانەی لێرەدا دەیهێنمەوە بۆ ئەوەیە بەلگە بۆ ئەوە بهێنمەوە کە دیموکراسیەت عەیب نیە.

نمونەکانم بۆ ئەوە نیە بڵێم هەمیشە رای گشتی راستە یان لەو نمونانەدا کە هێنامەوە راستی کرد. یان لەداهاتوودا راست ئەکات. چونکە ئەمە شتێکە ناتوانین لەبارەی هیچ رایەکەوە بڵێین جا چ گشتی بێ یان رای دەسەلات بێ. مەبەستم لێرەدا ئەمە نیە. بەلکو مەبەستم ئەو پرسیارەیە کە ئایا دیموکراسی عەیبە یان نەء.. ئەو بەڵگانەی هێنامەوە بە باشترین شێوە دەریدەخات کە دیموکراسی عەیب نیە. لێرەوە دەتوانین وەڵامی ئەو بەڵگە کلێشەییانە بدەینەوە کە ئەو کەمایەتیانەی بڕوایان بە بنەمای توندوتیژی هەیە، پشتی پێ دەبەستن.

لێرەدا دەتوانین شتێکیش لەبارەی مەسەلەیەکەوە بدرکێنین کە زۆر گرنگیەکی کەمتری هەیە. (کە ئەویش ئەوەیە) لەسەرەتای پەنجاکانداو پاش پووچەڵ بوونەوەی تیورەی مێژووی مارکسیزم، هەندێ شێوەی مارکسیزم گۆڕا بۆ ئەوەی ببێ بە چەند رەخنەیەکی ئاڵۆز سەبارەت بەخراپی جیهان و ژیان بەتایبەتی بەهۆی ناچاری ژیان لەناو دۆزەخی "سەرمایەداریدا". بەم شێوەیەش لەبری پێشکەشکردنی تیورەیەکی دیاریکراو، دەست کرا بە بەرزکردنەوەی دروشمەکان، ... بەتایبەتی ئەوەی لە دەوری زاراوەی "نامۆبوون" دەخولێتەوە. رەخنەکەش ئەوەیە سەرمایەداری لە ژیانی سروشتی خۆمان، نامۆمان دەکات و ژینگەی سروشتیمان لێدەسێنێ.

من ئەمرۆ ئامادەم دان بەوەدا بنێم کە هەندێ بیناو شێوەی جیاوازی پەرەسەندنی "کۆشکسازی" (معماری) "بەتایبەتی ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مارکس"، ترسناکەو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازی بەهەمهێنانەی -لێرەدا دەربڕینە مارکسیەکان بەکاردێنین- کە مارکس ناوی نابوو سەرمایەداری. هەروەها ئامادەم دان بەوەدا بنێم کە ئەو هەلومەرجەی دەبوو کرێکاران لەسایەیدا کار بکەن، زۆر ترسناکتر بوو. دان بەوەشدا دەنێم هەلومەرجی کار لەزۆر شوێندا خراپەو پێویستی

بە چاککردن هەیە.. تەنانەت گەر تا رادەیەکیش لەهەموو شوێنەکاندا برێك چاك بووبێ.

بەلام من ناتوانم مارکسیەکان بەجدی وەربگرم کاتێ بەهاتوهاوارەوە رەخنە لە مەیلی گشتی بەرەو نامۆبوون دەگرن.. نامۆ بونمان لەژینگەی سروشتیمان، چونکە ئەم مەیلە یەکێکە لە مەیل یان ئاراستە بنەڕەتیەکانی ژیان.. یەکێکە لەئاراستەکانی پرۆسەی "خۆگونجان". (تأقلم).(بۆ نمونە) جینی یەکەم کە ژمارەی لەناو کۆمەڵێ ئەنزیماتدا، زیادی کرد (بەو گریمانەوە کە شتێکی لەم شێوەیە روویدابێ) یەکەم شت بوو کە خۆی لە ژینگەی سروشتی خۆیو لەبواری ژینگەی هەڵبژێراوی خۆی، نامۆ کرد.. (ئەمەش) کاتێك لە رێگەی گۆڕانەوە کارەکانی خۆی بەو شێوە مەیسەر کرد کە رووکەشی تایبەتی خۆی لە ئەنزیمات دروست کات، کاتێکیش ئەمەی کرد، توانی ژینگەی تایبەتی خۆی دروستبکات: ژینگەیەك کە بێگومان زیاتر سەقامگیرە. ئەمەش ئەو شتەیە کە بەگشتی نامۆبوون دەیکات. بۆ نمونە کاتێك ئەمڕۆ ئێمە پاڵتۆیەکی چەرمین دژی باران لە رۆژێکی بارانـاویدا لەبەردەکەین یان پاڵتۆیەکی ئەستوور دژی رۆژێکی سارد یان جووتێ پێڵاو کاتێ رێگایەکی بەردەلان دەبڕین (لەپێ دەکەین)، ئەوا ئێمە خۆمان لەژینگەی سروشتیمان، نامۆ* دەکەین بەهۆی بەدەستهێنانی ژینگەیەکی تایبەتەوە لە لایەن خۆمانەوە.. رێك وەك حەلەزۆن دەیکات. ئەوەی لێرەدا مانایەکی زۆری هەیە تەنها ئەوەیە ئایا پاڵتۆ چەرمینەکە توانای گرتنی بارانی هەیە یان پێلاوەکە نادڕێ.. ئەگەر وابوو ئەوا بێگومان هەوڵدەدەین شتێکی باشتر لەوەمان دەستکەوێ. لە راستیدا مەسەلەی چاککردنی ئەو پێلاوەی لەپێی دەکەین، مەسەلەیەکی زۆر تایبەتمەندە



(خصوصی): لەو جۆرە گرفتانەیە کە ژیان دەستەبەری چارەسەرکردنیەتی بەهۆی گۆڕانکاری زیاترەوە.. واتە هەنگاوی تر بەرەو نامۆبوون و گواستنەوە. وەك ئەوەی گەچێکی پارێزەری حەب بۆ پاراستنی داوو دەرمان بەکاربێنین. بەلام بەشێوەیەکی گشتی رەخنەگرتن لە نامۆبوون مەسەلەیەکی هیچ و پووچەو وەك رەخنەگرتن وایە لە نمایشکردن (استعراضات)و ددانی دروستکراوو کەرەستەی سارێژکردن و (اللجام) لەبری ئەوەی دڵخۆشبین بەوەی ئێمەی مرۆڤ دەستمان بەم شتانە گەیشتووەو،لە هەوڵی بەردەوامیشداین بۆ چاککردنیان، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە پێوستیان بەچاککردن هەیە.

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ لێبوردن: هەمیشە لێبوردن و دیموکراسیو هەموو ئەو هەوڵە مەزنانەی بۆ چاککردنی هەلومەرجی ژیان بۆ هەموان دەیدەین، کۆمەڵێ هێرشی دەکرێتە سەر. بێگومان گەر ئەم هێرشانە لە سنووری رەخنەیەکی ماقووڵدا بوەستن، ئەوا دەبێ پێشوازیان لێبکەین. لەبەرامبەر ئەمەدا پێویستە گەر هەڵە بوو وەلامی بدەینەوە بەتایبەتی گەر لەلایەن ئەو کەس و گرووپانەوە بێت کە دەیانەوێت سوود لە لێبوردن وەربگرن بێ‌ئەوەی نیەتی ئەوەیان هەبێ شتێکی هاوتای لەبەرامبەردا پێشکەش بکەن کە ئەویش پراکتیك کردنی لێبوردنە لەلایەن خۆیانەوە. کەسان و گرووپێك کە داوای مافەکانی خۆیان دەکەن بێ ئەوەی ئامادەبن دستەبەری مافەکانی ئەو

کەسانە بکەن کە ئەمڕۆ داوای مافە تایبەتیەکانی خۆیانیان لێدەکەن. لێرەو لەم حاڵەتەشدا نەك هەر مافی ئەوەمان هەیە بەڵکو ئەرکی سەرشانمانە نکوولی لە لێبوردن بۆکەسانێك بکەین کە دەسیسە بۆ لەناوبردنی لێبوردن دەکەن. بەرپرسیارێتیشمان لەم ئاراستەیەدا زۆر گەورەیە.

لێرەدا پێویستە ئەم حاڵە بەمشێوەیە کورت بکەینەوە. ئێمە دەبێ بۆ ئەوەی بەرگری لە لێبوردن دژی دوژمنەکانی لێبوردن بکەین، پێویستە بەرگری لە دیموکراسیو دەزگاکانی دەستکەوتەکانی بکەین. بەڵام پێشنیار دەکەم بەشێوەیەك لەشێوەکان دوور تر بڕوانین.

ئەو لاوازیە راستەقینەیەی لە پشت دوو دڵیمانەوەیە لە بەرگریکردن لە دیموکراسیو لەوەی ناوم ناوە کۆمەڵگای کراوە دژی دوژمنەکانی... ئەو لاوازیەی لەپشت ترسی گەورەمانەوەیە لەوەی ببین بە کەسانی لێنەبوردو لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا کە ئامادە نین لەگەڵماندا بیگۆڕنەوە، ئەم لاوازیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە: لەراستیدا ئێمە ئەو وانەیە فێربووین کە ڤۆلتێر بەشێوەیەکی جوان دایڕشتبوو.. ئەو وانەیەی کە ناوەڕۆکەکەی بریتیە لەوەی ئێمە قابلیی هەڵەکردنین، ئێمە بوونەوەرێکی مرۆیین و زۆر جاریش دەکەوینە هەڵەوە. هەستنەکەم زۆر کەس لەنێوماندا وا لەم بیرۆکەیە تێگەیشتووە کە هەموو شتێ رێکوپێکەو دەکرێ بەرگری لێبکرێ. وا لەم وانەیە تێگەیشتووین کە نەك هەر دەبێ بەیەکسانیو دادپەروەریەوە گوێ لەهەموو کەسی بگرین بەڵکو هەر هەڵوێستێك باشترە لە هەڵوێستێکی دیو بەتایبەتی باشتر لەهەڵوێستەکانی ئێمە. هەروەها (وا لەم وانەیە گەیشتووین) کە بۆ ئەوەی عەقڵانی بین نەك هەر دەبێ لێبوردوبین و دۆگمایی نەبین بەڵکو بەتەواوی بێلایەن بین تەنانەت لەبەردەم خراپترین راکانیشدا. هەروەها دان بەوەشدا بنێین کە هەموو رایەك دەکرێ بەرگری لێبکرێو هەموو راکان یەکسانن.. جا چ دیموکراسی بێ یان تۆتالیتاری.. یان تەنانەت گەر وا هاتە پێشچاو ئەم رایە زۆر دڵڕەقانەو دۆگماییە. (هەموو ئەمانەش لەو بڕوایەوە کە) شتێك لەتوتالیتاریەتدا هەیە (بێگومان ئەمەش راستە) و تەنانەت شتێکیش لەوەدا هەیە کە فێری منداڵان بکەین چۆن دڵڕەق بن (بێگومان ئەمەش راست نیە).

ئەمە ئەو هەڵوێستەیە کە فەیلەسوفان ناوی "رێژەگەریی" لێدەنێن. هەندێ کەس وا هەستنەکەن گەر بڕوامان بە بیرۆکەی "ئەگەری کەوتنە هەڵەوە" هەبێ ئەوا دەبێ بە ناچاری قبوڵی رێژەگەری بکەین و بەرێی ڤۆلتێردا بڕۆین کە دوو مەسەلەی بەجدی وەرگرت: ئەگەری کەوتنەهەڵەی مرۆڤەوەو لێبوردن.

بەبڕوای من وەڵامدانەوەو پووچەڵکردنەوەی رێژەگەری مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. مەسەلەیەکی زۆر ئاسانیشە. ئەگەر کەوتنە هەڵەوەی مرۆڤ بەمانای ئەوە دێ ئێمە هەموومان دەشێ هەڵە بکەین و پێویستە لەسەرمان وا نەزانین ئەوەی لەبەرچاومان دەردەکەوێت بریتیە لەهەموو هەقیقەت.. یان لەرووی ئەخلاقیەوە راستە چونکە رەنگە هەقیقەت نەبێو لەرووی ئەخلاقیشەوە راست نەبێت.

بەڵام ئەمە پێویستی بەبوونی شتێك هەیە وەك حەقیقەت و پێویستی بەبوونی کردارێکە کە لەرووی ئەخلاقیەوە راست بێت، یان شتی لەم شێوەیە. بێگومان ئەگەری هەڵەکردن ئەوە دەسەپێنێ کە هەقیقەت و راستی بەگشتی گران بەدەست دێن کەئەمەش بەمانای ئەوە دێت

پێویستە هەمیشە ئامادەبین بۆ دۆزینەوەی ئەوەی هەڵەمان کردووە. لەلایەکی دیەوە ئەگەری هەڵەکردن ئەوە دەسەپێنێ کە دەتوانین بگەینە شوێنێك کە پتر لە هەقیقەت یان لە کۆمەڵگایەکی چاکەوە،نزیکە. لەحاڵەتێکی واشدا ناتوانین خۆمان لەکردارو لەلایەنگری لایەنێك لە لایەنەکان بەدوور بگرین. چونکە بێکرداری خۆی لەخۆیدا جۆرێکە لە کردارو لێرەوە دەبێتە هۆی لایەنگیری بۆ لایەنێك. ئەوەی لەهەموو ئەمانەشەوە فێر دەبین ئەوەیە کە نابێ لەگەڕانی رەخنەیی (زۆر رەخنەیی)ماندا بۆ گەیشتن بەهەقیقەت رابوەستین و پێویستە بەردەوام هەوڵبدەین لەو کەسانەوە فێر بین کە تێڕوانینی جیاواز لە ئێمەیان هەیە. ئەگەر بەشێوەیەکی جدی دەمانەوێت زیاتر لەهەقیقەتەوە نزیك بین و گەر دەمانەوێت باشترین شێوازی کارکردن بدۆزینەوە کە لەتواناماندایە پەیڕەوی بکەین، ئەوا پێویستە لەسەرمان هەوڵبدەین گوێ لە کەسانی دی بگرین و لێیانەوە فێربین.. بەتایبەتی لەنەیارەکانمانەوە. لەبەر ئەم هۆیەش بەدیاریکراوی پێویستە لەسەرمان ڕێژەگەری رەتبکەینەوە.

رەنگە بکرێ هەموو ئەمانە بەمشێوەیە دابڕێژین: زۆر شتێکی جوانە مرۆڤ بڵێت"رەنگە من هەڵە بم و رەنگە تۆ راست بکەی" ئەگەر دوولایەنیش پێکەوە ئەمەیان گوت ئەوا رەنگە ئەمە بەس بێ بۆ گەیشتن بە لێبوردنێکی دوولایەنە و بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی تەندروست. بەڵام بۆ خۆ دوورگرتن لە ڕێژەگەری دەبێ شتێکی زیاتر لەمە بڵێین. ئەوەی پێویستە بیڵێین ئەمەیە." رەنگە من هەڵەبم و رەنگە تۆ راست بکەی و رەنگە ئێمە بەهۆی وتوێژێکی عەقلانیەوە لە بارەی شتەکانەوە بتوانین هەندێك لە هەڵەکانمان راست بکەینەوە رەنگە پێکەوە بەجێگایەك بگەین کەلەهەقیقەت نزیکترە یان ئیشکردن بەشێوەیەکی راست".



من وایدەبینم ئەم دارشتنە زۆرگرنگەو دەمەوێ بۆ تەفسیرکردنی، زیاتر قووڵ ببمەوە. بۆ ئەمەش دارشتنەکەی سەرەوە دابەش دەکەین بەسەر سێ بەش یان سێ بنەمادا وەك پێشنیارێك لەمنەوە:

بنەمای یەکەم

"رەنگە من هەڵەبم و رەنگە تۆ راست بکەی" رەنگە بتوانین بڵێین ئەم دارشتنە دارشتنێکی دی بیروراکانی ڤۆڵتێرە سەبارەت بە قابیلیەتی مرۆڤ بۆ کەوتنە ناو هەڵە یان ئارەزوو بۆ هەڵە، جا چ پەیوەندی بەهەقیقەتی گریمانەیەك لە گریمانەکانەوە بێت یان پەیوەندی بە باشترین کار -یان گونجاوترین کارەوە بێت- کەپێویستە بەرامبەر هەلومەرجێك لەهەلومەرجەکاندا، پەیڕەوی بکەین. ئەم بنەمایە بەئاشکرا پشتگیری لێبوردن دەکات وەك ڤۆلتێر دەیدی. بەڵام هەڵەیەکی گەورەیە وابزانین پشتگیری ڕێژەگەری دەکات. بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەم بیرۆکەیە دوورە لەوەی ببێتە هۆی ئەوەی گەر من و تۆ جیاوازبین رەنگە هەردوکمان پێکەوە راست بین- رەنگە رایەکی راست و رایەکی هەڵە سەبارەت بە بابەتێك لەبابەتەکان هەبێ و لەراستیشدا رەنگە هەردوکمان هەڵەبین.

بنەمای دووەم

"رەنگە بەهۆی لێکگەیشتنی عەقڵانیەوە لەبارەی شتەکانەوە هەندێك لەهەڵەکانمان راست بکەینەوە"

من وای دەبینم ئەم بنەمایەی دووهەم زۆر گرنگە، ئاشکراشە ئەم بنەمایە پێویستی بەبوونی لێبوردنی پێشوەخت هەیە. سەرەتا ئەوە ڕووندەکەمەوە مەبەستم لە "لێککەیشتنی عەقلانی لەبارەی شتەکان"وە چیە؟ مەبەستم لەم وتوێژە لەسەر مەسەلەکان بەنیازی دۆزینەوەی ئەوەی راستەو ئەوەی هەڵەیە، ئەوەی هەقیقیەو ئەوەی ساختەیە چاوپۆشینیش-مادام ئەمە شتێکی مومکینە بۆ مرۆڤ-لەو پرسیارەی کێ راستی کردوەو کێ هەڵە.. ئەمەش پرسیارێکە بەلامانەوە دەلالەتێکی زۆری نیە. ئەمە ئەو وەسفەیە کە پێشنیاری دەکەم بۆ ئەو هەڵوێستەی لەئەنجامی وتوێژی عەقلانیەوە دروست دەبێ. زۆر بەڕوونی دەڵێم کە قسەکردنی عەقلانیو وتوێژی عەقلانی دەبێتە هۆی هەڵوێستێك کە زۆر دوورە لەهەڵوێستی ڕێژەگەریو لە بنەمای "هەموو شتێ مومکینە" هەڵوێستێك بەرەو گەڕان بەدوای هەقیقەتدا دەچێو بەرەو کارکردن بەپێی توانا بۆ ئەو مەبەستە. ئەم بنەمایەی دووهەم بەباسکردنی لێککەیشتن بەسووربوونی لەسەر دەلالەتی وتوێژ بێگومان بەدیاریکراوی وتوێژی عەقلانی) پێ لەسەر گرنگی ڕەهای زمانی مرۆییو بەکارهێنانی عەقلانی دادەگرێ. بنەمای دووهەم، ئەو بنەمایەی سەرچاوەی عەقلی ڕەخنەگرە دەڵێ "قسەکردن لەبری شمشێر" یان بە دەربڕینێکی واقعی ترو تازە تر، دەڵێ "زمان لەبری دەمانچەو قومبەلەو چەکی ئەتۆمی) بەکاربهێنن.

لێرەدا لەگەڵ زۆر جەختکردنم لەسەر پێویستی بەکارهێنانی زمان و وشەکان، دەمەوێ پێ لەسەر ئەوە داگرم کە پێویستە لەسەرمان زمانێکی سادەو ڕوون و ئاساییو خاکی بەکاربهێنن.. زمانێك کە زۆر بە وردی زاراوە تەکنیکیەکان بەکاردێنێو دەکرێت بەهۆیەوە هەموو خاڵێك بێ هیچ ئاڵۆزیەك بەشێوازی جیاواز بخرێتە ڕوو.. ئەمەش وا دەکات مەسەلەکان نەبەسترێنەوە بە بەکارهێنانی تایبەتیمانەوە بۆ زمان. بەکورتی: زمانێك کە وشەکان تیایدا خۆیان نەبن بە بابەت (قضية). لەلایەکی دیەوە لامان وایە وتوێژ- لێککەیشتن بەهۆی زمانەوە- مەسەلەیەکی بەراستی گرنگە. (چونکە) بێ زمان بێ خستنە ڕووی نمونەکان، بێ پێشنیار و گریمانەو تیورەکان، هیچ شتێك نابێت بەناوی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا. هەندێك جار ڕەنگە تێڕوانینێکمان هەبێت یان تیورەیەك کە بیری داگیر کردووین، بێ ئەوەی هێشتا لە وشەکاندا دەرمان بڕیبێت، پاش ئەوە ڕەنگە لە وشەی وتراودا دایبڕێژێت.

سەرەتا وادێتە پێشچاومان کە جیاوازیەکی گەورە نیە لەنێوان ئەوەدا کە بیر دەکەینەوە - بەهەڵە- ئەمرۆ پێنج شەمە 12ی ئازارە و لەنێوان ئەمەدا کە ئەمە بدرکێنین. بەڵام لەڕاستیدا جیاوازیەکە بەتەواوی لێرەدایە: کاتێ ئێمە ئەمە دەدرکێنین ئەوا بیرەکەمان دەبێ بەشتێك لەدەرەوەی ئێمەو لێرەوە دەکرێ ڕەخنەی لێ بگیرێ. بەڵام تاکاتی بیرۆکەیەك نەدرکێنراوە ئەوا بەشێك دەبێ لە خودی خۆمان و لێرەوە ئەستەمە هەڵە یان ڕاستیەکەی بزانین. بەدەربڕینێکی دی دەبینین یەکێ لە ئەرکە بنەڕەتیەکانی زمان لەڕووی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا ئەوەیە بیروباوەڕەکان دەخاتە بەر ئەگەری ڕەخنەوە، تەنانەت ئەگەر هیچ کەسێکی دیش ئامادە نەبێت. بەڵام گەر یەکێکی دی ئامادە بێت بەتایبەتی کەسێك کە بۆچوونی جیاواز لەئێمەی هەبێ ئەوا ئەوسا زمان دەرفەتی ئەو جۆرە وتوێژە ڕەخنەیەمان بۆ دەڕەخسێنێ -

بێ ئەوەی ئەمە شتێکی زۆر گران بێت لە زۆربەی حاڵەتەکاندا- کە یارمەتیمان دەدات بۆ دورخستنەوەی ئەو هەڵە مرۆییانەی لە زەینی ڤۆڵتێردا هەبوو.

بنەمای سێهەم

"ئەگەر بەشێوەیەکی عەقڵانی لێککەیشتین ئەوا رەنگە پێکەوە لەهەقیقەت نزیك بینەوە"

خاڵی سەرەکی لێرەدا بیرۆکەی نزیکبوونەوەیە لەهەقیقەت تەنانەت ئەگەر ناکۆکیش بین.

لێرەدا زۆر گرنگە بتوانین لە یەکدیەوە فێربین بۆ ئەوەی دواتر بزانین ئێمە هەڵە بووین.. تەنانەت ئەگەر دواجار رێکیش نەکەویت. زۆر گرنگە لە وتوێژێکی عەقڵانی زۆر زیاتر لەوەی پێویستە داوا نەکەین. لەمێژووی زانستەکانیشدا وتوێژی بەناوبانگ هەیە کە وتوێژکەرانی نەگەیشتونەتە رێکەوتن لەنێوان خۆیاندا. لەبەناوبانگترین ئەو وتوێژانەش لەسەدەی بیستەمدا، ئەو وتوێژەیە کە لەنێوان دوو گەورەترین زانای فیزیا لەم سەردەمەدا کرا: ئەلبێرت ئەینیشتاین و نیلس بوهلز4".

ئەو وتوێژەی لەنێوان ئەم دوو زانایەدا کرا، بە هیچ رێکەوتنێك نەگەیشت. بگرە خراپتر لەمەش ئەوە بوو کە هەر دوولایەنی وتوێژەکە پارێزگاری لەو هەڵوێستانەی خۆی کرد کە پێش وتوێژەکە هەیبوو. ئەگەرچی "بۆهر" ناچار بوو هەندێك لە هەڵوێستەکانی دەستکاری بکات. بەڵام ئەوەی گرنگە هەر دوولایەنەکە توانیان بیروڕاکانیان باشتر روون بکەنەوەو هەردووکیشیان توانیان دەستیان بە بەڵگەی تازەو زۆر گرنگ بگات، لەنێوان ئەم بەڵگەهێنانەدا، بەڵگە هێنانەوەیەك هەیە کە ئەینیشتاین لەگەڵ دوو هاوکاری خۆیدا لە ساڵی 1935 لە باسێکدا بڵاویکردەوە.. باسێك کە



تا ئەمڕۆش و پاش تێپەڕینی 46 ساڵ مۆرکی گەڕانی ئەزمونگەری (التنقیب التجریبي) پێوە دیارە کەس نیە نکوڵی لەوە بکات کە دەتوانین زۆر شت تەنانەت لە وتوێژەکە فێربین کە بە ئەنجام ناگات و نابێتە هۆی گۆڕینی هەڵوێستی بەشداربوانی، بێگومان نمونەش زۆرە بۆ ئەو وتوێژانەی نەبۆتە هۆی نزیکبوونەوەی بەشداربوانی لە یەکدی یان تەنانەت رێکەوتنیان.

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی لێبوردن.. ئێمە ئەم سێ بنەمایەمان لە زەینماندا دانا:

1)رەنگە من هەڵە بم و رەنگە تۆ راست بکەی.

2)لێگەڕێ وتوێژێکی عەقڵانی لەسەر شتەکان بکەین.

3)رەنگە لەهەقیقەت نزیك بینەوە تەنانەت ئەگەر رێکیش نەکەوین.

بنەمای یەکەم لەم بنەمایانەدا وەك بینیمان لەگەڵ تێگەیشتنی سوکرات و ڤۆڵتێردا بۆ پێویستیمان بە زانین کۆك دێتەوە. بنەمای دووهەمیش پێ لەسەر دەلالەتی زمان و قسەی ئازاد دادەگرێ، تاکو ببێتە زمانحاڵی خۆی بەمەش پەیوەندیەکی پتەوی بەلێبوردنەوە دەبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بۆ سنووری قسەی ئازاد دەکات بە تایبەتی لە پەیوەندیدا بە سنووری لێبوردنەوە. پێویستە ئامانجی بریتی بێ لە گەیشتن بە وتوێژێکی عەقڵانی واتە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت لەبری پێداگرتن لەسەر سەپاندنی ئارەزووەکان و بردنەوە لە وتوێژدا.

بنـەمای سێهەمیش لەسـەر ئـەو بناغەیـە وەستاوە کە ئێمە لەڕێی وتوێژەوە ڕەنگە لە هەقیقەت نزیک بینەوە، ئەگەرچی بەڕێکەوتیش نەگەین. ئاشکراشە ناتوانین لەهەقیقەت نزیک بینەوە، لەڕێی وتوێژەوە بەهۆی لێبوردنێکی دوولایەنەوە نەبێ‌و بەهۆی ئەو هەڵوێستە دوو لایەنەوە نەبێت کە دەڵێ ئەوەی لایەنەکەی دی دەیڵێ لایەنی کەم شایەنی ئەوەیە گوێی لێگرین.. بگرە ڕەنگە زۆر زیاتر لە گوێگرتن بەتەنها. لێبوردن پێشمەرجی گەیشتنە بەم هەڵوێستەو پێشمەرجی ئەگەری گەیشتنە بە چاککردنێکی هاوتا وە لەلایەن هەر دولاوەو دواجار (پێشمەرجی) نزیکبوونەوەیە لەهەقیقەت.

گەڕان بەدوای هەقیقەت و نزیکبونەوە لە هەقیقەت بەهۆی ڕەخنەیەکی دوولایەنەوە (متبادل) ناتوانێ ببێ بەبێ بوونی ڕادەیەکی زۆری لێبوردی دوولایەنە (متبادل). ڕێکەوتنیش بەشێوەیەکی ڕێژەیی گرنگ نیە لە پرۆسەی گەڕان بەدوای هەقیقەتدا: چونکە زۆر ئاسانە بۆمان هەردوکمان پێکەوە هەڵە بین. ڕەنگە سەرجەم خەڵکیش بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر زۆر لەتیۆرە هەڵەکان ڕێک بکەون (وەك چۆن لە سیستەمی گەردوونی بە تلیمۆسدا وا بوو) بگرە زۆر جار ڕوودەدات ڕێکەوتن ئەنجامی ترسە لە لێنەبوردن و ئەنجامی لە بڵاوبونەوەی توندو تیژی.

لەهەمان کاتدا وای دەبینم کە ئەم سێ بنەمایە بەکورتی ئەو هەڵوێستە عەقڵی‌و ڕەخنەییە کورت ئەکاتەوە کە بە بڕوای من بناغەی ئەخلاقە. هەروەها ئەمە هەڵوێستی زاناو میتودی زانستە کە زۆر بەسادەیی لەسەر بنەمایەك دروست ئەبێ کەوا دەکات وتوێژی ڕەخنەیی لەپێناوی هەقیقەتدا بێ. جگە لەمەش ئەم سێ بنەمایە بەرەو لێبوردنمان دەبات بەڵام لە هەمان کاتدا بوونیان پێویستی بە بوونی پێشوەختی لێبوردن هەیە. پێدەچێ هاتنە دی پێشکەوتنێکی ڕاستەقینە لە زانستەکاندا بێ بوونی لێبوردن مەحاڵ بێت. هەروەها بێ بوونی دڵنیایی تەواومان لەوەی دەتوانین بیروباوەڕەکانمان بەئاشکرا بڵاوبکەینەوە جا دەرئەنجامی ئەو بیروباوەڕانە هەرچۆنێك بن. لێرەوە لێبوردن و خۆبەختکردن لە پێناوی هەقیقەتدا دوو بنەمای ئەخلاقین کە لە لایەك زانستەکان دادەمەزرێنێ‌و لەلایەکی دیەوە بەهۆی زانستەکان بەرەو پێشەوە دەچێ. بەڵام دوو بنەماکەی دی بریتین لەخاکی بوونی (تواضع) فکری‌و بەرپسیاری فکری: سووربوون لەسەر ئەوەی ئێمە بیر لەخۆمان ناکەینەوە بەڵکو بیر لە هەقیقەت دەکەینەوەو پاراستنی نزیکبوونەوەی ڕەخنەی لەسەرجەم گرفتەکان، هەتا کۆتایی.

بێگومان زانای وامان هەیە کە لەڕووی فکریەوە خاکی نین و، بەرپرسیار نین بەو مانایەی مەبەستی منە،... زانایانێك کە ناتوانن جگە لە خۆیان کە زۆر بەنرخە، بیر لە هیچی دی بکەنەوەو بەهەموو توانایانەوە هەوڵدەدن هاوکاران و جەماوەرەکەیان سەرسام بکەن بەو توانایەی هەیانە. بەگشتی ئەمانە ڕیزی دووهەم لەزنجیرە پلەی زانستدا داگیر دەکەن، تەنانەت گەر لە بەرزترین پلەی ئەم ڕیزەشدابن.

لێرەوە من نامەوێ زۆر زیادەڕەوی بکەم و بڵێم زانست بەتەواوی توانای هەیە قوتابیەکانی لەڕووی ئەخلاقیەوە ئایدیال بکات و ئەو هێرشە هاوچەرخەش کە دەکرێتە سەر زانست ئەم خاڵە گرنگەی لەبیر دەچێ. هەرچۆنێك بێت هەرگیز زانست لەوەدا شکست ناهێنێ وا لە قوتابیەکانی بکات زیاتر لێبوردوو بن لەگەڵ بیروڕاکانی دیدا

(تەنانەت گەر وەك پێویستیش نەیانتوانی لێبوردە بن، لەزوربەی کاتەکاندا): زانست لەهەوڵدانیدا بۆ نزیکبوونەوە لە هەقیقەت چەند پێوەرێکی دیاریکراو سەقامگیر دەکات لەهەمانکاتدا کەوا لە قوتابیانی دەکات هوشیار بن بەوەی رەنگە هەرگیز ئەو خاڵە نەدۆزینەوە کە هەڵەمان تیادا کرد. لەراستیدا لە زانستدا دەسەڵاتێکی رەها نیە. گەورەترین زانایانی سروشت کە ناویان بریتیە لە: گالیلۆ، کپلەر، نیوتن، ئەنیشتاین، رازاوە فۆرد، بوهر، ئەرینگتۆن، جینز، هایزنبرگ، شرودینگر، و دیراك.. هەموو ئەمانە جارێك یان دوان هەڵەیان کردوەو هەمووشیان دانیان بەهەڵەکانیاندا ناوە. لەگەڵ ئەمەشدا زانست پێشدەکەوێو زیاترو زیاتر لە حەقیقەت نزیك دەبێتەوە. ئێمە لە هەڵەکانمان و لە راستکردنەوەی هەڵەکانمانەوە فێردەبین.

پێم وایە دەکرێ شتێکی لەم چەشنەش لەبارەی ئەخلاقەوە بڵێین: لێرەشدا دەتوانین لەهەڵەکان و راستکردنەوەی هەڵەکانمانەوە فێر بین. نمونەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە ئێمە لە رۆژئاوادا پاش چەند سەدە لە لێنەبوردن و توندوتیژی، فێربووین کە لێبوردوو بین و رقمان لە توندوتیژی بێت.

ئەمە بەو مانایە نایەت کە لەهەندێ جاردا هەڵەی تازە ناکەین رەنگە (ئەم هەڵانەش بەهۆی ئەوەوە بێت) دەچینە ژێر کاریگەری هەندێ عادەتی تازەی باوەوە، یان هەندێ عادەتی رۆشنبیری تازە کە کاریگەریەکی زۆری هەیە وەك تیرۆر یان رێژەگەری یان تەنانەت پیاهەڵدانی رەها بە لێبوردندا. من زۆر لەم عادەتە تازە باوانە دەترسم کە زۆر جار زمانێکی بریقەداری تازە نەك لێبورنێکی تازە، ئیدیعاو داواکاری توندڕەوانە بەرهەم دێنێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا



کە من پیرەمێردێکم لەتەمەنی 79 ساڵیدام و وەك دەزانن رقم لە عادەتە تازە باوەکانە: بەڵام ئومێدێکی گەورەم هەیە کە خۆشم ببمە دامەزرێنەری عادەتێکی تازەی باو: من خەون بەوەوە دەبینم خاکیبوونی فکری (تواضع الفكري) بکەم بە (مۆدەیەکی) باو. من بڕوام وایە هەموو زانا گەورەکان لەڕووی فکریەوە خاکی بوون، بەڵام ئەوەی دەمەوێت ئەوەیە یارمەتی ئەوە بدەم کە ئەم عادەتە لەناو نێوەندی تەکنیککارو رۆشنبیران و رۆژنامەنوسان و ئەوانەی پراکتیکی زانست دەکەن، سەقامگیر بێت. ئەوەی لە خەیاڵمدایە بە دیاریکراوی ئەم کارانەیە: پیاوانی پزیشکی، قازیو پارێزەران، بەشێوەیەکی گشتی، ئەندازیاران و بەشێوەیەکی زۆر گرنگتریش خزمەتکارە مەدەنیەکان -برادەرە ناشارستانیەکانمان وەك (چەرچڵ) ناوی لێنابوون- و سیاسیەکان.

لە راستیدا چەند بەڵگەیەکم لایە کە لە بەرژەوەندی ئەخلاقێکی پیشەیی تازەدایەو دەمەوێت لێرەدا پێشکەشتانی بکەم بۆ ئەوەی وتوێژێکی گشتی لەبارەیەوە بجووڵێنین. ئەم بەڵگانە پەیوەندیەکی پتەویان بە گرفتی لێبوردنەوە هەیە. چونکە ئەو ئەخلاقە پیشەییە تازەیەی دەمەوێت بەرگری لێبکەم، ئەخلاقێکە دژی دەسەڵات، بەپێچەوانەی ئەوەوە کەناوی دەنێم ئەخلاقی پیشەیی کۆن. پێدەچێ دەسەڵات بەردەوام لێنەبوردوو بێت. لەم ئاراستەیەدا پێدەچێ جەنگیزخان حاڵەتێکی دەگمەن بێت، لایەنی کەم لەوەدا کە پەیوەندی بە لێبوردنی دینیەوە هەیە.

ئـــەخلاقی پیشـــەیی کـــۆن -یـــان ئـــەوەی هـــەندێکتان پێـــی دەڵێـــن ئـــەخلاقی کـــۆن لای ڕۆشنبیران- وەك ئەخلاقی تـازە لەسـەر بناغـەی بـیری هەقیقـەت و عەقلانیـەت و بەرپرســـیاری فیکری رادەوەستا. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا ڕێگـەی بیرکردنـــەوە لـــە هەقیقـــەت و عەقلانیـــەت و بەرپرسیاری فیکـری (لەهـەردوو شێوەکەدا) بـە ئاشکرا لەیەکدی جیاوازن.

بیرۆکـەی ئایدیـالی کـۆن لەسـەر بناغـەی سـەقامگیرکردنی هەقیقـەت بـەهۆی بەلگـەی لۆژیکیەوە راوەستابوو.. ئەگەر بکرایـە. ئامـانجی گەیشتن بوو بە هەقیقەت: گەیشـتن بـە (پاسـاوی کۆتایی بۆ هەر هەڵوێسـتێك)(5) بـۆ هـەر تـێزێکی راگەیەنراو.

بەلام لەبەرامبەردا بیرۆکەی ئایدیالی شەخسـی لەبەرزترین ئاستەکانیدا لەسـەر بناغـەی گەیشـتن بە حیکمەتـەوە راوەسـتابوو. ئەگـەرچی بـە مانـا سوکراتیەکەیشی نـەبێت، (حـەکیم بـەو خـۆت بناسە -بزانە کە نازانیت- ئەمەیە ئامۆژگاریەکەی سوکرات). بەلام ئەو حیکمەتـەی پـەیوەندی بـەو ئەخلاقەوە هەیـە کـە نـاوم نـا ئـەخلاقی پیشـەیی کۆن، زۆر لەمە جیاواز بوو. داواکاریەکانی لە سەر ئەم بنەمایە راوەستابوو (هەموو شـتێك بزانـە کـە پـــەیوەندی بـــە بـــواری پســـپۆریتەوە هەیـــە. شـارەزابە ! ئەگـەر بوارەکـەت تەسـك بێـت ئـەوا خاوەن دەسـەلات دەبێـت و لـەبوارێکی تەسـکدا، دەبێتە پسپۆر. بەلام گەر بوارەکەت فـراوان بێت ئەوا خاوەن دەسەلات دەبی لە بوارێکی فراواندا). دەبی بە پسپۆڕێکی گەردوونی، پیـاوێکی حـەکیم و فەیلەسوف. لە هەموو حاڵەتەکانیشدا دەتوانیت خـــاوەن دەســـەلات بیـــت لـــەو بـــوارەدا کـــە هـەڵیدەبژێریت. تەنـها ئـەوەت لەسـەرە بتوانیـت بەهانە بۆ ئەو شـتانە بهێنێتـەوە کـە دەیزانیـت و بەڵگەیان بـۆ بهێنیتـەوە. پێویسـتە لەسـەرت بـە تەواوی بەرپرسیار بیت لەوەی دەیڵێیت، دەنا لـە دەسەلاتەکەتدا سوکایەتیت پێ دەکرێت، دەبێـت بە ساختەچیو پێویستە دەمامك لەسەرت لابرێو لەڕێی سوکایەتی پێکردنتەوە لەلایەن خەڵکەوە، سزا بدرێیت.

بەلام گەر رەسەن و لێهاتوو بیت ئەوا دەتوانی بەلگە بۆ هەموو شتێ بهێنیتـەوە و بـەم شـێوەیە ببی بە خاوەن دەسەلات -و گەر دەسەلاتەکەشت دانی پیـانرا کـە دەسـەلاتە- ئـەوا کـەس ناتوانـێ بەربەرەکانی دەسەلاتەکەت بکات. گەر یەکێکیش هەڕەشـەی لێکردی ئـەوا بێگومـان هەڕەشـەکەر لەلایەن هەموانەوە بەو شـێوەیە رەفتـاری لەگـەڵ دەکرێ کە شایستەیەتی: رەفتاری لەگەڵ دەکرێ وەك سـاختەچیەك، وەك فێڵبـازێك و زۆر لەمـەش خراپتر: وەك کەسێك رەفتاری لەگەڵ دەکـرێ کـە هەوڵ دەدا ئەو دەزگایانە لەناو ببات کـە بنـەمای سـەرجەم پیشـەکانی تـرەو هـەولدەدات متمانـەی جیهان بـەو دەزگایانـە لـەناو بـەرێ... لـەکاتێکدا خـودی کۆمـەلگا لەسـەر بناغـەی ئـەو متمانەیـە راوەستاوە).

ئەم ئەخلاقە کۆنـەی وەسفم کـرد، رێگـەت لێ دەگـرێ هەڵـە بکـەیت. پێشـتر هەڵـە رێگـەی پـێ نـەدرابوو، بەگشـتیش نەدەبەخشـرا، لـێرەوە هـەرگیز نـەدەکرا قبـوول بکرێ. دەبـوو خـاوەن دەسەلات مرۆڤێك بێت لەسـەروو مرۆڤەکانـەوە.. لەسـەروو هەڵەکردنـەوە بێـت. لـێرەدا پێویسـت ناکات پێتان بڵێم ئەم ئەخلاقە پیشەییە جۆرێکـی لێنەبوردوە، بەردەوامیش گەورەپیاوی وا هەبووە -وەك (ڤۆلتـێرو برنادشـۆ) دژی تێکۆشـاون. بێگومـان باشـترین چـەکیش کـە لـە پێنـاویدا بـەکاریان هێنـا، گاڵتـەجاری بـوو. بـەلام لەگـەڵ ئەوەشدا بەشێکی زۆری ئـەم ئەخلاقـە هێشـتا

زیندووە. بۆ نمونە تەنها لەم دواییانەدا پیشەی پزیشکی وازی لەم شێوازەی ئەخلاق هێنا. بەڵام هێشتا لەناو جیهانی قازیەکاندا باڵادەستە.. ئەگەر واش نەبوایە رەنگە ئەو هەڵە قەزائیە ترسناکەی لەم دوایانەدا روویدا، روویندایە.(6)

ئێستا پێم وایە ئاشکرایە ئەوەی ناومنا "ئەخلاقی پیشەیی کۆن) ناتوانێ چیدی خۆی راگرێ. بناغەکانی ئەم ئەخلاقە کە هەرگیز مومکین نەبوو لەڕوی ئەخلاقیەوە قبوڵ بکرێ، لەپاش شۆرشی زانستیو ئەو گەشەسەندنە خێرایەی بەسەر زانیاریە زانستیەکان و لێبوردندا هات، پاشەکشێی کرد. چیدی هیچ کەس ناتوانێ بە تەنیا دەسەڵاتی رەهای لەبوارێك لە بوارەکانی زانست دا هەبێت. گەر بۆ کەسێك رێکەوت کە پسپۆرێکی گەورە بێت ئەوا دەبێ دڵنیابێ کە ناتوانێ بۆ هەمیشە پسپۆر بێت. بە تایبەتی قبوڵ کردنی ئەو راستیەی کە زانست مۆرکێکی کاتی هەیە، یارمەتی رودانی گۆرانێکی قوڵی دا لە هەڵوێستی زانایاندا سەبارەت بە شێوازەکانی رەتکردنەوە.

لەم روانگەیەوە پێم وایە قبوڵ کردنی ئەخلاقی پیشەیی تازە بووە بە شتێکی ناچاری. لەم بوارەشدا پێشنیاری ئەم بنەمایە دەکەم:

1-ئێمە دەزانین -بەشێوەیەکی کاتی- زۆر زیاتر لەو کەسەی زانستێکی گشتی دەزانێ.

2-ئەمە تەنانەت بەسەر ئەو کەسانەشدا دەگونجێ کە هێشتا خۆیان بە پسپۆر دادەنێن. چونکە رەنگە هەر بوارێکی پسپۆری لەناو بچێ.

3-زانیاریەکانمان ناتوانن کاتی ئەبن واتە یەقینی نین و کۆتاییان دێت. تەنها بێ ئاگایمان دەتوانێ بێ کۆتایی بێ. تەنها ئێستا دەزانین کە من ئەو شتانەی دەیزانین:



ئەوە گەشەکردن و پەرەسەندنی زانیاریە بەڵگە بۆ ئەوە دەهێنێتەوە کە سوکرات راستی دەکرد.

ئەم راستیانە ئەمرۆ بوون بە بەشێك لە ئەزموونی پراکتیکە رۆژانەیەکانی زوربەی زانایان.

4-هەڵە هەموو رۆژێك دەکرێو لە هەموو بوارەکانیشدا ئەو بیرۆکە کۆنەی دەیگوت خاوەن دەسەلات دەتوانێ خۆی لە هەڵە بپارێزێو بگرە لەسەرێتی وا بکات، پێویستە ئەمرۆ دان بەوەدا بنێن کە بیرۆکەیەکی هەڵەیە. راستیەکی ترسناك ئەوەیە کە پێمان دەڵێت دەسەلاتداران بەپێی ئەخلاقی کۆن لەنێوان خۆیاندا رێك کەوتبوون بۆ ئەوەی هەڵەی یەکدی بشارنەوە.

5-لێرەوەو لەم لایەنە عەمەلیەوەو لەو خاڵەوە کە ئێمە هەڵەی زۆر دەکەین، دەتوانین دەست بکەین بە ریفۆرمی ئەخلاقی: لەبەر ئەوەی راکردن لە هەڵە نیە، کەوابوو دەبێ هەڵوێستمان بەرامبەری بگۆرێن. بێگومان هێشتا هەڵەی تاوانبار هەیە، هەڵەیەك کە دەکرێو بێگومان دەبێ خۆمانی لێ لابدەین. هەروەها حاڵەتی وا هەیە کە سنورە مومکینەکان دەبەزێنێ. بەڵام زوربەی ئەو هەڵانەی دەیکەین ئەو هەڵانەن کە لە سروشتی مرۆیمانەوە دێت کە قابیلی هەڵەکردنە یان لە بێ ئاگایمانەوە دێت کە ئەستەمە رزگارمان بێت لێی، یان لەو راستیەوە دێ کە بەپێی پێویست راهێنانمان نەکردووە لەسەر پراکتیکی رەخنە لەخۆگرتن. لە راستیشدا هەڵوێستی رەخنە لە خۆگرتن پراکتیك کردنی زۆر زەحمەتەو بەحاڵ بەشێك لە پەروەردەکردنمان پێك دەهێنێ.

6- پێشنیاری ئەوە دەکەم وەسیەتی یەکەم لە ناو وەسیەتی ئەخلاقە پیشەییە تازەکەمان ئەمە بێت (لە هەڵەکانتەوە خۆت فێر بکە).

هەندێ وانەی دیش هەیە کە دەکرێ لەمەوە سەرچاوە بگرێ: یەکەمیان ئەوەیە لێگەڕێین هەموان لە هەڵەکانمانەوە فێربین.

(دیارە) گرنگ نیە کێ هەڵەی کردووە: من یان دراوسێکەم. پێویستە هەموومان سەرەتا بە دوای هەڵە تایبەتیەکانماندا بگەڕێین. خۆ گەر دراوسێکەم سەرنجی بۆ هەڵەیەك راکێشام کە کردوومە، دەبێ سوپاسی بکەم. دەبێ ئەوەش فێربین کە لە پرۆسەی گەڕان بەدوای هەڵەدا، نابێ هەرگیز هەڵوێستێکی سوکایەتی پێکردن لەو کەسە وەربگرین کە هەڵەی کردووە، پاش ئەوەی کە دۆزیمانەوە.

پێویستە لە سەرمان هەولبدەین ئەو هەڵوێستە بەهێز بکەین کە دەڵێت: ئێمە هەموومان هاوکاری یەکین لە گەڕان بەدوای هەڵەکاندا. پێویستە هاوکاری یەك بکەین چونکە تەنها هاوکاریکردنە رێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی سەرجەم تێڕوانینەکان بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکانمان، کۆبینەوە. ئەمەش مەسەلەیەکی زۆر گرنگە چونکە گەر هەر یەکێك لە ئێمە لە گۆشەنیگای تایبەت و دیاری کراوی خۆیەوە لە دۆخی گشتی نزیك بێتەوەو، تەنها پشت ئەستوربێت بە چەك و جبەخانە عەقلیە دیاری کراوەکانی خۆی.. ئەوا ئیتر ئاستەمە هەر یەکێك بە تەنها لای خۆیەوە لەسەرچاوە ئەگەرەکانی هەڵە بگات ئامانجی بنەڕەتی بریتیە لە دۆزینەوەی هەڵەکان و راستکردنەوەیان بەخێراترین شێوە.. واتە پێش ئەوەی زیانی زیاتر بخاتەوە. لێرەوە تاکە گوناهێك کە نابەخشرێ گوناهی داپۆشینی هەڵەیەکە لە هەڵەکان و پێویستە لەسەریشمان ئەو پاڵنەرە بە لاوە نێین کە لەپشت ئەم داپۆشینانەوەیە.. ئەم پاڵنەرانە بەهۆی ئەخلاقی کۆنەوە، زۆر بەهێز بوون.

پێویستە فێربین رەخنە لەخۆگرتن باشترەو رەخنەی دولایەنەش (متبادل) کە بەردەوام پێوستمان پێیەتی بۆ ئەوەی فێربین چۆن رەخنە لەخۆمان بگرین، کەمتر نیە لە رەخنە لەخۆگرتن.

ئەگەر من خەون بە یۆتۆپیایەکی دیموکراسیەوە ببینم، ئەوا خەون بەیۆتۆپیایەکەوە دەبینم کە تیایدا دەکرێ پالێوراوێك بۆ کورسی نوێنەرایەتی ئومێدی بە بردنەوەی دەنگەکان بۆ خۆی هەبێ کاتێك بە شانازیەوە رایدەگەیەنێت کە چۆن 31 هەڵەی دۆزیوەتەوە، کە لە ساڵی رابردودا کردوێتیو هەولیداوە 13 یان راست بکاتەوە، ئەمەش لە کاتێکدا کە رەقیبەکەی تەنها 27 هەڵەی دۆزیوەتەوە.. تەنانەت گەر رایگەیاند کە ئەویش توانیوێتی 13 هەڵەیان راست بکاتەوە. رەنگە لێرەشدا پێویست بەوە ناکات بڵێم ئەم یۆتۆپیایەیە، یۆتۆپیای لێبوردنە.

*　*　*

پەراوێزەکان

* لە راستیدا تێگەیشتنی پۆپەر بۆ نامۆبوون تارادەیەکی زۆر هەڵەیەو تێکەڵی دەکات لەگەڵ پرۆسەی خۆگونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ هەلومەرجە سروشتیەکاندا، ئەوەی مارکسیەکان بەنامۆبوونی دادەنێن پەیوەندی بەدەسەڵات و نامۆبوونی دەسەڵاتەوە هەیە لە تاکە کەسێك.؟ مارکس نامۆبوونی بەو دۆخە دادەنا کە بەرهەمهێن پەیوەندی بە بەرهەمەوە نامێنێ، لەدەرەوەی حەزو ئارەزووەکانی بەرهەمهێنەوە ئاراستە دەکرێ، مارکس باس لە دۆخێك دەکات کە تیایدا

بەرهەم پێویستی دروست دەکات نەك پێویستی بەرهەم دروست بکات. واتە دۆخێك کە تیایدا بەرهەمهێنراو دەبێ بە شتێکی سەربەخۆ لەویستی بەرهەمهێن و ئاراستەی حەزو ئارەزوەکانی دەکات. پۆپەر بە وردی لە زاراوەی نامۆبوون نەگەیشتووە. (و.ك)

1-بگەڕێوە بۆ: ڤۆلتێر "فەرهەنگی فەلسەفی" بابەت "لێبوردن" پاریس: چاپ 1968

2-بگەڕێوە بۆ کتێبی "کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی" بەرگی یەکەم. فەسڵی حەوتەم (لندن 1945، 1966)

3-بۆ نمونە بگەڕێوە بۆ: وینستن چەرچل "جەنگی جیهانی دوهەم" بەرگی 1-75-79 (لندن 1949-1955)

4-نیلس بوهر ئەم وتوێژە لەم وتارەدا کورت ئەکاتەوە "وتوێژ لەگەڵ ئەنیشتایندا لەبارەی گرفتە ئەبستمۆلۆجیەکان لە فیزیای ئەتۆمیدا" لە کتێبی "ئەلبێرت ئەنیشتاین فەیلەسوف -زانا" نوسینی بول- ئارسەر شیلب "کتێبخانەی فەیلەسوفە زیندووەکان" (ئیفانستۆن III ، 1949)

5-بگەڕێوە بۆ: ڕۆدولف کارناپ Der Logische Aufbau Der Welt (چاپی یەکەم- بەرلین 1928)ز چاپی دوهەم، هامبورگ 1961). ڕستەی یەکەم لە برگەی یەکەمی تازە لە لاپەڕە x1x، هەروەها بگەڕێوە بۆ ئەو بەڵگەهێنانەوەی پەیوەندی بە میتۆدی ئەندازیاری سپینۆزاوە هەیە (stamm baumrtige zuruck Futirung) لە لاپەڕە XVIII، لەناوەڕاستدا، و ئەو بیرۆکە نامۆیەی دەڵێ ئەم میتۆدە باش بوو لە فەلسەفەدا.

6-بگەڕێوە بۆ لۆدۆفیك کنیدی لە Wicked Beyond Belief: the Luton murder case (لندن 1980) بەتایبەتی بگەڕێوە بۆ بەشداری لۆرد دیفلین. بەڵام ئەم کتێبە کە ناکرێ باوەڕ بە هەمووی بهێنین، دەبێت بخوێنرێ: چونکە لەراستیدا یاسا لەدەرەوەی بڕوا پێ بەخشینە (بۆ نمونە بگەڕێوە بۆ بەشداری نوێنەر: بریان ماگی) هەمان حاڵەت بەسەر ئەو تاوانە دزێوەدا جێ بەجێ دەبێت.



سەرچاوە:

التسامح بين شرق وغرب

دراسات في التعايش والقبول بالآخر

ترجمة: ابراهيم العريس

دار الساقي ط2 1992 بيروت- لبنان

# بیرۆکەیەك دەربارەی تیور و پراکتیکی حکومەتی خەڵك (دیموکراسی)(1)

■ کارل پۆپەر (2)

● لەفارسیەوە: محەمەد کەریم

**ئایا پەیوەندیەك لەنێوان ئەدەبیات و زانست و دیموکراسیدا هەیە؟**

نزیکەی (530) ساڵ پێش زاین بازاڕی ئازادی کتێب لە ئەسینا سەریهەڵدا. لەم بازاڕەدا کتێبە دەستنووسەکان بەشێوەی تۆماری سەر مقەبا بۆ فرۆشتن دادەنران. ئەو کتێبانەی کەبۆ یەکەمجار لەو بازاڕەدا خرانەڕوو، دوو کتێبە شیعریەکەی هۆمیرۆس[3] واتە ئیلیادە[4] و ئۆدێسە[5] بوون.

بەقسەی سیسرو (500) ساڵ دوای ئەوە، لەبەر نووسینەوەی شیعرەکانی هۆمیرۆس قەرزاربارى هەوڵی (پیسیستراتوس)[7]ی فەرمانڕەوا زۆردارەکەی ئەسینایە، کە ریفۆرمیستێکی مەزن بوو. یەکێك لەو کارانەی کردی، بەرپاکردنی نواندنی درامایی بوو لەئەسینا، واتە ئەوەی کەئێستا بەشانۆگەری ناوی دەبەین ئەو بنیاتی نا. رەنگەو زۆریش پێدەچێت خودی پیسیستراتوس(ناشری) بەرهەمەکانی هۆمیرۆس بێت. چونکە کەرەسەی لەسەر نووسینی وەکو پاپیروس(مقەبا)ی میسری، دەکڕیو ژمارەیەکی زۆر کۆیلەی خوێندەواری دەکڕی بۆئەوەی نووسینەکانی هۆمیرۆس لەسەر ئەو مقەبایانە بنووسنەوە. پیسیستراتوس پیاوێکی دەوڵەمەند بوو کەلەڕۆژانی جەژنە گشتیەکاندا نواندنی شانۆییو بەرنامەی فەرهەنگی دیکەی بۆخەڵك رێکدەخست. پاشان ژمارەیەك لەخەڵکی ئەسینا روویان لەو کارە کردو رۆڵی (ناشری) کتێبیان بینی.

ئەوەی ئەو ناشرانەی بۆ ئەو کارە هان دا ئارەزووی بێپایانی خەڵکی ئەسینابوو بۆ

نووسینەکانی هۆمیرۆس. خەڵکی ئەسینا بەخوێندنەوەی نووسینەکانی هۆمیرۆس فێری شت دەبوون. هەموویان هۆمیرۆسیان دەخوێندەوە. لەماوەیەکی زۆرکەمدا، بەرهەمەکانی هۆمیرۆس بووبە کتێبی پیرۆزی ئەسینابییەکان و وەکو یەکەمین کتێبی فێربوونی خوێندن و نووسینی ئەوانی لێهات. بەزوویی کتێبی دیکەش بڵاوبوونەوە. دەبێ هەمیشە ئەوەمان لەبیربێ کەهەتا بازاڕێك نەبێ بۆکتێب بڵاوکردنەوەش روونادات. بوونی یەك بەرگ کتێبی دەستنووس (یان کتێبێك بەچاپی ئەمڕۆ) لەکتێبخانەیەکدا نابێ هەرگیز لەگەڵ خواستی بازاڕدا بەراورد بکرێ. بۆماوەی‌نزیکەی دووسەدە ئەسینا تەنها جێگا بوو لەئەوروپا کەبازاڕی کتێبی هەبوو. رەنگە شارەکانی کۆرینتوس[8] و سەبس[9] یەکەمین شاربوون کەلاسایی ئەسینایان کردبێتەوە. هەڵبەتە بەرلەمەش، شاعیر هەبوون و کتێبی زۆریش هەبوو. بەڵام ئەدەبیات(کەپێویستی بەدەزگای بڵاوکردنەوەیە) تەنها لەئەسینا فۆرمەڵە بوو. تەنها لەوێ، نووسەران مێژوو نووسان و بیریارە سیاسیەکان و فەیلەسووفەکان و زانایان و "بیرکاری زانان" سەریان هەڵدا و خەمڵین. ژمارەیەکی زۆر لەوانە وەکو (توسیدید)[10] لەئەسینا لەدایك نەبووبوون، بەڵام ئەسینا بۆئەم جۆرە کەسانە هێزێکی راکێشانی وای تێدابوو کەنەیان دەتوانی بەربەرەکانی بکەن.

لەنێو ئەو نووسەرانەی کەچوونە ئەسیناو کتێبەکانی خۆیان لەوێ بڵاوکردەوە، هەردوو زاناو فەیلەسوف (ئاناکساگوراس[11] و هیرۆدۆت)[12] بوون کەهاوچەرخی یەکدی بوون بەڵام دووەمیان کەمێك لەیەکەم گەنجتربوو. هەردووکیان پەنابەری سیاسی بوون و لەئاسیای بچووکەوە راونرابوون. بڕواناکەم هیرۆدۆت مێژووە دوورو درێژەکانی خۆی بەنیازی بڵاوکردنەوە نووسیبێ، بەڵام بێگومان ئاناکساگوراس مێژووی سروشتی خۆی بەنیازی بڵاوکردنەوە نووسیووە (کەکورتترە) هیچکام لەمانە لەوە دڵنیا نەبوون



کەبڵاوکردنەوە بەراستی چ کاریگەرییەکی هەیە. چالاکی بڵاوکردنەوە زۆر تازە بوو ولەو کاتەدا هیچ کەسێ نەیدەتوانی وێنای ئەوە بکات کەگرنگی بڵاوکردنەوە تاچ رادەیەك دەبێ.

## لەبڵاوکردنەوەی یەکەم کتێبەوە لەئەوروپا بۆ شۆڕشی گوتەنبەرگ

بەڕای من، پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکەی کلتوری ئەسینای سەدەی پێنجەمی پێش زاین، زیاتر لەبەر داهێنانی بازاڕی کتێب بوو. ئەم داهێنانە بوو کەبوو بەهۆی سەرهەڵدانی دیموکراسی لەئەسینا.

دیارە، ناتوانرێ ئەوە بسەلمێنرێ کەلەسەرکار لابردن و وەدەرنانی (هیپیاس)[13] ی زۆردار لەئەسیناو چەسپاندنی دیموکراسی لەوێ راستەوخۆ پەیوەندی بەداهێنانی بازاڕی کتێبەوە هەبووە، بەڵام زۆرشت ئەم بۆچوونە بەهێز دەکەن. هونەری خوێندن و نووسین (کەزوو لەشار رەواجی پەیداکرد)، خۆشویستنی هۆمیرۆس (بێ گومان لەئەنجامی ئەمەدا) شانۆنامە نووسان و وێنەکێشان و پەیکەرتاشە گەورەکانی ئەسینا، ئەو نموونە تازانەی کەدەخرانەڕوو، وبەشێوەیەکی گشتی گەشەکردنی رۆشنبیری و هەموو ئەمانە راستیەکانی پایەی مێژوویەکن کەبەبێ دوودڵی لەژێر کاریگەریی داهێنانی بازاڕی کتێبدا سەریان هەڵداوە. تەنانەت ئەگەر بمان توانیایە ئەوە قبووڵ بکەین کەدیموکراسی بەبێ هەموو ئەمانە سەری هەڵداوە، ئەوا سەرکەوتنی

مەزنی دیموکراسی تازەی ئەسینا لەبەرامبەر ئیمپراتۆریەتی بەرفراوانی فارسدا بێگومان لەگەڵ ئەمانەدا بێ پەیوەندی نەبووە. ئەم سەرکەوتنە تەنها دەتوانرێ لەبەر رۆشنایی باوەڕ بەخۆبوونی تازەی ئەسینابیەکاندا دەرکی پێ بکرێ کەمیراتی لەڕادە بەدەری کلتووریو فێرکاری ئەوانی بەدیاری هێنابوو. سەرەڕای ئەو پەرۆشیەی کەبەشێوەیەکی سەربەخۆ لای ئەوان سەری هەڵدابوو سەبارەت بەجوانیو ناسکی لەهونەرو شیعردا.

بەهەر حاڵ، مایەی سەرنجە کەداهێنانی دەزگای چاپی گوتەنبەرگ لەسەدەی پانزەهەمداو فراوانبوونی بازاڕی کتێب لەئەورووپا، کەلەدوای ئەوەوە رووی‌دا، رەواجی بەشۆڕشێکی کلتووری‌دا، واتە ئەو شۆڕشەی کەبەناوی هیومانیزمەوە[14] ناسراوە، لەگەڵ بەخشینی گیانێکی تازەدا بەئەدەبیاتی کۆن، هەموو هونەرەکان پەرەیان سەند. زانستی سروشتی نوێ لەدایك بوو.

لە بەریتانیا جوڵانەوەی ریفۆرم خوازی بوو بەهۆی دوو شۆرش، شۆرشی خوێناوی 1648–1649وشۆرشی سپی 1688، کەلە ئەنجامیدا پەرلەمانی بەریتانیا رەوتێکی تەواوی بەرەو دیموکراسی دەست پێ‌کرد. لەم بارەیەوە پەیوەندی رەواجی کتێب لەگەڵ خەڵك سالاری‌دا ئاشکراتر بووە.

## سەرکەوتن و
## تاوانەکانی دیموکراسی ئەسینایی

موعجیزەی سەدەی پێنجەمی پێش زاین لەئەسینا، گەشەکردنی لەڕادە بەدەری کلتووری‌و سیاسی‌و سەربازی گرتەوە کەلەئەنجامی سەرهەڵدانی بازاڕی کتێبەوە رووی‌دا. ئەم گەشەکردنە هاوکات بوو لەگەڵ پەرەسەندنی خێرای ئەدەبیاتی بێ‌هاوتادا کەبوو بەسەرمەشقی ئایندەی ئەورووپا. لەنێو رووداوە گەورەکانی ئەو سەردەمەدا دووشەڕی گەورە هەن کەهەریەکەیان نزیکەی (سی) ساڵ درێژەیان کێشا. لەشەڕی یەکەمدا، ئەسینا کاول بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەسەرکەوتوویی هاتە دەرێ. لەشەڕی دووەمدا، شکستێکی گەورەی تووش بوو. رووداوە گرنگەکانی ئەو سەردەمە لەخوارەوە بەپێی مێژووەکەیان ریزکراون:

507 (پ.ز) بەرپاکردنی دیموکراسی لەئەسینا.

493ئەسینا چەك هەڵدەگرێ. هێزێکی دەریایی لەژێر فەرماندەیی سمیستوکل(15)دا دروست دەکرێ.

490جەنگی ماراسۆن[16]

480ئەسینا لەلایەن ئێرانیەکانەوە چۆڵ‌دەکرێ‌و پاشان نابووت دەبێ. تەنها هێزی دەریایی دەمێنێتەوە، شەڕی سالامیس.[17]

479شەرەکانی پلاتەئا[18] و میکال[19].یۆنانیە ئەیونیەکان کەلە ئاسیای بچووك و لە دوورگەکان رووبەرووی مەترسی بوونەوە،داوای یارمەتی لە ئەسینا دەکەن. بەم شێوەیە پەیوەندی دەریایی دالیان[20]، وئەوەی کەبە ئیمپریالیزمی ئەسینا ناودەبرا سەری هەڵدا. چاکردنەوەو قەڵا دروست کردنی ئەسینا.

462دەست پێ کردنی سەردەمی پریکلس[21].

تەلاری ئاکرو پولیس[22] و پەرستگای پارسنون[23]، یەکەم شەڕی (پلوپونزی).

431دەست پێ کردنی دووەم شەڕی (پلوپونزی).

429بڵاوبوونەوەی تاعوون لەئەسینادا، مردنی پریکلس، توندبوونی شەڕ.

413رووداوی کارەسات ئامێزی سیسیلی: لەناوچوونی سوپاو هێزی دەریایی ئەسینا.

411رووخانی دیموکراسی ئەسینا.

409ئەسپارتە بەسەر ئەسینادا سەردەکەوێ‌و لەئەسینا حکومەتێکی دەست نیشان کراوی دژی

دیموکراسی، تیرۆریستی دادەمەزرێنێ. ئەم حکومەتە لەماوەی هەشت مانگی تەمەنیدا ژمارەی ئەو کەسانەی لەئەسینا کوشتوونی لەوانە زیاترە کەلە شەڕی (دە) ساڵەی ئەسیناو ئەسپارتەدا کوژراون.

لەم مێژووە بەدواوە ئیتر مێژوویەکی نووسراو دەربارەی جەنگی دووەمی پلوپونزی لەبەر دەستدا نیەو، بەم پێیە بەئاسانی دەتوانرێ دان بەوەدا بنرێ کەدیموکراسی ئەسینا کۆتایی پێهاتبوو. بەڵام ئەم بۆچوونە راست نیە. دیموکراسی کۆتایی نەهاتبوو. لە دوای هەشت مانگ لەحوکمی تۆقاندن، دیموکراسی خوازانی ئەسینا گروپی سی کەسی فەرمان رەوا زۆردارەکەی خۆیان لەپیریۆس[24] تێك شکاندو لەنێوان ئەسپارتەو دیموکراسی ئەسینادا ئاشتی بەرقەراربوو. بەڵام دیموکراسی ئەسینا چەند هەڵەیەکی ترسناکی کردبوو. ئەم هەڵانە تەنها هەڵەی تاکتیکیو ستراتیجی نەبوون، بەڵکو تاوانی دژی مرۆڤایەتیشیان دەگرتەوە. وەکو لەناوبردنی دورگەی دلوس[25] کەبەرووکەش بەبێ هیچ هاندانێکی راستەوخۆ یان بەهانەیەك ئەنجام درا. لەم کارەدا هەموو پیاوەکانی دوورگەکە کوژرانو هەموو ژنو منداڵەکانیشیان برانو کران بەکۆیلە. زیاد لەم تاوانە ترسناکە حوکمدانی نادادپەروەرانەی سوکرات بوو. دادگایی کردنی سوکرات دادگایی کردنێکی سیاسیو، لێکۆڵەرەوەکەی سەرۆکی حزبی دەسەڵاتدار بوو. توسیدید کەلەو کاتەدا لەسوپای ئەسینادا سەرلەشکر بوو، وردەکارییەکانی رووداوی دورگەی دلوس باس دەکاتو دەڵێت: (بڕیاری رەشەکوژی خەڵکی دلوس بڕیارێکی درێوەو قابیلی بەخشین نیە، زۆربەی ئەوانەی کەئەم بڕیارەیاندا، زۆر بە وردی دەیانزانی چی دەکەنو لەسەر ئەم تاوانەیان سزا بدرێن). زۆر



رووداوی تری لەو جۆرە لەو سەردەمەدا لەئەسینا روویان دا.

لەم لایەنانەوە هیچ هەڵو مەرجێکی ناچاری لەئارادا نەبووە، بەڵام خۆش بەختانە توسیدید دەربارەی چەند بڕیارێکی دیکەش قسەدەکات بۆنموونە، کاتێك میتیلین[26] شۆڕشی بەرپا کردو پەیمانی وابەستەیی خۆی لەگەڵ ئەسینادا شکاند، بەزوویی لەبەرامبەر ئەسینادا شکستی هێنا.

ئەسینابییەکان سەرلەشکرێکیان بەکەشتیەکەوە نارده ئەوێ بۆ ئەوەی هەموو پیاوەکانیان بکوژێ، بەڵام رۆژی دوای ئەوە ئەسینابییەکان پەشیمان بوونەوە. توسیدید کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی گشتی باس دەکات کەتیایدا دیودوت[27] پشتیوانی لەلێبوردنی شکست خواردووەکان دەکات. پێشنیازەکەی بەزۆرینەیەکی کەم پەسەند کرا، بەڵام یەکسەر کەشتی دووەم رەوانەکراو سەربازەکانی بەبێ وەستان رۆیشتنو لەکاتی خۆیدا گەیشتنە ناوچەکە بۆ ئەوەی هەڵوەشانەوەی فەرمانی پێشوو رابگەیەنن. توسیدید دەنووسێت (میتیلین بەجیاوازی کاتێکی کەم رزگاری بوو).

## دیموکراسی هەرگیز حکومەتی خەڵك نەبووە، وقەت ناتوانێ ببێتە حکومەتی خەڵكو ناشبێ ببێ

پێم وایە تێگەیشتن کە دیموکراسی چەند مەسەلەیەکی جدی دەهێنێتە ئاراوە. ئەم مەسەلەیە لەسەرەتاوە هەبووەو ئێستاش هەیە. گرنگترینو دژوارترینی ئەو مەسەلانە مەسەلە ئەخلاقیەکانە. ئەو مەسەلەیەی کەهەمیشە سەرلێشێواوی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێو شێوەی

مەسەلەیەکی ئەخلاقی بەخۆیەوە دەبینێ، لایەنی لەفزی هەیە. دیموکراسی واتا حکومەتی خەڵك، زۆربەی خەڵك باوەڕیان وایە ئەم رستەیە بۆ تیۆری ئەو شێوە حکومەت کردنەی کەئێمە لەخۆرئاوا بەدیموکراسی لەقەڵەمی دەدەین، گرنگە. یونانیەکان ناوی جۆراوجۆریان بۆ شێوە جیاوازەکانی بەڕێوەبردنی ولات بەکاردەهێنا، دیارە لەبەر ئەوەی کەدەیانویست بپرسن کام شکڵی شیاوی حکومەت باش یان خراپە، باشتر یان خراپترە. بەم پێیە یۆنانیەکان لەسەر چۆنیەتی ئەخلاقی فەرمان رەواکان پێنج ناویان بۆجۆرەکانی دەستوور دانا. ئەم تیۆرە لەلایەن ئەفلاتوونەوە بەکارهێنراوەو وەکو ئەم نیشاندەرەی خوارەوە خستویەتیە ڕوو:

جۆری 1و 2، پاشایی: حکومەتی پیاوێکی باش‌و، شێوە دزێوەکەی زۆرداره– حکومەتی پیاوێکی خراپ.

جۆری 3و 4، حکومەتی خانەدانان: حکومەتی چەند پیاوێکی باش‌و، شێوە خراپەکەی ئۆلیگاریش– حکومەتی چەند پیاوێکی زۆر باش نا.

جۆری 5، دیموکراسی: حکومەتی خەڵك، خەڵکێکی‌زۆر، زۆرینە.

سەبارەت بەدوا جۆر، ئەفلاتوون تەنها یەك شێوەی حکومەتی پێناسە کرد کەئەویش خراپ بوو، چونکە لەکۆمەلانی خەڵك دا هەمیشە مرۆڤی خراپ بەدی دەکرێن.

ئەوە گرنگە کەهەوڵ بدەین مەسەلە بنچینەییەکانی ئەم نیشاندەرە بدۆزینەوە. دەتوانین ئەوە ببینین کەئەفلاتوون بە پرسیارێکی بەڕووکەش ساویلکانە دەست پێ‌دەکات:

چ کەسێ دەبێ کۆنترۆڵی حکومەت بکات؟ چ کەسێ دەبێ دەسەلاتی حکومەتی لەدەستدا بێت؟

رەنگە بتوانرێ ئەم پرسیارە ساویلکانەیە دەربارەی ولاتێکی بچووکی وەکو شار– حکومەتی ئەسینا بهێنینە پێشێ، کەتیایدا هەموو کەسێتیە گرنگەکان بەچاکی یەکتری دەناسن. هێشتا ئەم پرسیارە، (بێگومان بەشێوەیەکی ناهوشیارانە) بنچینەی لێکۆڵینەوە سیاسیەکانی ئەمڕۆیە.

مارکس‌و لینین‌و مۆسۆلۆنی‌و هیتلەرو، زۆربەی سیاسەتمەدارانی دیموکرات دەربارەی ئەم مەسەلەیە زۆرجار بەبێ ئەوەی کەبەخۆیان بزانن، بەجۆرێکی‌ماندوونەناسانە بیریان لێ کردۆتەوەو، هەر کاتێك چەند بڕیارێکی گشتیان تۆمار کردوە، بێ گومان بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە بووە کە(چ کەسێ دەبێ حوکم بکات؟) وەلامی ئەفلاتوون ئەوەبوو کە(دەبێت چاکترین کەسەکان حوکم بکەن) کە بە ئاشکرا وەلامێکی ئەخلاقی بووە. مارکس و ئەنگلس وەلامیان دایەوە کە" دەبێ زەحمەتکێشان حوکم بکەن" (نەك سەرمایەداران وەکو ئەمڕۆ)، دەبێ زەحمەتکێشان کۆنترۆڵی دەوڵەت بکەن، دەبێ دەسەلاتێکی دیکتاتۆرییان هەبێ:لێرەدا ئەو فاکتەرە ئەخلاقیە کەمێك نادیارە، بەلام هەڵبەتە ئەوە زەحمەتکێشانی باشن کەدەبێ حوکم بکەن، نەك سەرمایەدارانی خراپ.

دەربارەی هیتلەر پێویست ناکات قسەبکەین. چونکە بە سادەیی وەلامی ئەو"من" بوو، ئاشکرایە کە هیتلەریش وەکو ئەوانی پێش خۆی بیری لەوە دەکردەوە کە پرسیاری"دەبێ چ کەسێ حوکم بکات؟" پرسیارێکی بنەڕەتیە.

نزیکەی پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا، بڕیارم دا بۆ هەمیشە ئەم پرسیارە لە گۆڕ بنێم. چونکە ئەم پرسیارە گوزارشت لە خاڵێکی ناڕاست دەکات کە بە فریودان کۆتایی دێت و لە کۆتاییدا ئەو رێگەچارە گاڵتەجاڕانە دەهێنێتە ئاراوە کە بەزۆرەملێ ئەخلاقیەکانەوە گرێ دراوە. لە

روانگەی ئەخلاقیشەوە، زۆر بێ ئەخلاقیە کەنەیارە سیاسیەکان لە رووی ئەخلاقیەوە وەکو ئەهریمەن تەماشا بکرێن"و حزبی خۆیش بەچاك لەقەڵەم بدریّ" ئەم کارە ئەنجامەکەی نەفرەتە کە هەمیشە خراپەو بەرەو کردارێك دەچێت کە پشت بە دەسەڵات دەبەستێت لەباتی ئەوەی کە سنوور بۆ ئەو دەسەڵاتە دابنێت.

وا دیارە ئەوەی کە ئێمە لە سەرەتادا ئارەزوومان لیّ بوو بەراوردکردنی شێوە جۆراو جۆرەکانی دەوڵەت بوو، نەك کەسانی چاك یان خراپ، یان چینی چاك یان خراپ، یان رەگەزی چاك یان خراپ، یان هەتا ئاینی چاك یان خراپ!

لەبەر ئەوە پێشنیاز دەکەم لەجیاتی پرسیارە ئەفلاتوونیەکە" چ کەسێ دەبێ حوکم بکات؟" پرسیارێکی تەواو جیاواز دابنێین:"ئایا چەند شێواز لە حکومەت هەن کە بێزارکەر بن؟"لە بەرامبەر ئەمەشدا پرسیارێکی دیکە بکەین"ئایا چەند شێواز لە حکومەت هەن کە دەرفەت بە ئێمە بدەن خۆمان لە حکومەتێکی خراپ، یان لە حکومەتێکی بێ توانا یان زیان بەخش، رزگار بکەین؟"

لەو باوەڕەدام کە ئەم جۆرە پرسیارانە بەشێوەیەکی ناهوشیارانە لە بنچینەی ئەوەدا هەن کە ئێمە بە دیموکراسی خۆمان ناوی دەبەین و ئەم جۆرە پرسیارانە زۆر لەو پرسیارەی ئەفلاتوون جیاوازن کەلەسەر ئەوە بنیات نراوە کە ئایا دەبێ خەڵك حوکم بکەن. ئەم پرسیارانە ژێرخانی دیموکراسی ئەسینایی و دیموکراسیە تازەکانی خۆرئاوای خۆمان پێك دەهێنن.

ئێمە کە خۆمان بە دیموکرات لەقەڵەم دەدەین، دیکتاتۆری یان حکومەتی زۆردارانە وەکو شتێك تەماشا دەکەین کە لە ڕووی ئەخلاقیەوە ئەهریمەنێکە کە نەك تەنها قابیلی تەحەمول کردن نیە، بەڵکو لەڕووی ئەخلاقیشەوە قابیلی تەحەمول کردن نیە لەبەرئەوەی ناچێتە



ژێر لێپرسینەوەوە. هەست دەکەین کارێکی هەڵە دەکەین کەئەو جۆرە حکومەتە تەحەمول دەکەین. بەڵام ناچار نین ئەو حکومەتانە تەحەمول بکەین. ئەمە وەزعی پیلان گێڕانی (1944/7/20) ئەڵمانیا بوو[28]. کە ویستیان خۆیان لەو تەڵەیە رزگار بکەن کە بە پەسەندکردنی دیموکراسیانەی یاسای دەسەڵات پێدانی مارتی 1933تێی کەوتبوون. دیکتاتۆریی هەلومەرجێك دەخوڵقێنێ کەئێمە لێی بەرپرسیار نین، بەڵام گۆڕینیشی لەدەستی ئێمەدا نیە. هەلومەرجێکە کە قابیلی تەحەمول کردن نیە. لەبەر ئەوە ئێمە بەرپرسیارێتیەکی ئەخلاقیمان لەسەرشانە کەهەرچی لەتواناماندایە بیکەین بۆئەوەی رێگە لەسەرهەڵدانی هەلومەرجێکی لەوجۆرە بگیرێ. ئەمەش هەمان ئەو کارەیە کەئێمە هەوڵ دەدەین لەڕێگەی شێوە دیموکراسیەکانی حکومەتەوە ئەنجامی بدەین و ئەمەش تەنها بەهانەیەکی ئەخلاقیە. لەبەرئەوە حکومەتە دیموکراسیەکان لای هەموان خۆشەویست نین، بەڵکو لەسەروو هەموو شتەکانەوە، دەزگاگەلێکی بەرانبەر بەدیکتاتۆریەت ئامرازی بەرگری کردن لەخۆیانن.

ئەم دەزگایانە مۆڵەت بەحکومەتی دیکتاتۆریو کەڵەکەکردنی دەسەڵات نادەن و مەبەستیان سنووردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کەدیموکراسی بەم مانایە دەبێ بواری رزگاربوون لەحکومەتێك بەبێ خوێنرێژی بدات کەرێز لەئەرك و مافەکانی خۆی ناگرێ، یان تەنانەت ئەگەر لەبەرئەوەش بێت کە سیاسەتەکانی ئەو حکومەتە بەهەڵە دەزانین.

پرسیار ئەوە نیە کە(چ کەسێ) حوکم بکات، بەڵکو ئەوەیە کەدەوڵەت ئەبێ (چۆن)بێ. خاڵی

سەرەکی ئەوەیە کەدەوڵەت نابێ لەڕادە بەدەر حوکم بکات؛ یان راستتر بڵێین، مەسەلەکە ئەوەیە کەوڵاتێك ئەبێ (چۆن) بەڕێوە ببرێ.

ئەم بیرۆکەیە لەبنەمای دیموکراسی ئەسینادا هەبوو، هەرچەندە کەبەم جۆرە باسی نەکرابوو، بەڵام دەتوانرا بوونی هەڵ بهێنجرێ. ئەمڕۆکەش بیری ئێمە ئەوەیە، یان ئەبێ ئەوەبێ. نامانەوێ هیچ گرووپێك کەخۆیان بەخەڵك حساب دەکەن، چ سەربازان، کارمەندانی دەوڵەت، کرێکاران یان کارمەندان، رۆژنامەنووسان، بێژەرانی رادیۆو تەلەفزیۆن، نووسەران تیرۆریستان و لاوان لەدەسەڵاتدا بن یان حوکم بکەن. نامانەوێ لێیان بترسین یان ناچار بین بترسین. دەمانەوێو دەبێ لەحاڵەتی پێویستدا، لەبەرامبەر زۆرداری ئەوانەدا بەرگری لەخۆمان بکەین. لەشێوازەکانی حکومەتی خۆرئاوادا ئەمە ئامانجمانە، کەلەبەر نادیاری دەربڕین یان بەپێی نەریت بەدیموکراسی ناوی دەبەین. ئەوان بۆبەرگری لەئازادی تاکە کەس لەهەر شێوەیەکی حکومەتدا هاتنە ئاراوە، بەڵام بەدەر لەدەسەڵاتی میللیو حکومەتی قانون.

## خاڵی چارەنووسساز: دەبێ بتوانیت بەبێ خوێن رشتن دەوڵەت لەسەر کار لاببەیت

بەم پێیە، بەڕای من ئەوەی کەلەشێوەی دەوڵەتێکدا گرنگی هەیە ئەوەیە کەبتوانیت بەبێ خوێن رشتن لەسەر کار لایبەری- کەلە دوای ئەوە دەوڵەتێکی تازە دەسەڵات دەگرێتە دەست. پێدەچێ چۆنیەتی لەسەرکار لابردنی دەوڵەت، تاڕادەیەك بێ بایەخ بێت. چ لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە یان لەڕێگەی ئەنجوومەنی گشتیەوە دەبێ- بەو مەرجەی ئەم بڕیارە لەلایەن زۆربەی دەنگدەران یان لەلایەن نوێنەرانی ئەوانەوە درابێ، یان لەلایەن چەند دادوەرێکەوە لەدادگایەکی دەستوورییەوە درابێ. هیچ شتێك بەئەندازەی دەست لەکارکێشانەوەو وازهێنانی سەرۆك ریچارد نیکسۆن بەئاشکرا دیموکراسی بوونی سیستمی حکومەتی لەئەمەریکا نیشان نەدا.

مەسەلەی سەرەکیو بنەڕەتی سەبارەت بەگۆڕینی حکومەت هەمان دەسەڵاتی سەلبیو هەمان هەڕەشەی لەسەرکار لابردنە. دەسەڵاتی ئیجابی هەڵبژاردنی سەرکۆمارێ یان سەرۆك وەزیرانێ کێشەیەکی ترەو گرنگیەکی کەمتری لەم رووەوە هەیە. بەداخەوە زۆربەی خەڵك وا بیرناکەنەوە. بەر لە گرنگ نیشاندانی هەڵبژاردنێك چەند مەترسیەك هەیە. چونکە رەنگە هەڵبژادنی حکومەتێك لەلایەن دەنگدەرانەوە وەکو مۆڵەت دانێك لەلایەن دەنگدەرانەوە بەو حکومەتە لێك بدرێتەوە، واتە ئاراستەکردنی کەسێك بەناوی خەڵکەوەو لەڕێگەی بەکارهێنانی (ئیرادەی خەڵکەوە). بەڵام کوا دەزانینو، خەڵك کوا دەزانن، کەحکومەتی هەڵبژاردەیان لەئایندەدا چ هەڵەیەك یان چ تاوانێك دەکات؟

لەدوای ماوەیەك دەتوانین سەبارەت بەحکومەتێك یان سەبارەت بەسیاسەتەکانی، داوەری بکەین. رەنگە تەئیدی سیاسەتەکانی بکەینو لەبەر ئەوە دووبارە ئەو حکومەتە هەڵبژێرینەوە. رەنگە بشتوانین لەپێشدا رەزامەندی خۆمان دەربڕین. بەڵام لەم حاڵەتەدا شتێك نازانینو ناتوانین هیچ بزانین، حکومەتێك ناناسینو ناتوانین وای دابنێین کەحکومەت متمانەکەی ئێمە بەخراپی بەکار ناهێنێ.

بەپێی گێڕانەوەی توسیدید، پریکلس بەشێوەیەکی زۆر سادە ئەم تیورەی دەربڕیوە. (هەتا ئەگەر تەنها چەند کەسێك لەئێمە بتوانن نەخشە بۆ سیاسەتێك بکێشنو جێبەجێی بکەن، هەموومان دەتوانین حوکم بەسەر ئەو سیاسەتەدا بدەین) ئەم فورمەڵە سادەیە بەڕای من، بنەڕەتیە. تکا دەکەم سەرنج بدەن کە ئەم

بیرەی حکومەتی خەڵك بۆخەڵكەو هەتا دەستێوەردانی خەڵکیشی لەبەرچاو نەگرتووە. ئەم دوو شێوازە بەهۆی تیۆرەیەکی زۆر جیاوازی داوەرییەوە بەهۆی خەڵکەوە جێگیر کراون.

پریکلس(یان رەنگە خودی توسیدید- چونکە رەنگە هەردووکیان یەك باوەڕیان هەبووبێ) بەکورتی لێرەدا دەڵێت بۆچی خەڵك توانای حکومەت کردنیان نیە، تەنانەت لەکاتێکدا کە هیچ دژوارییەکیش لەبەردەمیان دا نەبێ. تیۆریەك-بەتایبەتی تیۆرە تازەکان- دەشێ تەنها کاری تاکەکەس بێ، تەنانەت ئەگەر ئەم تیۆرەیە بەهۆی هاوکاری کردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا رۆشنتر بووبێ یان باشتر بووبێ. زۆربەی خەڵك پاشان دەتوانن ئەوە ببینن کە ئەو تیورەیە خراپ یان چاك بووە، بەتایبەتی ئەگەر ئەنجامەکانی ئەو تیۆرەیان تاقی کردبێتەوە. ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنانەش، بەشێوەی رای ئیجابی یان سەلبی، ژمارەیەکی زۆرتر لە دەنگدەران دەتوانن ئەنجامی بدەن.

کەوابوو چەند رستەیەکی وەکو" پێشڕەوی جەماوەر"یش دەتوانێ گومراکەر و دروشم ئامێز بێت. بەشێوەیەکی گشتی پێشڕەوان ژمارەیەك کەسی دیاریکراون کەلەباشترین هەلو مەرجدا، بۆ هەڵسەنگاندنی رەخنەگرانە دەخرێتە بەرچاوی خەڵك. لەحاڵەتی لەم جۆرەدا گرنگە ئەوە بزانرێ کەئایا هەڵسەنگاندنی ئەو هەنگاوانەی پێشنیازکراون و لەتوانای ئەو دەنگدەرانە کە دەبێ هەڵسەگاندنەکە ئەنجام بدەن بەدەرە یان نا.

بەرلەوەی ئەم باسە تەواو بکەین دەمەوێ لەو مەترسییە ئاگادارتان بکەمەوە کە فێرکردنی ئەم باوەڕە بۆ ئەو خەڵك و منداڵانەی لەژێرسایەی حکومەتێکی جەماوەریدا دەژین، دەیهێنێتە پێشێ.چونکە ئەم مەسەلەیە راست نیەو ناتوانێت راست بێت. ئەگەر ئەوانە لەناکاو رووبەڕووی



واقیعیەتی مەسەلەکە ببنەوە، نەك تەنها ناڕازی دەبن بەڵکو نائومێدیش دەبن و هەست دەکەن کەفریویان خواردووە. چونکە ئاگایان لە ئاڵۆزیە تەقلیدیەکانی ئەم زاراوە بەکارهێنانانە نیە. رەنگە ئەم نائومێدیە کاریگەرییەکی خراپ لەسەر بۆچوونیان سەبارەت بەجیهان و جیهانی سیاسەتیش دروست بکات، تەنانەت رەنگە بەرەو تیرۆریزمیش رێنماییان بکات. لەڕاستیدا من ئاشنای ئەم جۆرە بابەتانە هەم.

## ئازادی و سنوورەکەی

هەروەکو بینیمان، ئێمە هەموومان تاڕادەیەك سەبارەت بە دەوڵەت بەرپرسیاریی هاوبەشمان هەیە، تەنانەت ئەگەر راستەوخۆش دەورمان تیایدا نەبێ. بەڵام بەرپرسیاریە هاوبەشەکەی ئێمە پێویستی بەئازادی هەیە، ئازادی زۆرشت: ئازادی قسەکردن، دەست گەیشتنی بێ قەیدوشەرت بەزانیاری و ئازادی کەڵك وەرگرتن لەو زانیاریانە، ئازادی بڵاوکردنەوەو، زۆر ئازادی دیکە. (زیادەڕەوی) لەرەزامەندیدا دەبێتە هۆی نەبوونی ئازادی. بەڵام دەتوانرێ خراپیش بەکار بهێنرێ. بەهەمان شێوەش دەتوانرێ دەسەڵاتی دەوڵەتیش خراپ بەکار بهێنرێ بۆ سنووردار کردنی ئازادیەکان.

ئێمە پێویستمان بەئازادی هەیە بۆئەوەی نەهێڵین دەوڵەت خراپ دەسەڵاتەکەی بەکار بهێنێ و، پێویستیشمان بەدەوڵەت هەیە بۆئەوەی جڵەوی خراپ بەکارهێنانی ئازادیەکان بکات.

ئاشکرایە ئەمە مەسەلەیەکە ناکرێ لەڕێگەی ئەو یاسایانەوە چارەسەر بکرێ کەبەشێوەیەکی تەجریدی دادەنرێن. ئێمە پێویستمان

بەدادگایـــەكی دەســـتووری هەیـــەو، زیـــاتر لەهەرشتێكیدیكە پێویستمان بەنیازپاكی هەیە.

دەبـــێ ئـــەو راســـتیە قبـــووڵ بكـــەین كەمەســەلەیەكی لـــەوجۆرە بێگومـــان قـــابیلی چارەسەر نیە، یان وردتر بڵێین، تەنها دەتوانرێ لەسیستمێكی دیكتاتۆریدا بەتەواوی چارەسەر بكـرێ، بـــەڵام مـــەبدەئی دەوڵـــەتێكی زۆر بەدەســـەڵات لەڕوانگـــەی ئەخلاقیـــەوە رەت دەكرێتەوە. لەبەر ئەوە دەبێ بەرێگەچارەی نیوە ناچڵو بەقبووڵ كردنـی سـازش خۆمـان قـایل بكەین. نابێ رێگەبدەین كەعەشقمان بۆئـازادی سەبارەت بەو خراپ بەكارهێنانەی كە لێیـەوە سەرچاوە دەگرن بەرچاومان تاریك بكات.

**تۆماس هۆبز[29]، ئەمانویل كانت[30]، ویلهلم فون هوم بولت، جۆن ئیستوارت میل[31].**

بیریارانی كۆنو نـوێ ئـەم مەسـەلانە یـان لـەپێناوی ئاراسـتە كردنـی پێویسـتی دەسـەڵاتی دەوڵەت و سنوورەكانیدا بەپێی ئـەو پرەنسیپانە پێناسە كردووە كەبەلای هەموانەوە پەسەندن.

تۆماس هوبز بەو گریمانەیە دەسـتی پـێ كرد كەبـەبێ دەوڵـەت، هـەر مرۆڤێك بـەزەبر(بـالقوە) دوژمنـی فەوتێنـەری جۆرەكـەی خۆیـەتی، لەبـەر ئـەوە ئێمـە بۆئـەوەی بتوانـین جڵـەوی تـاوانو توندوتیـژی بگریـن پێویسـتمان بـە بـەهێزترین دەوڵەت هەیە.

كـانت بـەجۆرێكی دیكـە مەسـەلەكە دەبینـێ. ئـەویش بـاوەڕی وابـوو كـە دەوڵـەتو سـنووردار كردنـی ئازادیـەكان پێویسـتن، بـــەڵام دەیویســت ئازادیەكان بەكەمینەش بگەیەنێ. كانت ئارەزووی ئـەوەبوو(دەسـتوورێك مۆڵـەتی زۆرتریـن ئـازادی شیاو بـەپێی یاسـایەك بـدات كـەتیایدا ئـازادی هەركەســـێك پەیوەســـت بـــێ بـــەئازادی هەموانەوە)[33].

كانت نەیدەویست دەوڵـەت زیاتر لـەوەی كـە بەتەواوی پێویستە بەهێزبێ، بۆئـەوەی ئەوپـەڕی ئـازادی شیاوی هەرهاوڵاتیـەك بـەجۆرێك دابـین بكـات كـە كـەمترین سنووردارییی شیاو بۆئـازادی كەسـانی دی فەراهـــەم بكـــات. كـــانت ئـــەم سنووردارییەی ئازادی بەدەرئەنجامێكی ناچـاری كۆمەڵگای مرۆیی دەزانی، كەڕەنگە بتوانـرێ بـەم بەسـەرهاتە گوزارشـتی لێ بكرێ. ئەمەریكاییـەك بـەوە تاوانبـار كـرا كـە بۆكسـی لـەلووتی كەسـێك داوە. ئـەم ئەمەریكاییـە لـەكاتی بـەرگری كردنـدا لـەخۆی وتـی وەكـو هاوڵاتیـەكی ئـازاد دەتوانـێ بەهەر لایەكدا كە بیەوێ بۆكسی خۆی بوەشێنێ. دادوەر بـەم شێوەیە وەڵامـی دایـەوە: (ئـازادی بۆكـس وەشـاندنی تـۆ سـنوورێكی هەیـەو، ئـەم سنووورە جاری وایە دەگۆڕێ. بەهەر حاڵ، لووتـی هاوڵاتیـــانی تـــۆ هەمیشـــە لـــەدەرەوەی ئـــەو سنوورەوەن).

لەیـەكێك لەنووسـینەكانی دوایـی كـانت دا دەربـارەی پـەندی بـەناوبانگی (رەنگـە ئەمـە لـەڕووی تیۆرییـەوە راسـت بـێ، بـەڵام بـەكردەوە راست نیە)، تیۆرێكیزۆر پێشكەوتووتر دەربارەی دەوڵـەتو ئـازادی دەبینـین. لەبەشـی دووەمـی نووســینەكەیدا كەلـــەدژی هوبـــز هەڵوێســـتی وەرگرتووە، كانت (بنەما پەتیەكانی لۆژیك) بـاس دەكات. یەكەم بنەما ئەمەیە: (ئـازادی تاكەكـەس وەكو مرۆڤێك، وەكو بنەمایەك بۆ یاسای بنەڕەتی بـەرژەوەندی هاوبـەش،..[34] دەتوانـرێ بـەپێی ئـەم فۆرمەڵەیـەی خـوارەوە نیشـان بدرێ. هیـچ كەسـێ ناتوانـێ ناچـارم بكـات بـەپێی تـێڕوانینی خۆی بۆخۆشبەختی كەسانیدی، خۆشـبەخت بم، چونكە هــەر كەسـە لـەو شوێنەدا بۆخۆشـبەختی خۆی دەگەڕێ كە خۆی بە گونجـاوی دەزانێت... دەوڵەتێك كە لەسەر بنەمای خێرخوازی بۆ خـەڵك دادەمـەزرێ، واتـە دەوڵـەتێكی بـاوك سـالارە، گەورەترین دیكتاتۆری شیاوە[35]

هەرچەندە رستەی کۆتایی(لەدوای لینین و ستالین، لەدوای موسولونی و هیتلەر) بەرای من زیادەڕەوی تیایە، بەڵام بەتەواوی رام لەگەڵ رای کانت دایە. چونکە ئەوەی کەمەبەستێتی(لە بەرامبەر هۆبزدا) بڵێت ئەوەیە کەئێمە دەوڵەتێکی زۆر بەهێزمان ناوێت، کە بە میهرەبانی ژیانمان "کە لەدەستی خۆیدایە" لە چنگی گورگەکان بپارێزێ، کە هاولاتیانی دیکەن. ئەرکی بنەڕەتی دەوڵەت دەبێ پارێزگاری و رێزگرتن بێ لەمافەکانی ئێمە تەنانەت ئەگەر هەموو خەڵك لەگەڵ یەکتریدا وەکو فریشتەکان رەفتار بکەن- بەپێچەوانەی تیۆرەکەی هۆبزەوە، هێشتا ئەم ئەرکە بۆ دەوڵەت پێویستە. چونکە هەتا لە هەلو مەرجێکی لەو جۆرەش دا لاوازەکان لە بەرامبەر بەهێزەکاندا مافێکیان نابێت و بەتەحەمولی ئەوانەوە بەند دەبێ. تەنها حکومەتی قانون دەتوانێت ئەم کێشەیە چارەسەر بکات و بەم پێیە ئەوەی کانت بە" رێزی تاکەکەس " ناوی بردووە بەدی بهێنێت.

ئەمە خاڵی بەهێزی تیۆرەکەی(کانت)ە دەربارەی دەوڵەت و ئەوەش دەردەخات کە بۆچی باوك سالاری رەت دەکردەوە. پاشان تیۆرەکانی کانت لەلایەن (ویلهلم فون هوم بولت)ەوە پەرەپێدرا- ئەمەش گرنگە، چونکە زۆرکەس وای بۆ دەچن کە لەدوای کانت ئیتر ئەم جۆرە تیۆرانە لە ئەڵمانیادا رەنگدانەوەیان نەبووە. بەتایبەتی لە پروسیا و لە ناوەندە سەرەکیە سیاسیەکان دا. کتێبەکەی هوم بولت"چەند تیۆرێك دەربارەی پێناسەیەك بۆ سنوورەکانی کارکردنی دەوڵەت" لە ساڵی 1851 دا بڵاوکرایەوە، بەڵام زۆر بەر لەو مێژووە نووسرابوو.

لە رێگەی ئەم کتێبەوە بوو کە تیۆرەکانی کانت سەرئەنجام گەیشتنە بەریتانیا. کتێبی"دەربارەی ئازادی"(1859) نووسینی جۆن ئیستوارت میل، ئیلهامی لە( هوم بولت) و لە ئەنجامدا لە"کانت"ەوە وەرگرتبوو. ئەم کتێبەش زۆرترین نفوزی لە جوڵانەوەی رادیکالی- لیبرالی بەریتانیادا هەبوو.



کانت و هوم بولت و میل، هەرسێکیان هەوڵیان دا واپێویستی دەوڵەت بسەلمێنن کە لە تەسکترین چوارچێوەی گونجاودا جێگیر بێت. بۆچوونیان وابوو کە: ئێمە پێویستمان بە دەوڵەتێکە، بەڵام کەمترین رادەی دەسەڵاتی هەبێت.-لە بەرامبەر دەوڵەتێکی زۆردار، نامانەوێ دەوڵەتێکی باوك سالار، زۆردار یان بیرۆکراتمان هەبێ. بەکورتی یەك دەوڵەتی بچووکمان دەوێ.

## دەوڵەتی بچووك یان دەوڵەتی باوك سالار؟

ئێمە پێویستمان بە دەوڵەتێك هەیە، دەوڵەتێك کە لەسەر بنەمای حوکمی یاسا-ئەو دوو مانایەی کە لە تیۆرەی کانت دایە کە مافە ئینسانیەکانی ئێمە واقیعێکەو دەبێ چاودێری بکرێ‌و، ئەمەی کەمافە (یاساییە) رێکخراوەکانمان کەئازادی ئێمە سنووردار دەکات، لەڕادەی شیاوداو تا ئەو شوێنەی کە مومکینە دادپەروەرانە بێ. دەوڵەتێکی‌لەو جۆرە دەبێ لەکەمترین سنووری شیاودا باوك سالارانە بێ.

بەڵام بەڕای من، هەر دەوڵەتێك بەلای کەمەوە یەکێك یان چەند لایەنێکی باوك سالارانەی تێدایەو، ئەم لایەنانە پێویستن‌و گرنگی بێ چەندو چوونیان هەیە.

ئەرکی یەکەمی دەوڵەت- ئەوەی کەلەهەرشتێك زیاتر لەدەوڵەتی چاوەڕێ دەکەین- ئەوەیە کەبەڕەسمی دان بەمافەکانی

ئێمەدا بنێ سەبارەت بەژیان و ئازادی لەکاتی پێویستدا، یارمەتیمان بدات بۆئەوەی وەکو مافێك بەرگری لەژیان و ئازادی خۆمان و (هەموو ئەوشتانەی پەیوەندییان بەو دووانەوە هەیە) بکەین. بەلام ئەم ئەرکەی دەوڵەت، بێ گومان لایەنی باوك سالارانەی هەیە! تەنانەت ئەوەی کەکانت بە(خێرخوازیەك) لە قەڵەمی دەدا، لێرەدا لەسەرەتاوە گرنگیەکی هەیە کەنکوڵی لێ ناکرێ. کاتێك ناچار دەبین داکۆکی لەمافە سەرەتاییەکانی خۆمان بکەین، نەك تەنها نابێ رووبەرووی دژایەتی یان پشت گوێ خستنی دەوڵەت (یان دەزگاکانی دەوڵەت) ببینەوە، بەڵکو دەبێ کەڵکیش لەخێرخوازی دەوڵەت وەربگرین.

لەڕاستیدا، وەزعی دەوڵەت لەهەر حاڵێکدا بێت باوك سالارانەیە، هەم لەڕووی زنجیرەی پلەو پێیەکانی دەوڵەتەوە لەسەرەوە بۆخوارەوە (سەبارەت بەدەزگاکانی دەوڵەت کەپێویست بوو خێرخواز بن)و هەم بۆ هاولاتیەکیش کەداوای یارمەتی لەدەزگایەکی بەهێزتر لەخۆی دەکات.

ئەمە راستە کەیاسا لەگرنگی واقیعی خۆی دا لەسەررو پەیوەندیەکی لەوجۆرەوە دادەنرێ کەتاڕادەیەك شەخسیە، بەلام لەبەرئەوەی ئەو بنەما یاسایانەی کە لە دەوڵەت و یاساکانیدا کاریان پێ دەکرێ، مرۆڤ دایناون، لەبەرئەوە هەڵەیان تێدەکەوێ، چونکە دەزگاکانی دەوڵەت لەو مرۆڤانە پێك هاتوون کەقابیلی هەڵە کردنن. سەرەڕای ئەمەش مرۆڤ گەلێکی لەم چەشنە هەندێجار ئەهریمەنین و کاتێ (خێرخوازی) نیشان دەدەن، (هەمان ئەو خێرخوازیەی کەکانت زۆر لێی وەڕس بووە) دەبێ رازی و هەتا سوپاسگوزاربین.

هەموو ئەمانە ئەوە نیشان دەدەن کە باوك سالاریی خوازی دەورێکی ئالۆز دەبینێ. بەداخەوە، هەلومەرجەکە بەو جۆرەیە–نامەوێ دان بەشتێکی وادا بنێم بەلام پێم وایە ئەمە واقیعێك بێت. لەبەرچاو نەگرتنی ئەم واقیعە بۆتە هۆی ونبوونی لۆژیك و هەلومەرجێکی خراپی لە وتووێژەکانی ئەم دواییەدا دروست کردووە. ئاماژەی من بۆ ئەوهێرشەیە کەبۆ دەوڵەتانی خۆشگوزەران دەکرێ[36]، بەپێی بۆچوونی من، ئەو هێرشەو ئەو مشت و مڕەی کەدووبارە زیندووبۆتەوە، گرنگیەکی زۆری هەیە. بەلام بەهەمان شێوە کەزۆرجار روودەدات، ناتوانرێ ئەو فەلسەفە باوەش زۆر بەجدی بگیرێ. ئەم فەلسەفەیە هەوڵدەدات ئەوەنیشان بدات کەتیۆری دەوڵەتی خۆش گوزەرانی هەموان و هەموو تێڕوانینە بەشکۆکانی دەربارەی ئەخلاق و مرۆڤایەتی، لەڕاستیدا هێرشێکی نائەخلاقیە بۆسەر گرنگترین مافەکانی مرۆڤ –مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی و مافی خۆش بەخت بوون یا بەدبەخت بوون بەسەلیقەی خۆی(مرۆڤ)، واتە ئەومافەی کە کانت لەبەرامبەر باوك سالاریدا بەرگری لێدەکرد.

هێرشی توندرەوانەی نوێ بۆسەر باوك سالاری، زۆرجار پشتی بەم دەربڕینانەی خوارەوە بەستووە لەکتێبی (دەربارەی ئازادی) کەجۆن ئیستوارت میل نووسیویەتی.

(تەنها ئامانجێك کەلەپێناویدا مرۆڤ رێگەی پێدراوە دەست لەئازادی کارکردنی هەرکەسێکی دیکە وەربدات، پارێزگاری کردنە لەخود{...} تەنها هۆی بەکارهێنانی دەسەلات لەبەرامبەر هەرئەندامێکی کۆمەڵگای مەدەنیدا، بەپێچەوانەی ئارەزووی خۆیەوە، دەبێ بۆ بەربەستکردنی ئەوکەسەبێ لەزیان گەیاندنی بەکەسانی دی. بەکارهێنانی دەسەلات بۆ بەرژەوەندیەکانی خود، چ فیزیکی یان ئەخلاقی بن، بیانوویەکی تەواو نیە بۆئەم کارە. ناکرێت بەزۆر ناچار ببیت بەکارێك یان بەنەکردنی کارێك تەنها لەبەرئەوەی بەڕای کەسانی دی بەقازانجی

ئەو مرۆڤەیە، یان بەختیاری دەکات، یان راستو ژیرانەیە کەئەو کارە ئەنجام بدات)[37].

ئەم نووسینە کەزۆر فۆرمێکی شارەزایانەشی نیە، پرەنسیپەکەی کانت دووبارە دەکاتەوە کەهەر کەسێك بەسەلیقەی خۆی دەتوانێت خۆش بەخت یان بەدبەخت بێ. لەبەرئەوە هەرجۆرە دەستێوەردانێکی باوك سالارانە رەت دەکاتەوە لەو کاتانەدا نەبێ کەبەرژەوەندیەکانی کەسی سێهەمی دەخاتەمەترسیەوە. هیچ کەسێك -نە خزم، نە برادەر، بێگومان نە دەزگا یان رێکخراوێك (وەکو ئەنجوومەن)، نە بەرپرسیارو نە فەرمانبەر- ناتوانێت داوای مافی سەر پەرشتیاری بکات بەسەر مرۆڤێکی بالغەوە لەمافەکانی بێبەشی بکات، مەگەر ئەوەی کەکەسێکی دیکە واتە کەسی سێیەم کەوتبێتە مەترسیەوە.

زۆرچاکە، کێ دەتوانێ شتێك بەپێچەوانەی ئەم پرانسیپەی جون ئیستوارت میلەوە بڵێت؟ بەڵام ئایا دەتوانرێ بەشێوەیەکی راستەقینە ئەم پرانسیپە بۆداکۆکی لەئازادی کارکردن بەکاربهێنرێ؟

لێگەرێن بانموونەیەك بهێنینەوە کەمایەی مشتو مرە. ئایا دەوڵەت مافی ئەوەی هەیە لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلدا فەرمانی بەستنی قایشی سەلامەتی بەهاولاتیان بدات؟ بەپێی پرانسیپەکەی (میل)، دەوڵەت ئەو مافەی نیە هەتا ئەگەر شارەزایان بۆ سەلامەتی ئەوە بە پێویستیشی بزانن و ئەوە رابگەیەنن کە بەبێ بەستنی قایشی سەلامەتی، لێخوڕین مەترسیدارە. بەڵام کەمێك بیربکەنەوە! ئەگەر وایە کەواتە رەنگە دەوڵەت بەرپرس بێ لەوەی رێگە لە سەرنشینی ئۆتۆمبیلەکە وەکو کەسی سێیەم بگرێ بۆئەوەی نەچێتە هەلومەرجێکی وامەترسیدارەوە، تاکاتێك کەسەرنشینەکە (هەڵبەتە، بەکەماڵی ئازادیەوە) بریار دەدات قایشی سەلامەتی خۆی ببەستێ یان نەیبەستێ.



نموونەیەکی دی کە پڕ مشتومڕە، مەسەلەی قەدەغەکردنی جگەرەکێشانە. ئاشکرایە، بەپێی پرانسیپی (میل) نابێ جگەرەکێشان لەهیچ کەسێ قەدەغە بکرێ بەو بیانووەی کەزیان بەخشە بۆی. بەڵام ئەی کاریگەری ئەمە لەسەر باری بەرژەوەندی کەسانی دی چۆنە؟ لەکاتێکدا کەشارەزایانی دەوڵەت دەڵێن هەڵمژینی دووکەڵی جگەرەی کەسانیدی بۆسەلامەتی زیان بەخشو تەنانەت ترسناکیشە، ئایا دەوڵەت بەرپرس نیە لەوەی کەجگەرەکێشان لەهەر جێگایەکدا قەدەغە بکات کەکەسی سێیەمی لێیە؟

هەمان ئەم تێبینیانە سەبارەت بەشێوە جۆراوجۆرەکانی بیمە راست دەردەچن. بۆنموونە، بەپێی پرانسیپی (میل) بیمەی بوون لەکاتی زیان لێکەوتنەکاندا نابێ بەهەرەشەی بەدواداچوونی یاسایی و بەزۆربێ، بەڵکو کەسی سێیەم، بۆنموونە دەبێ فەرمانبەرێك بەهەرەشەی بەدواداچوونی یاسایی رێگەی لێ بگیرێ لەوەی کە کەسێك بەکار بهێنێ کە بەخواستی خۆی واز لەبیمە بوون بهێنێ. ئەم مەسەلەیە سەبارەت بەمادە بێهۆشکەرەکان زۆر فراوان بووە. بەپێی پرانسیپەکەی (میل)، ئاشکرایە کەهەر کەسێکی عاقڵ لەتەمەنێکی دیاریکراودا (چ 14، 20، یان21) ساڵ بێ بەتەواوی مافی ئەوەی هەیە بەشێوەیەکی ئازادانە بە بەکارهێنانی مادەی بێهۆشکەر خۆی لەناو بەرێ. بەڵام ئایا دەوڵەت بەرپرس نیە لەوەی رێگە لەخولقاندنی هەلومەرجێکی وا ترسناك لەلایەن کەسانی دیەوە، بگرێت؟ وئایا ئەرکی سەرشانی دەوڵەت

نیە کەفرۆشتنی مادە بێهۆشکەرەکان قەدەغە بکاتو سزای قورسی بۆدابنێ (کە زۆرجار ئەو کارە دەکات)؟

مەبەستی من ئەمە نیە کە لەهەموو بوارێکدا بەهەمان شێوە کاریکرێ، بەڵام وادیارە کەئەم شێوازە لەزۆر لایەنەوە قابیلی جێبەجێ کردنە. ئەوە شتێکی باشە کەهەمیشە ئەوە بەبیری دەزگا دەوڵەتیەکانی ئێمە بهێنرێتەوە (بۆپاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئێمە، نەك خۆیان) کەهیچ مافێکیان نیە خەڵکی ناچاربکەن (بەقازانجی خۆیان) کارێك ئەنجام بدەن. دەزگاکان دەتوانن حوکمی غەریزەکانی باوك سالاری خۆیان بەکاربهێنن-هەروەکو ئێستاش کەم تازۆر بەکاری دێنن- بەڵام ئەم کارە دەتوانرێ بەشێوەیەکی باشتر ئەنجام بدرێ لەژێر پەردەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی کەسی سێیەمدا.

من بەم شێوەیەی خوارەوە پرانسیپەکەی جۆن ئیستوارت میل قبوڵ دەکەم: هەرکەسێك ئازادە بەسەلیقەو شێوازی خۆی خۆشبەخت یان بەدبەخت بێ، بەو مەرجەی کەئەم کارە ئازادی کەسی سێیەم نەخاتە مەترسیەوە. بەڵام ئەرکی سەرشانی دەوڵەتە کەزەمانەتی ئەوە بکات کەهاوڵاتیان ناهۆشیارانە رووبەرووی ئەو مەترسیانە نەبنەوە کەزیانێکی زۆری هەیە و توانای هەڵسەنگاندنیان نیە. بەم پێیە، بەم گۆرانە، پرانسیپەکەی میل دەتوانێت کاریگەرییەکی کەمی لەسەر ئەو رەخنە (زۆر گرنگانە) هەبێت کەئاراستەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی هەموان کراوە. ئارەزووی رەوای ئێمە بۆ بچووك بوونی دەوڵەت هیچ پەیوەندیەکی بەپرانسیپی میلەوە نیە. بەڵام لەگەڵ بابەتی دەوڵەتانی خۆشگوزەرانی هەمواندا پەیوەندی دروست دەکات چونکە بۆ تیۆری تایبەتی کردنی بیمە کۆمەڵایەتیەکان رێنماییان دەکات.

لەکۆتاییدا دەمەوێ ئاماژە بۆ ئەرکێکی تەقلیدی دەوڵەت بکەم، ئەگەرچی بەدڵ پێم خۆشە ئەو ئەرکە وەکو زۆر لەئەرکەکانی دیکەی دەوڵەت بەزیادە وەسف بکەم، بەڵام بەداخەوە ئەوە ناکرێ. ئەم ئەرکە هێشتا گرنگی زۆری هەیەو بۆ ئەنجام دانی ناتوانرێ پشت بەهیچ رێکخراوێکی تایبەتی ببەسترێ. ئاماژەی من بۆ بەرگری نیشتمانیە. ئاشکرایە ئەمە بەرپرسیارییەکی باوك سالارانەیەو گرنگی ئێستای لەروانگەی فەلسەفیەوە، هەموو تیورەکانی دژی باوك سالاری دەوڵەت پووچەڵ دەکاتەوە. وادیارە ئەو فەلسەفانە بەو ئومێدە بڵاودەکەنەوە کەئەگەر مەسەلەی بەرگری نیشتمانی لەبەرچاونەگیرێ، خۆی لەخۆیدا نامێنێ. بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی زۆر پر بایەخەو بەهایەکی زۆری دەوێ. ئەم مەسەلەیە، گەورەترین هەرەشەیە سەبارەت بەتیۆری (دەوڵەتی بچووك)و ئەرکێکی دیکەمان بەبیر دەهێنێتەوە، کەبەهەمان ئەندازە پر بایەخەو خەرجیەکی زۆری دەوێو پەیوەندییەکی نزیکی بەبەرگری نیشمانیەوە هەیە: سیاسەتی دەرەوەی هەردوو ئەرکەکە چەند دەرئەنجامێکیان هەیە کە(دەوڵەتی بچووك) (لەرەخنەکاری) دووردەخاتەوەو وەکو ئامانجێك نیشانی دەدات، هەر چەندە ئەمە بەو مانایە نیە کەدەبێ دەست بەرداری تیۆرەکە بین. تیۆری (دەوڵەتی بچووك) وەکو جاران بوونی دەبێ، هەتا ئەگەر تەنها وەکو پرەنسیپێکی چاك کەرەوەش بێت.

من دەمەوێ خاڵێکیدیکەش باس بکەم، دەوڵەتێك کەئەرکی سەرشانێتی بەرگری لە وڵات بکات، دەبێ چاودێری ئامادەیی سەربازی هاوڵاتیان و بەوپێیەش چاودێری سەلامەتیان بکات، تەنانەت دەبێ تارادەیەك چاودێری ئابووریش بکات. چونکە پێویستە چەند

سەرچاوەیەکی بەرچاو ئامادەبکات، ترافیکو سیستمی ئیشارەت دان ڕێك بخاتو بیپارێزێو زۆرشتی دیکەش بکات.

**مافی هاولاتیە بچووکەکان:**

بەداخەوە، لەڕووی پرانسیپەکانەوەو هەروەها لەبەر هۆی ئەخلاقی، کارەکان بەبێ باوك سالاریی‌خوازی ئەنجام نادرێ. کاتێك دەولەت مافی هاولاتیان بۆ پاراستنیان لەناخۆشی لەبەرامبەر دزیدا بەهۆی پۆلیسەوە بەڕەسمی دەناسێ، دەبێ‌مافی منالانو مێرد منالانیش بۆ پارێزگاری کردن لەجیاوازیان تەنانەت لەبەرامبەر باوكو دایکیاندا بەڕەسمی بناسێ. بەم پێیە لەڕووی پرانسیپەوە، ئەم مەسەلەیە باوك سالارانەیە. مەسەلەی (دەولەتی بچووك یان دەولەتی باوك سالار) بەمەسەلەیەکی دیکە جێگەی دەگیرێتەوە: (باوك سالاریی‌خوازی نابێ لەوە زیاتر بێت کەپێویستیەکی ئەخلاقیە) ئێستا لەجیاتی بالادەستی پرانسیپی (دەولەتی بچووك) بەسەر پروپاگەندە ئەخلاقیەکانی دەولەتی باوك سالاردا، ئێمە دووبارە خۆمان لەهەمان هەلومەرجی رابردوودا دەبینینەوە، واتە ناکۆکی کۆنی نێوان دەولەتو ئازادیو هەروەها تیۆری دژی دیکتاتۆری کانت کەنابێ ئازادی زیاتر لەوەی کەپێویستە لەقالب بدرێت.

## مەسەلەی بیرۆکراسیی دەولەتی قابیلی چارەسەرە

**بیرۆکراسیی سەربازی:**

خالی گرنگ لەهەر تیۆریەکی دژ بە دیکتاتۆریەت هەروەها دژ بە (خەلك سالاری) دەولەت، مەسەلەی بیرۆکراسیە، چونکە دەزگا ئیداریەکانی ئێمە (لەپێناسەکەی مندا) دژی دیموکراسین.. ئەم دەزگایانە ژمارەیەکی زۆر (بەچکە دیکتاتۆر) یان لەخۆیان گرتووە کەنابێ



حسابی کارو غەفلەتەکانی خۆیان بە کەس بدەنەوە. بیریاری گەورە ماکس ڤیبەر [38]، دەربارەی ئەم مەسەلەیە رەشبین بوو باوەڕی وابوو کە هەرگیز قابیلی چارەسەر نیە. من باوەڕم وایە ئەگەر بنەما دیموکراسیەکانی ئێمە رەچاو بکرێن، ئەم مەسەلەیە دەتوانرێ چارەسەر بکرێ، دیارە ئەگەر بەراستی بمانەوێ چارەسەری بکەین.بەلام بڕوای من مەسەلەی بیرۆکراسی سەربازی قابیلی چارەسەر نیە.

مەترسی گەشەکردنی بێ سنووری دەسەلاتی سەربازی کە پرس بە خەلك نەکات یەکێکە لەو هۆیانەی کە من،لەگەل گەشبینیدا، هەموو ئومێدی خۆم" کە دەبێ هەر وابێ" بە ئاشتی جیهانیەوە گرێ دەدەم، ئومێد بە(ئاشتی بێ کۆتایی) کانت ئەم ئاشتیە هەرچەندە دوورە دەستیش بێت،بەلام دەبێ زوو ئەوە روون بکەمەوە کە لە پێناوی گەیشتن بە ئاشتیدا، لەگەل ئەو بزووتنەوەیەدا بین کە بەحساب بزووتنەوەی ئاشتیە. ئێمە دەبێ لە ئەزموونی خۆمانەوە ئەوە فێربین کە جولانەوەی ئاشتی هەتائێستا دووجار بۆتە هۆی هاندانی دەست درێژکاران. قەیسەر ویلهم ی دووەم باوەڕی وابوو کەبەریتانیا لەبەر ئاشتی خوازی لەسەر بەلجیکا ناچێتە جەنگەوە، لەگەل ئەوەشدا کەدەیزانی بەریتانیا دابینکەری ئاسایشی بەلجیکایە؛ هیتلەریش هەمان خەیالی دەربارەی پۆلەندە لەسەردا بوو، کەبەریتانیا ئاسایشی ئەویشی دابین کردبوو.

## ئومێدی لاوان

دیموکراسیەکانی خۆرئـاوا سـەرکەوتنی بـێ وێنەیان بەخۆیانەوە دیوە. ئەم سەرکەوتنە بەری کاری سەختو کۆششی زۆرو نیەت پاکی فراوانو لە سەروو هەمووشیانەوە ئەندێشەی داهێنەرانە بووە لەزۆربەی بوارەکاندا. ئەنجامەکەشی ئەوەیە کەژمارەیەکی زیاتر لەخەڵك خۆشبەختن، ژیانێکی ئازادترو باشترو درێژتریان هەیە لەهەر میللەتێکی دیکە بەدرێژایی مێژوو.

دیارە دەزانم کەزۆربەی شتەکان هێشتا دەبێ باشتربن. گرنگترینی ئـەو شتانە ئـەو لایەنـەی کـــە(دیموکراســـیەکانی) ئێمـــە هێشـــتا لەدیکتاتۆریەتی زۆرینەی جیا نەبوونەتەوە. بەڵام هەرگیز بەدرێژایی مێژوو وڵاتێك نـەبووە کـەتیایدا خەڵك بتوانن تائەو ئاستە ئـازادبنو ژیـانێکی ئـاوا باش، یان باشتریان هەبێ.

دەزانم کەکەسانێکی زۆر لەگـەڵ ئـەم رایـــەی مندا نین. دەزانم کەجیـهانی ئێمە لەشتی خراپ نەشـۆراوەتەوە: تـاوان-توندوتیـژی- مادەبـێ هۆشکەرەکان. ئێمە هەڵە زۆردەکـەینو، تەنانـەت ئەگـەر زۆرکـەس لەئێمـەش دەرس لـەو هەڵانـە وەربگرن، هێشتا هەندێ کەس بەدیلی ئەو هەڵانە دەمێننـەوە. ئـەوە واقیعـی جیهانـە کەئـەرکمان بۆدیـاری دەکـات. ئێمـە دەتوانـین خۆشـبەختو رازی بژین. ئەم خاڵەش دەبێ بەبەرزیو بەرەوانی بوترێ! من کەمتر گوێم لێی دەبـێ. لـەبری ئەمـە هـــەموو رۆژێ ســکاڵا و منجـــەمنج دەبیســـتم کەجیهانی ئێمە بۆ ژیان چەندە ترسناکە.

بـەرای مـن، بڵاوکردنـەوەی ئـــەم درۆیانـــە گـەورەترین تـاوانی ئـەم سـەردەمەی ئێمەیـە، چونکـــە حـــەقی لاوەکانمـــان ســـەبارەت بەئومێدەواریو گـەش بینیـان دەدزێ. هـەندێ حاڵەتی ئەم نائومێدیە دەبێتـە هـۆی خۆکوشتنو بەکارهێنانی مەوادی بێهۆشکەر یان تیرۆریزم.

## گەش بینیو مەترسی دەزگاکانی راگەیاندن

خۆش بەختانە، بەئاسـانی دەتوانرێ هەست بەحەقیقـەت بکرێ: حەقیقـەت ئەوەیـە کەئێمـە لەباشترین جیـهاندا دەژیـن کەتائێستـا وێنـەی نـەبووە. نـاتوانین رێگـە بـەوە بدەیـن کەئـەم حەقیقەتـە بـە نـەگوتراوی بمێنێتـەوە. دەبـێ دەزگاکانی راگەیاندن کەلەم بارەیەوە گەورەترین گوناهیـان لەئەستۆدایە، قەناعـەتیان پێبـهێنرێ کەرەفتاریان زیـان بەخشە. دەبـێ ناچـاربکرێن بۆئـەوەی لەکۆمـەڵدا ئەرکەکانی خۆیـان ئـەنجام بدەن. دەبێ دەزگاکـانی راگـەیاندن ناچاربکرێن بۆئەوەی کەحەقیقەت ببینـنو بیڵێنـەوە، هەست بــەو مەترســیە شــاراوەیە بکــەن کــەخۆیان بەرپرسیارن لێیو رەفتارێ بگرنە بەر کە لەسـەر رەخنە لەخۆگرتن بنیات نرابێ. (بەهـەمان شێوە کەهەر رێکخراوێکی ساغ رەفتار دەکات)و خۆیـان چاك بکـەن. ئەمـە ئـەرکی سەرشـانیانە، بـەڵام دەزگاکانی راگەیاندن دەبنە هـۆی زیـانی گـەورە. ئەگەر لەم بوارەدا هاوکاری نەکەنو بەگەش بینی مانەوە، تارادەیەك مەحاڵ دەبێ.

### پەراوێزەکان:

1- دەقـی لێدوانـی کـارل پۆپـەر لـەمیونیخ رۆژی 1988/6/9.

2-Karl Popper

3-Homer

4-Iliad

5-Odyssey

6-Cicero

7-Pisistratus

8-Corinth

9-Thebes

10-Thucydides

Anaxagoras—11

Herodotus—12

Hippias—13

Humanism—14

The mistocles—15

Marathon—16

Salamis—17

Plataea—18

Delian League—20

Periclean Age—21

Acropolis—22

Parthenon—23

Piraeus—24

Delos—25

Mytilene—26

Diodotus —27

28— ئاماژەیە بۆ هەوڵی کوشتنی هیتلەر لەلایەن ئەو ئەفسەرانەوە کەدژی دیکتاتۆریەتی ئەو بوون.

Thomas—29

Immanuel Kant—30

Wilhelm Von Humboldt—31

John sturart—32

I. Kant, Critique of Pure Reason, London:—33 Mac Millan, 1963, P.312 See also "Perpetual Peace: a philosophical sketh" (in Political Writings, Cambridge: Cambridge University Press, 1991)

eines gemeinen wesens—34

I. Kant, (on the Common Saying: "This May Be—35 True in Theory, But It Dose Not Appiy ink in Practice") in Political Writings, P. 74.

Welfare state —36 ئەو وڵاتەی کەتیایدا دەوڵەت لەرێگەی فراوانکردنی خزمەتگوزاری بیمەی کۆمەلایەتیەوە خەرجی لای کەمی خۆشگوزەرانی (مافی ژیان)ی هەموو هاوڵاتیان دابین بکاتو هەتا بۆئەوانەی کەتوانای کارکردنیان هەیە، بەڵام کارناکەن مووچە دابین بکات.

John Stuart Mill, On—37 Liberty and Other Essays, Oxford: Oxford University Press, 1991, P.140.

Max Weber—38

**سەرچاوە:**

اطلاعات سیاسی – اقتصادی

شمارة 141— 142

ص 48— 57.

# "هەڤپەیڤینی جیانکارلۆبۆزتی

# لەگەڵ کارل پۆپەردا"

● و. لە فارسییەوە: شۆڕش جوانڕۆیی

**"تەلەفزیۆن وەچەی مرۆڤایەتی بەرەو گەندەڵی ئەبات، ئەم دۆخە وەك جەنگێك وایە"**

**پرسیار: مەبەستان چی‌یە کە لەو جێگایەدا، قسە لەسەر "هەڵوەشاندنەوە ئاکاریەکان" ئەکەن؟**

وەڵام: مەبەستم، بەشێوەیەکی سادەو ئاشکرا، زۆربونی تاوانەکانو، هەستکردن بە لەدەستدانی ژیانە لەجیهانێکی، دامەزراودا. لەئەوروپادا. تاماوەیەك لەمەوبەر، ئێمە لەکۆمەڵگایەکدا ئەژیاین، کە تاوانەکان، لەریزی جەنجاڵە (ئاوارتەکاندا) (استثناء)، نەهاتنە ئەژمار.

**پرسیار: ئایا ئەمە جۆرێك، لە (ئەفسانەسازی)، رابوردو نی‌یە؟**

وەڵام: هەڵبەتە لەگەڵتام، کە ئەم جیهانی خاوەن ئەزمو یاسایە، لەهەمان کاتدا بچوکو ناشرینە، وەك ئەڵێن، بورژوابوو. بەڵام جیهانێك بوو کە تیایدا دەتتوانی، ئەوە بهێنیتە بەرچاوت– هەر بۆ نمونە، بەو شێوەیەی کە من بۆ تۆی لەبەرچاو ئەگرم– کە ئەو کەسەی لەبەرامبەرتا، وەستابوو دەمانچەی پێ نەبوو. ئەمە بەو مانایەی، کە هیچ هەواڵێك لەم جیهانە نی‌یە.

**پرسیار: بەڵام ئێوە جەنابی پرۆفیسۆر، هەمیشە فەیلەسوفێکی گەشبین بوون، و واتان تێ ئەگەیاندین، کە جیهانی خۆمان، هەر بەو شێوەیەی کە "لایب نیتس" وتبوی، بەباشترین جیهان بزانین، ئایا ئێستاش هەر بەو شێوەیە، بیر ئەکەنەوە؟**

وەڵام: راستە کە من گەشبینم، بەڵام نەك بەو شێوەیەش کە ئێوە ئەیخەنەڕوو. من هەرگیز

ئەموتوە، جیهانی ئێمە باشترین جیهانە. من وتومە ئەو جیهانەی ئێمە تیا ئەژین، سەرەڕای ئەو جەنگە ترسناکانەش کە تیایدا، روویان داوە، تا هەنوکە، باشترین جیهانە. هەڵبەتە هەموومان لەوە گەیشتوین، کە ئەو ئەزمونە توندو تیژانەی، کە هەڵقولاوی جەنگن، کاریگەریەکی قوڵو ناخۆشیان بەجێ هێشتووە. لەسەردەمی ئێمەدا، جیهانی رۆژئاوا، هەولێکی گەورەو سەرکەوتوی، بەمەبەستی باشکردنی کاروبارەکان بە ئەنجام گەیاند. بەڵام ئێستا وێرانەیەکی ئاشکرا بەرچاو ئەکەوێت، کە بۆ هەرکەسێك بەچاوێکی هوشیارەوە، سەرنج بدات، ئەم وێرانیە بەهەڵقولاوی توندوتیژیەك ئەزانێ، کە بەردەوام لەبەرامبەر، چاو و مێشکماندا، حزوری هەیە.

**پرسیار: بەزەحمەت بڕوا ئەکرێت، کە ئەم هەڵوەشاندنەوە گەورەیە. بەتەواوەتی لە تەلەفزیۆنەوە سەرچاوەی گرتبێت. ئایا ئەمە لوتبەرزیەکی زێدەڕەویانە، نییە؟**

وەڵام: لەڕاستیدا، هیچ هۆکارێکی دیکەی نییە. جەنگەکان، برەو بەتوندوتیژی ئەدەن، لەکۆمەڵگادا. بەڵام دواهەمین شەڕ، پەنجا (50) ساڵ لەمەوبەر، رویدا.

**پرسیار: مۆڵەتم بدە، هەندێ لەو رەخنانەتان بۆ دووپات بکەمەوە، کە لەم مانگانەی دوایدا، لەکاتی بڵاوبونەوە. وتووێژەکەتان لە (Lunita)دا، خراوەتەڕوو.**

وەڵام: بەڵام سەرەتا بوارم بدەن، کە بیرەوەریەکتان بۆ بگێڕمەوە. من لەساڵی (1920)دا، سەرپەرشتیکەری باخچەی ساوایان بووم، لەوێدا بەسەرهاتێکی سەرنجڕاکێش، رویدا. ئاشپەزەکە (چێشت لێنەر)، مێردێکی هەبوو، کە لەبارەیەوە، ئەیانوت "هەڵبەتە من دڵنیانیمو واتە تەسەور ئەکەم لە پروپاگەندە زیاتر هیچی



دیکە نەبوو" کە لەشەڕدا بەسەختی بریندار بوەو تا ئێستاش گوللەیەك لەسەریا ماوەتەوە، هەر بۆیە هەنوکەش چاوەڕوانی کاری توندو تیژی لێ ئەکرێت.

لەڕاستیدا لەگەڵ هاتنما بۆ ئەم جێگایە، روداوێکی ترسناك رویدا. جارێکیان تەواو لەژنەکەی توڕەبوو و هەڕەشەی لەژنەکەی ئەکرد. من لێی چومە پێشەوەو ناوبژیم کردن، تاڕادەیەك بەئازایەتیەکەوە، توانیم چەقۆکەی لەدەست بسێنم.

**پرسیار: تۆ؟**

وەڵام: بەڵێ. سەرت سوڕ نەمێنێ. من لەو کاتەدا زۆر لاویومو تەنها کەسێك بووم، کە ئەمتوانی کارێکی لەو بابەتە ئەنجام بدەم. دەستی پیاوەکەم گرتو لەژوورەکە بردمە دەرەوە، گەرچی هیچ کەسێکی بەساڵاچوم، دەست نەکەوت، تا مناڵەکانی پێ بسپێرم، لەگەڵ ئەوەشدا، بەخێرایی مناڵەکانم لەجێگای روداوەکە دورخستەوە، لەکاتێکدا بەچاوی خۆیان ئەو روداوەیان بینی، کە ئینسانێك بەچەقۆ هەڕەشە، لە ئینسانێکی تر دەکات (واتە باوکیان بەچەقۆ هەڕەشە لەدایکیان ئەکات).

**پرسیار: بۆچی ئەم بەسەرهاتەم بۆ ئەگێڕیتەوە؟**

وەڵام: چونکە ئەمە نمونەی حاڵەتێکی زۆر (ئاوارتەیە) (استثناء)، لەژیانی ئەو مناڵانەدا. بۆ هەریەکێك لەوانە، ئەو روداوە، رەنگە جدیترین روداو بێت، کە لەدەورانی مناڵیو گەورەییدا، چاویان پێ کەوتبێت. کەواتە ئەم مەسەلەیە زیاد لەوەی، کە مەسەلەیەکی تیۆری بێت،

مەسەلەیەکی پراکتیکیە. هەروەها ئەگەری ئەوەش هەیە، کە توندوتیژی ئەو پیاوە لەو جەنگەوە سەرچاوەی گرتبێت، کە تەنها دوو ساڵ بەر لە سەرهەڵدانی ئەو روداوە، کۆتایی پێ هات، وە ئەمرۆ دوای پەنجا ساڵ دوای جەنگی دووهەمی جیهانی، لێرەو لەوێ، جەستەی بێگیانی مناڵەکان ئەدۆزرێنەوە، کە بە کۆمەڵ ئەکوژرێن، یان بەشێوەی جۆراو جۆر توندوتیژیان بەرامبەر ئەکرێت.

**پرسیار: ئێستا یەکەمین رەخنەم، بۆ ئێوە ئەخەمە روو:**

**رەگەزی ئینسان توانایەکی زۆری هەیە، بۆتەبایبوون، لەگەڵ بارودۆخە تازەو جۆراو جۆرەکاندا. لەراستیدا، ئێوە هەمیشە ئاماژەتان کردوە بەو شێوازانەی، کە بونەوەرە زیندوەکان، ئەتوانن لەژینگەی خۆیاندا، هەڵسو کەوتی پێ بکەن.**

وەڵام: بەڵێ، ئەگەر مناڵان، بەردەوام رووبەرووی بارودۆخە توندوتیژەکان ببنەوە، ئیدی پەیرەوی ئەو بارو دۆخە ئەکەن، بەڵام تەبابوونی ئەوان لەگەڵ توندوتیژیدا، کتو مت ئەو مەسەلەیەیە کە ئێمە ئێستا سەرقاڵی قسەکردنین لەسەری. مەنتقیترین ئاکامی ئەم تەباییەش ئەو ئایندەیەیە، کە تیایدا مناڵانیش، خوازیاری کڕینی دەمانچەی حەوت تیرن، خاڵی دووهەم، کە ئەبێ باش سەرنج بدەین، ئەو شتەیە، کە لە رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ توندوتیژیدا، قسەی لەسەرکراوە، واتە، دایکانو باوکان؟ بەڵام چەند ژمارە لەدایکانو باوکان رووبەڕووی کاری توندوتیژی ئەبنەوە؟ مامۆستایان؟ بەڵام مامۆستایان هیچ کارێکیان پێ ناکرێت، لەبەرامبەر تەلەفزیۆندا. تەلەفزیۆن، هەمیشە بۆ فریودانی مێشکە بێ گەردەکەی مناڵان، پلە بە پلە جوانترو، دڵفرێنترو، سەرنجڕاکێشترو، بەتواناتر هاتۆتە بەرچاو، هەروەها بەتواناتر، بۆ هاندانو جوڵاندنی لایەنە ئەرێنیەکانی (مثبت) ئەوان، بەتایبەت پەیوەندیان بەژیانەوە. تەلەفزیۆن خاوەنی فۆرمۆڵێکی لە شکان نەهاتوە: "جۆشو خرۆشو بەسەرهات، و جۆشو خرۆش و بەسەرهاتی زیاتر"-ئەمە بەگشتی فەلسەفەی بەرهەم هێنەرەکانی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنە. مامۆستایەك ئەتوانێ چی بکات لەبەرامبەر ئەم شتانەدا؟ تەنها دەنگی عەقڵەکە ئەتوانێت، لەم زەمینەیەدا، کارێك ئەنجام بدات.

سەردەمێکی زۆری خایاند تا تەلەفزیۆن تەکامولی کرد و تەنها لەماوەی ئەم، دەپانزە ساڵەی رابوردودا بو، کە کاریگەریەکی لەرادەبەدەری بەدەست هێنا. بەڵام پاش ئەوە بە خێرایی، وەك کرێوەیەك (ڕنویەك) لەحاڵەتی هاتنە خوارەوەدا، رێگای هەرەسی گرتەبەر. هەر بۆیە مامۆستایان، توانای بەرگرتنی ئەم دیاردەیەیان نییە.

**پرسیار: رەخنەکەی دیکەم ئەوەیە، کە لە توانادا نییە، تەلەفزیۆن رابوەستێنرێت، کارێکی لەو جۆرە، شتێکی بێمانایە، وەك ئەوە وایە کە لەجیهانێکدا، بەبێ کارەباو، یان تەلەفون، ژیان بەسەر بەرین.**

وەڵام: کارەبا، تەلەفون، سەیارە. بەڵام ئەم رەخنەیە چاودێری لەچی ئەکات؟ ئایا هەموو ئەم شتانە لەژێر چاودێریکردنو کۆنترۆڵدا نین.؟ ئایا سەیارە لێخوڕینیش، هەر بەو شێوەیە، مل کەچی کۆمەڵێ بڕیار نییە؟ هێندە بەسە، ساتێك بیر لەو مەترسیە چاوەڕوان نەکراوە بکەینەوە، لەو کاتانەدا کە گوێ نادەینە ئەو بڕیارە پەیوەندارانەی. کە بۆ مەبەستی سەیارە لێخوڕین

دانراون، له ئۆتوبانەکاندا، من لەو بڕوایەدا نیم، کە بە ڕاستی ئەمە ڕەخنەیەکی جدی بێت. سەرنج بدە، تکایە ڕونی بکەرەوە، کە من مەبەستم ئەوەیە، ئامادەکەرانی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنیش بەهەمان شێوە، لەو جۆرە نەزمو دسپلینانە، بەهرە وەربگرن کە فەرمان ئەکات، بەسەر بڕیارەکانی هاتوچۆکردندا لەجادەو شەقامەکاندا. ئێمە بۆ ئەوەی سەیارە لێ بخوڕین، پێویستمان بەگەواهی نامە هەیە، وانییە؟ وە ئەگەر بەشێوەیەکی خەتەر سەیارە لێ بخوڕین، گەواهینامەکەمان لێ وەرئەگرن، و حەقیانە، وانییە؟ باشە کەواتە وەرن، هەر بەو جۆرەش کەڵك لەتەلەفزیۆن، وەربگرین.

**پرسیار: هەروەها ڕەخنەیەکیشم لەسەر لیبرالیزم هەیە. ئێوە تیۆریسینی (کۆمەڵگای کراوەن)و، داکۆکی ئەکەن لەرۆڵی ئابوری ئازاد، بەڵام کاتێك مەسەلە دێتە سەر باسی تەلەفزیۆن، خوازیاری دانانی هەندێ یاسای تۆکمەن.**

وەڵام: مانای ئەم ڕەخنانە چ دەگەیەنن؟ ئایا بازاڕ، یاسای تایبەت بەخۆی نییە؟ ئەگەر پەخشدارێکی (ناشر) ئیتاڵی، یەکێك لەکتێبەکانم چاپ بکات، ئایا نابێت، حەقی نوسینەکەم بداتێ؟ ئایا ئەم مەسەلەیە، پێچەوانەی کۆمەڵگای کراوەیە؟ لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، ئەگەر بڕیار گەلێك لەئارادا نەبن، ئەوا لەو کاتەدا، بێ بەندو باری حوکم ئەکات، تازە ئەمە هەموو مەسەلەکەش نییە. بازاڕ بۆ ئەوەی بتوانێت کار بکات، نەك هەر پێویستی بە بڕیارگەلێکە، بەڵکو لەهەمان کاتدا، تاڕادەیەکی زۆر، پێویستی بەدڵنیاییو، دامەزراویو، دسپلینو، هاوکاری هەیە. کەواتە من بەڵگەی خۆم لەسەر ئەو بناغەیە ئەهێنمەوە، کە تەلەفزیۆن بەهرەمەندە،



لەدەستەڵاتێکی کاریگەری لەرادەبەدەر، لەسەر مێشکی خەڵکی. دەستەڵاتێك کە هیچ کاتێك لەرابوردودا، پێشینەی نەبوە. ئەگەر سنورێك بۆ ئەم کاریگەریە دانەنێین، بەرەو خوار لێمان ئەخوڕێو دورمان ئەخاتەوەو لەشارستانیەت، و مامۆستایانیش ناتوانن بەری پێبگرن. من ئەم زەنگە خەتەرەم چوار پێنج ساڵ لەمەوبەر لێداوە. بەڵام هیچ کاریگەریەکی نەبوو. چونکە ئەزانم هیچ کەسێك نایەوێت ئەم دەسەڵاتە ترسناکە، رابوەستێنێ.

**بەڵام ڕەنگە بەو جۆرەش نەبێت کە ئەیڵێیت، (سێرکاڵ)، لانی کەم هەموو ڕۆژێك ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی، ئەم پرسیارە ئەخەنە رووکە: ئەگەر "کارڵ پۆپەر" ڕاست بڵێ، چی؟**

Lunita– 25 **ژانویە** 1994

*سەرنج: خوێنەری خۆشەویست. ئەم مەقپەیڤینەی ئەیخوێنیتەوە، وەرگێڕاوی بەشی حەوتەمی، کتێبی (درس این قرن، همراه بادوگفتار درباره آزادی و حکومت دمکراتیک)ە کە (جبانکار لوبوزتی) لەگەڵ (کارل پۆپەردا) ئەنجامی داوە.*

❑

# مێزگردێك لەسەر (كارل پۆپەر)

● و. لە ئینگلیزییەوە: س.ع

**(مردنی كارل پۆپەر** لەپایزی رابوردوودا دەنگدانەوەیەكی زۆری هەبوو لەدەزگاكانی راگەیاندندا. هەموو لەو باوەڕدا بوون كە نووسینەكانی گرنگیەكی زۆریان هەیە، بەڵام كەس خۆی لەقەرەی میراتە فیكریەكەی نەدا. زۆر باسی كاریگەریی پۆپەر لەسەر باڵی ڕاستی نوێ لە بریتانیا كرا. (سێر كەیث جۆزف لافی ئەوەی لێدا كە دانەیەك لەكتێبەكەی پۆپەر كە ناوی "كۆمەڵگای كراوە"یە بەكتێبخانەی 10 داوننگ ستریت سپاردووە).

هەموو ئەم بایەخدانە لەحیسابی پلەوپایەی پۆپەر بوو وەك فەیلەسووفێك. لەبەرنامەیەكی BBC، پۆل جۆنسن رایگەیاند كە (پۆپەر یەكێك بوو لەهۆیەكانی بەرپاكردنی جەنگی سارد لەلایەن رۆژئاواوە، بەڵام بەهیچ جۆرێك باسی ئەوەی نەكرد كە پۆپەر فەیلەسووفێكی زانست بوو، ئەمەش وەكو جۆن نۆتن لەرۆژنامەی ئۆبزێرڤەردا نووسی، وەك ئەوە وابوو كە (یەكێك لاواندنەوەیەك لەسەر پاپا جۆن پۆڵی دووەم بنووسێت، بێ ئەوەی باسی ئەوە بكات كە لایەنگری چ ئاینێك بووە). بیروڕاكانی پۆپەر دەربارەی زانست پەیوەندییان بە بۆچوونە رامیارییەكانیەوە هەیە لەرێگەی چەمكەكانی عەقلانیەتەوە.

لێرەدا، بیروڕای چوار كەس بڵاو دەكەینەوە كە هەریەكە بەشێوەیەك پەیوەندی بە پۆپەرەوە هەبووە لەگەرمەی چالاكیەكانیدا لەساڵانی شەستەكاندا:

(جۆزف ئەگاسی) یارمەتیدەری پۆپەر بوو لە لێكۆڵینەوەكانیداو پاشان بوو بەهاوڕێی لە كۆلیجی (قوتابخانەی ئابووریی لەندەن). ئێستاش پرۆفیسۆری فەلسەفەیە لەزانكۆكانی

تـەل ئـەبيبو يـۆرك تۆرنتـۆ، لـێرەدا لـە لێكدانەوەكانی خۆی دەربارەی مێژووی زانستە فیزیاییەكان لـە سـەرەتای سـەدەی نـۆزدەوە دەدوێت.

(جێری رەیڤنز)، جاران مامۆستای فەلسەفە بوو لەزانكۆی لیدز، ئێستا بەڕێوەبەری مەڵبـەندی شێوەكانی لێكۆڵینەوەیە.

(برنارد بورگوان) یارمەتیدەری پۆپەر بـوو لـە لێكۆڵینەوەدا لە سـاڵانی 1967–1968، ئێستاش بەڕێوەبەری مەڵبـەندی لێكۆڵینـەوەو شیكردنەوە فرۆیدییەكانـە لـەزانكۆی میدلسـێكسو، شیكردنەوەی دەروونی ئەنجام دەدات.

(رۆبن بلاكبرن)یش جاران مامۆستای زانستی رامیاری بوو، ئێستا نووسـەرە لـەگۆڤاری (چـەپی نوێ).

## جۆزف ئەگاسی:

### فێربوون لە نموونە نێگەتیڤەكانەوە

لە 17 ئەیلوولی 1994دا كارڵ پۆپەر لەتەمەنی 92 سـاڵیدا مـرد. پۆپـەر بـە بەرهەڵسـتكاری رەسمیـی بازنـەی ڤییـەنا دادەنرا، كە یانەیـەكی فەلسەفیی نێـوان هـەردوو شـەڕی جیهانی بوو و لایـەنگری رێبازگــەی پۆزیتیڤـیزم (وضعـی Positivism) بـوو كـە لـەو سـەردەمەدا بـاو بـوو. جۆری پـەیوەندی پۆپـەر لەگـەڵ ئـەم یانەیـەدا "دوژمنایەتیـەكی– دۆستانە" بـوو (ئەگـەر ئـەو دەربڕینەی خۆی بەكار بهێنین كـە بۆ پـەیوەندی نێوان لێكۆڵـەرەوە زانستیەكان بـەكاری هێنـا. پۆپەر دوا كەسی ئـەو نەوەیەیە (ئەگـەر كـارڵ هـەمبلی لێدەركـەین كـە هێشتا خـۆی بەگـەنجتر دەزانێـت). ئـەم پەیوندییـە (دوژمنایەتیـە–



دۆستانەیە)ی پۆپـەر لەگـەڵ هاوپیشـەكانی بازنـەی ڤییـەنا، بەداخـەوە، زیـاتر دوژمنانـە بـوو نـەك دۆسـتانە. بـەڵام فەیلەسـووفەكان، بەشێوەیەك، توانیان ئەم حیسابەی نێوانیـان بۆ ماوەیەكی درێژ بەكراوەیی بهێڵنەوە.

بەكۆتایی هاتنی ئەو دەورانە، ئیتر كاتی ئەوە هـاتووە كـە ئـەو حیسـابە دابخرێـت، چونكـە تێكەڵكردنی كاروبـاری كەسـی لەگـەڵ زانسـتدا نادروستە. بەڵام، هێشتا میراتگرە سـەرەكیەكانی بازنـەی ڤییـەنا هـەر بـەدەوری ئـەو مەسـەلانەدا دەخولێنـەوە كـە كـاتی خـۆی پۆپـەر هێنابوونیە روو، چونكـە نـەدەتوانن پشـتگوێی بخـەن و نەدەتوانن بەدروستی لێیان بدوێن. ئەگەر بتوانین پشت بە بەڵگەكانی رابوردوو ببەستین دەبێت ئەم بارە ئێستا بگۆڕدرێت. وانیە؟

پۆپـەر بـەوە ناسـراوە كـە چارەسـەری بـۆ مەسەلەی (استقراء(1) induction) دۆزییەوە بێ ئەوەی نكوڵی لە دروستیی رەخنـە كلاسیكیەكەی (دەیڤد هیوم) دەربارەی بیردۆزەكانی (استقراء) بەگشتی بكات. كێشەكانی (استقراء) بەزۆری بەم شێوەیە دەخرێتـەروو: ئایا دەتوانین پشت بـە رابوردوو ببەستین وەك نیشاندەرێك بـۆ داهـاتوو؟ یـان، ئایـا داهـاتوو وەك رابـوردوو دەبێـت؟ ئـەم شێوە داڕشتنە زۆر بەختەوەر نیە، چونكە هەموو لەو باوەڕەداین كـە رابـوردوو زینـدوو ناكرێتـەوەو منیش جارێكی دیكە گـەنج نابمـەوە. شـێوەی تەقلیدیی خستنەرووی ئەم پرسیارە بەم شێوەیە

بوو. ئایا دەتوانین پشت بە گشتگیرکردنێکی (تعمیم generalzation) تاقیکردنەوەکانمان ببەستین؟ ئەمەیان باشترە، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نییە، چونکە هەموو دەزانین هەندێك تاقیکردنەوەی سەردەمی منداڵیمان بەهیچ جۆرێك پشتیان پێ نابەسترێت. دارشتنێکی باشتری هەمان بیرۆکە بەم شێوەیەیە: ئایا دەتوانین پشت بەگشتیکردنێك ببەستین کە لەسەر زۆر نموونە دامەزرابێت هیچ نموونەیەکیان پێچەوانەی ئەو بیرۆکەیە نەبێت؟ ئەمەیان، بێگومان، باشترە، بەڵام هێشتا مایەی خۆشنوودی نییە، چونکە زۆر گشتیکردن هەن کە هەڵەن، بەڵام ناتوانین بەئاسانی بەڵگەی هەڵوەشاندنەوەی بۆ بدۆزینەوە، بەتایبەتی ئەو گشتیکردنانەی کە لەقاڵب دراون. لەوەش زیاتر، زانست بە بەردەوامی پێشنیازی بیردۆزەگەلێك دەکات، وەك بیردۆزەی ئەتۆم‌و تایبەتمەندیەکانی کە بەهیچ جۆرێك گشتیکردن نین. باشترین رێگە بۆ دەربڕینی کێشەی (استقراء) لەوەدایە کە بگەڕێینەوە بۆ ئەو راستییەی کە دەڵێت: زانست بریتیە لەفێربوون لە تاقیکردنەوەو پەرەپێدانی بیردۆزەکان: چۆن بەڵگەکان یارمەتیمان دەدەن بۆ تێگەیشتن لەجیهان بەگشتی؟ تاچ رادەیەك فێربوونی بیردۆزەیی لەتاقیکردنەوەدا دەشێت؟ چۆن بەڵگە پشتگیری لە بیردۆزە دەکات؟ ئەم دەربڕینە رەخنەکەی هیوم دەربارەی بیردۆزەکانی (استقراء) بێ وەڵام دەهێڵێتەوە، چونکە بەراستی تێبینی ئەوە دەکرێت کە بەهیچ جۆرە دەرئەنجامێك راست نییە لەبەڵگەی تایبەتەوە بچین بۆ بیردۆزەیەکی جیهانی. هیوم هەموو ئەو هەوڵانەی دەدران بۆ دەرئەنجامی وەها پووچەڵ کردبووەوە، بەتایبەتی بیردۆزەکانی ئەنجامگیری شیاو (Probable inference). پۆپەر لەو باوەڕەدا بوو کە فێربوون لەتاقیکردنەوەوە هەمان شت نیە وەك چوون لە ئەنجامگیری لەبەڵگەوە بۆ بیردۆزە: بەواتایەکی دیکە ئەنجامگیری پشتگیریی هیچ بیردۆزەیەك ناکات. بەڵام لای وابوو کە بەڵگە دەشێت‌و دەبێت نەرێی (نفی) بیردۆزەکان بکات. ئەم بەڵگانە جاران بەشێك بوون لە ژێربیری (استدلالی). تازەیی بیرۆکەکان لەوەدا نییە کە پووچەڵکردنی ئەنجامگیرییەکی راستە، بەڵکو لەوەدایە کە ئەم پووچەڵکردنانە زۆر فێرکەرن (instructive) چونکە ئەمە وا لەزانست دەکات کە پێشکەوتوو خوازو وروژێنەربێت‌و کرۆکی فەلسەفەی زانست لای پۆپەر بەم شێوەیە بوو: فێربوون لە ئەزموونەوە بەهۆی نموونە پۆزەتیڤەکانەوە نابێت بەڵکو نموونە نێگەتیڤەکانەوە دەبێت. ئەمە بۆچوونێکە کە ئەستەمە بە (جدی) وەربیگرین، ئەمەش لەو راستییەدا دەردەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆر کەم لەو لایەنگرانەی کە لەسەریان نووسیوە نکولی لەوە دەکەن کە ئەمە پوختەی بۆچوونەکانی بێت، هەرچەند، لەراستیدا، خۆی ئەمەی وتووەو هەرگیز لێی پاشگەز نەبۆتەوە.

دەبێت دان بەوەشدا بنێین کە لەکاتی باسکردنی وردەکاریی بیرۆکەکانیداو لەوەڵامدانەوەی گومان لێکردنی دوو گریمانەی بچووکی دیکەی خستەسەر بۆچوونەکانی، هەندێك لەو گریمانانەی پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە بۆ ماوەیەك (تحمل) دەکرێن‌و زانستیش پێویستی بە چەسپاندنی بیردۆزەکانی هەیە. ئەو گریمانە

بچووکانـــــه ناگەنـــــه رادەی بــــــەرەواژکردنی (reversal) ئەو بۆچوونانەی کە دەڵێن فێربوون لەئەزموونەوە تەنها لەڕێگــەی پووچەڵکردنــەوە دەبێت، هــەر چەند کە هێزی بیردۆزەکان کــەم دەکەنەوە بۆ ئەوەی شایستەترین.

مرۆڤ دەبێت، بەلایەنی کەمــەوە، بەدروستی باس لەگوتارەکانی پۆپەر بکـات، باشتریش وایە بەجیا لەبیردۆزەکانی بکۆڵینەوە، جــارێك لەدەقە وشکەکانیەوەو جــارێکی دیکــەش لــە چــاپی پاشکۆکانیدا.

### سنوردانان: بیردۆزە یان زمان؟

زۆربەی ئەو بۆچوونە شێوێنەرانەی کە باس لەپۆپــەر دەکــەن هــەموو ئــەو مەســەلانەی کــە پاسمــانکردن پشتگوێ دەخــەنوزیاتر بایەخ بــە لێکۆڵینەوەکانی پۆپەر لــەبواری زانستدا دەدەن. پۆپەر کێشەی سنووردانانی بۆ زانست هاوکات لەگەڵ کێشەی (استقراء)دا چارەسەرکردبوو.

بــەڕای پۆپــەر بــیردۆزە تەنــها لــەو کاتــەدا زانســتییە ئەگــەر بەهەڵــەمان دانــاو توانیمــان بــەکردەوە پووچەڵی بکەینــەوە. ئەم بیردۆزەیــە بەرەوشتێکی تایبــەت لەلایــەن هاوپایەکانیــەوە لەبازنــەی ڤییــەنا شێوێندرا، بەتایبــەتی لەلایــەن (ڕۆدڵــف کارنــاب)ەوە: لــەکاتێکدا کــە پۆپـــــەر خەریکی توێژینەوەی سنووردانان بوو بۆ بیردۆزە زانستییەکان، کارناب دەیــوت: ئــەوەی پۆپــەر کردوویــەتی تەنـــها دەستنیشـــانکردنی زمـــانی زانستە.

دوا کەڕەت کە گوێم لە (کارڵ هێمپڵ) بوو، کە مــیراتگری ســەرەکیی بازنەکــە بــوو، هــەمان شـــــێواندنەکانی دووبـــــــارە کـــــــردەوەو ڕاستکردنەوەکانمی قبووڵ نەکرد، دەشــیزانی کــە پۆپــەر بــە بــەردەوامی گلــەیی لــەو شـــێواندنە هەبووە. جیاوازیی نێوان ئـــــەم دووانـــــــە زۆر ئاشکرایە: جــاران نــەرێ کردنــی بیردۆزەیــەکی زانســـتی بـــەکردارێکی



نازانستی دادەنرا، بەڵام زمانی زانسـت دەتوانێـت نـەرێی هــەموو ئــەو دەرخسـتنانەی کەتیایــەتی بکـات، بـەمجۆرە ئــەو دەرخســتنەی کــە نــەرێ کردنـی بـیردۆزەی نیوتـن دەکـات هــەم لــەدیدی پۆپــەرو هــەم لــەدیدی بۆچوونـە تەقلیدیەکانــەوە زانستی نییە، بەڵام هەمان دەرخستن هەمان ئـەو زمانەیە کە بیردۆزەکەی نیوتنـی پــێ وتــراوە. هێمپـڵ بۆچوونــەکانی (کارنـــاب)ی دەربـــارەی بۆچوونـەکانی پۆپــەر پووچـەڵکردەوەو ڕایگـەیاند کـە بۆچوونــەکانی پۆپــەر شـێوێندراون. هیــچ کەسـێك ئــەم جــۆرە بیرکردنەوانــەی ڕاسـت نەکردەوە، پۆپەرو هاوڕێ نزیکەکانی نەبێت.

ئەو بۆچوونانەی کە کارنابو هێمپڵ پێی ڕازی بوون ئەوانە بوون کە (لۆدڤیگ ڤیتنگشتاین)ەوە وەریان گرتبوو. ئـەو شێوە بۆچوونانـەی کە لـە پۆپــەرەوە وەریــان گرتبــوو، بەڕاســتکردنەوەو پێشخستنێکی باشـی پۆپــەریان دادەنــا، بــەڵام پۆپــەر خــۆی، بــەهۆی لــەخۆباییبوونێکی زۆرو بەهۆی تێنەگەیشتنی لـەگرنگیی بەشـداریەکەی ڤیتنگشتاین پێی ڕازی نەبوو. لەبەر ئەوە ناتوانین گرنگیـی بەشـدارییەکانی پۆپـەر بـنرخێنین بــەبێ باسکردنی بەشداریکردنەکانی ڤیتنگشتاین، ئەگەر بەژیربیری لێیان بدوێین لەدوو جیهانی جیاوازدان. لەڕاسـتیدا داننـان بـەگرنگیی بەشـداریکردنەکانی

پۆپەر تەنها لەبەر ئەوە زەحمەتە چونکە جێی هەردووکیان لەم شارە بچووکەدا نابێتەوە. ئەو بۆچوونە سەرەکییانەی ڤیتنگشتاین کە پۆپەر هەوڵێکی زۆریدا بۆ پووچەڵکردنیان ئێستا بەهەڵە دادەنرێن. هەردووکیان حەزیان لەمیتافیزیك نەبوو، بەڵام لەکاتێکدا ڤیتنگشتاین ئەمەی بەلادان لەیاسا بنچینەییەکان دادەنا، پۆپەر زۆر بەتوندی نکوولی لەوە دەکرد. دوا کتێبی ئەلبیرتۆکۆڤا، دەربارەی بازنەی ڤییەنایە بەناونیشانی (بەرەو وێستگەی ڤییەنا). هەرچەند ئەم کتێبە دەربارەی فەلسەفەی زمانەو پەسنێکی زۆری پۆپەر دەکات، بەڵام دوو شت دەخاتە پاڵ پۆپەر، یەکەمیان کە فەلسەفە کارێکی بێ مانایەو دووەمیشیان، زۆر ناڕەوایانە، ئەم قسەیە بەهی پۆپەر دادەنێت، ئەمەش کارێکی بێ سوودە. لەراستیدا بەشداریکردنی پۆپەر لەفەلسەفەی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا لەهەمان ئاستی بەشداریکردنەکانیەتی لەبواری فەلسەفەی زانستداو لەدیدی سیاسیو رۆشنبیرییەوە گرنگتریشە. بەبۆچوونی ئەو دیموکراسییەت ئەو رژێمەیە کە بوار بەخەڵك دەدات ئاشتییانە هەڵەکانیان، وەك هەڵبژاردنی حاکمێکی نەویستراوە، راست بکەنەوە.

ناسراوترین بیرۆکەی پۆپەر ئەوەیە کە دەڵێت بیردۆزەی چارەنووسی مێژووی زانستی نییە. هەرگیز نەیووت ئەوە هەڵەیە، تەنها ئەوەی وت کە ناتوانرێت بەشێوەیەك وا روون لێی بدوێین کە بتوانین بیخەینە تاقیکردنەوەوە، چونکە بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ راستییە زانراوەکاندا، دەبێت بەئاڵۆزی بمێنێتەوە، چونکە لەبنچینەدا زانستی داهاتوو دەبێت چاوەڕوان نەکراو بێت.

(ئەگینا دەبێتە زانستی سەردەم). کاریگەریی زانست لەسەر کۆمەڵگا ئێجگار زۆرە، ئەگەر بەشێوەیەکی هەمەلایەنە سەیری باوەڕەکان بکەین، دەتوانین باوەڕێك دابنێین دەربارەی حەتمیەتی مێژوویی کە تاقی بکرێتەوە، پاشان بەئاسانی لەهەمان دیدەوە دەتوانین بەئاسانی پووچەڵی بکەینەوە. بۆ نموونە کارڵ مارکس وای پێشبینی کرد کە سەرمایە لەچڕبوونەوەیەکی بەردەوامدایە، ئەمەش وادەکات کە شۆڕشی سۆشیالستی ئاسان بێت کەس نەتوانێت خۆی لێ لادات، ئەم پێش بینیە لەسەر ئەو بینینە دامەزرابوو کە کارگە پیشەسازییەکان هەمیشە لەپەرەسەندندان بەهۆی ئابووریی رەسیدەوە. بەڵام کاتێك کە داینەمۆ دروستکرا ئەم بۆچوونە، بەڕای پۆپەر، سەرەوژێر کرایەوە. بەمجۆرە مرۆڤ بۆی هەیە بیردۆزەکەی مارکس بەبیردۆزەیەکی گشتی یان تایبەتی دابنێت، ئەگەر بەیەکەمی دابنێت، ئەوا دەیکاتە بیردۆزەیەکی میتافیزیکی، ئەگەر بە دووەمی دابنێت، ئەوا بەتاقیکردنەوە پووچەڵ دەکرێتەوە بەمجۆرە، دەتوانین بیردۆزەکانی مارکس یان بە زانستی دابنێین، کە بە تاقیکردنەوە پووچەڵ دەکرێنەوە، یاخود بەنازانستی، هەروەها، پۆپەر دەڵێت، تاقیکردنەوە گەواهی بۆنادات مەگەر بەشێوەیەکی وا دابڕێژرێت کە تەنها (ئەگەر راست بوو) بسەلمێنرێت، بەڵام (ئەگەر هەڵەبوو) پووچەڵ نەکرێت، کەواتە زانستی نین، هەرچەند سەلماندنەکانی رواڵەتێکی زانستیان دەداتێ. لایەنگرانی مارکس یان پۆپەر پشتگوێ دەخەن، یان بۆچوونەکانی بە نادروست دادەنێن.

(ئێرنست گیلنەر) ئەوەی تێبینی کرد کەئەوانەی پۆپەر پشتگوێ دەخەن، لەهەمان کاتدا دان بەوەدا دەنێن کە مارکسیزم ئەزموونگەی نییەو بەمجۆرە لەپایەی مارکسیزم کەم دەکەنەوەو ئێستاش بەشێوەیەکی نائەقڵانی پشتگیری لێدەکەن.

ئێمە دەتوانین لەسەر هەموو ئەو بابەتانەی کە باسمان کرد زیاتر بدوێین، پۆپەرو لایەنگرەکانی زۆریان لەسەر ئەم بیرۆکانە نووسیوەو دەتوانن زیاتریشی بخەنە سەر. بەهەر حاڵ، لەم لێکۆڵینەوەیەدا زۆر بابەت فەرامۆش کران، بۆچوونەکانی پۆپەر رەخنە هەڵدەگرن و هەندێك لەچاکترین لایەنگرەکانی رەخنەیان لێگرتوون. بەڵام ئەم خاڵەی لێرەدا باس کرا پەیوەندیی بە راستیی مێژووییەوە هەیە نەك راستیی فەلسەفی. ئەوانەی بەم وەسفە مێژووییە رازی نین، خزمەتێکی زۆری خەڵك دەکەن ئەگەر بڵێن: بۆ؟ ئەوانەی کە رازین بارەزامەندییەکەیان بشارنەوە بۆ ئەوەی زەمینە خۆش بکەن بۆ بەردەوامبوونی ئەم گفتوگۆیە بەشێوەیەکی سودبەخش.

## جێری رەیڤتز:

## دواکەسی باوەڕدارە مەزنەکان

گرنگیی کارڵ پۆپەر لەبواری کەڵچەری باوی رۆشنبیریدا زیاتر دەردەکەوێت وەك لە فەلسەفەی ئەکادیمی، وەك لێکۆڵەرێك، بەو هەموو حەماسەتو سادەییەی کە ئەو پلەو پایەیە لێی داوای دەکرد، زیاتر لە لێکۆڵەرێکی ئارەزوومەند (هاوی) دەچوو، کەمو کورپی کارەکانی لای هاورێکانی زۆر ئاشکرابوون.



ناتوانین بڵێین کە لەهیچ بوارێکدا قوتابخانەیەکی بەهێزی دروست نەکردووە. جگە لەچەند شاگردێکی کەمو چەند کەسێکی کاریگەر کە هێنابوونیە سەر باوەڕی خۆی و ئەو خەڵکە زۆرەی کە گوێیان لە بیروڕاکانی دەگرت، بێجگە لەمانە، پۆپەر لەهەموو پرۆفیسۆرە تەقلیدیەکان زیاتر پەیوەندی هەبوو بەو مەسەلە گرنگانەی زانستەوە کە خۆی تێ هەڵدەقورتاندن.

لە پیشەکەیدا لەوە سوودی وەرگرت کەزوو دەستی پێکردو زۆر ژیا، بیرۆکە سەرەکییەکانی هەر کە قوتابی بوو لەساڵانی شەڕی جیهانیی یەکەمدا دارێژران. ساڵانێکی زۆر چاوەڕوانی دانپێدانان بوو، کاتێکیش، کە لەپاش شەڕی جیهانیی دووەم، ئەم دانپێدانانە هات دڵخۆشکەر بوو. بێجگە لەو، هیچ فەیلەسووفێکی زانست نەکرا بەئەندام لە (کۆمەڵەی شاهانە). لێکۆڵینەوەی سەرجەم کارەکانی، کەسایەتیەکی ناکۆکمان بۆ دەردەخات: کە پابەندبوونێکی توندی هەبوو بە رەخنەگرتنێکی بێبەزەییانە لەخەڵکو لەخۆ، بەڵام بەزۆری ئاراستەی دەرەوەی دەوروبەری خۆی دەکرا. بەمجۆرە، رەخنەی توندی لەمارکسیزم دەگرت چونکە بەهەڵە نەدەخرایەوە (unfalsifiable) کەچی هەمان وردبینی لەگەڵ بیرۆکەی هاوکێشبوونی گشتی General Equilibrium بەکار نەدەهێنا.

من لەژمارە 37ی گۆڤاری Radical philosophy دا لەهاوینی 1984 "دانپیانانەکانی"

پۆپەرم شی کردەوەو پیشانمدا کە چۆن پۆپەر بەرەو ئەوە دەچێت کە لەوە تێبگات کە بۆچوونی پۆزیتیڤیزم (الوضعية Positivism) بۆ زانست دان بەهەمان تاوانەکانی دژە- زانستو دژە ئەقلانییەتدا دەنێتو چۆن ئەو وێنە فەنتازییەی ئەنیشتاینی بۆ ئەوەی سیمبولێك دروست بکات بۆ پیشاندانی یەکپارچەیی زانست هەڵوەشاندەوە، هەروەها، بێگومان، بەهیچ جۆرێك روون نەبوو ئایا هەوڵدان بۆ پووچەڵکردنەوە مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە زانستەوە هەیە یان مەسەلەیەکە دەبێت بەکردەوە ئەنجام بدرێت، یاخود تەنها پاڵنەرێکە، هەروەها روون نەبوو ئایا پووچەڵکردنەوە سیفەتی هەموو زانستێکە، یاخود تەنها باشترینی (the best).

هەندێك بیروڕای کاریگەر دژ بە دەروونزانی (ایحاء) دەربارەی زانست پێشکەش کرا لەلایەن ئەوانەی وایان دادەنا کە بیروبۆچوونەکانی پۆپەر باس لەو شتانە دەکات کە زانا ئاساییەکان ئەنجامی دەدەن.

ئەگەر پۆپەر کتێبە گەورەکەی کە ناونیشانی (کۆمەڵگای کراوە)یە دوابخستایە، ئەوا هەتا هەتایە وەك فەیلەسووفێکی نەناسراوی زانستی ئەوروپای ناوەڕاست دەمایەوە وەك ئاوارەیەکی ئەوسەری دنیا تێکەڵ بە فەیلەسوفەکانی بازنەی ڤییەنا دەکرا، کە زۆر رەخنەی لێدەگرتنو راستی دەکردنەوە. بەڵام، بێئەوەی گوناهەکانی نووسەرێکی ئارەزوومەندی مێژوو، کە وەك نێچیر بەدووی وەرگرتنی قسەکاندا دەگەڕێن بۆ پشتگیری لەگفتو گۆیە ئامادەکراوەکانیان، دووبارە بکەینەوە، دەتوانین بڵێین کە نووسینەکانی پۆپەر کاریگەر بوون، چونکە وەڵامێکی چەسپاوی دانا بۆ پرسیاری: (بەراستی، مارکسیزم چیی هەڵەیە؟)

بێگومان، رێبازی زۆر دژ بەیەك هەبوون، بەڵام مارکسیزم، سەرەڕای گەندەڵیی بەرچاوی لەکاتی دەسەڵاتی ستالیندا بایەخی بۆ گێڕدرایەوە. خەباتی هەمەلایەنە دژی نازییەکان دوژمنایەتی مارکسیزمی مایە پووچ کرد بەهۆی مەیلی پێشوویان بۆ هاندانی هیتلەر. بەڵام، لەکۆتایی چلەکاندا ستالین رووی ستەمکارانەی خۆی بەتەواوی هەڵماڵیو ئەو رۆشنبیرانەی هەوڵی هاوکارییان لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا دەدا، بەشکستەوە پاشەکشەیان کردو ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو، بێهەست بە نەنگی کردن باس لە فەلسەفەیەك دژ بە گەلەیی collectivist بکرێتو ئەو پێشینە بەناوەی دوژمنە فەلسەفیەکانی سوودی هەبوو بۆی. پۆپەر بوو بەڕابەری رۆشنبیرە سیاسییە میانڕەوەکانی بەریتانیاو پەیامەکانی دژی بە بیرکردنەوەی دۆگمایی دەنگدانەوەیەکی بەرفراوانی هەبوو بۆ چەند نەوەیەکی دواتریش.

پۆپەر فەلسەفە رامیاریەکەی بە بەشدارییەك دادەنا لەتێکۆشانا دژ بە فاشیزم، حەزی هەمیشەیی لە فەلسەفەی زانست بوو، بەڵام، لەم بوارەدا، هەرچەند لەسەر ئاستێکی بەرز دانی پێدانرا، زۆر جێی رەزامەندی نەبوو، چەند ساڵێکی پێویست بوو بۆ ئەوەی چەند قوتابیەکی بەهرەمەند لەکۆلیجی (قوتابخانەی ئابووریی لەندەن) بۆ لای خۆی رابکێشێت، بەڵام ئەوەندە توندباوەڕ بوون کە ئیتر ژیان لەناو گرووپەکەی پۆپەردا بەدەگمەن هێمنیی تێدا دەبینرا،

جیابوونـەوەو پەیمانشـكێنی لــەو ڕۆژانــەدا (لەپـەنجاكاندا) بـاو بـوونو هێشـتا پەیامـە مەنهەجیەكانی بە تەواوەتی جێگیر نـەبوون، كـە ڕووبەڕووبوونەوەیـەكی تـازە لەلایـەن (تۆمـاس كون)وە دەستی پێكرد.

## ڕووبەڕووبوونەوەی كون Kuhn

لەگـەڵ ئـازادبوونی بوونـی (كـون Kuhn) لـەوەهمی دیـدی مەعریفـەو دۆگمـای ئاسـاییو شۆڕشـە نـا ژیرییرییـەكان، تـەلاری گریمانـەكانی ڕۆشـنكردنەوە دەربـارەی زانسـت ڕووخـا. كاردانـەوەی خـودی پۆپـەر زۆر لاواز بـوو. لەپێداچوونـەوەی ئـەنجامی ڕووبەڕووبوونـە بەناوبانگەكەی ساڵی 1965 یان، پۆپـەر خاڵێكی باشی خستەڕوو. ئـەویش ئەوەیە كـە زانسـتی ئاسایی، دوژمنـی زانسـتو شارستانیەتە، بـەلام پاشـان بـەردەوام بـوو لـە هێرشـكردن دژی فێركردنی دۆگمایی لە زانستدا، بەپشت بەستن بە بەڵگەیەك كە هاوڕێیـەكی سی سـاڵ لـەوەپێش وتبووی، ئەمەش وایدەردەخست، كە پێش ئـەو ڕووبەڕووبوونەوەیە هیچ بیری لـەوە نەكردبێتـەوە كە لێكۆڵـەرە ئاسـاییەكانو مامۆسـتایانی زانسـت چی دەكەن، نە لەبواری ئـابووریداو نـە لـەبواری زانستە سروشتیەكاندا.

ئــەم پێداچوونەوانـــەش لەوانـــەبوو ئـــەو پێشبینیانەی تەڵخ بكەن، كە هەرچەند پەشـۆكاو بوون بەلام هەمیشە بەهێز بوون.

دەتوانین پۆپـەر بـەدوا فەیلەسووف بژمـێرین كــە بــاوەڕی بــەهێز بـــوو بەزانســـت وەك بەرجەستەكەری ڕەوشت باشی. دیـدە فەلسـەفیە مەزنەكەی كە بریتی بوو لە بەدرۆخستنەوە لەبری سـەلماندن هـەوڵێكی قارەمانانـە بـوو بـۆ وازهێنان لەزانستی ڕاست بۆ ئـەوەی زانسـتی بـاش ڕزگار بكات. هـەموو ئـەو هەوڵانـەی كـە دەیدا بـۆ پێشـاندانی ئەنشـتاین



وەك قارەمانی حیكایەتێك ئـەوە دەردەخـەن كـە پۆپـەر مرۆڤێكـی ئاكـاری (اخلاقـی) بـوو نـەك ئـەنجامدەری ئەپسـتمۆلۆجی، خۆیشـی هیـچ هەوڵێكی نەدا بۆ بەرپەرچدانەوەی هیچ حاڵەتێكی زانستی. دەتـووت لـەو باوەڕەدایـە كـە زانسـت دەبێت واز لەكەرامـەتی خـۆی بهێنێتو ملكـەچی بەزین بێت، بۆ ئەوەی ڕزگار بكرێتو ڕاستییەكەی بسەلمێنرێت.

گرنگیـی پۆپـەر لەوەدایـە كـە بەدواكەسـی باوەڕداری زانست دەژمێردرێت. پاش شەستەكان پۆپـەر هیـچ بڵاوكراوەیـەكی گرنگـی نـەبوو نـە لەبواری ئەپستمۆلۆجیو نـە لـە بـواری مەنهـەجی زانستیدا، پـاش ئـەو كێشـە فیكرییـەكانی خستە ئەسـتۆی خـۆی، بەئاڵۆزیـەكی زیـاتر، بـەلام بەكاریگەرییەكی كەمترەوە. خـەریكبوو خـۆی لـە بەرەنگاربوونەكـەی لەگـەڵ (كـون Kuhn) دا لابـدات، بـەلام بەرگـەی ململانێكـەی (فێربـان Feyerband)ی نـەگرت. پـاش ئـەوەش یەكسـەر لافــاوی هەڵوەشــاندنەوە (بونیادشـــكێنی deconstructionism) هـاتو پۆپـەر، لـەكاتی مردنیدا وەكو كارناپ Carnap بوو بە مێژوویەكی كۆن.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، پـاش ئـەوەی ئـەو حەسانەوەیەی پێ بەخشرا، پۆپـەر شتێكی هـەر

پێ هەیە کە فێرمان بکات. لێکۆڵینەوە سۆسیۆ- فەلسەفییەکانی ئێستای زانست لەسەر لێواری (هیچ گەرایی- عدمية nihilism) بەلادا دێتو وای لێ هاتووە پیاو خراپانو پیاوچاکان وەك یەك بتوانن چەمکی بێ ناوەڕۆکی زانست بەکاربهێنن. وەکو هەر گەڕانێکی فەلسەفی (quesat) دیکە، گەڕان بە دووی ماکی مەعریفەی راستی کارێکی بێ کۆتاییە. وە بیرهێناوە جوانەکانی پۆپەر کە زانست چالاکییەکی ئاکاری (اخلاقی)یە (دەبێت هەر واش بێت). بەشدارییەکی جێگیرە لە پرۆسەی تێگەیشتنماندا.

### برنارد بورگوان:

### پرسیارو وەڵام

ئەوانەی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی زانستین چۆن ئاشنای کارەکەیان دەبن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە بەریتانیا بەهۆی فەلسەفە ساکارو بێ ئاگاکەی کارڵ پۆپەرەوە ئەوە بوو کە لە رێگەی ژیربیری (استقراء)و تەنکیکی (استقراء)ەوە دەبێت. یەکەم گۆڕانکاریی مەزن کە بەهۆی وەرگێڕانی نووسینەکانی پۆپەرەوە لەساڵی 1930و کاریگەریی بەردەوامی نووسینەکانی بە ئینگلیزی لەوەدا بوو کە ئەم چارەسەرکردنە گوماناوییەی کە لاوازو دەستوورەکانی چەواشەکەر بوو لە راڤەکردنی زانستدا بەرەبەرە بێ هێز کراو پاشان وەك لێکۆڵینەوەیەك بۆ زانستی داهێنەر، پشت گوێ خرا. لەبری ئەوە پۆپەر ئەم چارەسەرییەی دانا: بواری زانست لەسەر ژیربیری پرسیارو وەڵام بونیاد دەنرێتو ئاراستە دەکرێت کە بە ژیربیری (استدلال(2)deductive- یان بەدایەلەکتیکی سوکرات ناسراوەو لەگەڵ لێکۆڵینەوەی چارەکردنی کێشەکاندا گونجاوە کە لەرێی گریمانەو مەزەنەو ئەنجامەکانیانەوە تێ دەگەین، ئەمە بنچینەیترین رێکخستنەوەی مەنهەجی زانست بوو کە لەم چەرخەدا پێشکەش کرا. ئەگاسی هەمان ئەو پرسیارەی ئێمەی دارشتەوە کە دەربارەی نووسینەوەکانی پۆپەر لەپەنجاکاندا کردبوومان. لەم دارشتنە تازەیەدا کێشەی پەیوەندیی نێوان فەلسەفەو دیالەکتیکی زانستی هێنایە روو. ئایا دیالەکتیکی پرسیارو وەڵام لەزانستدا رێبازی خۆی دەستنیشان دەکات، یان شتێکی دەرەکی ئاراستە دەکرێت، بەگریمانەی فەلسەفی، بۆ نموونە؟ پۆپەر، وەك فرۆید، لای وابوو کە زانست پێویستی بەهیچ جیهانبینییەکی فەلسەفی دەرەکی نییە. بەلام لەکاتێکدا پۆپەر رەگو ریشەی کێشە فەلسەفییەکانی لەزانستدا دەبینی- ئەگاسی دیدێکی پێچەوانەی هەڵبژارد، ئەویش ئەوەبوو کە ئەو ئاراستەکردنە لەلایەن میتافیزیکی دەوروبەر circumjacentەوە پێشکەش بکرێت. ئەمەش پاڵی بە (ئەگاسی)یەوە نا کە بەرنامەکەی ناوبنێت: (بەرنامەی لێکۆڵینەوەی میتافیزیکی)و هەوڵی دا کە ئەم بەرنامەیە لەمێژووی نوێدا بەکاریگەر دابنرێت. لاکاتۆس Lakatos، بەپێشکەشکردنی زاراوەی "بەرنامەی لێکۆڵینەوە" جێگۆڕکێی پێشینەیی priority لەبواری فراوانکراوی زانستدا کرد بێ گوێدان بەسروشتی ئەو بابەتانەی کە تێکەڵکێشی دەکرێن. کێشەکان بەو پرسیارانە دەخرێنەڕوو کە لەلایەن هەڵوێستە- کێشەکانی -problen

situatiom ژێربێرییەوە پێشکەش دەکرێن. پۆپەر هەرگیز پێشنیاری ئەوەی نەکرد کە ماتماتیك بەهۆی پرۆسەی رەخنەی مەزەنە (حدس)ەوە کاردەکات، بەڵام لاکاتۆس ئەو پێشنیازەی کرد، فرمانی سەلماندن، لای لاکاتۆس، ئەوەیە کە بیرۆکەیەکی باشتر بداتێ بۆ سەلماندنی هەڵەی ئەو شتانەی کە سەلمێندراون. نووسینەکانی لاکاتۆس ئاراستەی پرسیارکردن دەربارەی ناوەکیی INTERNAL سەلماندن دەگۆرێت، بەهەمان شێوەی کە نووسینەکانی ئەگاسی لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی پایەی ئاکاریی پرسیارکردن دارشتەوە. قوتابخانەی پۆپەر – ئاگاسی – لاکاتۆس گرنگیەکی زۆری هەیە لەململانێی نێوان قوتابخانەکاندا. تیمەکەی پۆپەر، پێشینەکانیان بریتیبوون لە (سوکرات، جوویەر، پاپۆس، پروکلاسو پۆلیاس)، پۆپەریش سۆسیۆلۆجیای نوێی لە پشتەوە بوو. پۆپەر پشتی بەمیراتێکی دەوڵەمەند بەستبوو، ئەمەش لە نووسینەکانیدا دەردەکەوێت، لەبەر ئەوە ئەم پرسیارانە زۆر بێبایەخن. لام وایە رەخنەکانم لەسەر بۆچوونەکانی ئەگاسی ئێستا روونن، کاتێك کەدەڵێت: ئەگەر بەشداریەکانی پۆپەر لە فەلسەفەدا بەراورد بکەین بەشدارییەکانی لەبواری فەلسەفەی زانستدا، یەکەمیان پرپایەخترن نەك لەلایەنی (رامیارییەوە) بەڵکو لەلایەن (رۆشنبیری)یشەوە.. کاتێك وا دەڵێت لەراستیدا نووسینێکی پلەدوو تێکەڵ دەکات لەگەڵ پێشینەیەك کە رەگەزی فەلسەفی زۆر گرنگی پێشکەش کردو چەسپاند لەبواری فەلسەفەی زانستیدا. لاکاتۆس دوو دوواندنی هەیە لەبارەی



فەلسەفەی بیرکاریو فەلسەفەی زانست– دووەمیان زۆر لاوازە ئەگەر چەند زاراوەیەکی ئیلهام بەخشی لێ دەرکەیت کە لە بیرکارییەوە وەریگرتوون.

بەهەمان شێوە، پۆپەریش دوو دوواندنی هەیە_ دووەمیان، کە لێدوانە لەسەر مارکسو فرۆیدو زانستی کۆمەڵایەتی بەگشتی، ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو لێدوانەی کە دەربارەی فارادەیو ماکسوێلو ئانیشتاینو لەسەر گواستنەوە سەرەکیەکانی رێباز گۆرینەکانی بواری زانستی نوێ، هەژارییەکی ترسناکی پێوە دیارە.

زانستە سروشتیەکان، ئەگەر بەزانستی بیرکاری بەراورد بکرێت، لەحاڵەتێکی زۆر غەمناکدایەو داماوتر دەبێت ئەگەر فەلسەفەی پۆپەر پشتگوێ بخات، مەبەستم نووسینەکانێتی دەربارەی فەلسەفەی سروشتی بیردۆزەی کۆمەڵایەتی. بواری لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵایەتی، زەرەری ئەوەیان کردووە کە سوودیان لە تەکنیکەکانی پۆپەر بۆ ئەنجامدانی زانست، پەیرەوی نەکردووە.

من هیچم نییە بیڵێم دەربارەی مارکسو فرۆید، بەڵام هێشتا زۆرم پێماوە کە بیانڵێم– رێبازی پۆپەر لەچارەکردنی کێشەکانو دۆزینەوەی رێگەیەك زۆر جیاواز نییە لەشیکردنەوەی دەروونی.

## گواستنەوەی سوکراتی: Socratic Transference

بەرنامەی سوکراتی ئەوە بوو کە بارودۆخێکی وا دابمەزرێت کە تیایدا یەکێك لەلایەنان پەیوەندیی خۆی لەگەڵ بۆچوونەکانیدا خاوتر بکاتەوە- لەحاڵەتی شیکردنەوەی دەروونیدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ بیروڕا سێکسیەکانو خەیاڵە (فەنتازیا) سێکسیەکانیدا خاو بکاتەوە، لەم رووەوە، بەلایەنی کەم، لایەنێکی تەکنیکی شیکردنەوە کێشەو پرۆسەکانی دواندنی سوکرات کورتکراوە دەکات. بەڵام، لەشیکردنەوەی دەروونیدا تۆزێك سوکرات تێدەپەڕێنێ: هەندێك کێشە کە ناتوانین هێرشیان بۆبەرین چونکە گریمانەنو لەقوڵایی نەستدا شاراوەنو لەرێگەی کردارە پێشنیاز کراوەکانی یادکردنەوەی ئازاد نەبێت نایانگەینێ، هەندێك بواری پەخش بووی پەیوەندیی درۆو رواڵەتی دروستکراوی خەیاڵی بۆشاییەکانی نێوانیان لەنەستدا پڕ دەکەنەوە، ئەم کێشەیە کەم نییە لە ئەپستمۆلۆجیداو لێکۆڵینەوەی ئەم کێشەیەش وای لەمەیدانەکانی شیکردنەوەی دەروونی کردووە لەئێستا بایەخ بە بونیادەکان،و بونیادگەری بدات.

گواستنەوە بریتییە لەکرداری دۆزینەوەی رێگەیەك -لەچارەسەکردنی گومانەکان[3] aporias، لە دەستپێکردنی داڕشتنی ڕێژەیەك بۆ ئەو کێشانەی کەوانەکەین پێیان ناگەین. خۆشەویستی، بەپێی میثیولوجیاکانی ئەفلاتوون لەمێزگردەکەیدا، پێکهاتەی یەکگرتنی هەژاریی لەگەڵ poros دا ئەمەش دۆزینەوەی رێگە بوو بەناو ئەشکەنجەیەکی دەروونیدا. خۆشەویستی، لەم گواستنەوەیەدا بووە چالاکییەکی کێشە چارەسەرکەر.

لاکان (Lacan) بەردەوام کێشە بیردۆزییەکانی لەسەر زنجیرەیەك کێشەو گومان (aporia) دادەمەزراند، تەکنیکەکانی شیکردنەوەی دەروونیش هەوڵێکە بۆ یەکالاکردنەوەی گومان.

فرۆید لای وابوو کە شیکردنەوەی دەروونی پێویستی بەهیچ جۆرە ئاراستکردنێك نییە- نە لەبواری پێشخستنی بیردۆزەو نە لەبواری ئەنجامدانیدا کە لەدەرەوەی بواری شیکردنەوەی دەروونییەوە بۆی هاتبێت، فرۆید نکوڵی لەهەر پشت -بەیەك- بەستنێك دەرکرد کە هەبێت لەنێوان فەلسەفەو شیکردنەوەی دەروونیدا- نە لەلایەنی ئاکارییەوەو نە لەهیچ لایەنێکی دیکەوە. لەبەر ئەوە فرۆید داوای ئەوەی دەکرد کە شیکردنەوەی دەروونی تەنها پشت بەلێکۆڵینەوەی ناوەکیی زانستی سروشتی دەبەستێت، من لێرەدا زاراوەی (Waltanschauung)ی فرۆیدو (پوتمان Puttmom) بگۆڕمەوە بەزاراوەی (بەرنامەی لێکۆڵینەوەی)ی ئاگاسیو لاکاتۆسو لەم دەقەشدا ئەمە وەرگێڕانێکی خراپ نییە. دەربارەی ئاکاریش (ئەگاسی) هەمان هەڵوێستی (پوتمان)ی هەیە، ئەویش دۆزینەوەی رابەرێك بۆ زانست لەدەرەوەیدا.

فرۆید لای وابوو کە ئەو زانستە دەروونییەی کێشەکانی دەروونیی هەڵبژاردووە زانستێکە کە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتیی بەسەردا دێت.

لایەنێکی ئەم گواستنەوەیە لەو جووڵەیەدایە لە (نێوان زەینی intersubjectivenes)ی (من ا)

و ئەوی دیکەوەیە (The other) بۆ دیالەکتیکی فرۆید دەربارەی (خۆ ego) و (ئەو Id).

روبرن بلاکبرن:

## پۆپەرو چەپی نوێ

بێ ئەوەی هیچ ئاگایەکی لێ بێت، پۆپەر کاریگەرییەکی پێکهێنەرانەی هەبوو لەسەر چەپی نوێ لە بەریتانیاداو لەدەرکەوتنی ئەنگلۆ- مارکسیزم. کارەکانی پۆپەر بەباشی دابەش دەکرێن بەدوو جۆرەوە: لەلایەك هێرشکردنێکی توندوتیژی دژ بە (مێژووگەرایی[4] historicism) و لەلایەکی دیکەشەوە لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی فەلسەفەی زانستەوە چۆن دەتوانین بڵێین کە پۆپەر کاریگەریی هەبووە لەسەر بەشێکی چەپ یان تەنانەت ئەو رێبازانەی کە بەرهەڵستیشیان دەکرد لەکاتێکدا کە دوژمنایەتیی مارکسیزم تاکە بزوێنەری ژیانی بووە! تاکە هۆیەك کەوا دەکات ئەمە بشێت، ئەوەیە کە پۆپەر رەخنەکانی ئاراستەی حەتمیەتو پۆزیتیڤیزم (وضعیة Positvist) ی مارکسیزمی ئینتەرناسیونالی دووەم دەکرد. لە پەنجاکانو شەستەکاندا باوەڕکردن بەحەتمیەتی مێژوویی یەکێك لە سیفەتەکانی مارکسیزم بوو. ئێمە کە لە کۆلیجی قوتابخانەی ئابووری لەندەن فەلسەفەو زانستی کۆمەڵایەتیمان دەخوێند زۆر هۆگری مارکسیزم بووین، بەڵام بەهیچ جۆرێك پەژارەیی باوەڕ- بە چارەنووس راینەدەکێشاین.

کەم کەس هەیە لە شۆڕشگێڕەکانی شەستەکان کە گەیشتبێتە زانکۆو کتێبی (کۆمەڵگای کراوەو دوژمنەکانی) یان (هەژاری مێژووگەرایی) نەخوێندبێتەوە. بۆمان دەردەکەوت کە زانیاریەکانی هیگل دەکەوتنە بەر لێپرسینەوەیەکی توندو بۆچوونی زۆر لایەنگرانەی فەلسەفەی مێژوو تووشی نەنگی



دەبوون. بەڵام هێشتا گفتوگۆیە سەرەکیەکانی دژ بە شیکردنەوەی چارەنوسی مێژوویی هەر جێی پەسەندکردن بوون، هەرچەند ئەگەر ئەم کارە بنەڕەتیانەی دەربارەی فەلسەفەی زانست نەنووسیبایە، ئەم کاریگەریەی تەنانەت لەژێر تخوبی ئاگایشدا پشتگوێ دەخرا.

نووسینەکانی پۆپەر دەربارەی ئەگەری بەدرۆخستنەوە Falsifiability ئێستا ستایش دەکرێت چونکە گرنگییەکی زۆری هەبوو لەتاقیکردنەوەکانی ئەزموونگەریی emperical test، بەڵام لە کەشوهەوای دنیای ئینگلیزی زمانی ساڵانی پەنجاکانو شەستەکاندا کە ئەزموونگەریی empericism زاڵ بوو، لێکۆڵینەوەکانی پۆپەر وا دەبینران کە لە هەوڵی سەرنج راکێشاندایە بۆ دامەزراندنی بیردۆزەیەك، کە بە باوەڕی زۆر ساویلکانە نیکۆڵ کرابوو، کە لای وابوو تەنها بە پشت بەستن بەکۆکردنەوەی راستیەکان (data)، ئیتر بیردۆزە، وەك هەڵمی ئاوی کتری، بەرزدەبێتەوە.

ئەم بۆچوونە بەتەوژمەی پۆپەر دژ بە ئەزموونگەریی بەئاشکرایی لەنووسینی لایەنگرەکانیدا دیارە، لەسەرووی هەموویانەوە (پۆل فێیەربان Paul Feyerbend)، نووسینە زیرەکو بتشکێنەکانی ئەم، بێگومان، پۆپەریش

تێپەڕ دەکەن، بەڵام هێشتا قەرزارباری نووسینە کێشە ئامێزەکانی پۆپەرەو زۆریشی بەدەستەوەیە گفتوگۆی لەسەر بکات لەگەڵ (ئێمری لاکاتۆس Imre Lacatos)، قوتابیەکی دیکەی لادەر لە ڕێبازی پۆپەر.

لەکاتێکدا پەنای دەبردە بەر پلەو پایەی زانست بۆ کەمکردنەوەی پایەی شێوەکانی دیکەی بیرکردنەوە، وەك مارکسیزم و شیکردنەوەی دەروونی، فێیەریان زەمینەی خۆش دەکرد بۆ گومان کردن لە بیرکردنەوەی زانستی کە مۆرکی چەپی نوێ بوو. کەواتە، لەکاتێکدا کە هیچ هۆیەك نییە بۆ شاردنەوەی پارێزگارییەتی (conseratism) پۆپەر، ئەو ڕاستییە دەمێنێتەوە کە هەندێك خاڵ هەبوون کە ئەنگلۆمارکسیەکان بایەخیان پێ دەدا. هەڵبژاردنی ناوی (هەژاریی مێژووگەرایی) ڕەنگدانەوەی کتێبی (هەژاریی فەلسەفە) ی مارکس بوو. کاتێکیش (ئێدوارد تۆمسن Edward Thomson) ناونیشانی (هەژاریی بیردۆزە)ی هەڵبژارد بۆ وەڵامدانەوەی (ئاڵتۆسێر Althusser)، دیسان ناونیشانەکەی لە مارکسەوە بوو. بەڵام ئەگەر بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەمان بەتەواوەی لەبیر مابێت دەنگدانەوەی بۆچوونەکانی پۆپەر بەخراپ دانانێین.

## پەراوێزەکان:

1- (استقراء induction) گەیشتن بەئەنجام لە تایبەتەوە بۆ گشت، دارشتنی یاسای گشتی لە ڕێگەی چاودێریکردنی حاڵەتی تایبەتەوە. (ژیربیری)

2-(استدلال deduction) گەیشتن بە ئەنجام لە گشتەوە بۆ تایبەت. (ژیربیریی).

3-گومان aporia: لە ژیربیریدا، ڕێگەیەکە کە تیایدا مرۆڤ وا خۆی دەردەخات کە نازانێت چی بکات یان بڵێت.

4-مێژووگەرایی historicism: باوەڕ بەوەی کە مێژوو بڕیار لەسەر هەموو ڕاستیە کۆمەڵایەتیو کولتوورییەکان دەدات، کە پێوانەکانی نەوەیەك بۆ نەوەیەکی دیکە ناشێتو کە هەر ماوەیەکی مێژوویی دەبێت سەربەخۆ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

## سەرچاوە:

گۆڤاری رادیکال فیلۆسۆفی Radical philosophy

ژمارە: 70 شوباتو ئازاری 1995



# ویستگەکانی سەردەم

- مەڕە ڕەشەکەی لاپلاند
- کۆچی دوایی ئەکیرۆ کۆرۆساوا
- خۆزێ ساراماگۆ لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی خەڵاتی نۆبڵدا
- هونەر لەسەردەمی ستالین دا
- تورکێک هەموو دنیا دێنێ






# مەڕە ڕەشەکەی لاپلاند(1)

## دیدارێکی توربیۆرن سێڤەیێن- کلاودە هوسەیس

• لەسویدییەوە: (حەکیم عەبدوڵڵا) کاکە وەیس

**سەرەتای** حوزەیران، بە ناو نه بارانێکی کتوپڕدا گەیشتمە ماڵەکەی توربیۆرن سێڤە، کە لە سکورهۆڵمی شاری لیلیویە(2). لەدەرگامدا، چونکە وا بۆ دووساڵ دەچێ زەنگی دەرگاکەی تێکچووە. نووسراوێك بەدەرگاکەیەوە هەڵواسراوەو وێنەی سەگێکی دڕی لەسەرەو ناوی ئەو کۆمپانیایەشی پێوەیە کە سستەمی ئاگادارکردنەوەی بۆ ماڵەکە داناوە. ئەگەر توربیۆرن بەوە نەناسرابا کە قینی لەهەموو دامودەزگایەکی پۆلیسە، دەبوو نووسراوێکی ئاوها هەڵواسێ: "لەلایەن -سی ئای ئەی، کەی جی بی، سێ پۆ و گیستا پۆ-وە چاودێری دەکرێ".

ئەم ڤیللایە، هی گێرەشێوێن، رقن، گەمەزانی بۆکسێن، کۆنە ستالینی، لایەنگری قەززافی، سۆفی، لایەنگری ژنانو دەمدەمەش عارەقخۆر، (توربیۆرن سێڤە)یە، بە کورتیەکەی، ئەشکەوتی عەلی بابایە لە لیلیۆ. شێرە ردێن ماشو برنجە 67 ساڵە یاخییەکە، تۆربیۆرن سێڤە لێرە دەژی. مەڕە رەشەکەی لاپلاند- داستانی زندووی لەهەموو لاپلاندا ناسراو.

گردی سکورهۆڵم لەنێوان ماڵەکەی منو ئەودا قیت بۆتەوە، بەڵام نەرمە هەورازو نشێوەکانی، کە بەگیای چنگە پشیلە داپۆشراون، بەیەکەوەمان گرێ دەدەن. جاری پێشوو کە توربیۆرن سێڤە لای من بوو، بەدەم قسانەوە نیوەی شووشە کۆنیاکەکەمی(3) بەتاڵکرد: "زەمانی زوو، ئاهەنگی ئاینی لەسەر ئەو تەپۆڵکانە بەڕێوە دەچوون کە تیشکی مانگی

چوارده شەوە بەجەستەی لیلیۆی خەواڵوو و بەدرۆو دەلەسەی سیاسەتمەداران برسی کراو دەکەوێ، کە لەو گۆڕە راکشاوە، پیاو گوێی لەدەنگی نووساوی جادووگەران دەبێ کە لەو قەراغ گردانەدا راوە جنۆکان دەکەن. دەتەوێ بچینە دەرێو تەماشا بکەین؟". خەریك بوو لەماندوێتیدا گیانم دەربێو هەوڵم دەدا تێبگا کە کاتی رۆیشتنی هاتووە.

بەدەم چاوەڕوانییەوە، بیرم لەسەرەناوێك دەکردەوە کە بۆ یەکێ لەرۆمانەکانی دانابوو: "مەترسە". بۆ یەکەمجار وەك دراوسێو هاورێ نەدەچوومە سەردانی، تا لەبارەی هیچو هەموو شتێکەوە لەگەڵیدا بدوێم. ئەمجارەیان گەرەکمە لەبارەی رۆمانە سێینەکەیەوە بیدوێنمو پرسیاری لێ بکەم کە خەریکی نووسینێتی. وا بۆ سێ ساڵ دەچێ دەمەوێ شتێکی لەبارەوە بنووسمو نەموێراوە. "مەترسە". خۆ بیر بکەوە: تور بیۆرن لەودیو دەرگاکەوە وێستاوەو بەپەنجەکانی ردێنی خۆی شەدەکا. بەپێخواسی دێتو دەچێ. کراسێکی لەبەرکردووە کە دە ساڵیش دەبێ ئوتووی نەدیوە. لەبەر ئەوەی لەتەلەفۆندا قسەی دەکرد، ئیشارەتی بۆ کردم بچمە ژووری دانیشتنەوە. دەیزانی شارەزام.

چوار دانە لەگۆڤاری (لادێ) کە لە بارەی "بەهەشت- باخچەی ئیسلامی)یەوە بوون، لەسەر تەپڵەکە گچکە خڕەکە دانرابوون. باخچە بەسێبەر، بیری بەهارانەی گوند، موزائیل نموونەی رووەکی خشۆك، نووسینی ئەدەبی کۆن، قوتابخانەکانی قورئان- مەدرەسە- شەرابو بۆن لەئەندەلووسی موسوڵمانانەوە.. تا ئەورۆش ناوی قوردوبەو گرێناداو سیفیللا. تا ئەورۆو بۆ هەمیشەش (ئیبن لعەرەبی)ەو منیش لەبەر خۆمەوە، دەیڵێمو دەیڵێمەوە: "مەترسە ! هەموو شتێ بەدڵی خۆت دەبێ".

ماڵەکە چۆڵە. لینا، ژنەکەی تۆربیۆرنو دایکی چوار منداڵەکەی لەماڵەوە نییەو بۆ مەسەلەی میرات چۆتە ناوچەی ڤێرملاند. چینێ تۆز بەسەر زەوییو بن قەنەفەکانەوە نیشتووەو ماڵەکە پڕە لەدووکەڵی جگەرە. زۆرپا کوژاوەکە، زۆری پاکەتە جگەرە فیچاو تێدا فڕە دراون. بەر لەوەی دەست بەقسان بکەین، لەناو قەنەفەکە، کە مۆدێلی (بابا کوول)ە دادەنیشمو تابلۆکانو ئامێرە مۆسیقییەکان دەبینم کە بە دیوارەکانەوە هەڵواسراون. بەدڵنیاییەوە تابلۆکان هی لینان. ئامێرەکانیش کە هی هەموو قوژبنەکانی جیهانن، ماوەی چارەکە سەدەیەکە ئاوازی حاجییان بۆ جووتە هاوسەر- سێڤە- لێدەدەن.

شڵەژان دەسبەردارم نابێو رەنگە ئەمەش شتێکی سەیر نەبێ: من لای کەسێکی بەرهەڵستکارم، تا شتێ پێچەوانە لەسەر بەرهەڵستکاریی خۆیو ئەوەی پێی دەگوترێ گۆڕانی کۆمەڵایەتی لۆتەری(4) نەڵێم: من لەکن پیاوێکم کە هەمیشە یەك دوو کەتنی بەدواوەن. بەڵام باش دەبێ کە کاتی ئەوە دێ جێیە قووڵە نەپێوراوەکانی ئەو زەریا بێ کەنارە تاقیی بکەمەوە، (شۆڕشگێڕانی سوێد) و نیو دەرزەن لەشارەزایانی بۆکسێن لەهەمان مەعدەنی (سیکی سەنیگالسن)ی تووڕدراو دێنو پشتی من دەگرن. (ئیبن لعەرەبی) لێ ناگەڕێ بەربمەوە. شاعیرو هونەرمەندی وەك مایکۆفسکی لە (دەسووتێم)دا، ئەویندارەکەی مۆلزاو ئیڤان عەبدولهادی ئاگۆیلی یارمەتیم دەدەن. تۆربیۆرن بەخۆی وەك

دراوسێیەکی باش یارمەتیم دەدا.

وەك گیانداریکی بریندار بەژوورەکەدا دێتو دەچێ، بێ ئەوەی بزانێ چی دەوێ. لە ئەنجامدا دەڵێ: ئا، قاوە!.

دەچێتە مەتبەخەکەوەو بەترمزێکو دوو کووپو پاکەتە پسکیتێکەوە دێتەوە.

سێ بابەتە پسکیت لەیەك پاکەتدا. ئەمە ریك سویدییانەیە.

دوایی:

-لێنا لێرە نییە.

پێدەکەنم چونکە دەزانم چم وەلام دەداتەوە. دەپرسم:

-بیری دەکەی؟.

-زۆر. دەبێ بۆ هەموو شتێ سوپاسی لێنا بکەم. ئەگەر لەژیانم دوور بکەوێتەوە، قەت ناتوانم بنووسم. بەراستی نازانم بێ ئەو چم بەسەر دێ.

بیر لەدێرێك دەکەمەوە کە پێککە سێرکینیامی لەپێشەکی ئەو رۆمانەدا نووسیویەتی کە بۆ ئیڤان ئەگیلی نووسراوە. دەکرێ بلێین مەیلەو دوعایە. ئا، دوعایەك، کە تۆربیۆرن هەموو رۆژێك روو دەکاتە (ئەڵلا): کارێکی وا بکە خەم روو لەخێزانەکەم نەکاو بەوپەڕی تواناشمەوە بنووسم. بەردەوام دەبێو دەڵێ: خێزان یارمەتیم دەدا تا شێت نەبم. ئەوە خێزانەکە پێی بەسەر ئەرزەوە هێشتووم.

تۆربیۆرن ساڵی 1941 لەکیرۆنە لەدایك بووە. دایکی کیژی کرێکارێکی (کان)ی بەرد بووەو باوکی سەرەك عەشرەت بووە. خێزانەکەیان باری کردۆتە لیلیۆو باوکی، لەوێ داوای کردووە بچێتە قوتابخانەی پۆلیسەوە. تۆربیۆرن، ساڵی 1968 (لێنا رووێنینگ)ی ناسیوەو لەوساوە بە بەردەوامی دەنووسێ. لەیەکەم هەوڵی 1971یدا بە (شۆڕشگێڕانی سوێد) وەك رۆماننووسێك ناسرا. یەك ساڵ دواتر، لەگەڵ لێنادا سەفەری مەغریب دەکا. یەك ساڵ دواتر کتێبی دووەمی تەواو دەکاو 1973 چاپ دەکرێ، لێنا لە پشتەوەی هەموو بەرهەمێکیدایەو هەر ئەویش هەناسە وەبەر تۆربیۆرن دێنێتەوە، کە (من ژنان دەپەرستم) دەنووسێ.

"دەمچنێتەوە بۆ نهۆمە بەهەشتییەکەی کە ئەو ئاگرەی تێدابووە نەیکردمە مشکی. ئەو فێرم دەکا بە ڕێڕەوی نووسەریدا بڕۆم.. بەعاقڵی لەمینبەری مامۆستایانەوە دەدوێم. رەخنەی بەدیسیپلین دەنووسم.

ئەو فێرملاندم پێشان دەدا.

ئەو ئێرلاندم پێشان دەدا.

ئەو کەسێکە کە دەبێ بۆ هەمیشە هی من بێ.

لەهەمان کتێبدا بەدیاری (ئەڵلا) ناوی دەبا.

هەموو ئاینگۆرپینێك، لەسۆفیگەریدا، بۆ (ئەڵلا)و محەمەد، کە پێغەمبەری پێغەمبەرانە، دەگێڕێتەوە. هەمیشە توربیۆرن بەلێنا دەست پێدەکا ئەوجا دەچێتە سەر نووسینە سێینەکەی، کە هێشتا خەریکی نووسینیانەو لەبارەی نهێنیە ئەدەبیو جیهانییەوەن، کە یەکەمیان (دێوی چاخی بەستەڵك)ەو بەدەستیەوەیەتی، بەنیازە بگەڕێتەوە سەر تانگەر چونکە هەموو شتێ ساڵی 1972 لەوێ، لەو خوارە دەستی پێ کردوە. جووتە هاوسەر-سێڤە- ئەو دەمە لەو شارە لەباسکردن نەهاتووەدا بوون. توربیۆرن چاوی بەپیاوێکی قەڵەو کەوتووە کە لەپشت هێندی رەفتی کتێبەوە بووە. روخساری کابرا، توپی (رۆگی) بەفێسێکی مۆرەوە بیر دەخاتەوە. توربیۆرن، چاوێ بەکتێبەکاندا دەگێڕێو دەیەوێ لەگەڵ لێناو (بەشیر)ی دەلیلیاندا بڕوا، بەڵام کتێبفرۆشەکە بانگی دەکا. کابرا

دەبینێ توربیۆرن تۆرستێکی وەکی ئەوانی تر ئاسایی نییە. وەك لەداستانە رۆژهەڵاتییەکاندا هاتووە، ئەوەشی پێ ناڵێ کە سێ هەزار ساڵە چاوەڕوانی ئەو دەکا، بەڵام دەیەوێ شتێکی پیشان بدا کە لەهەموو ژیانی توربیۆرندا رەنگ دەداتەوە. هەرسێ پیاوەکەو لینا، بەقاڵدرمەیەکدا، بەسەر قاوەخانەی (لیگراند پاریس)دا دادەگەڕێنو لەوێوە بە کونێکی سەربانێکدا دەچنە ژوورێکی تاریکی ژێر زەمینێکەوە، کابرا کلیلێکی گەورە دەردێنێو دەرگایەك دەکاتەوەو داوایان لێ دەکا بەژوور کەون. توربیۆرن، باوەڕ ناکا چ دەبینێ. ژێرزەمینێك، هەر لەزەوییەوە تا بنمیچەکە کتێب، بەرانبەری دەکرێتەوە. ملیۆنان کتێب لەسەر رەفتی پلاستیك دانراون. پیاوە گچکەکە روونی دەکاتەوە کەشاری تانگەر، ساڵی 1955 لەلایەن فەرەنسا، ئەمەریکا، ئینگلیزو رووسو هی ترەوە چۆڵ کراوەو بۆتەوە بەشارێکی مەغریبیو کتێبەکانیشیان لەدوای خۆیانەوە جێ هێشتووە. کابرا بەتوربیۆرن دەڵێ پێشکەوێو بەدرێژایی مەترێ کتێب بۆخۆی هەڵگرێو ئەویش ئەڵڵا خوایی هێندێ کتێبی ئینگلیزی دەچنێتەوە. لەئوتێلەکەدا دەبینێ کتێبەکان زانستینو پەیوەندییان بەکەناڵی پەنەماوە هەیە. دوای هەشت مانگ لە نووسینەکەی دەبێتەوەو دەینێرێ بۆ ئۆپسالاو ساڵی 1973 (من کەناڵی پەنەمام دامەزراند) بڵاو دەکرێتەوە.

ئەم رووداوە کاریگەریی هەمیشەیی لەسەر توربیۆرن دەبێو دەیەوێ جارێکی تریش بەم ویژدانی مرۆڤایەتییەدا داگەڕێو خۆ بەکونو کەلەبەرە سەرسوڕهێنەرەکانیدا بکا.. خۆ گوم بکاو خۆی بدۆزێتەوە. کە جارێکی دی گەڕایەوە تانگەر تووشی سەرسوڕمانی ژیان بوو: زەوی، کتێبفرۆشەکەی قووت دابوو. قاوەخانەی لیگراند پاریس بەوپەڕی سەلامەتیی لەجێی خۆیدا مابۆوە بەڵام ئەو رێیەی دەچووە سەر کتێبخانەکە شوێنەواریشی نەمابوو.

لەو دەمەوە، توربیۆرن بۆ ئەو کتێبخانە جیهانییە وەك دەست لێوەشاوی لێ هاتووە. لەگەورەییو شێتی مرۆڤ سەرسامەو دەیەوێ نهێنی دەسەڵاتی کوریدۆرەکە تێ بگا. دەیەوێ کتێبخانەکە لەخەیاڵی خۆیدا دابڕێژێتەوە. دەیەوێ دوو هەزار لاپەڕە بۆ کاریگەریی ئەو رووداوە تەرخان بکات.

—ئێمە لەوێنەی جیهانی خۆماندا بەندکراوین. بەڵام جیهان گەورەیە. زۆر زۆر لەو جیهانە کۆریدۆرییە گەورەترە کە جارێك لەجاران چاوم پێی کەوت.

توربیۆرن گەرەکێتی کتێبی کتێبەکان بنووسێو باسی سەرجەمی سەدەی بیستەم بکا. بۆ ئەوەی ئەمەش بکا، ژیانی بەحەفتا کەسی هەر چوار قوژبنی جیهان بەخشیوە. رێیان دەدا دەمەتەقێ لەسەر لایەنە گرنگەکانی ژیان بکەن بەمێژوو و سیاسەتو فەلسەفەو هونەرەوە. بەکورتییەکەی، هەموو سەدەی بیستەم.

رووداوەکان لە ئۆپسالا روو دەدەن. کە تۆربیۆرن شارەزای هەموو شتێکێتی- (راسپۆتین لە ئۆپسالا) ناوی بەردی دووەم گۆشەی کارەکەی دەبێ کە ساڵی 2003 چاپ دەکرێ. کتێبفرۆشەکەی شاری تانگەر دەگۆڕێو دەبێتە هوێبەرت ئۆێبێری، کە 11 ی نۆڤەمبەری 1900 لە ئۆپسالا لە دایك بووە. ئۆێبێری کتێبفرۆشەو کلیکی هەموو کتێبخانەکان لەلان. لەدەمی کارکردنیدا، بە کوریدۆرە نهێنییە میراتییەکاندا

دەسووڕێتەوەو دڵی خۆی بەو نهێنیانەو ئەو ناوانە خۆش دەکا کە دەیاندۆزێتەوە. بڕیار دەدا خۆی بەو حەفتا نووسەرەوە گرێ بداو بناغەی ئەدەبیو نهێنی جیهانی دابنێ.

—بۆ حەفتا کەس؟

—رێکەوت. دەفتەری سەرنجەکانم حەفتا لاپەڕە بوو و نوسەرەکانیش بوونە حەفتا.

هەموویان ساڵی 1900 هاتوونەتە دنیاوە.

توربیۆرن دەفتەری سەرنجەکانی دێنێتە پێشێ کە بەرگێکی کەسکی هەیەو ناوی ئەو نووسەرە نهێنیانەی تێدان کە ئەندامی ئەکادیمیا نهێنییەکەن. یەکەم ناو فەرەنسییە:

ژان پێر ئارتەر 27 نوڤەمبەری ساڵی 1900 لەدایک بووە.

—هەموو دەنگە گرنگەکانی ئەم سەدەیە لەرۆمانەکەمدا دەبێ.

کەواتە، نۆبێری ئەکادیمیای نهێنی ئەدەبی دادەمەزرێنێ. نامە لەگەڵ حەفتا نووسەرەکەدا ئاڵوگۆڕ دەکات یەکە یەکە دەعوەتیان دەکا بۆ ئۆپسالاو هەموویان لە یەك ماڵدا دەژین.

—پلانێکم بۆ خانووەکە هەیە. با ئەوەش بڵێم کە بەتەنها نایەن بەڵکو ژنیشیان لەگەڵدان. یەك بەدوای یەکدا دێن.

—کەواتە باس باسی 140 کەسە.

—نا، بەلای کەمەوە.

ساڵی 1957 کاتی ئەوە دێ نۆبێری بۆ یەکەمین جار میوانەکان دەعوەت بکا. (پێر ئاگوستین) 16ی ئابی 1900 لەپاریس لەدایك بووە. ئەم (پێر)ە، مێژووی ئەدەبو پەرەسەندنی سیاسی نیوەی یەکەمی سەدەکە لە کەسایەتی خۆیدا چڕ دەکاتەوە. لەگەڵ دادایی‌و سۆریالیستو تەجریدی‌و شۆڕشگێڕاندا ئەوینداری هەیە. ئەوەی دوای ئەو کە لەسەرەدایە (یان- ئینقارت کاریسۆن)ی خوێندکاری لیلیۆیەو دەبێتە نوسخەیەکی نۆبێری.

—توندڕەویکەو لەناو باسکە جیابوونەوە خوازەکاندا دێتو دەچێ. ئەمە کەسێکی زیادەڕۆییەو تووشی ماریۆبیکابیا، پیکاسۆو تەنانەت (ئەگۆیلی)ش دەبێ. کاریسۆن، هەموو ئەندامانی ئەکادیمیاکە دەباتە لیلیۆ، لەنۆربۆتن.

توربیۆرن، لە 900 لاپەڕەی پتر نەنووسیوە. رێیەکی دوورو درێژی لەبەردەمدایە بەلام کاتێکی باشیشی لەپێشدا ماوە کە نزیکەی دوو ساڵە.

—ئەمە رۆمانێکی رێڕەوی زۆری هەیە. هەموو جۆرە ئەدەبێکی ئەم سەدەیە وەخۆ دەگرێ. ئەدەبی سوێدیش، سەرەتای وەك کۆتایی نابێ. زمان، هەمیشە پەرەدەسێنێ.

کە توربیۆرن باسی رۆمانە سێ هەزار لاپەڕەییەکەی دەکا، بێگومان بیرم بۆ لای خوێنەریش دەچێ. دڵنیام دەکا: خوێنەر، بەلەزەتەوە دەیخوێنێتەوە. لە شتێکی نوێوە بۆ شتێکی نوێتر دەچێ. موغامەرەی هەموو ئەم سەدەیە دەخەمە بەر دەستی. دوایی بەردوام دەبێ:

—خوێنەرەکانم زیاتر ژن دەبن. لەسوێد، زیاتر ژنان دەخوێننەوە. پیاو، لە بارەی کەتنەکانەوە دەخوێننەوە.

—بەلام دیارە ژمارەی پیاو لەرۆمانەکەتدا زۆر دەبێ

_بێگومان. باس باسی کەتن دەبێ. ئەم رۆمانە کەسایەتی سوێدی دەردەخا.

—توربیۆرن، تۆ حەز بەکەتن دەکەی؟

پرسیارەکە ئەوە نییە. چەوتییەك دەبینمو فوو بەئامێری ئاگادارکردنەوەدا دەکەمو خەتابارەکان

دەستنیشان دەکەم. مەبەستم دەسەلاتدارانە،.

-وێ دەچێ ڕۆمانێکی سیاسی بێ.

لە ڕۆمانەکانی ترمدا باسی شیعر، شتی سەیر، هونەرمەندو ئەو کەسانەم کردووە کە بۆکسێن دەکەن. سیاسەتمەداریان لەگەڵدان بەلام ناڕاستەوخۆ. ئەمەیان تەواو سیاسییە.

-کە خوێنەرانت لە خوێندنەوەی دوو هەزار لاپەڕە دەبنەوە دەتەوێ چ بڵێن؟

کەمێ بیر دەکاتەوەو دەستێ بەڕدێنە ماشوبرنجیەکەیدا دێنێتو بەدوو چاوی شینەوە لێم ورد دەبێتەوە:

-دەمەوێ دەنگیان بەرز بێتەوە: "خوایە گیان، نەمدەزانی بەلام ڕاستە".

دەرزەنێ پاکەتە شیر کە قەپاغیان قرتێندرابوو و پڕ کرابوون لەگڵ، لەسەر مێزێك بەلای یەکەوە دانرابوون. هێندێ چوزەرەیان لێوە دەرچوو بوو.

گوتم:

-ئەمە بیرکردنەوەیەکی چاکە.

ئەویش ڕاپەڕی:

-ئەه خوایە گیان! شیناییەکانی لێنا! بیرم چوو ئاویان بدەم.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەهەنگاوی هێواش ون دەبێتو بەشووشە ئاوێکەوە دەگەڕێتەوە.

-ئەگەر شیناییەکان شتێکیان لێ بێ هەر دەمکوژێ.

توربیۆرنی سۆفی بەناوهێنانی خۆشەویستەکەی کۆتایی بەقسان دێنێ.

-دەبێ بێتەوە دەنا من کۆتاییمە.

ئەوجا لەبارەی شتی ترەوە قسە دەکەین، لەبری سەگی دڕ پشیلەیەك خۆی بەژووری دانیشتندا دەکاتو بەدووی توربیۆرندا دەگەڕێ. ئەو پیاوەی کە بەرانبەر خۆمی دەبینم، هەرچییەك بێ بێزارکەر نییە؛ بەلکو ڕاستو ڕەوان گۆرانیبێژێکی ئەویندارە.

"دڵم جۆرێکە هەموو شێوازێك دەگرێ: جێگای پێکگەیشتنی ئاسکو دێڕی ڕەبەنەکانە. جێی پەیکەری پەرستنو کەعبەی حاجییەکانە. تابلۆی یاساکانە وەك چۆن جێگای قورئانی پیرۆزیشە لەخزمەتی ئاوازی ئەویندارییدامو چوار پەلی ئەسپی سوارە کێوە بچێ ئەوێ ئاینو باوەڕمە".

تا بەردەرگا بەڕێم دەکا.

لەڕاستیدا، مەڕە ڕەشەکەی لاپلاند جگە لە بەرخێك هیچی تر نییە.

***پەراوێزی وەرگێڕ:***

(1) ئەم دیدارە، لەگۆڤاری ئەدەبی سویدی (BLM)ی ژمارە (3) ی ساڵی 1998 دا بلاوکراوەتەوە. (BLM) کورتکراوەی (Bonniers Litterara Magas)ە، لەساڵی 1932وەوە بەردەوامی دەردەچێ. لاپلاند ناوچەیەکە لەباکووری سوید

(2) لیلیۆ: شارێکە کەوتۆتە ناوچەی لاپلاند باکووری سویدەوەو توربیۆرن سیڤە (Torbjiorn Safve) کە دیدارەکەی لەگەڵدا کراوە، لەوێ دەژی.

(3)لەدەقە سویدییەکەدا، جۆری کۆنیاکەکە (Renault Carte Noire) نووسراوە:

(4)مەبەست (مارتین لۆتەرکینگ)ە کە لە ئەمەریکا سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئاشتیخوازانەی کرد. ساڵی 1968 کوژرا.





# کۆچی دوایی ئەکیرۆ کۆرۆساوا

## *ئەستێرەی پرشنگداری سینەمای جیهان*

● لەفارسیەوە: ئامانج عەزیز کەندی

**رۆژی** یەك شەممە 4ی ئەیلولی 1998 "ئەکیرا کورۆساوا" گەورەترین فیلم سازی ژاپۆن لەماڵەکەی خۆیدا لەتوکیۆ، لەتەمەنی 88 ساڵیدا بەهۆی سەکتەی دڵ ماڵئاوایی لەژیان کرد.

کورۆساوا لەنێوان 55 هەڵسووڕانی سینەمایی خۆیدا توانی 30 فیلم دروست بکا کە لەلایەن رەخنەگرانی سینەمای دونیاوە، نازناوی ئیمپراتۆری سینەمای دونیای پێ درا. شاکارە سینەماییەکانی وەکوو "راشوموون"، "حەوت سامۆرایی"، "دود ئیسکادن"، "دەرسوا ئۆزالا"، چەندینو چەند جار مۆر پەسەندو ئافەرینیان لێ درا. کورۆساوا بە فیلم سازێك دەزانن کە لەراستیدا هاوتایە لەگەڵ شیوەنو پێدا هەلگوتنێکی غەریبانە، بەسەر بەژنو بالای تەنیایی مرۆڤەکاندا، هەروەها پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ راستەقینەو خەونو خەیاڵو سروشت.

کورۆساوا لە 23 ی ئازاری 1910دا لەشاری توکیۆی ژاپۆن هاتۆتە دونیاو حەوتەمین و ئاخرین منداڵی بنەماڵەی خۆیان بوو. روانگەی بە راستەقینە رووناك کراوی دایکی لەبەرانبەر

کۆسپو تەگەرەکانداو دڵو دەروونی ڕۆمانتیکانەی باوکی کە سەر بەبنەماڵەی سامورایی بوو، لەدروست کردنی کەسایەتی هونەری ئەم فیلم سازەدا کاریگەرییەکی یەکجار گرنگی هەبووە.

گەورەترین ڕووداوی سەردەمی منداڵی کوروّساوا کارەساتی بوومەلەرزەکەی شاری "کانتۆ" بوو کە لەساڵی 1923دا ڕوویداو بوو بەهۆی مردنی سەدو چل هەزار کەس. لەو ڕووداوەدا، هەرچەند بنەماڵەی کوروّساوا بە سلامەتی دەرچوون بەڵام بینینی کارەساتی بوومەلەرزەکەو ڕووداوەکانی دوای ئەوە، دونیاو ڕوانگەی کوروّساوای سەبارەت بەژیانو مرۆڤ لەبنەڕەتەوە گۆڕی. کاریگەری خوو و ڕەوشتی دڕندانەو کێویانەی مرۆڤەکان لەبارودۆخی بوومەلەرزەی ساڵی 1923دا لەسەر ڕوحیەتی کوروّساوا، بەئاشکرا لەزۆربەی فیلمەکاندا دیارو بەرچاوە. بۆ نموونە فیلمەکانی وەکو "ڕاشومون"، "حەوت سامورایی"، "تەختی خوێنین"و "قەلای نهێنی" ئەوەیان زۆر جوان پێوە دیارە.

کوروّساوا، لەرێگەی ڕاگەیاندنێکی کارەکە کۆمپانیایەکی ساوای فیلم سازی بۆ وەرگرتنی جێگرو هاوکاری کارگێڕ بڵاوی کردبۆوە، بەهەڵکەوت فیلم سازی دەست پێ کرد. سەرەنجام لەدوای ساڵانی ساڵ جێگریو کارکردن لە ستودیۆکانی "توهوو"داو زیاتر لەگشتیان کارکردن بۆ "کاجیرۆ یاموتۆ"، هەروەها کاری نەقاشیو ناردنی داستان بۆ گۆڤارەکان، یەکەمین فیلمیشی لەسەر بناغەی ڕۆمانتێکی "تسۆنیۆ تومیتا" داڕشت. بەر لەدروست کردنی ئەو فیلمە گەلێك فیلم نامەی ناردبوو بۆ دەزگای سانسۆرچیانی نیزامی ژاپۆن کە گشتیان لەبنەوە هەڵپاچران و ڕەت کرانەوە. ئەو فیلمەش کە یەکەم فیلم بوو بەناوی "ئەفسانەی جۆدۆ" لەژێر مقەستی سانسۆرچیانی نیزامی ژاپۆندا بەساغی دەرنەچوو. بەڵام سەرەنجام مۆڵەتی نواندنی پێ درا. کوروّساوا لەو فیلمەدا، بەدەست نیشان کردنی دژایەتی ماناو لێکدانەوەکانی ڕوحیو خوو و ڕەوشتی ئینسانەکان، ڕوانگەی جیاوازی مرۆڤەکانی بەوێنە کێشاوە. هەروەها بەو ڕستەیە کە: "فێربوون دەتوانێ وەکو سەرچاوەیەك وابێ بۆ ئاڵوگۆڕی ڕۆحیو دەروونی ئینسانەکان"، پەیامی خۆی بەبینەر ڕاگەیاند. لەفیلمەکانی دیکەشیدا سەرنجی قووڵی داوەتە ئەو پەیامە؛ بەتایبەت فیلمەکانی "دەرسو ئوزالا"و "کاکە موشا" ئەوەیان جوان پێوە دیارە. شاکارێکی دیکەی کوروّساوا لەدوای ئەو فیلمە، فیلمی "حەوت سامورایی" بوو کە لەساڵی 1954دا سازی کرد. ئەو فیلمەش وەکو فیلمی "ڕاشومون" خاوەنی ناوەڕۆکێکە کە لە ڕوانگەی پەیوەندی بەشو لایەنەکانی دراماتیکی (داستان)، کە دەتوانێ لەهەر سەردەمێکدا یان لەهەر جێگایەکدا گشتی ببێتەوە. ئەو فیلمە چیرۆکی حەوت سامورایی لەسەدەی 16دا بەوێنە دەکێشێ کە بە ویستو دڵخوازی خۆیان دەچن بەهاواری ئەو وەرزێرانەوە کە لەلایەن چەتەو ڕێگرەکانەوە تاڵانو بڕۆ دەکرێن. ئەو حەوت سامورایی‌یە هەرچەند ڕابردوویەکی دێزو تاریکیان لەکۆڵ شەتەك داوە، بەڵام هەر کامەیان بەکەسایەتیەکی جیاوازەوە، هەلێك وەدەست دێنن کە بۆ بەڕێوەبردنی ئامانجێکی هاوبەش، ئازایەتیو لێهاتوویی خوو و ڕەوشتی مرۆڤانە نیشان دەدەن.

شاکارێکی دیکەی کوروّساوا، "دود ئیسکادێن" بوو لە ساڵی 1970دا. ئەو فیلمە نەك

هەر شاكاری سینەمای ژاپۆن، بەڵكو یەكێكیشە لەشاكارە سینەماییەكانی دونیا. ئەفراندن و روانینی زیرەكانەو باریك بینی كورۆساوا لە ئینسانو رۆحیەتی نەتەوەیی خەڵكی ژاپۆن، ئەو فیلمەی كرد بە بەرهەمێكی قەت لەبیر نەچووی سینەما، هەوڵدان بۆ زانیاری وەدەست هێنانی روونی مرۆڤ، تەوەرەی سەرەكی ئەو فیلمەیە. كەسایەتیەكانی "دود ئیسكادێن" مرۆڤەكانی سەردەم پێكی دێنن كە لەنێو خەونو راستیدا سەراسیمەن. كارەساتی ژیانی مرۆڤ لەو فیلمەدا زۆر بەقووڵی بەوێنە كێشراوەو ئەو كارەساتە ئەوەندە گەورەیە كە مرۆڤ بۆ هەڵاتن لەچنگ ئەو كارەساتە هاوار دەباتە بەر خەون، تەنانەت مەرگی رۆڵەش ناتوانێ ئەو مرۆڤە سەوداسەرە بێنێتەوە سەرخۆ و وەخەبەری بێنێ. كورۆساوا لەو فیلمەدا نە تەنیا هەر تراژیدیای مرۆڤی ژاپۆن، بەڵكو توانی قووڵایی كارەساتی هەر مرۆڤێك، لەهەر جێگایەكی دونیا بە وێنە بكێشێ.

لەناو بەرهەمە سینەماییەكانی كورۆساوا دەكرێ فیلمێكی دیكە ناو بێنین كە بەرهەمی ژاپۆن و سۆڤیەتە بەناوی "درسوا ئوزالا"و ساڵی 1975 خوڵقاندی. لەو فیلمەشدا مرۆڤ، تەنیایی و پەیوەندیی چڕو پڕی لەگەڵ سروشت، تەوەری سەرەكی فیلمەكەیە. وێنەگری بێرادە جوانی سروشتی لەو فیلمەدا، ئەوی كردووە بە فیلمێكی قەت لەبیر نەچوو.

ئاشنایی لەگەڵ شاكارە ئەدەبیەكانی ئەورووپاو سۆڤیەت، بەتایبەت شاكارەكانی دیستۆفسكیو گوركیو هەروەها ماوەیەك هەڵسوڕان لەناو بزووتنەوەی چینی كرێكاری ژاپۆنو حزبی كۆمۆنیستی ئەو وڵاتەدا لەژیانو بەرهەمەكانی ئەودا بێ كاریگەری نەبووە. كورۆساوا بەردەوام لەدرێژەی ژیانی هونەریدا، گەلێك جاران لەگەڵ ئیدارەی سانسۆری نیزامی ژاپۆن كەوتە كێشەو ململانێ، بەڵام لەبەر لایەنگری كردنی رۆژئاوا لەبەرهەمەكانی ئەو و پێشكەشكردنی خەڵاتی جۆراو جۆر لە فیستیڤاڵە گرنگەكان، بەتایبەت خەڵاتی ئۆسكار بۆ فیلمی "راشومون" بەناوی باشترین فیلمی دەرەوە لەساڵی 1952دا، گەلێك دەرفەتی زێڕینی بۆ بەدیاری هێنا. ئاكادیمی ئۆسكاریش بۆ دووهەم جار لەدوای دروستكردنی فیلمی "رەن" كە لەسەر شانۆنامەیەكی شكسپیر بەناوی "شالیر" سازی كرد، بەبۆنەی 50 ساڵ هەڵسوڕانی سینەمایی كورۆساوا، جارێكی دیكە لەساڵی 1985دا خەڵاتی ئۆسكاری باشترین كارگێڕی دونیایان پێشكەش كرد.

كورۆساوا ئێستا دوو فیلم نامەی لەدوا بەجێماوە كە دەیویست لەروویان فیلم دروست بكا مەرگ مەودای پێنەدا. لەهەر حاڵێكدا دونیای سینەما بە مەرگی "كورۆساوا" یەكێك لەفیلم سازە مەزنەكانی خۆی لەدەستدا یادی بەخێر.





# خوزێ ساراماگۆ

## لەڕۆژی ڕاگەیاندنی خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵدا


■ موجتەبا باکۆولی وەند

● و: ئا. ع. ك


ئاکادیمی زانستیەکانی سوێد خەڵاتی ئەدەبی ساڵی 1998ی پێشکەش کرد بە "خوزە ساراماگۆ"ی نووسەری پورتەغالی. لەڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەگەری‌دا کە کەوتە بەردەستی ڕاگەیەنە گشتیەکانی دونیا، وا هاتووە کە پێشکەش کردنی ئەو خەڵاتە سەبارەت بە ژمارەی زۆری بەرهەمی ئەو نووسەرەیە، کە لایەنی بنەڕەتی‌و سەرەکی ئەو بەرهەمانە "فانتزی، تەنزو هاودەردیە. گرینگترین بەرهەمی "خوزە ساراماگۆ" ڕۆمانێکی بەناوی "شاری کوێران(1)" کە لە ساڵی 1997دا چاپی کردووەو هەتا ئێستا بەگەلێك زمانی زیندووی دونیا وەرگێردراوە.

خوزە ساراماگۆ لەساڵی 1933 لە کوێرە دێیەکی وڵاتی پورتەغال چاوی بەدونیا پشکووت. باوکی جوتیارێکی هەژار بوو کە زۆر بەسەختی دەیتوانی بژێوی ژیانی بنەماڵەکەی وەدەست بێنێ‌و هەر بەو هۆیە بوو کە سەردەمی منداڵی ساراماگۆ بەهەژاری‌و دەست کورتی تێپەڕی.

بەهەموو ئەوانەشەوە بەهەر کوێرەوەریەك توانی خوێندن بە کۆتایی بگەیەنێ. خوزە سەرگەرمی کارگەلێکی جۆراو جۆر بوو وەکو میکانیکیو نەخشەکێشی تا ئەوەی کە بڕیاریدا ببێتە ڕۆژنامەگەر. سالانێکی زۆر لەگەڵ گەلێك ڕۆژنامەی جۆراوجۆر هاوکاری کرد.

"خوزە ساراماگۆ" هەڵسووڕای چڕو پڕی نووسەریی زۆر درەنگ دەست پێ کرد، لەڕاستیدا لەتەمەنی46 ساڵی بەدواوە بوو کە شێلگیرانە دەستی بۆ قەڵەم بردو بەرهەمەکانی خۆی بڵاوکردەوە. لەو ڕێکەوتە بەدواوە ڕۆمانو داستان گەلێکی فرەی نووسی. لەدەورانی دیکتاتۆری دەسەلاتداری پورتەغالدا لەگەڵ ریزی ئۆپزسیۆن بووو لەبزووتنەوەی بەرەنگاریدا وەك کۆمۆنیستێك بە چەکی قەڵەم لەدژی دواکەوتوویی ولاتەکەی خەباتی دەکرد.

ساراماگۆ ئێستا 75 ساڵی تەمەنەو یەکێکە لە بەناوبانگترین سیمای ئەدەبی پورتەغالی. بەشێك لە بەرهەمەکانی ئەو نووسەرە کە لەگەڵ پێشوازی دونیا بەرەو ڕووبوونەوە بریتین لە: "هیوا لەئەلنتی یو" (ڕۆمان1979)، (بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە بۆ ساراماگۆ سەرکەوتنێکی مەزن بوو و سەرنجی خوێنەران و ڕەخنەگرانی پورتەغالی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، هەر بەو هۆیە لەساڵی 1981دا خەلاتی ئەدەبی شاری لیسبوونی پێ درا). "دەفتەرچەی بیرەوەری" (ڕۆمان 1983)، "ساڵی مەرگی ریکاردو رایس" (ڕۆمان 1985) بەسەرهاتی ئابلۆقەی لیسبوون (ڕۆمان 1989)، "بەلەمی بەردین" (ڕۆمان 1990)، "مەسیحیەت لەدوای عیسا مەسیح" (ڕۆمان 1993)، ساراماگۆ ئەو ڕۆمانەی لە بارەی مەسیحیەتەوە نووسیوە، هەڵبەت لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەوە. دوای بڵاوبوونەوەی ئەو ڕۆمانە هەراو هوریایەکی زۆر لە دژو ڕەزامەندی ئەو دروست بوو، تا گەیشت بەو جێگایە کە وایتکان سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی ئەو ڕۆمانە هەڵوێستی توندو تیژی لەخۆی نیشاندا...

ئەوەی کە لێرەدا دەیخوێننەوە دەقی وتو وێژێکە کە لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی پێشکەش کردنی خەلاتی ئەدەبی نۆبڵ هەواڵنێرەکان لەگەڵیان کردووە.

-تۆ ئەو کاتەی کە هەواڵی پێشکەش کردنی خەلاتەکەت بیست لەکوێ بووی؟

+من بۆ بەشداری کردن لەنمایشگای نێونەتەوەیی فرانکفۆرت هاتبوومە ئاڵمان. هەڵبەت لەو ڕۆژەدا کارم کۆتایی پێ هاتبوو بۆ گەڕانەوە لەفڕۆکەخانە چاوەڕوانی سەعاتی هەڵفڕینەکەم بووم تا بچم بۆ مەدرید. کەچی یەکێك لەخاتوونە میواندارەکان هاتە لام و هەواڵەکەی پێدام. سەرەڕای ئەوەش حەزم دەکرد کە سواری فڕۆکە بمو بگەڕێمەوە بۆ ماڵێ، بۆ لای هاوسەرە خۆشەویستەکەم، بەلام ناشر تکای لێ کردم کە سەعاتی هەڵفڕینەکەم بخەمە دواو بگەڕێمەوە بۆ نمایشگای کتێب.

-ئایا تۆ هیچ چاوەڕوانی وەرگرتنی خەلاتی ئەدەبی نۆبڵ بووی؟

+ئەگەر ڕاستت دەوێ نا، ئەو ساڵ هیچ چاوەڕوانی وەرگرتنی ئەو خەلاتە نەبووم. ڕەنگە لە ساڵانی داهاتوودا ئەو چاوەڕوانیەم بایە...

-یانی ئەو زەمەنەی کە لە نمایشگای نێونەتەوەی کتێبدا، کە ساڵی "ئەدەبیاتی پورتەغال" ڕاگەیەندرابوو؟

+نازانم. بەهەرحاڵ نەمدەویست سەفەرەکەم وەدواخەم. تۆ بیری لێ بکەوە، ئەگەر هەڵفڕینەکەم وەدوا خستبایە، بەڵام هەواڵەکە راست نەبایە، بێگومان گاڵتەم بەخۆم کردبوو!

-بەڵام سەرەڕای گشت ئەوانە بۆ تۆ کە دوور لەچاوەڕوانی نەبوو؟

+ماوەی پێنج ساڵە کە بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە منیان لەریزی هەڵبژاردەکاندا راگەیاندووە، دەیجا خۆ تەنیا هەڵبژاردەبوون شتێك ناگەیەنێ. هیچ دەزانی کە تا ئێستا چەندین نووسەری نێو بەدەرەوەو بەتوانا لەسەر زمانان بووە، بەڵام قەت ئەو خەڵاتەیان وەرنەگرتووە.

-کاتێ هەواڵەکەت بیست چ هەستێك دایگرتی؟

-دەستمدا جانتاکەم و بەتاقی تەنیا وەڕێ کەوتم. بە ناچاری دەبوو بە داڵانی دوورو درێژی فڕۆکەخانەکەدا تێ بپەڕم. بەخۆم وت چەندە پێکەنینیە، خەڵاتی نۆبڵت پێشکەش کراوە بەڵام کەست لەگەڵ نیە کە لەو بارەیەوە لە گەڵی بدوێی.

-ئەوە یەکەم جارە کە خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵ دەدرێ بە وڵاتی پورتەغال؟

+بەڵێ. ئێستاش من ئەرخەیانم کە زۆربەی هاووڵاتیانم بەوە زۆر خۆشحاڵن. وڵاتی ئێمە خاوەنی سەدان ساڵ باوو سونەتی ئەدەبیە. لە رابردوودا گەلێك جار هاتو هاوار بەرز دەبۆوە کە بۆچی ئێمە تا ئێستا خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵمان نەبردۆتەوە..؟ بەڵام ئێستا ئەومان لەژێر رکێف دایە.

-بەڵام تۆ لەساڵی 1993 وە ئیتر لە پورتەغال ناژی.

+من ئێستا لەدورگەی "رانساروتە" دەژیم، چونکە بنەماڵەی خێزانم لەوێن. ئێمە لەوێ ماڵێکمان دروست کردوەو هەردوکمان ئەویندارى ئەو دورگەیەین. نابێ ئەوە بە مانای دژایەتیو نارەزایەتی لێکبدرێتەوە. من زۆرتر لە پورتەغالم و زۆر لەوێ دەمێنمەوە. هەڵبەت لە رابردوودا گیرو گرفت و دژایەتی بیر بۆچونم لە گەڵ دەوڵەت بووە کە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر بڵاوکردنەوەی رۆمانێکی من لە ژێر ناوی "مەسیحیەت لەدوای عیسا مەسیح".

-دەزانی کەواتیکان دوای راگەیاندنی هەواڵی خەڵاتەکە هەڵوێستێکی توندی لەخۆی نیشان داوەو سەبارەت بە پێشکەش کردنی نۆبڵی ئەدەبی، کە دراوە بەتۆ نارەزایەتی دەربڕیوە؟

+واتیکان وا باشترە بەگیروگرفتەکانی خۆی رابگا، تا ئەوەیکە بە چەکمەوە وەنێو ئەو کارانە کەوێ کە پەیوەندی بەوەوە نیە. چونکە ئەگەر وانەکا زۆر زیاتر لەوەیکە ئێستا هەیە خۆی بەرتەسك تر دەکاتەوە "ئوسرواتوورە رومانۆ" بۆ هاندان و هەڵفڕاندنی بیروڕای گشتی نووسی: "کە من کۆمۆنیستم و کتێبم لە دژی دەورو نەخشی مەزهەب نووسیوە.." زۆر باشە من حاشا ناکەم و لەوەش زۆر تر پێ رادەکێشم کە بەڵێ، من کۆمۆنیستێکم و بۆ خزمەت بە ئینسانیەت دەنووسم.

-تۆ لە بنەماڵەیەکی وەرزێری هەژار لە گوندێکی دوورە دەست هاتوویە دونیا، بە جۆرێك کە دایکت هەتا کۆتایی تەمەنی هەلی بۆ نەلوا کە خوێندن و نووسین فێربێ. ئایا پێت وا نیە لە بەینی بێ بەشی سەردەمی منداڵیت و سەرکەوتنی ئەمڕۆدا نێوانێکی یەکجار زۆر هەیە؟

+ناتوانم بڵێم لەو کاتەوە کە لە سەر لانکە بووم بەگوێمدا لایەلایەیان خوێندوە کە من ڕۆژێك ئەو خەڵاتە وەردەگرم، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم بەبێ تێپەڕکردنی ئەو ئەزموونە تاڵانەی دەورانی منداڵیم، نەمدەتوانی بەرهەمێکی ئەدەبی ئاوا بخولقێنم.

–ئایا تۆ بەرهەمەکانی خۆت بە بەشێك لە ئەدەبیاتی چیرۆکیی ئەورووپایی دەزانی؟

+ئەوە بەو مانایە کە ئەدەبیاتێکی تاقانە هەیە بەناوی "ئەدەبیاتی ئەورووپایی" لەحاڵێکدا وا نیەو ئێمە لە چوارچێوەی ئەورووپادا لەگەڵ گەلێك زمانی جودا لەیەکو جیاوازیە جۆراو جۆرەکانی ناوچەی ڕووبەڕووین.

–ئێستاکە تۆ ئاوڕ لەژیانی ڕابردووی خۆت و بەرهەمە بڵاوکراوەکانت دەدەیەوەو بیریان لێ دەکەیەوە، دەتوانی دەست نیشانی بکەی کە ئایا لەو ڕێگایە رازی کە تێپەڕت کردووە؟

+من یەکەمین ڕۆمانی خۆم کە نووسی تەمەنم 35 ساڵ بوو. هەر ئەلێرە ئەو خاڵە دەست نیشان بکەم کە ئەو ڕۆمانە لەو دوایەدا بۆ یەکەم جار چاوی بە چاپ پشکووت، چونکە دەیان ساڵ بوو کە لەبیر چوو بووەوەو گوایە تازە دۆزراوەتەوە. لەدوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەر نووسینی ئەو کتێبەدا من تەنانەت یەك وشەشم لێ نەگۆڕیو هەر بەو شێوەیە بە چاپم ئەسپارد. لەدوای نووسینی ئەو کتێبە، ماوەی چەند ساڵ دەستم لە نووسین هەڵگرت. چونکە پێم وابوو شتێکی وام پێنیە بۆ نووسین. بەڵام لە ساڵی 1975دا کەوتمە بارودۆخێکەوە کە دەبوو یان بەدوای کارو پیشەیەکی تازەدا بگەڕێم یان نووسەریی بکەمە کاری سەرەکی خۆم. جا هەروا کە دەیبینی دووهەمیانم هەڵبژاردو ئەورۆش ئەو خەڵاتەم پێدرا. دەی باشە ئەوە وا نیشان دەدا کە بڕیاری من زۆریش هەڵە نەبووە.

سەرچاوە: گۆڤاری ئارش

**پەراوێز:**

1–ئەو ڕۆمانە بە فارسی وەرگێڕدراوە بەناوی (کوێریی)

# هونەر لە سەردەمی ستالیندا

- **کتێب: هونەر لە سەردەمی ستالیندا**
- **نووسەر: ماتیوکالرن باون**
- **پێشەکی: ئەلکساندەر سیدوروف**
- **بڵاوکەرەوە: فایدون**

**و. لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد**

لە سیپتامبەری ساڵی 1932دا جوزیف ستالینی سەرۆك ئەنجومەنی سەرکردایەتی یەکیەتی سۆڤیەتی جەماوەری شورەوی سوسیالیست ئەو دەزگا سەربەخۆ هونەریانەی هەڵوەشاندەوە کە لەیەکێتی شورەویدا هەبوون، پرنسیپی ڕێنمایی نوێی هونەری حیزبی پەسەند کرد کە پێویستە وەفاداریەکی ڕەها بۆ حیزب هەبێت، لەو دەوری تاك ڕەویەدا ژیان ببەخشێتە مێژووی هونەرو بووە قۆناغی ریالیزمی سوسیالیست.

لەو ساڵەداو ڕێك لە 5ی سیپتامبەری 1932دا ئانتونیوگرامشی، ڕابەری حیزبی کومونیستی ئیتالی، کە لە بەندیخانەی توری زیندان کرابوو لە نامەیەکدا ئەمەی نووسی: "... ئەم فەرمانەی بە منتان داوە تەواو ناڕاستە، فەرمانێك کە سەرسامی بە نووسەرێك یان هونەرمەندێك لەگەڵ ئافەرین لێ کردنیا فەرقی هەبێت. من ناتوانم قسەیەکی وا بکەم، واتا سەرسام بوون بە هونەرێك لەبەر بەها هونەریەکەی جیابکرێتەوە لە سەرسامی بە بەها ئاکاریەکەی، واتا بەشداری کردن لە دنیای ئایدیۆلۆژی هونەرمەندەکەدا، جیاوازیەك کە بەڕای من لە باری ڕەخنە گرتنەوە پەسەندو پێویستە، من دەتوانم لە جوانکاری شەڕو ئاشتی تولستوی تاریف بکەم بەڵام لەگەڵ جەوهەری ئایدیۆلۆژیاکەیدا نەبم"

پاشان گرامشی دێتە سەر کۆمەڵێك نمونەو توێژینەوە لە سەر ئەوەی کە بۆچی داوەری ئیستاتیکی جیاوازە لە داوەری




ئاكاری (ئەخلاقی) ئەگەرچی دەتوانرێت هەردوو لای كارەكە هەڵسەنگێنیت، بەڵام ئەمە نە ئەركێكی ئاكاریە نە ئایدیۆلۆژی. پێش ئەویش كازیمیر مالڤیچ (1878–1935)ی نیگاركێشی روسی، لە بەیاننامەی سوپرە ماتیزمدا باس لەوە دكات كە لە پشت هەر كارێكی هونەریەوە بەهای روناكبیری خۆی هەیە، هەر ئەوەیشە دەبێتە هۆی ئەوەی كە (قیامەت) بەو شێوەیەی میكل ئانژ باسی دەكات لە لای یەكێكی تریش كە بێباوەڕە پەسەند بێت. بەڵام ستالین كە هەر بە سروشت ئاشنای هیچ یەكێك لەم مەسەلانە نەبوو، بە پێی پلەو

پایەکەی خۆی بە داوەری ئیستاتیکی و ئاکار دادەنا، لێرەوە بەرەو بانگەشەکردن بۆ شوێنی ریالیزمی سوسیالیست و پراکتیکی سەرسەختانەی گەیشتە ئەوەی کە نابێت لە یەك کاتدا هەم هونەرمەند بیت و هەم مارکسی.

نووسەری کتێبی -هونەر لەسەردەمی ستالیندا- کە لە دوای پیروسترویکا نووسراوە، نیگارکێش و رەخنەگرێکی ئینگلیزیە کە لە ئەنجامی ماوەیەك ژیانی مۆسکۆیو کارکردن لەگەڵ هونەرمەندانی شورەویدا کتێبەکەی نووسیوە، ئەو لە ساڵی 1989دا کتێبێکی تری بە ناوی هونەری هاوچەرخی شورەویەوە لە هەمان دەزگا چاپ کردووە.

کالرن باون لە لاپەڕە 89ی کتێبەکەی بەدواوە باس لە ریالیزمی سوسیالیست و چەمکەکەی دەکات کە لەم رستەیەدا پوختی کردۆتەوە "بە ئایدیۆلۆژی کردنی ریالیزم بە هاوتەریبی لەگەڵ سوشیالیزمدا" جۆرە نووسینێك کە بە بڕوای نووسەر (ل227) ئەگەر هاو ئاهەنگ نەبوایە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی دەزگا سەربەخۆکانی هونەرو سەرکوت کردنی هونەرمەندان هیچ کێشەیەکی دروست نەدەکرد. ئەو لە شێوەی دروست بوونی رەخنەیەکی نیە. کە بەڕواڵەت لەسەرەتادا مەکسیم گۆرکی لە بەهاری 1932دا ناوی لێ ناو، دوایی ستالین لە سیپتامبەری هەمان ساڵداو، دوای گفتوگۆ کردن لەگەڵ گۆرکیو کەسانی تردا. ئەویان بە "تاقە شێوەیەکی هونەری کە خزمەتی چینی کرێکار بکات" ناوزەد کرد.

ریالیزمی سوسیالیستی لە هونەرداو کلاسیزمی نوێ لە تەلارسازی (معماری)دا.

گرونسکی لە دانیشتنێکی هونەرمەنداندا لەگەڵ ستالین ساڵی 1933 وتی "ریالیزمی سوسیالیست لە هونەردا واتا روبنسن، رابرانت و، ریپین پێکەوە لە خزمەتی چینی کرێکاردا" (ل92) هەڵبەت کلاسیزمی نوێ رابوردوویەکی درێژتری لەم بارەیەوە هەبوو، ئەلکسی شچوسیف (1873-1949) سەرۆکی ئەنجومەنی تەلارسازانی موسکۆ، لە یەکەم کۆنفرانسی تەلارسازانی یەکیەتی شورەویدا وتبووی "ئێمە نەوەی راستەقینەی رۆمای کۆنین" (ل74) ستالینیش کە تەلارسازانی شورەوی بە "تەلارسازو خولقێنەری رەسەنی وڵاتی سوسیالیست"یان لە قەڵەم دەدا، بۆ تازە کردنەوەی بینای شارەکان، کە هەر لە ساڵی 1918ەوە بە بڵاوبوونەوەی (بەرنامەی پەیکەرتاشین) لینین پێشنیازی دروست کردنی زیاد لە (50) پەیکەری شەهیدانی کردبوو، دەیتوانی چ بڕیارێکی بویستایە بیدات، دەشیا هەندێك لەوانە پاساوی خۆیان هەبێت، بەڵام ئەوەی کە نە نووسەرو نە ئێمە ناتوانین هیچ پاساوێکی بۆ بدۆزینەوە ئەوە بوو کە بۆ رەخنەگرتن، پیلان، سەرکوت کردن و تەنانەت کوشتنی هونەرمەندان هەنگاوی بۆنراو نیشانەیەکی هەرە بچووکیش نە لە هونەرو نە لەقسەیاندا ئەوەی نەدەسەلماند کە سەرپێچیان لە فەرمانی ستالین و دارو دەستەکەی کردبێت.

لەلاپەڕە 117 بەدواوە کە باسی فورمالیستە، باسی سەرکوت کردنی ژمارەیەکی زۆرو کوشتنی لانی کەم دە هونەرمەند لە مۆسکۆ دەکات، بە بیانووی ئەوەی لە بەرهەماکانیاندا مەیلی بورژوازیانەیان هەبوە، ئەمە جگە لە دەست گیریەکانی ساڵانی 37 و 38 (ل134) کە

تـاوانی سیاسـی درۆیـان بـۆ هەڵبەستن.

تاوانبـارکردنی هونەرمـەندان بـەوەی مـەیلی فورمالیزمیـان هەیە لە سەرەتاوە بۆ ماوەیەکی کورتیش بە ریالیزم و ناتورالیزم و پاشان بە مودەرنیزم ترسێکی گـەورە بـوو بـە دوای هونەرمەندانەوە. ئەلکساندر فیچ ولـتر (1889– 1974) ی نیگـارکێش، کـە سـاڵی 1920 ئەندامی حیزب و لێپرسراوی لقی مۆسکۆی یەکیەتی هونەرمەندان بـوو، لـە نیسـانی 1993دا وتـی: "فورمالیزم جەوهەری بـەیانێکی ئـایدیۆلۆژی‌و دنیـابینی بورژواییـە. دەبێـت ئـەو هاوڕێیانـەمان کـە دەیانـەوێت کەڵك لەم فورمـالیزمی بورژوایـە وەربگرن. ڕەنگـە بـێ ئـەوەی بـەخۆیان بزانـن بـە شـێوەیەکی میکانیکی ئێمەیش تووشـی ئـەو ئایدیۆلۆژیای بورژوازیـە بکـەن. بۆیـە دەبێـت بـەم چـاوەوە تماشایان بکـەین" (ل119) هـەر جـۆرە تۆمـەتێکی لـەم بابەتـە راسـت یـان درۆ دەشـیا چارەنووسـێکی پـڕ مەترسـی دروسـت بکردایـە. هـەر لـە گۆڕینـی بەشـێکی ئاسەوارەکەوە، وەك گاڵتەجاڕو پێکەنین خسـتنە سـەر لێـوی خەڵکی، تـاوانکردنی بەرهەمەکـە بە دەستی خۆی یـان کارمـەندە تایبەتیەکان و، گۆشـەگیری‌و لـە کـار دەکـردن، پیشـان نـەدانی بەرهەمەکـە، بڕینـی ئـەو کۆمەکیانـەی بـۆ کەرەسـەی کارەکە پێویست بوون، زیندانـی کـردن، پاشـانیش کوشـتنی هونەرمەندەکە.

نووسـەر لەهـەر جێگایـەکدا پێویسـت بووبێـت کۆمـەڵێك دیکومینـت و ئامـاری زۆری هێنـاوە، گفتوگـۆی لەگـەڵ هونەرمەندان یـان خێزانـەکانیان کە بوونەتە قوربـانی سیاسـەتی سـتالین لـە بـواری روناکبـیریدا کـردوە. نووسـەر وێنەیـەکی زیندومان دەخاتە بەرچاو کە لـە خـودی بابەتـە پـڕ لـە دژایەتیەکەوە هـەڵقوڵاوە، بـەڵام وێنـەکان هەمیشە وردەکاریـان تیا نـەکراوە، بـۆ نموونـە لـە سـەرەتاوە باسـی سـەردەمێکی کـەم خایـەنی پێـش شـۆڕش دەکـات، شـتی زۆر زەقیـش ئەوەیـە کـە لەسـەر هونەرمـەندێکی وەك مـالڤیچ، ڤلادیمیر تاتلین (1885–1935)و کاریگـەریان لەسـەر هونـەری ئـەوروپا بـاس دەکـات. ئـەو قسەیەیش کە گوایا هـەموو ئـەم شێوانە هاوتای ڕۆژئاواییان هەیـە گومـانی زۆری لێ دەکرێـت. هەروەها ئەو لێك چواندنـەی لـە نێـوان سـوپرەماتیزمی داهێنەرانەی مالڤیچ و کۆپـیزمی شـیکردنەوەو نیگارکێشـانی ئەبستراکی موندریاندا دەیکات جێگای باس و خواس لێ کردنە. هەرچەندە لە بارەی فوتوریستە پێشڕەوەکانی روسـەوە زۆر بـە وردی دەست خۆشـی لێ کردنی دەوێت. (ل21) بێجگە لەمـە لـە جێگایـەکی تـردا (ل26) ئـارەزووی نیگارکێشـی دیواربـەندی (فرسـکو) بـەوە دادەنێت کـە ئیلهامەکـەی لـە کتێبـی -وڵاتـی خـۆر-ی تومازوکامپـانلای چاکـەخوازی ئاینی سەدەی حەڤدەهـەم لـە ئیتالیایـەوە وەرگرتـووە، ئـەوەیش کـە ئـەم کتێبـی نیگارکێشانی دیواربەندیەی بـۆ فێرکردن پێشنیاز کردووە، لـە دیدی نووسـەرەوە لێك چونێك هەیـە لـە نێـوان کامپـانلاو حکوومـەتی شورەویدا ئـەویش ئەوەیـە کـە هـەردووکیان کومونیستن!!

بـەڵام کامپـانلا کومونیسـت نیەو، کەسانێکی تری پێش ئـەو لـە کڵێسـاداو بـە نیگـاری دیواربـەند بـۆ فێرکردنی کتێبی پـیرۆز کـەڵکیان وەرگرتـووە، هـەروەها پرولت کـالت Prolet calt دامەزرێنـەری کلتـوری – فـێرکردنی پرولیتـاری– هـەر

لەسەرەتای دروست کردنەوە لە بەهاری ساڵی 1917دا کتێبخانەیەکی گەڕۆکی بەڕێکردو بڕوای تەواوی بە نەهێشتنی نەخوێندەواری گشتی هەبوو، نووسەر لە چەند جێگایەکی تردا بێسڵ کردنەوە داوەری لە نێوان شورەوی و خۆراوادا دەکات.

نووسەر بڕوای وایە کە بنەمای بیری ستالین لە بڕیارە روناکبیریەکانی لینینەوە سەرچاوەی گرتوە. باس لەوە دەکات کە چۆن دوای شۆڕشی فوریەی 1917 پرولت کالت، بە سوود وەرگرتن لە بیرەکانی ئەلکساندر بوگدانف (1875-1928) بۆ بەدەست هێنانی هونەرێك کە وەڵامی داواکاریەکانی چینی کرێکار بداتەوە دەرکەوت. پشتیوانی تیوری ئەم گروپە گیورگی پلیخانوف (1856-1918) و کتێبە بەناوبانگەکەی - بزوتنەوەی پرۆلیتاریاو هونەری بورژوازی- (1905) بوو، لە سەرەتادا پرولت کالت هانی کۆمەڵانی خەڵکی دەدا بۆ بەرهەم هێنانی هونەر، لەو ساڵەدا 1917 لە زوربەی شارەکاندا بەشی هونەری بۆ خەڵکی دامەزراند، تا ساڵی 1920 ژمارەی ئەندامانی گەیشتە 400000 کەس، کە 80000 کەسیان لە ستودیوو شوێنە هونەریەکاندا چالاکیان دەکرد. دە هەزاریشیان پەخش نامەیان بڵاو دەکردەوە. هەر ئەم پرولت کالتە بوو کە فرە بەرهەم هێنانی هونەری بە کۆمەڵی داهێنا، بەڵام بەرهەم هێنانی بە کۆمەڵ تەنیا شێوەی بەرجەستە دەکرد نەك ناوەڕۆك، هەرچەندە ناکۆکی پرولت کالت لەگەڵ روانینی ئاکادیمیە دەسەڵات خوازەکان کە تایبەت بوو بە دەستەبژێران (نخبە) لەمەدا دەردەکەوت. یەکەم ئەوانەی بەرگریان لە ئاکادیمیای دەسەڵات دەکرد زیاتر لە (کارگەی بەستەنی دروست کردن) دەچوون و، دوەم سەربەخۆیش نەبوون.

بەڵام ئەوانەی داوای سەربەخۆیی هونەریان دەکرد زیاتر باسیان لە داخراوی ئاکادیمیو مەحکومیەتی هونەری ریالیزمی دەکرد، ئەمە بە تووڕەییەکی زۆریشەوە.

دوای شۆڕشی ئۆکتوبەر تەمەنی لینین ئەوەندەی نەخایاند کە نەخشە بۆ سیاسەتی هونەری و دەورە چالاکەکەی بکێشێت. بەڵام هەڵوێستەکانی لە چەند بۆنەیەکی ژیانی روناکبیریدا بوونە هۆی بڕیارەکانی لەوەودوا.

نابێت دەوری هونەرمەندە شۆڕشگێڕەکانیش لەو بوارەدا سووك تەماشا بکرێن.

ڕاستیەکە ئەوەیە کە دەسەڵاتی دەوڵەت هەمیشەو لە هەموو شوێنێکی دنیادا زۆر لەوە کەمترە کە خودی دەسەڵاتداران یان هەندێك کەسی تر وێنای دەکەن. بەتایبەت کاتێك کە مەسەلەی هونەر لە ئارادا بێت. تەنیا بەو دەلیلە سادەیە کە -وتەکان تا لەدەم نەیەنە دەرەوە ناتوانن خۆبەخۆ پراکتیزە بن.

لە راستیا ژیانی هونەرمەندەکان کاتێك رەهەندی سیاسی وەرگرت کە خودی هورنەمەندان هەر لە سەرەتاوە هێنایانە گۆڕێ، ئەمەیش لەگەڵ بۆچوونی مارکسیستەکاندا کە دەربارەی کلتور دەدوان تەواو دەگونجا، چونکە هونەر چالاکیەکی کۆمەڵایەتیەو بەردەوام رەهەندی سیاسی خۆی هەیە. بەڵام کەس بە تەمای ئەوە نەبوو کە ئەو تاقە رەهەندە سیاسیە لە ئایندەیەکی زۆر نزیکدا ببێتە ئەژدیهاو هەموو رەهەندەکانی دی قووت بدات و، بێ سێو دوو لێ کردن گشتی بکاتە پاشکۆی

فەرمانەکانی دەوڵەتی ستالین. تەنانەت هونەرمەندە پێشڕەوەکانیش نەیانزانی لە چ داوێك کەوتوون و، بەماوەیەکی کورت دوای شۆڕش ناچار کران یان بەرگری لە ئازادی بکەن دژی دەسەلات، ئەو دەسەلاتەی بە ناوی لایەنگرانی حیزبی کومونیستەوە پیادە دەکرا، یان مەیدانەکە چۆڵ بکەن.

بلینسکی (1811–1848) رەخنەگری هونەر، وشەی Narodnastی داهێنا، بەو مانایەی کە دەبێت هونەر هەم جێگای پەسەندکردنی خەڵکی و لەبەردەستی هەموو کەسێکدا بێت، هەم لەناو خەڵکەوە هەڵقوڵابێت (وەك فولکلور یان هونەری ئاماتور) یان ئەگەر ئەمانە نەبوو بەرژەوەندی خەڵك بپارێزێت، خەڵکی فێربکاتو رێگایان پیشان بدات (ل25) لینین ئەمەی گۆڕی بە Partinost بەمانای خۆدانە دەست بڕیارەکانی حیزبی کومونیست. بە بڕوای ئەو هەموو بڕیارەکان، تەنانەت ئاکاریەکانیش پەیوەندیان بە حیزبەوە هەیەو ئەرکی حیزبیش چاودێری کردنی ویژدانی هەر هونەرمەندێکە.

بەدامەزراندنی -کۆمیتەی رووناکبیری خەڵك- لە لایەن لوناچارسکییەوە (1875–1933) لە هەڵوێستەکانی بوگدانوف دوورتر دەکەوینەوە، لوناچارسکی تا رادەیەك بڕوای بەوە بوو کە دەبێت هونەر سەربەخۆیی خۆی هەبێت. لێپرسراوی بەشی هونەری ئەم کومیتە کلتوریە، دیڤید شترنبرگ (1881–1948) خۆی بەرگری لە مودەرنیزم دەکردو هونەرمەندانێکی وەك مالڤیچ، تاتلین، ڤاسیلی کندینسکی (1866–1942) رابرت فالك (1889–1958) پاڤیل کوزنتسیف (1878–1968) ئەلکساندر شفچنکو (1883–1948) و.. لە سەرەتاوە کەڵکیان لە داکۆکیەکانی ئەو وەرگرت، واتا ئەو کاتەی هونەرمەندە پێشڕەوەکان گرنگ بوون و، لە بەرانبەردا هونەری ریالیزمیو ئاکادمیکی پێش شۆڕش کەنیشانەی رژێمی کۆنیان پێوە بوو ناجورو دواکەوتو بوون، قوتابخانەو ئاکادیمیای کۆن داخران و کۆمەڵێك قوتابخانەی هونەری ئازاد لە بریتییان دامەزرا. کە بە رواڵەت هەموو دەتوانن بچنە ئەو قوتابخانانەوە. بەلام ئەوانە بۆ پرۆلیتاریەکان تەرخان کرابوون. خێزانە بۆرژوازیەکان مامۆستای تایبەتیان دەگرت، دەوڵەت بودجەی قوتابخانەکانی دابین دەکرد، بەلام کۆنترۆلی بودجەکە لە دەستی هونەرمەندە پێشرەوەکان یان چەپەکاندا بوو، مۆزەخانەکانیش هەر بە دەستی ئەو هونەرمەندانەوە بەڕێوە دەبراو دەوڵەت لە سەرەتادا کۆمەڵێك ئاسەواری زۆری کڕی، لەوە دەچوو هەموو بڕوایان بە ئازادی بیری لوناچارسکی هەبێت. بەلام لە ساڵی 1918 لە پراڤدادا یەکەمین رەخنەی لێ گیرا. گوایا لیژنەی کڕینی کومیتەی روناکبیری جیاوازی دەکات و ئاسەوارە ریالیزمیەکان ناکڕێت، لوناچارسکی لە وەلامی رەخنەکەدا دەڵێت کە ئەو ئامانجی پارێزگاری کردنە لەو هونەرمەندانەی کە لە سەردەمی تزاریدا پشت گوێ خراون، بەلام لە راستیا هەموو ئەوانەی بەرگری لێ دەکردن هاوڕێی خۆی بوون. هەرچەندە ئەم قۆناغی مودێرنیستیە زۆر ناخایەنێت، بەلام هاوکات لەگەڵ بزاوتی مودیرنیستەی ئەوروپادا دەتوانرێت بەراورد بکرێت، هەرچەندە ئەمیان لە خۆراوادا پلەی خوارترە. ئایا لینین لەم هەڵوێستە بەرپرسیارە؟

بێگومان بابەتی سەرەکی ئەم کتێبە هونەرە لە نێوان

ساڵانی 1932 تا 1953دا، لەبەر ئەوە ناتونێت وەڵامێکی وردی ئەم پرسیارە بداتەوە، چونکە وەك لە پێشەکیەکەی سیدوروفدا دەی خوێنینەوە. ناتوانین رای تەواو دروست لەسەر ئەو بەرهەمانە بدەین کە لەو کاتەدا لەبەر دەستا بوون. یەکەمین لەبەر ئەوەی هەندێك لەو ئاسەوارانە شێوێنراون و دووەمیش لەبەر ئەوەی گۆڕانی زۆر بەسەر سیاسەتی کلتوریدا هاتوە. لەوە دەچێت لینین هیچ هونەرێکی پێشڕەوی حەز لێ نەبووبێت. ئەو سەلیقەیەکی هونەری پارێزکارانەی بوە.

نووسەر لە لاپەڕە 23 دەڵێت کە دوای بڵاوبوونەوەی شیعرێکی فوتوریستی ڤلادیمیر مایکوفسکی (1893–1930) لینین بە یەکێکی نزیکی خۆی وت: "ناشێت کەسانێکی دژی فوتوریس پەیدا بکەین کە جێی متمانەمان بێت؟". بەڵام لینین بڕوای بەوەیش هەبوو کە "دەبێت هەر کارێکی هونەری جوان وەك نموونە بپارێزرێ‌و وەك خاڵی دەست پێکردن سوودی لێ وەربگیرێت، تەنانەت ئەگەر کۆنیش بێت". بۆیە هەر لە سەرەتاوە مۆزەخانەکان لە پەلاماری شۆڕشگێڕان پارێزران و خۆماڵی کران، هەموو ئەو شوێنانەی خۆماڵی کران 1100 شوێن بوون کە 200000 ئاسەواریان تیا بوو، ستالین لە سەرەتای جەنگی دووەمی جیهاندا بەشێکی لێ فرۆشتن.

بەڵام ئەو بڕینانەی ستالین کردنیە جەستەی هونەر لە شورەویدا تا دەهات قووڵتر دەبوون. مەسەلەکە ئەوە نەبوو کە هونەر خەسڵەتی چینایەتی هەیەو دەبێت لە خزمەتی چینی کرێکاردا بێت، چونکە لینین، مارکس و ئینگلسیش هەر وایان بیر دەکردەوە، بەڵکو مەسەلەکە ئەو بڕیارە چەوت و ناڵەبارانە بوو کە تەنیا هێزی سەرکوت کردنی زیاد دەکرد. ستالین لە سەرەتای دەسەلاتیا دروشمی "کومونیزم لە وڵاتێکدا" ی بانگهێشت کرد (ل168) کە هونەری ئاکادیمیای سەردەمی تزاری بە بورژوا دایە قەڵەم، بەڵام پاشان کە بوو بە قارەمانی شەڕ، لەسەردەمی شەڕی ساردا، هەموو بۆچوونەکانی پێشوی خۆی سەبارەت بە "بە ناوەڕۆك سوسیالست و بەشێوە میللی" لەیادکرد، (ل175) لەو کتێبەیدا کە بە رواڵەت ئەدیبانەیە لەژێر ناوی –مارکسیزم و مەسەلەی زمان– (1950) ئەوەی باسکرد کە زمان جیاوازە لە چین و، ریگایشیدا ئەمە بە زمانی هونەرەوە بڵاوبکرێتەوە. زمانێك جیاواز بێت لە چینایەتی بەڵام سەد لەسەد وابەستەی حیزب بێت. ئەو لەم کارەیدا دوو ئامانجی هەبوو، لەلایەکەوە رێگا خۆش کردن بۆ شۆڤینزمی روسی کە لەدوای شەڕو لەبەر ئەوەی کۆمارەکە زیاترین هێدمە (صدمە)ی لە شەڕدا چەشتوە، روسیای وەك سەرۆکی هەموو کۆمارەکانی تری شورەوی ناساند. بۆ بەرگری کردنیش لە هونەری ئاکادیمیای روسی لەلایەن حیزبەوەو، دەرخستنی بەرهەمی هونەری ئاکادیمیای سەدەی نۆزدە کە خودی ستالین هەمیشە حەزی پێ دەکرد (ل1722). لەلایەکی تریشەوە سەرکوت کردنێکی وەحشیانەی هەر شێوە هونەرێکی تر بوو بە بەهانەی جۆراو جۆرەوە. هەر ئەوکاتە مەسەلەی ئیمپرسیونزیم و کاسموپولیتانیزم casmopolitanism بەمانای سەرسام بوون بەخۆرئاواوە بەهانەیەکی تر بوو کە هێنابویانە ئاراوە.

ئەم بێ سەرەو بەریە زۆرەو گۆران لە هەڵوێستدا، رەت کردنەوەیەکی خوێنینی شێوەی هونەرو روانین، پاشان پەشیمان

بوونەوەو لە گەڵدابوونی سەد دەرسەد. نەفرەتی مەرگاوی لەو کەسەی سەربەخۆ بیر بکاتەوە، خەسڵەتی زانینی ئەو راستیەیش کە ئازادیو گەڕان لە تایبەتیە هەرە دیارەکانی بیرکردنەوەن، نەفرەت لێ کردنی بیرمەندان، هەموو ئەمانە کتێبی (هونەر لە سەردەمی ستالیندا) لە بەردەم هەڵبەزو دابەزدا رادەگرن. هەندێك جار زۆر سەرنج راکێش و جاری تر زۆر ناخۆشە، سەرنج راکێش کاتێك کە باس لە بەرگری کردنی هونەرمەندان دەکات بۆ پارێزگاری سەربەخۆیی بیرکردنەوەیان، بۆ نموونە ئەو وەڵامەی کە ئاکادی پلاستف (1893–1972) دەیداتەوە کاتێك سیویف، مێژوونووسی هونەرو ئەندامی KPDI (کۆمیتەی کاروباری هونەری) رەخنەی لێ دەگرێت کە بۆچی لە دوا تابلۆیدا (خۆراکی شوفێری تراکتور–1951) ئەو نانو شیرەی بۆ شوفێرەکەی داناوە زۆر کەمە، ئارکادی بە توانجەوە وەڵامی دەداتەوە: "هاوڕێ، بوتڵە شەرابی شوفێرەکەت نەدیوە!" ئەمە پێکەنین هێنە.

هەروەها کتێبەکە لە هەندێك رووەوە ناخۆشە، کاتێك کە باس دێتە سەر ئەوانەی لەبەر ئەوەی سیاسەتی روناکبیری ستالینیان پێ قبووڵ نەبوە گیانیان لە دەست داوە. لەبەر ئەوەیش کە هەندێك لە خودی هونەرمەندان چاڵیان هەڵدەکەندو پیلانیان بۆ هاوڕێکانیان هەڵدەبەست. ئایا ستالین لێپرسراوە بەرانبەر بەم بارەی کە سیدوروف لە سەرەتای پێشەکی کتێبەکەدا لە قسەیەکی پوشکینەوە وێنای دەکات: "کاتێك کە لە ئاودەستا بیت، بتەوێت یان نا دەبێت لەگەڵ بۆنەکەیدا رابێیت".

لە لاپەڕە 175دا نووسەر دەڵێت کە جون شتاین بیك لە ساڵی 1974دا سەفەرێکی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت کردو پاشان لە دەفتەری یاداشتەکەیدا ئەمەی نووسی:

"هەموو شتێك لە شورەویدا لەژێر چاودێریەکی بەردەوامی چاوی چیمەنتویی، برونزی، شێوەکاری، یان چنراوی ستالیندا روو دەدەن. وێنەی ستالین نەك تەنیا لەهەموو مۆزەخانەیەکدا، بەڵکو تەنانەت لە هەموو ژوورەکانی هەر بینایەکی گشتیدا دەبینرێت، پەیکەری ئەو رازێنەرەوەی هەموو ساختمانەکانی دەوڵەتە، وێنەی لە فرۆکەخانە، هەموو وێزگەیەکی شەمەندەفەرو پاسدا هەیە، لەهەر پۆلێکی خوێندندا وێنەی هەڵواسراوەو زۆر کەرەت دیوارەکەی بەرانبەریشی پێوەیەتی، ئەو لە پارکەکاندا لەسەر کورسیەکی چیمەنتۆ دانیشتوەو شەشو بێش لەگەڵ لینیندا قسە دەکات. منالانی قوتابخانە وێنەکەی دەچنن، ئەو لە هەموو شوێنێکدا هەیە، هەموو شتێك دەبینێت، قەت بڕواناکەیت کە قەیسەری رۆمیش بە درێژایی تەمەنی خۆی بەقەدەر ستالین لە ستایش کردنو دەسەلاتی خوا ئاساییانەی بەرانبەر بە خەلك بەهرەگیر بووبێت.

دوای کەوتنی ستالین مێژونووسانی شورەوی سەبارەت بە شێوازی کەسایەتی ستالین وتیان: کە تەنانەت شوێنی لەدایك بونی کراوەتە پەرستگا، ژدانۆف لە ساڵی 1946دا لە وتەیەکیا هێرشی کردە سەر ئەوانەی کە هێشتا بڕوایان بە دەسەلاتی رەهای ستالین، یان حیزب نیە، ژدانۆف ساڵی 1948 مرد. بەڵام تا ساڵی 1957 کە خروشیف قسەی کرد هێشتا گیانی ژدانۆف بەسەر هونەردا زاڵ بوو، (ل204) **ئاخۆ بەراست ئەوە گیانی ژدانۆف بوو؟**

لەو پانۆرامایەوە کە نووسەر بەڕوماندا دەیکاتەوە، هونەر، بەتایبەتی هونەری بینراو، لەو بوارەدا دەوری گرنگی دیوە، نیگارکێشانو پەیکەرسازیو تەلارسازی کاریان دەکردە سەر مرۆڤە سادەکان، تەنانەت لەهەر وێنەو فیلمێکدا دەبوو ئاماژە بۆ ستالین بکرێت. ئەگەرچی وێنەکێشان جیاوازی لەگەڵ نیگارکێشاندا نەمابوو، وێنەکان دەستکاریو مونتاژ دەکران تا سیاسەتی حیزب وەك خۆی بکەوێتەروو، بە جۆرێك بە زەحمەت دەتوانرێت لە بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمەدا جیاوازی لەنێوان وێنەو نیگارکێشاندا بکرێت. وەك ئەوەی ناحەقیقەتی ئەوان شناسەکەیانیشی لەناودا بێت.

لەسەردەمی خروشیفدا هونەری نارەسمی، یان ئەوەی نەبوبوە پاشکۆ دەرفەتێکی بۆ گەشەسەندن پەیدا کرد، هەلێکیش هەڵکەوت بۆ ئەو هونەرمەندانەی حەزیان لە ریالیزمی سوسیالیست نەبوو پێکەوە کۆببنەوە، بەڵام ئەم یەك گرتنە نە ئەوساو نە تا سەرەتای ئەم دەیەیە، واتا ئەو کاتەی کالرن باون کتێبەکەی تیا نووسیوە بە هیچ جۆرێك ئومێدبەخش نەبوو، وەك نووسەر بەزمانی هونەرمەندێکەوە دەڵێت: "ئەوەی ئێمە پێکەوە دەبەستێت نەبوونی ئازادیە". راستی ئەم قسەیە ئەو ڕووداوانە دەریان خست کە پاشان لە شوورەویدا ڕوویاندا.

دەقی کتێبەکە 184 تابلۆ، پەیکەرسازی، نەخش و نیگاری بەرجەستە، فوتوگراف و ساختمانەکانی سەردەمی ستالینی تیایە، لە لاپەڕە 233دا کە کتێبەکە کۆتایی پێ دێت ئێمە لەبەردەم پرسیارێکی بێ وەڵامدا دمێنینەوە:

**چ هێزێك هەیە بتوانێت هونەرمەندێك لە دەوروبەرێکی وادا بهێڵێتەوەو بڕوای بە هونەرکەیشی بمێنێت؟**

سەرچاوە:

گۆڤاری بخارا- ژمارە 5 ساڵی 1378 ل356-363




# تورکێك، هەموو دنیا دێنێ

**ناوی کتێب: سی‌و سێ گوللە**
**نووسەر: ئیسماعیل بێشکچی**
**وەرگێڕ: ئاسۆس هەردی**
**لەبڵاوکراوەکانی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**چاپی یەکەم: 382 لاپەڕە**

● ماردین ئیبراهیم

**تورکێك** هەموو دنیا دێنێ، ئەمە بەتەنیا شیعارێك نی‌یە لاوێکی شۆفێنیست لەگەرمەی هەڵچوون و حەماسەتی خۆیدا فڕێی دات، بەڵکو وتەیەکە سەرجەم فەزای کۆمەڵگای تورکی داگرتووەو لەکەناڵە جۆراوجۆرەکانی راگەیاندندا دەبیسترێت و بەرچاو دەکەوێت. هەرکەسێك بیەوێت توێژینەوە لەکۆمەڵگای تورکیدا بکات بەهیچ شێوەیەك ناکرێت ئەم رستەیە لەبەرچاو نەگرێت، کاتێکیش سەرجەم رەهەندە سۆسیۆلۆژی و سیاسی و سایکۆلۆژیەکانی ئەم وتەیە شیدەکەینەوە تێدەگەین کەسنووری رستەیەکی ئاسایی تێدەپەڕێنێت و هەڵگری پرۆژەیەکی چەندە ترسناکە، وەتێشدەگەین کەکۆمەڵگای هاوچەرخی تورکی گیرۆدەی چ جۆرە راسیزمێکە، راسیزمێك کەناچارمان دەکات بۆناسین و توێکاریکردنی لەمێژوویەکی پێشتردا بۆڕەگەکانی بگەڕێین، چونکە مێژووی هاوچەرخی تورکیا مێژوویەکە، کەلەچاخەکانی پێش خۆی دانەبڕاوەو ئەم وێنانەی تورکیا

لەمڕۆدا بۆخۆی دروستی دەکاتو ئەم فەنتازیایانەی کەکۆمەڵگای تورکی لەمڕۆدا بەرهەمیاندێنێ جیاوازیەکی جەوهەریان نییە لەگەڵ ئەو وێنەو فەنتازیایانەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دوێنێدا بەرهەمی دەهێنا. هەروەها ئەو وێنانەی کە لەمڕۆدا تورکیا بۆ" دەرەوەی خۆی" دروستیان دەکات جیاوازیەکی بنەڕەتی نییە لەگەڵ وێناندنەکانی دوێنێدا، هەرچەندە پرۆژەی تورکیای هاوچەرخ پرۆژەیەکی سکۆلاریستییەو پرۆژەی دەوڵەتی عوسمانی پرۆژەیەکی دینی بوو، بەلام لەئاستی گوتاردا بەیەك ئاراستەدا کاریان کردووە، ئاراستەیەك کەکۆمەڵگای بەڕاسیزم گەیاندووە.

هەردوو پرۆژەکە هەلگری گوتارێکن کەبەچاوی سووكو بێ نرخ سەیری (ئەوانی دی)یان کردووەو لەهەوڵێکی بەردەوامدا بوون بۆسڕینەوەی. بێ هۆنییە تورکیا نکۆڵی لەوە دەکات کەلەچوارچێوەی سنوورەکەی ئەودا توخمی جیاواز هەن، کۆمەڵگای تورکی ناتوانێت تورکیا وەك مۆزائیکی ئەتنیو دینیو رەگەزیو نەتەوەیی جیاواز ببینێت. بەلەبەرچاو گرتنی ئەو وەفاداریەی تورکیا بۆ رابردووی (پڕ سەروەری) خۆی هەیەتی دەتوانم بڵێم هەر چاودێرێکی وردکار ئەگەر مەرگەساتی جینۆسایدی ئەرمەنیەکانی لەساڵی 1915 بینیبا دەیتوانی پێشبینی ئەوە بکات کەتورکەکان نیازیان وایە لەئایندەدا چ دۆزەخێك بخوڵقێنن، دۆزەخێك کەڕووداوی سیوسێ گوللە تەنیا دیمەنێکیەتی (رەنگە بەکارهێنانی چەمکی تورکەکان یان کۆمەڵگای تورکی هەلگری جۆرێك لەگومڕایی بێتو تاڕادەیەك سەرلێتێکدەربێت، بەلام بێگومان من مەبەستم گوتاری باوو زاڵی ناو ئەو کۆمەڵگایەیە).

گوتاری باو لە تورکیادا لە بەرامبەر روداوێکی وەکو روداوی سیوسێ گوللە و روداوی تری لەم شێوەیەدا تەنیا لە توانایدایە دوو هەڵوێست وەربگرێت یان دوو کاردانەوەی هەبێت، ئەوانیش یان خۆی بەتەواوەتی لەم رووداوەو رووداوی تری لەم شێوەیە کەڕکاتو فەرامۆشی بکات، یان وەکو سەرکەوتنو شانازییەکی نەتەوەیی باسی بکات.

رووداوی سیوسێ گوللە ئەو سنوورە دەبەزێنێت کەبەتەنیا گوللە باران کردنی کۆمەڵێك گوندنشینی بێتاوانی کوردبێت، بەڵکو دەمامك لەسەری مێژوویەك دادەماڵێت کەڕووبارێکی گەورەی خوێن لەنێوان دوونەتەوەدا دروست دەکات. هەرچەندە تۆقێنەرەکانی ئەم رووداوەشە (نەك بەتەنیا خودی رووداوەکە) والەڕۆشنبیرێکی مرۆڤدۆستوگەورەو جدی وەکو ئیسماعیل بێشکچی دەکات کەسالآنێکی زۆرخۆی بەهەڵدانەوەی دۆسێو فایلە تۆز لێنیشتووە لەبیرکراوەکانی حکومەتو دادگاوە خەریك بکاتو لەشێوەی کتێبێکی پڕ بایەخدا پێشکەشمانی بکات.

رەنگە ئەو کتێبە دەروازەیەکی باش بێت بۆ ئەوەی ئێمە تێبگەین کەتورکیا لەناو چ ریاییو دووفاقییەکدا ژیان بەسەر دەبات، لەلایەکەوە لافی ئەوە لێدەدات کەسیستەمو بەها مرۆییو نوێیەکانی خۆرئاوای لەچەشنی مافی مرۆڤو ئازادیو یەکسانیو دیموکراسیو سکۆلاریزم گرتۆتە خۆی لەلایەکی تریشەوە دڵی بەوە خۆشە کەمنداڵانی نەتەوەیەکی دیکە بەزۆر فێر

دەکات لەقوتابخانەکاندا بڵێین، ئەوەی تورکە بەختەوەرە!

لەبەرامبەر کارەساتی بەنەفرەت کردنی کوردەکان لەتورکیاداو ئاکامە مەرگبارەکانی، ئایا کۆمەڵگای تورکی تاوانبارە یان بەتەنیا دەسەڵاتی سیاسی؟

لەراستی‌دا بۆچوونێك هەیە پێی وایە کەکۆمەڵگای تورکی بەتەواوەتی بێبەری‌یە لەو خوێنەی کەڕژاوەو لەو سوکایەتیەی کەکراوەو تاکە بەرپرسیار دەسەڵاتی سیاسی‌یە. بەڵام من لەگەڵ ئەم جۆرە لەلێکدانەوەی رووداوەکانو خوێندنەوەیە بۆمێژوو تەبانیمو بەخوێندنەوەیەکی تەنكو سەرپێیی دەزانم. چونکە ئەم تێڕوانینەی کەبەتەنیا دەسەڵاتی سیاسی بەبەرپرس دەزانێت، سەرجەم پاشخانە کلتووریەکانی کۆمەڵگایەك پشتگوێ دەخات، کەلەراستی‌دا دەسەڵاتی سیاسی بەرئەنجامی ئەو پاشخانە کلتووریو فەرهەنگی‌یەیەو ناتوانین بەدابڕاوی لێکدی بیانخوێنینەوە. ئەدی دەزگا زانستی‌یەکانی تورکیا رۆڵیان چی‌یە؟ سەبارەت بەهەڵوێستی دەزگا زانستیو ئەکادیمی‌یەکانی تورکیا لەبەرامبەر کێشەی کوردستان کەئەوان پێی دەڵێن (خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ) ئەوانیش شتێك نالێن کەپێچەوانەی گوتاری باوبێت. شیاوی باسە بێشکچی زۆر باش ئەو دەزگایانەی ناسیوە بەتایبەت زانکۆکان. چونکە ئەو زانکۆیانە بەدرێژایی نزیکەی سەدەیەك زانستێك بەرهەم دەهێنن کەخاڵی‌یە لەبنەڕەتو خەسڵەتەکانی زانست، یاخود دەتوانین بڵێین کەکۆمەڵە تێزێکی هەڵە بەرهەم دێنن بەتایبەت لەبوارەکانی مێژوو سۆسیۆلۆژیاو جوگرافیاو ئەنسرۆپۆلۆژیادا، ئاشکراشە کۆمەڵگایەك لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیو سیاسی راسیزم بەرهەم بێنێت، ئەوا ناتوانێت زانستێکیش بێنێتە ئارا کەبتوانرێت وەکو زانستێکی‌باوەڕپێکراو پشتی پێ ببەسترێت. بابەنموونە جوگرافیاو مێژوو وەکو دووکایەی زانستی وەربگرین، دەزگا زانستیو ئەکادیمی‌یەکانی تورکیا جوگرافیاو مێژووی میللەتێك پشت گوێ دەخەن لەباشترین حاڵەتدا دەیشێوێنن کەلەواقیعدا ئەو میللەتە 27٪ی تورکیا پێك دێنێت، بەلەبەر چاوگرتنی ئەو خاڵەیە کەبێشکچی ئەو دەزگایانە وەکو دەزگای پارێزەری ئایدیۆلۆژیای رەسمی دەوڵەت چاو لێدەکات، وەهەر ئاشکراکردنو دانپێدانانی ئەو راستیانەشە وادەکات ئەو دەزگایانە رێگە بەبێشکچی نەدەن لەزانکۆکانیاندا لێکستی(محاضرة) بڵێتەوە، سەرەڕای ئەوەی بێشکچی هەڵگری بروانامەی دکتۆرایەو پرۆفیسۆریشە.

بەراستی بێشکچی بەو کارانەی، ئێمەی قەرزار بارو ئیحراج دەکات لەلایەکەوەو لەلایەکی تریشەوە وامانلێدەکات دڵمان خۆش بێت بەوەی کەهێشتا سەردەمی مرۆڤە گەورەکان هەر ماوە، گومانیشی تیانی‌یە کۆمەڵگایەکی ناتەندروستی وەکو تورکیا کەشۆڤینیزم پڕزەی لێبڕیوە پێویستی بەچەندان بێشکچی هەیە، پێشم وایە بێشکچی لەلایەن رۆشنبیری کوردی‌یەوە بایەخێکی کەمی پێدراوە کەئەو ئەرکەی کاك ئاسۆس هەردی بایەخێکی دەگمەنو نایابەو تائێستا هێندەی من بزانم کاك ئاسۆس بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو رێبوار رەشید بەوەرگێڕانی (کوردستان کۆلۆنیەکی نێودەوڵەتی‌یە) توانیویانە ئەو ئیحراجی‌یە لەسەر خۆیان کەمکەنەوە.

## ئاگادارییەك بۆ نووسەرانی گۆڤاری سەردەم

- لەگەڵ دەقە وەرگێڕراوەکەدا دەقە ئەسڵیەکەش بنێرن.
- رەچاوی رێزمانو خاڵبەندی بکەن.
- دەبێ بابەتەکە بەخەتێکی جوانو لەسەر دیوێکی کاغەزەکە بنوسرێ، دەنا فەرامۆش دەکرێ.
- بەپێی پێویست وێنە لەگەڵ بابەتەکەدا هەبێ.
- هەر بابەتێك بڵاوبکرێتەوەو نەکرێتەوە نادرێتەوە بەخاوەنەکەی.
- ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە مەرج نی یە دەربڕی راو بۆچوونی گۆڤارەکە بن.
- (سەردەم) پاش بەراوردو پیاچوونەوە بەبابەتەکاندا، لەدەسکاریو داڕشتنەوەیاندا ئازادە.

## ئاگادارییەك بۆ وەرگێڕەکان

دەزگای چاپو پەخشی سەردەم بەنیازە لەزنجیرە کتێبە چاپکراوەکانیدا گرنگییەکی تایبەت بەوەرگێڕانی کتێبی هەڵبژاردە بدات لە زمانە زیندووەکانی جیهانەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە:

یەکەم: بایەخی تایبەت بەلێکۆڵینەوە دەدرێ لەبوارەکانی: فیکر، فەلسەفە، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەقی جیهانیی وەرگێڕراو، رەخنە، زانستە مرۆییەکان، مێژوو، لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسیەکان، تۆژینەوەی هونەری، ئەدەبی منالّ، فەرهەنگسازی...دا.

دووەم: دەبێ دانەیەك لەکتێبە ئەسڵیەکە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هەبێ.

سێیەم: دوای ئەوەی بڕیاری چاپکردنی دەدرێ؛ نۆرەی خۆی بۆ چاپ دەگرێتو پاش چاپکردن، بەپێی قەوارەی کتێبەکە (جگە لە رێژەیەك لەکتێبەکە) خەڵات بۆ وەرگێڕەکەی تەرخان دەکرێ.

